# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کولتووری بیانی

57

زستانی

2008

ساڵی دەیەم

- سەردەم گۆڤارێکی وەرزییە، تایبەتە بە نوسین و وەرگێڕانی کولتوری بیانی لە بواری فەلسەفە و ڕەخنە و زانستە مرۆییەکان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیکیدا.
- داوا لەو بەڕێزانە دەکەین کە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەکەن، هاوپێچ ناوی تەواوی نوسەر، وەرگێر، سەرچاوەو زانیارییەکانی تایبەت بە چاپ و بڵاوکردنەوە، لەگەڵ کۆپییەک لەدەقی ئەسڵی بابەتی وەرگێڕدراو بنێرن.
- ئەو بەڕێزانەی بە نوسین و ئامادەکردن بەشداریدەکەن پێویستە هەموو مەرجە ئەکادیمیەکان، لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە، پێڕەویکەن.
- باشتر وایە بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ کرابن، بە فۆنتی سەحیفە بۆڵد، هاوپێچ لەگەڵ سی-دی و دەقی چاپکراوی بابەتەکەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیکترۆنی نوسەر یان وەرگێڕدا.
- ئەو بەڕێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێڕن پێویستە هاوپێچ ناونیشانی تەواوی سایت و لینک و ڕۆژی بڵاوکردنەوەی سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکە بنێرن.
- بەرهەمەکان گەر بڵاوبکرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەکانیان.
- پەیوەندییەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە ئەنجام دەدرێن.

خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

سکرتێری نووسین: شوان ئەحمەد

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی    د. شاهۆ سەعید

دەرهێنان و کاری کۆمپیوتەری

ئاڤگە فائق

بەرگ: نەرمین مستەفا

هەڵەچنی چاپ: ساکار ڕەووف

ناونیشان

سلێمانی – شەقامی سالم

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن: سەرنووسەر ٠٧٤٨٠١٣٦٦٥٩

دەزگای سەردەم ٣١٢٩٦٠٩

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: [illegible]

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( [illegible] ) ئاران

لە ڕێگەی (ئیمەیل)ەوە:

govarysardam@yahoo.com

www.sardam.enf

www.sardam.net

www.sardam.org

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

# سەردەم

## ناوەرۆکی ژمارە ٥٧



**نرخی (١٢٥٠) دینارە**

# فەلسەفە چییە؟

## کەواتە، ئەوە پرسیارەکەیە....

جیل دۆلۆزو فیلکس گاتاری

لەعەرەبییەوە: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل

ڕەنگە ئێمە نەتوانین پرسیاری: فەلسەفە چییە؟ بخەینە ڕوو، مەگەر بەدرەنگەوە نەبێت، کاتێک بەشێوەیەکی ئاشکرا پیری ڕێگامان پێدەگرێت و کاتی قسەکردن دێت. بەڵام سەرچاوەکانی ئەو پرسیارە زۆر نایاب و دەگمەنن. ئەوە پرسیارێکە ئێمە لەکاتی نیوە شەودا لە حاڵەتی شڵەژاوی شاراوەدا دەیخەینە ڕوو، کاتێک هیچ بابەتێکمان نەما شایەنی پرسیارکردن بێت.

لەڕابردوودا ئێمە بەردەوام ئەو پرسیارەمان دەخستە ڕوو و هەرگیز بێزاریش نەدەبووین لەخستنە ڕووی ئەو پرسیارە، ئینجا بەشێوەیەك و ڕێگایەکی ڕاستەوخۆ بێت، یا لابەلاو دروستکراوو زۆر ئەبستراکت. ئێمەش دەمانخستە ڕوو و کۆنترۆڵمان دەکرد و پێیدا تێپەڕ دەبووین، زیاتر لەوەی پێی سەرسام بین.

هەرگیز کاتی ئەوەمان نەبووە بەتەواوی لێی ڕابمێنین و ورد ببینەوە. ئێمەی فەلسەفەکار زۆر حەزمان دەکرد ئەو شتانە بەرهەم بێنین کە بۆ فەلسەفە دەگەڕێنەوە، بەبێ ئەوەی پرسیاری ئەوە بکەین کە لەچ حاڵەتێکدا بووە تەنیا مەگەر لە چوارچێوەی مومارەسەی شێواز نەبێت، ئێمەش نەماندەتوانی بگەینە ئەو خاڵە لە نا شێوازی و لێی دەرباز بین بەجۆرێك لە کۆتاییدا بتوانین بڵێین: باشە ئەو شتە چی بوو کە من بەدرێژایی ژیانم پێی هەڵساوم و ئەنجامم داوە؟

هەندێك حاڵەت هەیە تێیدا پیری هەرگیز گەنجێتییەکی هەمیشەیی نابەخشێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئازادییەکی تەواو دەبەخشێت، پێداویستییەکی پەتی، چونکە ئێمە چێژ لە چرکەساتی خۆشی نێوان ژیان و مردن وەردەگرین ، کاتێك هەموو بەشەکانی ئامێر لەنێو خۆیاندا بەیەکەوە کۆ دەبنەوەو خۆیان دەگونجێنن وەکو چۆن هێڵێك بەرەو ئایندە دەنێردرێت کە هەموو سەردەمەکان دەبڕێت، ئەوەش حاڵی تورنەرە ـ *Titien M onet*

- چونکە تۆرنەر لەپیرێتیدا توانی مافی *Turner* ئاراستەکردنی وێنەکێشان بەڕێکایەکی وشك و بریشکدا ببات کە گەڕانەوەی بۆ نییە، یا توانی ئەو مافە بەدەست بێنێت، بەشێوەیەك هەرگیز جیاوازی نەبوو لەبارەی ئەوەی کە دوا پرسیار مانای چی دەگەیەنێت.

ڕەنگە کتێبی (ژیانی ڕانسی - *La vie de Rance*) لەیەك کاتدا پیرێتی شتۆبریان و سەرەتای ئەدەبی نوێی تۆمارکردبێت - ڕانسی کتێبێکی شتۆبریانە لەبارەی پیرێتی وەکو بەهایەکی ئەستەم، کتێبێکە دژ بەپیرێتی دەسەڵات نووسراوە، کتێبێکە لەبارەی پاشماوەی شمولییەت کاتێك تەنیا دەسەڵاتی نووسین جەختی لێدەکرێتەوە. ڕەنگە سینەماش هەندێکجار بەهرەکانی خۆیمان پێبدات، ئەو بەهرانەی کە پەیوەستن بە تەمەنی سێیەم، کاتێك بۆ نموونە، ئیڤانس - *Ivens* - دێت پێکەنینی خۆی ئاوێتەی پێکەنینی جادووگەر دەکات لەنێو ڕەشەبادا.

هەمان شتیش لەنێو فەلسەفەدا دەدۆزینەوە، چونکە کتێبی (ڕەخنە لەحوکمدان) ی کانت لەپیریدا نووسراوە. کتێبێکی گشتگیر کە هەرگیز ئەو نووسین و کتێبانەی دوای ئەو نووسراون واز لەوە ناهێنن بەدوایدا بڕۆن و دوای بکەون، بەجۆرێك کە هەموو مەلەکاتەکانی دەروون و سنوورەکانیان دەبەزێنێت، خودی ئەو سنوورانەی کانت زۆر بەوردی کۆنتڕۆڵی کردبوون لەنێو ئەو کتێبانەی کە لەسەردەمی لاویدا نووسیویەتی.

ئێمە ناتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین کە ئەو ڕەوشەمان بەدیهێناوە، ئەوەی هەیە ئەوەیە کە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە تاوەکو پرسیار بکەین فەلسەفە چییە. ئێمە هەرگیز لەو ڕەوشە دانەبڕاوین، پێشتریش خاوەنی وەڵامێکی کۆنکریتی نەبووین کە گۆڕاو نەبێت: فەلسەفە بریتییە لە هونەری پێکهێنان و داهێنان و دروستکردنی چەمك. بەڵام هەر ئەوەندە بەس نەبوو کە وەڵامی پرسیارەکە بدرێتەوە، بەڵکو پێویستبوو کە دەستنیشانی کاتژمێرەکەو دەرفەت و بارودۆخ و دیمەن و کەسەکان و مەرجەکانی پرسیارەکەش بکەین. دەبوایە ئێمە بتوانین ئەو پرسیارە لەنێو هاوڕێیاندا بخەینە ڕوو، وەکو ئەوەی نهێنییەك بێت، یا شتێك بێت پێویست بکات لەدڵنیاییەوە بخرێتە ڕوو، یا بەڕووی دوژمناندا وەکو سەنگی مەحەك بخرێتە ڕوو، لەهەمان کاتیشدا توانای گەیشتن بەو کاتژمێرە لەئاڵۆزی کاتێك ئەستەم دەبوو سەگ و گورگ لەیەکتری جیا بکرێتەوە، تەنانەت ترسمان لەهاوڕێکانی خۆشمان هەبوو.

ئەوە ئەو کاتەیە کە تێیدا دەڵێین " ڕێك بەوردی ئەوە سەرقاڵی کردبووم، بەڵام نازانم ئایا بەجوانی گوزارشتم لێکردووە، یا بەتەواوی بڕوام پێی هەیە". ئینجا دەردەکەوێت کە ئەوە زۆر گرنگ نییە ئەگەر ئێمە باش گوزارشتمان لێکردبێت، یا پێی ڕازی بین و بڕوامان پێی هەبێت، مادام لەهەموو حاڵەتێکدا مەسەلەکە وایە کە ئێستا ئێمە پێیەوە سەرقاڵین.

چەمکەکان وەکو ئەوەی دەبینین، پێویستیان بە کەسایەتی چەمکگەرایی هەیە تاوەکو بەشدار بن لەدەستنیشانکردنیدا. هاوڕێ ئەو کەسەیە کە ئێمە دەتوانین لەبارەیەوە تا ئەو ڕادەیە بڕۆین و بڵێین شایەدە لەسەر ئەسڵی گریکیانەی خۆشویستنی - حیکمەت (*Philo - Sophie*)، چونکە شارستانییەتەکانی تر خەڵکی حەکیمیان هەبوو، کەچی گریکەکان ئەو هاوڕێیانەن کە بریتین لە هەندێك حەکیمی خاکی.

دواتر دەبینین گریکەکان خۆیان جەخت دەکەنە سەر مەرگی حەکیم و لەبری ئەویش هانا دەبەنە بەر فەلسەفەکاران، ئەوانەی هاوڕێی

حیکمەتن، ئەوانەن کە بەدوای حیکمەتدا دەگەڕێن، بەڵام بەبێ ئەوەی بتوانن بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە دەسگیری بکەن.

بەڵام دیارە جیاوازی نێوان حەکیم و فەلسەفەکار، ئەگەر مەسەلەکە پەیوەست بێت بەپێگە، تەنیا جیاوازی نییە لەپلەو پایە، ڕەنگە ئەو پیرە حەکیمەی لە خۆرهەڵاتەوە هاتووە لەمیانەی وێنەوە بیر بکاتەوە، لەکاتێکدا فەلسەفەکار چەمك ئافرێندە دەکات و بیری لێدەکاتەوە، بۆیە حیکمەت زۆر گۆڕاوە.

زۆر زەحمەتە بتوانین بزانین (هاوڕێ) لەلای گریکەکان چ ماناو پێگەیەکی هەبووە، بەتایبەتیش لەلای گریکەکاندا. ئایا (هاوڕێ) مانای جۆرێك لەژیانی ئاوێتەبوو و خۆشگوزەرانییە، جۆرێکە لە چێژی مادییانە، توانای بەیەکەوە کۆکردنەوەی نێوان دارو دارتاشە، ئایا دارتاشی باش بریتییە لە دارێك بەهێزەوە، ئەو هاوڕێی دارە؟ پرسیارەکە گرنگە مادام هاوڕێ وەکو ئەوەی لەنێو فەلسەفەدا هەیە مانای کەسێکی دەرەکی و نموونەیەکی یا ڕەوشێکی ئەزموونگەرایی نییە، بەڵکو بەمانای ئامادەگی دێت لەنێو هزردا، مەرجێکە بۆ بوونی خودی هزر خۆی و گوتەزایەکی زیندوو و ترانسندتالییە.

گریکەکان لەگەڵ سەرهەڵدانی فەلسەفەدا هاوڕێیان ناچار کرد پێوەندی لەگەڵ ئەویتر پووەو پێوەندییەکی هەمەکی و بابەتی لەگەڵ ماهییەتدا ببەزێنێت. بۆیە هەریەك لە (تیۆفیل - *Theophile*) و (فیلالێت - *Philalethe*) هاوڕێی ئەفلاتون بوون، بەڵام زیاتر هاوڕێی حیکمەت بوون.

بۆیە کاتێك فەلسەفەکار شارەزا دەبێت لە چەمکەکان و نەبوونی چەمك چ مانایەك دەگەیەنێت، ئەوە ئیدراك بەو چەمکانە دەکات کە لۆژیکی نین، یا عەشوایی و بێ توانان، ئەو چەمکانەی کە تەنیا بۆ یەك چرکەساتیش خۆیان ڕاناگرن. هەروەها بەپێچەوانەشەوە، ئیدراك بەو چەمکانەش دەکات کە بەجوانی داڕێژراون و ئاماژەیەکن لەسەر داهێنان، ئەگەر پڕ لە دڵەڕاوکێ و مەترسیداریش بن.

هاوڕێ مانای چییە کاتێك دەبێتە کەسایەتییەکی چەمککەرایی، یا مەرجێك بۆ مومارەسەی هزر؟ یا عاشق، ئەی باشە بەڕاستی ئەو عاشق نییە؟ مانای ئەوە نییە کە هاوڕێ تەنانەت لەنێو خانەی هزریشدا دەخرێتە نێو پێوەندییەکی زیندەگیانە لەگەڵ ئەویتر کە ئێمە پێمان وابووە لەنێو هزری پەتیدا بەلاوەنراوە؟ باشە ئەوە پێوەندی بە بوونەوەرێکی تر نییە جگە لە هاوڕێ و عاشق؟ چونکە ئەگەر فەلسەفەکار هاوڕێی حیکمەت، یا عاشقی حیکمەت بێت، باشە لەبەرئەوە نییە کە بانگەشەی ئەو مەسەلەیە دەکات بە کۆششی زیاتر لەسەر ئاستی هێزدا، لەبری ئەوەی بەڕاستی دەسگیری بکات؟ باشە ئەی هاوڕێ خۆی کەسێك نییە کە حەز دەکات و حەزی هەیە، ئەو بابەتەش کە ئارەزوو بەدەستی دێنێت ئەوەیە کە پێی دەگوترێت هاوڕێ، نەوەکو توخمی سێیەم کە بەپێچەوانەوە دەبێتە ڕکابەر؟ باشە ناکرێت هاوڕێیەتی جۆرێك لە وشیاری ململانێکاری تێدا بێت بەو ڕادەیەی کە خشانێکی عاشقانەیە ڕووەو بابەتی ئارەزوو. ڕەنگە دوو هاوڕێ کاتێك هاوڕێیەتی ڕووەو ماهییەت دەچێت وەکو ئارەزووکارو ململانێکار دەربکەون - بەڵام کێ لەیەکتریان جیا دەکاتەوە؟

ئەو سیمایەیە کە فەلسەفە وا لێدەکات ببێتە بابەتێکی گریکیانەو لەگەڵ شێوەی بەشداری شاری گریکی ڕێك و تەبا بێت، چونکە کۆمەڵگایەك بووە لە هاوڕێ و کەسی یەکسان پێکهاتووە، هەروەها لەبەرئەوەی لەنێویانداو لەنێو هەریەکێکیاندا جۆرێك لەپێوەندی

ململانێکاری دروستکردووه کە هاوشانی ئارەزوو بووە لە هەموو بوارەکاندا، لەنێو خۆشەویستی و یاری و دادگاو ئەنجومەنە دادوەرییەکانیشدا، لەنێو سیاسەت و تەنانەت هزریشدا کە هەر تەنیا پرسی هاوڕێی تێدا نادۆزێتەوە، بەڵکو ئارەزوو و ململانێش (ئەو جەدەلەی کە ئەفلاتون لەنێو دیالۆگی — Amphisbetesis) دا دەستنیشانی دەکات بەوەی کە بریتییە لە ململانێ لەنێوان مرۆڤە ئازادەکانداو جۆرە وەرزشێکی مەعمەعەییە، ململانێ. بۆیە لەسەر هاوڕێیەتی پێویستە گونجان لەنێوان کەمالی ماهییەت و ململانێی نێوان کەسە ئارەزووخوازەکاندا بکات. ئەی باشە ئەوە ئەرکێکی زۆر گەورە نییە؟

هاوڕێ و عاشق و ئارەزووخوازو ململانێکار دەستنیشانکراوی ترانسندتالین، بەبێ ئەوەی ئەو کارە ببێتە هۆی لەدەستدانی چڕییەکەی و زیندەگییەکەی نێو تاکەکەسێك و فرە کەسەکاندا. کاتێك ئێستا مۆریس بلانشۆ دێت کە یەکێکە لەو بیرمەندە دەگمەنانەی بایەخ بەچەمکی (هاوڕێ) دەدات لەنێو فەلسەفەدا، کاتێك دێت سەرلەنوێ چاو بەو پرسە ناوخۆییانەی مەرجی بیرکردنەوە دەدات بەوەی کە نا بیرکردنەوەیە، کەسایەتی چەمکگەرایی تازە ناخاتە نێو هزری پەتی تر، کەسایەتی کەمتر ئینتیما بۆ گریکەکان کە لەشوێنێکی تر هاتووە وەکو ئەوەی کارەساتێکی بەزاندبێت کە ڕووەو پێوەندی زیندووتری ڕادەکێشێت و بەرزکراوەتەوە بۆ ڕەوشێکی پێشینەییانە.

وەکو ئەوەی جۆرێك لە گۆڕینی ڕووگە ڕوویدابێت، یا جۆرێك لەماندوو بوون، یا جۆرێك لە بێ ئومێدی لە هاوڕێیان بەشێوەیەك خودی هاوڕێیەتی خۆی دەبێتە بیرۆکەی چەمك کە نزیکە لە سەبرێکی بێکۆتایی. بۆیە هەرگیز لیستی چەمکەکان داخراو نییە، بەوەش ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە پێشڤەبردنی فەلسەفەو وەرچەرخانەکانی، بۆیە دەبێت وا تەماشا بکرێت کە فرەییە بەبێ ئەوەی کورت بکرێتەوە لە یەکێتی فەلسەفەکاری گریکی کە پێشتر ئاڵۆزە.

فەلسەفەکار هاوڕێی چەمکە، ئەو خۆی چەمکە بەهێزەوە. ئەوەش مانای وایە فەلسەفە هەر تەنیا هونەری پێکهێنان و ئافراندن و دروستکردنی چەمك نییە، چونکە چەمکەکان مەرج نییە شێوە یا دۆزینەوە یا مادەی دروستکراو بێت. وردتر بڵێین، فەلسەفە بریتییە لە کایەیەکی مەعریفی بونیادنراو لەسەر داهێنانی چەمك. باشە دەکرێت هاوڕێ ببێتە هاوڕێی داهێنانە تایبەتییەکانی خۆی؟ یا کردەی چەمك خۆی ئیحالەی هێزی هاوڕێ دەکات لەنێو یەکێتی داهێنەرو هاوشانەکەیدا؟ بۆیە داهێنانی چەمکی بەردەوام تازە بابەتی فەلسەفەیە.

لەبەرئەوەی چەمك پێویستی بەداهێنان هەیە، ئەوە وا دەکات ئاراستەی فەلسەفەکار بکرێت وەکو ئەوەی بەهێز دەسگیری کردبێت، یا هێزو توانای هەیە لەسەر ئەوە. ناکرێت ڕەخنە لەوە بگیرێت کە هەندێکجار دەگوترێت لەبارەی داهێنانی هەستی، یا لەبارەی هونەرەوە، مادام هونەر کیانی ڕۆحی دێنێتە کایەوەو چەمکە فەلسەفییەکانیش هەستناکن.

لەڕاستیدا خودی زانست و هونەرو فەلسەفەکانیش داهێنەرانەن، تەنانەت ئەگەر داهێنانی چەمك بەمانا وردەکەی تەنیا بۆ فەلسەفەش بگەڕێتەوە. چەمکەکان بەئامادەیی لە چاوەڕوانی ئێمەدا نین وەکو ئەوەی تەنی ئاسمانی بن. هیچ ئاسمانێك بۆ چەمکەکان بوونی نییە، بەڵکو دەبێت دابهێنرێت و دروستبکرێت، یا بەمانایەکی تر، دابهێنرێت،

هیچیش نییە ئەگەر واژووی داهێنەرەکەی بەسەرەوە نەبێت.

ئیچە کارو فرمانی فەلسەفەی بەو شێوەیە دەستنیشانکرد کاتێک نووسی: "نابێت فەلسەفەکاران بەوە ڕازی بن ئەو چەمکانە قبووڵ بکەن کە پێیانەدرێت تاوەکو ئەوان تەنیا بێن جوانییان بکەن و سەرلەنوێ بریقەداریان بکەنەوە، بەڵکو پێویستە لەسەریان دەستبکەن بەدروستکردن و داهێنان و خستنە ڕوویان و قەناعەتپێکردنی خەڵک بەوەی کە مانایان بۆ ببەن و بەکاریان بێنن. تا ئێستا ئێمە هەمووومان، هەریەکەمان هەر ئەوەندەیە کە بڕواو متمانە دەبەخشێتە چەمکەکانی خۆی وەکو ئەوەی مەسەلە پەیوەست بێت بە جوانووێکی باڵا کە لە جیهانێکی باڵاوە هاتبێت".

بەڵام دەبێت قەرەبووی بڕواو متمانە بە وشیاری و وریایی بکەینەوە، ئەو چەمکانەش دەبێت فەلسەفەکار زۆرتر لێیان ڕابمێنێت و ئاگاداریان بێت، مادام ئەو خۆی داینەهێناون (ئەفلاتون ئەوەی زۆر بەباشی دەزانی، ئەگەرچی خەڵکی بەپێچەوانەوە فێر دەکرد)، ئەفلاتون دەیگوت پێویستە لە ئایدیاکان ڕابمێنین، بەڵام پێویستبوو ئەو خۆی پێشتر چەمکی ئایدیای داپهێنابووایە. باشە ئەو فەلسەفەکارە چ بەهایەکی هەیە کە هیچ چەمکێکی دانەهێناوە؟ چەمکی خۆی دانەهێناوە؟

با ئێستاش بەلایەنی کەم بڕوانین و بزانین فەلسەفە چی نییە: فەلسەفە تێڕامان و بیرکردنەوەو پێوەندی نییە، تەنانەت ئەگەر هەندێکجار خۆیشی پێی وابوو یەکێکە لەوانە، چونکە هەر کایەیەک لەوانە توانای بەرهەمهێنانی وەهمی خودی خۆی هەیەو دەتوانێت خۆی لەپەنای ئەو تەمووموژەدا بشارێتەوە کە بەتایبەتی بۆ ئەوە دروستی دەکات.

فەلسەفە تێڕامان نییە، چونکە تێڕامانەکان هەمان خودی ئەو شتانەن کە وا تەماشا دەکرێن لەچوارچێوەی داهێنانی چەمکی تایبەت بەخۆیەوە. فەلسەفە بیرکردنەوە نییە، چونکە هیچ کەسێک پێویستی بەفەلسەفە نییە بۆ بیرکردنەوە لەهیچ شتێک، جا ئەو شتە هەر چییەک بێت. ئێمە پێمان وایە شتێکی زۆر بەفەلسەفە دەبەخشین کاتێک وای لێدەکەین ببێتە هونەری بیرکردنەوە، بەڵام ئێمە ئەو کاتە لەهەمموو شتێکی دادەماڵین، چونکە ماتماتیککاران وەکو کەسانی ماتماتیکی هەرگیز چاوەڕوانی هاتنی فەلسەفەکارانیان نەکردووە بۆ ئەوەی بێن بیر لە ماتماتیک بکەنەوە، هەروەها هونەرمەندانیش چاوەڕوانی هاتنی فەلسەفەکاران نەبوون تاوەکو لە وێنەو مۆسیقا ڕابمێنن، ئەو قسەیەش کە دەڵێت ئەوانە بەو شێوەیە دەبنە فەلسەفەکار، نوکتەیەکی زۆر قۆڕە، مادام بیرکردنەوەیان سەریەداهێنانی هەریەکێک لەخۆیانە.

فەلسەفە پەناگەی کۆتایی خۆی لەنێو پێوەندیدا نادۆزێتەوە - دۆلۆز لێرەدا مەبەستی تیۆری پێوەندییە لەلای هابرماس و ڕەخنەیەکی خێرای لێدەگرێت - کە لەمیانەی هێزەوە کار ناکات، تەنیا لەبواری ڕاو بۆچوونەوە نەبێت، ئەوەش لەپێناو دروستکردنی کۆدەنگیدا، نەوەکو لەپێناو ئافرێدەکردنی چەمکدا — مەبەستی دۆلۆز ئەوەیە کە پێوەندی تەنیا لەبواری ڕاو بۆچووندا کاردەکات، بۆیە دەیەوێت کۆدەنگیان لەنێواندا دروستبکات، کەواتە پێوەندی چەمک بەرهەم ناهێنێت. ئەو قسەیەشی وەڵامێکە بۆ هابرماس — چونکە پیرۆکەی دیالۆگی دیموکراتییانەی خۆرئاوایی لەنێوان هاوڕێیاندا هەرگیز بچووکترین چەمکی بەرهەم نەهێناوە، خۆ ڕەنگە ئەو پیرۆکەیە لە گریکەکانەوە هاتبێت، بەڵام گریکەکان زۆر بە

وشیارییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد و دەیانخستە ژێر پشکنینێکی توندو تۆڵ؛ بۆیە چەمك وەکو ئەو چۆلەکەیە وایە کە سکاڵا لە خۆی دەکات و بەگاڵتەوە بەسەر کێڵگەی جەنگی ڕاو بۆچوونە ناکۆك و دژیەکەکاندا دەسووڕایەوە، ئەو ڕاو بۆچوونانەی کە هەندێکیان هەندێکی تریان لەناو دەبەن و دەسڕنەوە (وەکو ئەو سەرخۆشانەی لەسەر خوانندان) ــ ئەوەش ئاماژەیەکی دۆلۆزە بۆ دیالۆگی خوان لەلای ئەفلاتون کە بابەتەکەی لەبارەی فەلسەفەو خۆشەویستییە.

فەلسەفە ڕانامێنێت و بیر ناکاتەوەو پێوەندیش نییە، تەنانەت ئەگەر لەسەریشی بێت چەمك بۆ ئەو جۆرە کارو هەڵچوونانە دابهێنێت. تێڕامان و بیرکردنەوەو پێوەندی کایەی مەعریفی نین، بەڵکو ئامرازن بۆ پێکهێنانی هەمەکێتی لەنێو سەرجەم کایەکاندا. هەمەکێتی تێڕامان و هەمەکێتی بیرکردنەوە ئەو دوو وەهمەن کە پێشتر فەلسەفە بەزاندوونی کاتێك خەونی بە کۆنترۆڵکردنی بوارە مەعریفییەکانی تر دەبینی (ئایدیالیزمی بابەتی و ئایدیالیزمی خودی)، بۆیە فەلسەفە شەرافەتمەند نابێت کاتێك خۆی وەکو ئەسینایەکی نوێ پێشکەش دەکات، یا کاتێك دەگەڕێتەوە سەر هەمەکێتی پێوەندی کە هەندێك بنەمای خەیاڵیمان پێدەدات بۆ کۆنترۆڵکردنی بازاڕو دەزگاکانی ڕاگەیاندن، بۆیە هەموو داهێنانێك دەکمەنە، چەمکیش وەکو داهێنانێکی فەلسەفی پەتی بەردەوام دەگمەنە، بۆیە یەکەم پرنسیپی فەلسەفە ئەوەیە کە هەمەکێتییەکان هیچ شتێك ڕاڤە ناکەن، بەڵکو ئەوان خۆیان دەبێت جێگای تێڕامان و ڕاڤەکردن بن.

ئەگەر ئێمە بەخۆمان بێین خۆمان فێر بکەین - فێری بیرکردنەوە بین - وا ڕەفتار بکەین وەکو ئەوەی هیچ شتێك بەدیهی نییە ــ " سەرمان سووڕ بمێنێت لە کەینوونەتی بوونەوەر"، ئەو دەستنیشانکردنانە بۆ فەلسەفە، لەگەڵ هەندێك دەستنیشانکردنی تر، هەڵوێستی بەسوودن تەنانەت ئەگەر بەتێپەڕینی کاتیش دووچاری بێزاریمان بکەن، بەڵام سەرقاڵبوونێکی ئەوپەڕی دەستنیشانکراو و چالاکیەکی ورد نین لەڕوانگەی پەروەردەییەوە.

بەپێچەوانەوە، دەشێت ئەو پێناسەیە بۆ فەلسەفە پێناسەیەکی یەکلاکەرەوە بێت: مەعریفە لەمیانەی چەمکە پەتییەکانەوە. بەڵام دیارە هیچ بوارێك لەئارادا نییە بۆ بونیادنانی دژکاری لەنێوان مەعریفە لەمیانەی چەمکەوە، لەگەڵ مەعریفە لەمیانەی بونیادنانی چەمکەوە لەنێو ئەزموونێکی مومکین یا حەدەسدا، چونکە بەپێی حیکمەتەکانی نیچە، هیچ شتێك لەمیانەی چەمکەکانەوە نازانن، ئەگەر پێشتر ئێوە بەخۆتان داتان نەهێنابێت، بەمانای ئەوەی لەنێو حەدەسی تایبەت بەخۆیدا بونیادتان نەنابێت: کایە، یا ئاست، یا پانتایی، تاوەکو بتوانێت ئاوێتەی ببێت، بەڵام ئەو تۆیەکەی و ئەو کەسانە لەخۆ دەگرێت کە دەیکێڵن.

خولیای بونیادگەرانە دەخوازێت هەموو داهێنانێکی بونیادنەرانە لەسەر موسەتەحێك دامەزرابێت کە بوونێکی سەربەخۆی پێدەبەخشێت ــ موسەتەح *Le Plan* ئەو زاراوەیە بەو شێوەیە بەکاردێنین کە لەنێو دەقەکانی دۆلۆزدا بەکارهاتووە، لێرەدا بەمانای ئەو بەش و شوێنە دێت لە موحایەسە کە مادەی چەمکی دۆلۆزی و بنەمای دەرکەوتنی دەگەیەنێت ـ داهێنانی چەمك، بەلایەنی کەم بریتییە لە ئەنجامدانی کارێك. بەو شێوەیە پرسی بەکارهێنانی فەلسەفە، یا دەسەڵاتەکەی، تەنانەت پرسی ئەوەش کە ئازار بەکێ دەگەیەنێت، گۆڕانی بەسەردا هات.

کۆمەڵێك کێشەی زۆر دێنە پێش چاوی پیاوی پیر، کاتێك تێبینی دەکات جۆرەها چەمکی فەلسەفی و کەسایەتی چەمککەرا بەریەك دەکەون. چەمکەکان بەرلەهەموو شتێك بەواژووکراوی دەردەکەون ـ لەلایەن خاوەنە فەلسەفەکارەکانیان ـ وەکو: جەوهەری ئەرستۆ، کۆجیتۆی دیکارت، مۆنادی لیبینتز، مەرجەکانی کانت، هێزی شلینگ، دیمومەتی برگسۆن.

بەڵام هەندێك کەس بانگەشەی وشەیەکی سوپەر دەکەن، یا هەندێکجار دڕو بێزارکەر، تاوەکو دایبمەزرێنن، کەچی هەندێکی تریش هەر بەوشەیەکی سادە دەوەستێت کە پڕە لە ریتمی زۆر دوور کە ڕەنگە گوێچکەی فەلسەفی بەدی نەکات. هەندێك کەس هەن دێن گوزارشتە کۆنەکان دەوروژێننەوە، خەڵکی تریش هەیە دێت گوزارشتی تازە دادەتاشێت و دەچێتە ژێر باری ڕامێنانی داتاشینی زاراوەسازی پڕ لەشێتی، وەکو ئەوەی زاراوەسازی جۆرێك بێت لە وەرزشێکی فەلسەفی پەتی.

بۆیە پێویستە هەموو حاڵەتێك بچێتە ژێر باری داڕشتنەوەی وشەکان و جۆری هەڵبژاردنی ئەو وشانە، وەکو ئەوەی ئەو کارە توخمی هەرە دیارو بەرچاوی شێواز بێت. ڕەنگە داهێنانی چەمك پێویستی بەچێژێکی فەلسەفی پەتی هەبێت کە لەمیانەی توندوتیژییەوە کاردەکات و لەنێو زماندا زمانێکی فەلسەفی پێکدێنێت، نەوەکو هەر تەنیا فەرهەنگێك بۆ وشەو زاراوەکان، بەڵکو سیاقێك بگاتە ئاستێکی باڵا، یا ئێستاتیکایەکی جوان.

بەو شێوەیە چەمکەکان شێوازو ڕێگایەك دەدۆزنەوە تاوەکو لەناو نەچن، ئەگەرچی مێژوویان هەیەو ناویشیان هەیەو واژوو کراویشن، لەکاتێکدا دەخرێنە ژێر باری پێداویستی نوێکردنەوەو قەرەبووکردنەوەو تەحویلکردن کە مێژوو و جوگرافیایەکی شێواو بەفەلسەفە دەبەخشن بەجۆرێك هەر چرکەساتێك لەمێژوو و هەموو شوێنێك لە جوگرافیا پارێزگاری لەخۆیان دەکەن لەنێو زەماندا وەکو چۆن لەدەرەوەی زەمانیشدا گوزارشت دەکەن.

بۆیە ڕەنگە پرسیاری ئەوە بکەین کە چ یەکێتییەك بۆ فەلسەفەکان دەمێنێتەوە، لەکاتێکدا چەمکەکان هەرگیز لەوەستان ناوەستن. ئایا هەمان شتیش بەسەر زانست و هونەرەکاندا پراکتیك دەبێت کە لەمیانەی چەمکەکانەوە کار ناکەن؟ ئەی چی لەبارەی مێژووە هەر یەکێکیان؟ ئەگەر فەلسەفە بریتی بێت لە داهێنانی بەردەوامی چەمکەکان، ئەوە کارێکی زۆر سادەیە ئەگەر بپرسین ئایا چەمك وەکو بیرۆکەیەکی فەلسەفی مانای چییە، هەروەها ئەگەر بپرسین ئایا بیرۆکە داهێنەرانەکانی تر کە چەمك نین، لەسەر چ شتێك دەوەستن و بونیاد دەنرێن، ئەوانەی سەر بەزانست و هونەری خاوەن مێژووی تایبەت و سەیرورەتی تایبەتی خۆیانن، خاوەنی پێوەندی گۆڕاوی نێوان خۆیان و نێوان فەلسەفەن.

تاکرەوی فەلسەفە بەداهێنانی چەمك، وەزیفەیەکی بۆ مسۆگەر دەکات، بەبێ ئەوەی ئەو وەزیفەیە ببێتە هۆی ئەوەی هیچ جۆرە باڵادەستی و ئیمتیازێکی پێبدات، مادام ڕێگاو شێوازی تر هەیە بۆ بیرکردنەوەو داهێنان، شێوازی تر هەیە بۆ چنینی بیرۆکەو هزر، بەجۆرێك ناچار نییە بەچەمکەکاندا تێپەڕێت وەکو ئەوەی لەنێو هزری پراکتیکیدا هەیە، چونکە پێویستە بەردەوام بگەڕێتەوە بۆ پرسی ئەوەی کە بزانێت ئەو جۆرە چالاکیە تایبەتە بەداهێنانی چەمك چەندە بەسوودە بەپێی ئەو فۆرمەی تێیدا جیاوازە لەچالاکی زانستی، یا هونەری.

بۆچی دەبێت بەردەوام چەمکی نوێ و تازە دابهێنرێت؟ بۆچی پێویستەو بۆچی دەبێت بەکاربێت؟ لەپێناو چیدایە؟ دیارە وەڵام دەبێت دان بەوەدا بنێت مەزنێتی فەلسەفە لەوەدایە کە بۆ هیچ شتێك دەستنادات و ناشێت، ئەو وەڵامەش دیارە لە ئەمڕۆدا تەنانەت ناتوانێت گەنجانیش ڕازی بکات.

هەرگیز ئێمە کێشەیەکمان نەبووە تایبەت بێت بەمردنی میتافیزیکا، یا بەزاندنی فەلسەفە، چونکە ئەو جۆرە هزرو بیرۆکانە قسەی بۆش و بەتاڵ و قورسن. باشە ئێستا ئێمە بەردەوام بین لەقسەکردن لەبارەی مایەپووچی سەمت و ڕێبازەکان، لەکاتێکدا ئەوەی ڕوویداوە، هەر تەنیا ئەوەیە کە چەمکی سەمت گۆڕاوە.

هەرچەندەی لەنێو کات و شوێنێکی دیاریکراودا چەمك دابهێنرێت، ئەوە ئەو پرۆسەیەی پێی دەکات، بەفەلسەفە ناو دەبرێت، یا تەنانەت ئەگەر ناویشی جیاواز بێت، ئەوە هەرگیز خۆی جیاواز نییە لێی.

لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە دەزانین کە هاوڕێ، یا عاشق وەکو ئارەزووخوازێك هەرگیز ڕۆڵی دژو ململانێکار نابینێت.

ئەگەر ئەسڵی فەلسەفە گریکی بێت وەکو ئەوەی تا ئێستا ئێمە دەیڵێینەوەو باسی لێوە دەکەین، لەبەرئەوەیە کە شاری گریکی، بەپێچەوانەی ئیمپراتۆرییەت و وڵاتان، دێت لاگۆن ـ *Lagon* ئافرێدە دەکات، یا ململانێ وەکو بنەمایەك بۆ کۆمەڵگای "هاوڕێیان" و کۆمەڵگای مرۆڤە ئازادە ململانێخوازەکان وەکو هاوڵاتی بەرهەمی دێنێت.

ئەوە ئەو ڕەوشە جێگیرەیە کە ئەفلاتون وا وەسفی دەکات: ئەگەر هەموو هاوڵاتییەك بەدوای شتێکەوە بێت و حەزی لێبێت بەدەستی بێنێت، ئەوە دیارە بێگومان ڕوو بەڕووی کەسانێکی تر دەبێتەوە کە هەمان ئارەزوویان هەیەو دەچێتە نێو ململانێ لەگەڵیاندا، بۆیە دەبێت جۆرە حوکمێك هەبێت بتوانێت لەسەر بنەمای ئارەزووەکان بڕیار بدات. دەشێت دارتاش حەزی بەدار بێت، بەڵام تووشی پاسەوانی دارستان و داربڕو دروستکەری دار دەبێت کە هەریەکێك لەوانە دەڵێن: من، من هاوڕێی دارم.

خۆ ئەگەر مەسەلەکە بگاتە هەڵسووڕاندنی ئیش و کاری خەڵك، ئەوە زۆر کەسی ئارەزوومەند دەبینین کە دێنە پێش و خۆیان وەکو هاوڕێی مرۆڤ پیشاندەدەن، کەسانی وەکو ئەو جوتیارەی خۆراك بۆ مرۆڤ پەیدا دەکات، ئەو چنەرەی کە پۆشاك و جلوبەرگی بۆ دەچنێت و دروست دەکات، ئەو پزیشکەی کە مرۆڤ چارەسەر دەکات، ئەو جەنگاوەرەی مرۆڤەکان دەپارێزێت.

خۆ ئەگەر هەڵبژاردن لەنێو ئەو هەمووانەدا سەرەڕای هەموو شتێك هەر لەنێو بازنەیەکی بچووکدا ئەنجام دەدرێت، ئەوە پرسەکە لەنێو سیاسەتدا جیاوازە، چونکە وەکو ئەوەی ئەفلاتون پێی وایە، دیموکراتییەتی ئەسینایی ڕێگای بە هەموو کەسێك داوە کە ئارەزووی هەر شتێك بکات.

بۆیە بەپێی بۆچوونەکانی ئەفلاتون لێرەوە گرنگە سەرلەنوێ شتەکان ڕێکبخرێنەوەو پلەکان دابهێنرێت تاوەکو بکرێت لەمیانەیانەوە بڕیار لەبارەی ڕاستی ئارەزووی کەسان بدرێت. ئەوە ئایدیاکانن وەکو چەمکی فەلسەفی نمایش دەکرێن. بەڵام، باشە ئەی لێرەدا ئێمە بەهەموو بانگەشەکاران ناگەین، هەر کەسێك بۆ خۆی ناڵێت: فەلسەفەکاری ڕاستەقینە منم، من هاوڕێی حیکمەت و بیری ڕاستەقینەو ڕاستم. ململانێ و کێبڕکێ ئەوکاتە دەگاتە لووتکە کاتێك فەلسەفەکارو سۆفیست

بەیەکدەگەن و ململانێ لەسەر پاشماوەی حەکیمی کۆندا دەکەن.

بەڵام، باشە چۆن دەکرێت جیاوازی بکەین لەنێوان هاوڕێی ڕاستەقینەو ساختەچیدا، لەنێوان چەمك و هاوشێوەکەی، لەنێوان هاوڕێ و ئەو کەسەی وەکو هاوڕێ خۆی نمایش دەکات، ئەوە لەلای ئەفلاتون شانۆگەریەکی تەواوەو هەوڵدەدات کۆمەڵێك کەسایەتی چەمککرایی پێشکەش بکات و هەندێك هێزی تری بخاتە سەر، هێزێك پێوەندیان بە کۆمیدیاو تراژیدیاوە هەیە.

لە سەردەمانێکی نزیك لە ئێمەدا، فەلسەفە لەگەڵ کۆمەڵێك ململانێکارو ڕکابەری تازەدا بەیەك گەیشتن. سەرەتا لەشێوەی زانستە مرۆڤایەتییەکاندا بوون، بەتایبەتیش سۆسیۆلۆژیا، کە ویستی شوێنگەی ئەو بگرێتەوە. ئەوکاتەی کە فەلسەفە زیندەڕۆییکرد لە بەلاوەنانی ئارەزووەکانی خۆی بەرەو داهێنانی چەمك و خۆی خستە نێو هەمەکێتییەکان و گرمۆڵە بوو، ئەوکاتەش ئێمە بەوردی نەماندزانی مەبەست لەو بابەتە چییە. ئایا مەسەلەکە ئەوە بوو کە دەستبەرداری داهێنانی هەموو چەمکێك بوو لەپێناو زانستێکی ورد لەبارەی مرۆڤ، یا بەپێچەوانەوە، لەمیانەی گۆڕینی سروشتی چەمکەکان لەڕێگای ئەوەی وای لێبکات جارێکیان نمایندەی کۆمەڵی بن، جارێکی تریش بۆ ئەوەی ببنە وێناندنێکی داهێنەرانە لەبارەی جیهان لەلایەن گەلان و هێزە زیندووە مێژوویی و ڕۆحییەکانیانەوە؟

ئینجا ڕۆڵی ئەپستمۆلۆژیاو زمانەوانی هات، بگرە دەروونشیکاری و شیکاری لۆژیکیش. بەو شێوەیە لە ئەزموونێکەوە بەرەو ئەزموونێکی تر فەلسەفە ڕووبەڕووی ململانێکارو ڕکابەری گەمژەتر دەبۆوە، ڕکابەری توندترو قسەڕەقتر،

بۆیە ئەفلاتون خۆیشی هەرگیز لەکاتی هەرە لاوازیدا وێنای شتی وای نەکردبوو.

لەکۆتاییدا شوورەییەکە گەیشتە لووتکە کاتێك زانیاری و بەبازاڕکردنی بازرگانی و هونەری دیزاین و ڕێکلام، هەموو مەعریفە تایبەتەکانی بەپێوەندی، دەستیان بەسەر زاراوەی خودی چەمکدا گرت و گوتیان: ئەوە کاری ئێمەیە، ئێمە ئافرێنەکارین، ئێمەین کە چەمکەکان بەرهەم دێنین! تەنیا ئێمە هاوڕێی چەمکین و دەیخەینە نێو کۆمپیوتەرەکانمان.

بۆیە ڕاگەیاندن دەبێتە کارێکی داهێنەرانە، کۆمپانیاش خۆی دەبێتە چەمك، بەوەش ئێمە پێشتر دەبینە خاوەنی بیبلۆگرافیایەکی دەوڵەمەند. لەی باشی خۆی بەبازاڕکردن پارێزگاری بەجۆرێك لەپێوەندی نەکردووە لەنێوان چەمك و ڕووداودا، بەڵام ئەوە ئێستا چەمك بۆتە کۆمەڵێك لە پێشکەشکردنی ڕێکلامی تایبەت بە بەرهەمێکی مێژوویی و زانستی و هونەری و سێکسی و ...تاد.

ئێستا ڕووداو بۆتە ئەو پێشانگایەی کە دێت ڕێکلامی جیاوازمان پێشکەش دەکات و ڕاو بۆچوونی جیاواز دەگۆڕێتەوە کە گریمانکراوە ببێتە بواری تایبەتی خۆی. ڕووداوەکان ئێستا بەتەنیا بریتین لەو پێشانگایانەی کە دەکرێنەوە، چەمکەکانیش بوونەتە ئەو بەرهەمانەی کە دەشێت بفرۆشرێن. ئەو بزاڤە گشتییەش کە پارەی بەپیشەچوونی بازرگانی گۆڕیوەتەوە، ئەوەی بینەچووە کە کار بکاتە سەر فەلسەفەش. ئێستا وێنەکە وەهمییانەیە، یا خەیاڵی پاکەتێك ماکەڕۆنەیە، چەمکی ڕاستەقینە، ئەو شتەش کە پێشکەش دەکرێت، ئەوەی کە دەخرێتە ڕوو و نمایش دەکرێت، جا ئەوە کاڵا بێت، یا تابلۆیەکی هونەری، بریتییە لە فەلسەفەکان، یا کەسایەتی چەمککرایی، یا هونەرمەند.

چۆن فەلسەفە دەتوانێت وەکو کەسایەتییەکی کۆن و دێرین بگاتە ئەو چوارچێوە گەنج و مۆدێرنانە لەنێو کێبڕکێ پڕوەو هەمەکێتی پێوەندی بەئامانجی دەستنیشانکردن ـ هاندان و فرۆشتن ـ ی وێنەی بازرگانیانەی چەمک؟ بێگومان شتێکی ئازاربەخشە ئەوەمان بۆ ڕوون بێتەوە کە چەمک بریتییە لە کۆمپانیایەک بۆ خزمەتگوزاری و ئەندازەی زانیاری.

بەڵام هەرچەندە فەلسەفە بەر ململانێکارو ڕکابەری گەمژەو سەرلێشێواو بکەوێت، هەرچەندەی لەنێو سێنتەری خۆیدا بەریان بکەوێت، ئەوەندە هەست بە زیندەداری دەکات بۆ ئەنجامدانی کارەکانی خۆی و داهێنانی ئەو چەمکانەی کە زیاتر لەشێوەی فڕێنەری ئاسمانین، زۆرتر لەوەی کالاّ بن. ئەوەش پاڵی پێوەدەنێت بەشێوەیەک پێبکەنێت کە ئاوێتەو بارگاوییە بەگریان. بەو شێوەیە پرسی ئەوەی کە فەلسەفە چییە، دەبێتە ئەو خاڵە دەگمەنەی هەریەک لەچەمك و داهێنان بەرەو یەکتری کێش دەکات و بەیەکەوە هاناى بۆ دەبەن.

فەلسەفەکاران بایی ئەوەندە بایەخیان بەسروشتی چەمك نەداوە وەکو واقیعێکی فەلسەفی، بەڵکو پێیان باشتر بوو وەکو مەعریفەیەک یا نماینەیەکی پێدراو تەماشای بکەن کە لەمیانەی ئەو مەلەکانەی ڕاڤەدەکرێن کە دەتوانن پێکیان بێنن و دروستیان بکەن ـ ئەپستراکتکردن و گشتاندن ـ یا بەکارهێنانی ـ بڕیاردان.

بەڵام چەمك پێدراو نییە، بەڵکو داهێنراوەو دەبێت دابهێنرێت، ئەو پێکنامێنرێت، بەڵکو بەخۆی لەنێو خۆیدا خۆی دەخاتە ڕوو. مەسەلەکەش ئەوەیە کە داهێنان و خۆ خستنە ڕوو هاوشێوەن. مادام هەموو ئەو شتانەی بەراستی داهێنراون، هەر لە شتە زیندووەکانەوە تا دەگاتە تابلۆیەك، ئەوانیش دەتوانن خۆیان بخەنە ڕوو، یا بەشێوەیەکی ئەوەندە تایبەت کە دەتوانین لەمیانەیەوە بیانناسین.

بەو ڕادەیە چەمك داهێنراو دەبێت کە خۆی دەخاتە ڕوو. هەموو ئەو شتانەی پەیوەستن بەچالاکی داهێنەرانەی ئازاد، ئەوە بەشێوەیەکی سەربەخۆو پێویست خۆی لەنێو خۆیدا دەخاتە ڕوو، هەریەکێکیشیان خودیتر بێت، ئەوە بابەتیتریشە.

ئەوانەی لەدوای کانت هاتن، ئەوان بوون زۆرتر بەو مانایە بایەخیان بە چەمك دا، وەکو واقیعەیەکی فەلسەفی، بەتایبەتیش شلینگ و هێگل. هێگل چەمکی وا دەستنیشانکرد لەمیانەی بوونی ڕووی داهێنەرانەو چرکەساتی خۆ خستنەڕوویییەوە.

بووە بوونی ڕووی ئینتیماخوازانە بۆ چەمك، چونکە لەو لایەنە پێکدێنن کە لەسێبەریدا چەمك بەرهەمهاتووە، لەسایەی وشیاری و لەنێو وشیاریدا، ئەوەش لەمیانەی بەدوایەکدا هاتنی ڕۆحەکاندا، کەچی چرکەساتەکان لایەنەکەی تر پێکدێنن کە بەپێی ئەو خودی چەمك دەخرێتە ڕوو و نمایش دەکرێت، بۆیە ڕۆحەکان لەنێو ڕەهایی خودا بوونیان هەیە.

بەوەش هێگل ئەوەمان پیشاندەدات کە چەمك هیچ پێوەندییەکی بەبیرۆکەی گشتی یا ئەپستراکت نییە، هیچ پێوەندییەکی بەحیکمەیەکی نادامێنراوەوە نییە کە پەیوەست نەبێت بەخودی فەلسەفە.

بەڵام لەهەمان کاتیشدا، ئەوە فراوانکردنێکی سنووورداری فەلسەفە بوو کە خەریکبوو بزاڤ و جوولەی سەربەخۆی خۆی بۆ زانست و هونەرەکان جێبێڵێت، چونکە خەریکبوو لەمیانەی چرکەساتە تایبەتەکانی خۆیەوە سەرلەنوێ هەمەکێتییەکان بونیاد بنێتەوە، بۆیە

ئێستا کەسایەتییە داهێنەرە تایبەتییەکانی خۆی وەکو ڕووی لاوەکی و تارمایی دەخاتە ڕوو.

بۆیە ئەوانەی دوای کانت هاتن بەدوای ئینسکلۆپیدیایەکی گشتگیر بۆ چەمک خولیان دەخوارد کە بتوانن داهێنانی چەمک ئیحالەی خودێتی پەتی بکەن، لەبری ئەوەی ئەرك و فرمانێکی موتەزایعانەتر بۆخۆیان دەستنیشان بکەن، واتا پیداگۆجیای چەمك كە دەبێت مەرجەکانی داهێنان هەڵبوەشێنێتەوە وەکو فاکتەری چرکەساتێکی دەگمەن.

ئەگەر هەر سێ سەردەمی چەمك بریتی بێت لە ئینسکلۆپیدیاو پێداگۆجیا ـ پەروەردەو فێرکردن ـ لەگەڵ پێکهاتنی پیشەیی بازرگانی، تەنیا قۆناغی دووەم دەتوانێت ڕێگا لەبەردەم کەوتنە خوارەوەمان بگرێت لەلووتکە بەرزەکانەوە، لەنێو ئەو کارەساتە ڕەهایەی قۆناغی سێیەمدا کە کارەساتێکی ڕەهایە بۆ هزر، ئەوەش بێگومان سوودە کۆمەڵایەتییەکانی هەرچەند بێت لەڕوانگەی سەرمایەداری تۆتالیتارییەوە.

**سەرچاوە:**

ئەم نوسینە پێشەکی ئەم کتێبەیە: (ماهي الفلسفة، جيل دولوز و فيلكس غتاري، ترجمة: مطاع الصفدي، الطبعة الاولى، ١٩٩٧، بيروت)..

# سارتەر

# مرۆڤێکی ئازاد لە بەردەم تۆفانی مێژوودا

میشێل کۆنتا

لە فارسییەوە: مستەفا زاهیدی

فەیلەسووفێک کە نەخشەی بۆ ئەوە کێشابوو، هاوکات هەم "سپینۆزا" بێت و هەم "ستاندال" هاوڕێکانی سەردەمی گەنجێتی پێیان دەوت "پیاوە بچووکەکە" ڕەنگە لەبەرئەوەی دەیانزانی بەڵێنی بە خۆی داوە ببێ بە پیاوێکی گەورە. خۆی، ئەو کاتەی کە تەنها پشت ئەستوور بوو بە خۆی، دوو دڵ نەبوو لەم شتە. ریمۆن ئارۆن[1] باوەڕ بە خۆبوونەکەی بە یاد دەهێناوەو بە باشی باسی دەکرد: "لە ئاستی کانت یان هێگڵدا بوو؟! بۆچی وا نەبێت؟ هاوپۆلەکانی لە خۆیان دەپرسی کە ئەو و هاوڕێ هەمیشەییەکەی " پۆل نیزان"[2] کامیان لە پێشدا ناو دەردەکەن و ناودەرکردنی کامیان هەمیشەیی دەبێت؟" ئارۆن لای وابوو سارتەر لە فەلسەفەدا و "نیزان" لە ئەدەبیاتدا دەیانتوانی بە وەها پلەیەک بگەن. سارتەر خۆی دەیگێڕێتەوە کە لەسەر ئەو باوەڕە بووە کە لە داهاتوودا دەبێت بە پیاوێکی گەورە، کە وایە بە شێوەی "سارتەری گەنج" دەژیا کە بیرگرانی نووسەکان (لە داهاتوودا) دەپەرژێنە سەر وردەکارییەکەی. باشتر بڵێین نەخشەی بۆ ئەوە کێشابوو کە هاوکات هەم سپینۆزا[3] بێت و هەم ستاندال[4]. کاتێک سیمۆن دۆبۆڤار بۆ یەکەم جار لە بەهاری ساڵی ١٩٢٩ سارتەری بینی، ئەم باوەڕە جوانە کە هاوکات بوو بوو لەگەڵ خرۆشانی ماندوو نەناسانەی بیر و تیۆرییەکانی سارتەر، بە توندی کاری کردە سەر سیمۆن دۆبۆڤار، هەرچەند دوای خوێندنەوەی یەکەم وتارەکانی بەهۆی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ساویلکەیی نووسەر، ڕاچڵەکی. ڕووداوێکی بان سروشتی(ما ورا الطبیعة) بۆ سارتەر ڕووی دابوو: ئەو هەمدیسان لەدایک ببۆوە. ئەم ڕووداوە بۆ هەمووان ڕوودەدا، بەڵام بۆ سارتەر ئەم لەدایک بوونە هاوکات بوو لەگەڵ گەڕانێکی بوون ناسانە[5]: ڕێکەوتێکی ڕووت و پەتی. بە واتایەکی تر ئەو وای بیر دەکردەوە کە

وەها ڕووداوێك دەكرا هەر ڕوونەدا. دواتر سارتەر لە كتێبی " وشەكان"[٦]دا لە شیكردنەوەی هەلومەرجی تایبەتی سەردەمی منداڵی خۆیدا نووسی:" بەختی من ئەوە بوو كە منداڵی كەسێكی مردوو بووم: مردوێك كە چەند دڵۆپ سپێرمی پێویستی ئامادە كردبوو بۆ دروست كردنی منداڵێك." ئەو لەم بارەوە هەستی بە بەختەوەری دەكرد:" نەبوونی باوك لە تەمەنی كەمدا" ببوو بە هۆی ئەوەی بەشێوەیەك لە شێوەكان لەلایەن "برینی دەسەڵات نەبیجاوێ" و سۆپێرمنێك(Iuperege) بە سەریەوە نەبێت[٧]. كە وایە ئەو شتێكی زیاتری هەبوو و ئەم تایبەتمەندییە زیادەیە ئەوی بەو باوەڕە گەیاند كە مرۆڤی ڕاستەقینە ئەمەیە (واتە دەبێ وەها تایبەتمەندییەكی هەبێ). بە گشتی سارتەر لە سەرەتای لەدایك بوونەوە بیرمەند و فەیلەسووفێكی ئازاد بوو چونكە هەر لە منداڵیەوە لەگەڵ تایبەتمەندی بێ ئامانجی مرۆڤدا ژیابوو: ژیانێ كە هەموان ناتوانن توانای گۆڕینی هەلومەرجیان هەبێت بۆ ئەوەی بكەوێتە سەر ئەو ڕێگایە. ئەم بارودۆخە لە ژیاندا دەتوانێ گەرمێتی پێشەنگ بوونی تاك بكات.

لەگەڵ ئەمانەشدا دەبێت شێوەیەك كە بەهای هەقیقەتێكی گەردوونی بەم دۆزینەوە دەدات بدۆزینەوە. سارتەر بۆ ئەم كارە كاتی زۆری تەرخان كرد. ئارۆن بە چەكی ئیدئالیزمی كانتەوە یەبێ ئەوەی قەناعەت بە سارتەر بێنێ گشت تیۆرییەكانی ئەوی لێك هەڵوەشاندەوە. ئەو كاتەی ئارۆن بە جل و بەرگی جوانەوە بۆ یاری تێنس دەڕۆشت، سارتەر پێداگری لەسەر باوەڕەكانی دەكرد، چونكە باوەڕی بە ڕاست بوونی وتەكانی خۆی هەبوو بە بیركردنەوەیەوە ژیانی دەكرد. لە سەردەمێكدا كە نیزانی هاوڕێی، بە گوڕ و تینێكەوە كە هەستی بەرپرسایەتی بەرامبەر بە دۆزەخییەكانی سەرزەوی حیزبی كۆمۆنیستی فەرەنسا پێی دەبەخشی، لە ڕۆمانەكانیدا بە توندی هێرشی دەكردە سەر چینی دوژمنی مرۆڤایەتی واتە بۆرژوازی، سارتەر سەرقاڵی نئۆ كلاسیسمی میرات ماو لە والری[٨] بوو و ئووستوورەی تازەی دەربارەی ئەفسانەی هەقیقەت پێشنیار دەكرد و هەوڵی دەدا سەرلەنوێ چیرۆكی ئەفسانەبوونی ئەو حەقیقەتە بنیات بنێتەوە. دواتر بە پێشنیاری "كاستۆر"[٩]ی پیاوچاك( سارتەر ئەم هاوڕێیەی-بۆڤاری- وەها ناو نابوو) بڕیاری دا ئەزموونی بنیاتنەری خۆی بە شێوەی ڕۆمان بنووسێ. بەرهەمی ئەم كارەی بە ئەوپەڕی بێ فیزییەوە ناونا " كتێبی پێشهات"[١٠]. بۆڤار بە خوێندنەوەی یەكەم ڕەشنووسەكەی كە سارتەر لە "هاور"- ئەو شوێنەی كە سارتەر وانەی فەلسەفەی تێدا دەوتەوە- نووسیبووی، ناوچاوی گرژ كرد. ئەم نووسینە هێشتا زۆر بۆن و بەرامەی مامۆستا بوونی لێدەهات. ئاخۆ نەیدەتوانی لە تەكنیكی چاوەڕوان كردن كەڵك وەربگرێ بەو چەشنەی لە سینەماو ڕۆمانە ئەمریكاییەكاندا كەڵكی لێوەردەگیردرێ و هەردووكیان(سارتەر و دووبۆڤار) بەدڵیان بوو؟ سارتەر بەسەرهاتەكەی لە بەشی بەرلین، كە بەپێی نووسراوەكەی خودی سارتەر، دوای بە دەسەڵات گەیشتنی كەسێك بە ناوی ئادۆلف هیتلەر، لە ساڵەكانی ١٩٣٣- ١٩٣٤ بە مەبەستی سەردانی هۆسرێل[١١] و هایدگێر[١٢] بەرەو ئەوێ سەفەری كردبوو، دەست پێكردبوو و بە تەواوەتی گۆڕیبووی.

جارێكی تر بۆڤار، كە دواتر بە " یەكێ لە شاهیدە وردبینەكان" ناوی لێدەبا، كە بەرامبەر كاری ئەو " لێبوردنی نییە" ئەم كارەی بە دڵ نەبوو. هەر بۆیە، سارتەر دەست نووسەكانی

لەسەر کورسی کارەکەی دانا، بەشە زیادییەکانی لێ بڕی و دواتر کردی بە نووسراوەیەکی ساف و تۆکمە. بەڵام ئەم نووسراوە چاپ کراوە کە ناوی " مالیخولیا"[١٣]ی لێنرابوو، بە دڵی خەبیر و شارەزاکانی ناوەندی بڵاوکەرەوەی "گالیمار" نەبوو. سارتەر هەستی بەوە کرد کە لە دەروونی خۆیدا رەت بۆتەوەو دەرنەچووە، لەو رووەوە کە ئەو ژنە جوانەش کە ئەوی شەیدای خۆی کردبوو، جوابی رەدی پێدابۆوە، تووشی خەمۆکی بوو، لای وابوو کوللە دەریایی و قرژاڵەکان بە شوێنیەوەن، لای وابوو تووشی نەخۆشییەکی دەروونی خراپ بووە. بەڵام بۆفاری هاوڕێی زۆر نیگەران بوو و لای وابوو ئەو دەیهەوێت خۆی بخاتە قووڵاییەکانی شێتێتییەوە. سارتەر لە کۆتاییدا شێتێتی نایە لاوە، "شارل دۆلن"[١٤]ی هاوڕێی وەك واسیتە ناردە لای "گاستۆن گالیمار"[١٥] کە یەکێك بوو لە هاوڕێکانی دۆلن، گالیمار ئەم رۆمانە سەیرەی وەرگرت، بەڵام ناوی "رشانەوە"[١٦]ی بۆ ئەم رۆمانە پێشنیار کرد. سارتەریش رازی بوو بەوەی کە تا رادەیەك لە لایەنە رەشۆکی و ناشیرنەکانی بەرهەمەکە کەم بکاتەوە. هەمووان درێژەی رووداوەکە دەزانن. رەخنەگەلێکی پۆزەتیڤانە، پاڵێوران بۆ خەڵاتی "کۆنکۆر"[١٧]، بڵاو کردنەوەی کورتە چیرۆك و وتار لە گۆڤاری ئەدەبی بەناوبانگی " *N.R.F*[١٨] کە یەکێك لەو بابەتانە دەربارەی "مۆریاك"[١٩]، ئەم نووسەرە کاسۆلیکەی لە بێدەنگیدا هاوکات لەگەڵ سەرلێشێواویدا غەرق کرد.

بەر لە جەنگ سارتەر چ شتێکی بە ئەدەبی جیهانی بەخشی کە دواتر، بە شێوەی واقعی دەردەکەوێت؟ دیدێکی ورد و قووڵ و لە هەمان حاڵدا بێ بەزەییانە لەسەر هەلوومەرجی ژیانی مرۆڤایەتی. روانینێکی بوون ناسانە، نەك سیاسی: مرۆڤ هەر کە بەڕاست پەی بە بوونی خۆی برد تووشی دڵەڕاوکێ دەبێت. مرۆڤ ئەو شتەیە کە نیە و ئەو شتە نییە کە هەیە، و ئەم دوورکەوتنەوە لە خود، ئەوەی کە بێ توانایییە لە رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ خود، هیچ شتێ نییە مەگەر ئەو شتەی کە پێی دەوترێ ئازادی ویژدان.

"هۆسرێل" ئەم تیشکی وشیاری و ویژدانە بە " روانگە یان روو لێهێنان"[٢٠] ناو دەبا. مرۆڤ لە جیهاندا، بە تەواوەتی کەوتۆتە دەرەوەو لە مەترسی تۆفانی واقیعدایە. شتێکی دەروونی دەروونبوو[٢١] بوونی نییە، ئەو شتەی کە پێی دەوترێ ژیانی دەروونی، هیچ نییە جگە لە فێڵێك، جۆرێ دڵخۆشکردنی بێهوودە بەو ئەفسانانەی کە لە لووت بەرزی ئینسانەوە سەرچاوەیان گرتووە. دیارە ناسی ئێمە لە "پرۆست"[٢٢] و دەروونناسی رزگار دەکات. خەیاڵ، توانایەکی وێرانکەرانەی وشیارییەو دەبێتە هۆی ئازادی وشیاری. بەڵام ئەم ئازادییە دیارییەك نییە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە بەرپرسایەتی و دەربەست بوون دروست دەکات، بەدەر لەمەش، ناتوانین لە دەست ئەم ئازادییە هەڵبێین مەگەر ئەوەی مرۆڤ مەبەستێکی خراپی بێت یان بیەوێ لەگەڵ خۆی و ئەوانی تر درۆ بکات. ئازادی بە پێچەوانەوە، سەرەڕای هەموو جەبرگەرایییەکان– لەوانە ناوشیاری – دەبێ بە هۆی بڵاوتر بوونەوەی پانتای ژیان.

ئەم بابەتە بوونگەرایییە سارتەرییە یان ئێگزیستانسیالیزمی خوانەناسانە کە دواتر (١٩٤٣) لە کتێبی "بوون و نەبوون"[٢٣] دا تیۆریزە دەکرێن، هەر لە سەرەتای دەیەی ١٩٣٠ەوە لە وتارەکانی سارتەردا دەبینرێ.( ئێگزیستانسیالیزمی سارتەری یان ئێگزیستانسیالیزمی خوانەناسانە بەرامبەر بە

ئێگزیستانسیالیزمی مەسیحی بەکار دەبرێ کە بۆ یەکەم جار لە ئایدیای "کیرکەگارد"[(٢٤)] دا دەبینرێ). جەنگ دەبێ بە هۆی ئەوەی کە سارتەر پەرە بەم تیۆرییە بدات و بە قووڵی بە ناویاندا رۆ بچێ.

دەتوانین بڵێین جەنگ گەورەترین دەستکەوتی بۆ ئەو هەبوو. — ئەگەر ئەم وتەیە نەبێ بەهۆی پارادۆکسی بێزێەکی شەرمهێنەر—. دوای ئەوەی فەرەنسا لە داگیرکاری ئازاد کرا سارتەر دەستی دایە نووسینی وتاری "کۆماری بێدەنگی"[(٢٥)] و بەم رستە بە ناوبانگەی خۆی دەستی پێدەکات: " ئێمە هیچ کات بە رادەی سەردەمی داگیرکاری ئەڵمانییەکان ئازاد نەبووین. " سارتەر لەسەر ئەو باوەڕە بوو هۆکاری ئەو ئازادییە ئەوەیە (فەرەنسییەکان) لەگەڵ حەقیقەتی هەلومەرجی مرۆڤانە و هەڵبژاردنە ئەستەمەکاندا روو بەڕوو بوون. سارتەر بە تایبەت دوای مەرگی زۆرجار لۆمەی دەکرێ چونکە بۆ بەرگری کردن، بە جێگای چەک تەنها دەستی بۆ قەڵەم بردبوو و تیرباران یان تەنانەت ئەشکەنجە نەکرا و " ژان کاویس"[(٢٦)] یان" رێنە شار"[(٢٧)] نەبوو. بەکشتی لەبەرئەوەی تەنها سارتەر بوو لۆمەو سەرزەنشت دەکرا. بە جێگای کوشتنی ئەڵمانییەکان یان تەقاندنەوەی شەمەندەفەرەکان "مێشەکان"[(٢٨)] ،"کۆبوونەوەی نهێنی"[(٢٩)] و "بوون و نەبوون"ی نووسیوە. ئەوەی کە دواتر خۆی خۆی سەرزەنشت کردوەو رەخنەی لە خۆی گرتووە شتێکە کە دەکرێ لێی وەربگێردرێت، بەڵام رەخنە و سەرزەنشت کردنی ئەوانی تر، بەتایبەت ئەوانەی بەرهەمەکانیان خوێندۆتەوە دەکرێ بە گاڵتە بزانرێت. چونکە بەرگری کردنی نووسەرو فەیلسووفێك کە سارتەری ناوە، جێگای رەخنە نیەو ناکرێ نکۆڵی لێ بکرێ .

ئەگەر بابەتێك هەبێت بۆ رەخنە گرتن و سەرزەنش کردن، شێوەی بەڵگاندنی سارتەرە لە پاساوهێنانەوە بۆ هەڵبژاردنە سیاسییەکانی لە سەردەمی دوای جەنگ و لە ساڵەکانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠دا. ئەمڕۆکە ئامانجی یەککرتنێکی دیموکراتیکی شۆڕشگێڕ، کە سارتەر لە ساڵەکانی ١٩٤٩-١٩٤٨ دا باسی لێوە دەکرد( و مەبەستیشی بەخشینی نێوەرۆکێکی بابەتی بوو بە مافە ئەبستراکتەکانی دیموکراسی، بە پێکهێنانی ئەوروپایەکی سۆسیالیست و شۆڕشگێڕ) بۆ ئێمە ئاسانتر وەردەگیردرێ و قەبووڵ دەکرێ، تا ئەو هەڵوێستەی کە ساڵەکانی ١٩٥٢ تا ١٩٥٦ گرتیە بەر لە بەرژەوەندی حیزبی کۆمۆنیستدا لە ژێر ناوی هاوڕێیانی هاوسەنگەر و هاودەم، کەوایە بەرگری کردن لە بەرەی سۆڤیەت لە شەڕی ساردا، لەبەرئەوەی بەرامبەر بە بەرەی ناتۆ، چەك و چۆڵی کەمتری هەیە دەتوانێ ئاشتیخوازتر بێت).

بەڵام ئەم هەڵوێست گرتنانە تەنها هەڵوێستی سیاسین، لە حاڵێکدا ئەو شتەی کە بە لای ئێمەوە گرنگە شتێکی ترە: ئەوەیە کە بەرهەمەکانی سارتەر لەم ساڵانەدا کە باسمان لێکرد، بە باوەڕی بەشێکی زۆر لە خاوەن رایان، لەوانە "بێرنارد هانری لۆیی"[(٣٠)] لە راستیدا بەرهەمی هەڵکەوتەیەکە. "رێگاکانی ئازادی"[(٣١)] ئەزموون کردنی ئازادییە لە ئەزموونێکی ئەدەبیدا بە شێوەی رۆمانە ئەمریکاییەکان، بە ریالیزمی زەین. "ژێنێ قەدیس"[(٣٢)] دەروونشیکاری کردنی بوونناسانەی سەرنج راکێشی نووسەرێکە لەلایەن نووسەرێکی ترەوە. (مەبەست خستنە رووی کێشەیە لە لێکدانەوەی دەرونشیکاری و مارکسیستیدا. و) "دەستە پیسەکان"[(٣٣)]، "شەیتان و خودا"[(٣٤)] و "بەندکراوەکانی ئالتونا"[(٣٥)] هەڵگری کۆمەڵێك

پرسیاری هەژێنەرە کە ئێمە ئەو کاتەی تووشی کێشە دەبین لە خۆمانی دەپرسین. " رەخنەگرتن لە عەقڵی دیالەکتیک"[٣٦] هەوڵێکی بەردەوامە بۆ تێگەیشتنی شێوەی سەرەو بن بوونی روخساری ئازادی ئەو کاتەی جووڵە لە جیهانی ماددییدایە، و ئەوەی کە گرووپێك چۆن بە هۆی پەیمانێکەوە کە بەستوویانە، لەگەڵ گۆڕانی هەلومەرجی دەرکەوتنیدا، دۆگما دەبێت و دەست لە زانینی چۆنییەتی درێژەدان هەڵدەگرێ. "وشەکان" شێوەیەکی تەنزئامێزە بۆ رزگارکردنی خود، بە لەبەرچاونەگرتنی ئەو ئوستوورانەی مرۆڤیان دروست کردوە. " گێلی بنەماڵە"[٣٧] کۆبەندییەکی مرۆڤناسانەیە کە تیایدا "فلۆبێر"[٣٨] و هەوڵەکانی بۆ ئەوەی هەموو جیهان بخەنە چوارچێوەی خەیاڵەوە لە جیهانێکدا کە مێژوویەکی هەیە و قابیلی تێگەیشتنە، بووە بە حەکایەتێکی کۆن و بەشێکە لە مێژووی رابردوو. بەشێکی زۆر لەو بەرهەمانەی کە لەوێدا، نهێنییەکان لەبەر تروسکایی تێگەیشتنی مرۆڤدا دەسڕدرێنەوە: بە درێژایی سەدەی بیستەم، کەس وەك سارتەر مرۆڤی عاقڵی ئەم ئاستە ئازاو بەهێز نەدیوە.

ئێمە دەکرێ لەبەر هاوچەرخ بوونمان لەگەڵ ژان پۆل سارتەری پڕکار و پڕ ئیحساسدا شانازی بە خۆمانەوە بکەین.

کاتێ تەمەنی ٦٠ ساڵ بوو لەگەڵی ئاشنا بووم و ئەو سەردەمە بوو کە لە لووتکەی ناو دەرکردندا بوو، ناو دەرکردنێ کە ژمارەیەکی کەم لە نووسەرانی فەرەنسا بەو رادەیە ناویان دەرکردوە، لە چالاکی و جموجووڵدا دەدرەوشایەوە، هەموو سەرپێچی و هیوا و گەلاڵەییەکانی بە هەستێکی تازەوە دەورووژاند. بەلام ئەو لە سارتەر بوونی خۆی بێ ئاگا بوو، ئەو کەسێکی تر بوو کە داوەرەکانی خەلاتی نۆبڵ ویستبوویان بیکەن بە پەیکەرێکی بەردی، ئەو شتەی کە ئەو لێی بێزار بوو. ژیانی خۆش دەویست و سۆزی لەگەڵ خۆی نەدەکرد. بەلام لە کاتی پێوەندی گرتن لەگەڵ کەسانی نزیکیدا، لەو شوێنەدا کە دەیزانی ئەوانی تر ناتوانن حەقیقەت و راستی وەربگرن، بەبێ ئەوەی نیگەران بێت یان هەست بە تاوانبار بوون بکات و خۆی ئازار بدات بێدەنگی هەڵدەبژارد. ئەو بەردەوام لە بەرەوپێشچووندا بوو، من وەها ناسیم و تەنانەت ئەگەر سوکایەتیشی پێکرابا نیگەرانی ئەو شتە نەبوو کە رابردوو بوو، زۆریش بەهای بە بەرژەوەندییە تاکە کەسیەکان نەدەدا کە مرۆڤەکانی دەکرد بە کۆیلە.

سارتر بەپێی "حوکمی جوانی وەفادار بوون بە بێ وەفایی بۆ هەموو شت" ئازاد بو و لە بەرامبەر تۆفانی مێژوو و رەوتی فەزای قورس و وێرانکەری جیهاندا ئازاد مایەوە. زیندوویەکی گەورەیە کە نەمردووە، چونکە بووە بەو شتەی کە بووە. بووە بە هاوارێك بۆ ئازادی. ئێمەش ئەو کاتەی هەڵگری ئەندێشەی سارتەرین لە هەموو کات ئازادترین.

**پەراوێزەکان:**

*1-Raymond Aron(1905-1983)*
*2-Paul Nizan(1905-1940)*
*3-Baruch Spinoza(1632-1677)*
*4-Henri Beyle Stendhal(1783-1842*
*5-ontologique*
*6-1964) Les Mots*
*7-surmoi- superego*
*8- (Paul Valéry (1871-1945*
*9-Castor*
*10-factum sur la Contingence*

*11- ( 1859 ) Edmund Husserl*

*12-Martin Heidegger (1889-1976)*

*13-Melancholia*

*14-Charles Dullin*

*15-Gaston Gallimard*

*16-La Nausée*

*17-Goncourt*

*18-La Nouvelle Revue Française*

*19- (1885-1970) François Mauriac*

*20-intentionnalité*

*21-intériorité*

*22-Marcel Proust(1871-1922*

*23-L'Etre et le Néant*

*24-Soren Kierkegaard (1813-1855*

*25-La République du silence*

*26-Jean Cavaillès(1903-1944)*

*27-René Char(1903-1988*

*28-Les Mouches*

*29-Huis Clos*

*30-Bernard Henri Lévy*

*31-Les Chemins de la liberté*

*32-Saint Genet*

*33-Les Mains sales*

*34-Le Diable et le Bon Dieu*

*35-Les Séquestrés d'Altona*

*36-La Critique de la raison dialectique*

*37-L'Idiot de la famille*

*38-Gustave Flaubert*

**سەرچاوەکان:**

http://www.mihan.net/٨٤/mihan-٢٥-٨٤.htm

http://www.mihan.net/٨٥/mihan-٠٦-٨٥.htm

# پرۆژەی تێگەیشتن و راڤەکردنی ئاین (سۆسیۆلۆژیا و ئاین)

دانیال هیرڤیۆلێژی و ژان پۆل ویلیەم

لە فەرەنسییەوە: عادل باخەوان

## بەشی شەشەم

### کارل مانهایم
### (١٨٩٠-١٩٤٧)
### لە نێوان ئیوتۆپیا و ئایدۆلۆژیادا

کارل مانهایم کەمتر وەك سۆسیۆلۆگی ئاینەکان و زیاتر وەك سۆسیۆلۆگی مەعریفە ناسراوە. ئەو جولەکەیەکی هەنگاری بوو، لە ساڵی ١٩١٩داو پاش هەرەسی جمهوریەتی راوێژکاریی کرێکاریی بێلاکوون، بە ناچاری وڵاتەکەی بەجێدەهێڵێت و ڕوودەکاتە ئەڵمانیا و پاشان بەریتانیا.

لە سەرەتادا وەك سۆسیۆلۆگێکی مارکسیست دەستپێدەکات و پاشان لەسەر ئاستی میتۆدۆلۆژیا جیادەبێتەوەو لە قوتابخانەی مێژووگەرایی ئەڵمانی و ماکس ڤێبەر نزیك دەبێتەوە. ساڵی ١٩٢٤، لە کتێبێکی بەنرخدا ( *Der Historismus dErnst Troeltsch*)، مەیلی خۆی بەلای رێژەگەرایی مێژوییدا دەخاتە سەر شانۆ، بەڵام لە هەمانکاتدا هەوڵدەدات تیایدا چەقنەبەستێت و تێی بپەڕێنێت. لەو کتێبەدا، تەواو بە پێچەوانەی ترۆلچی تیۆلۆگەوە، مانهایمی سۆسیۆلۆگە هەوڵدەدات فاکتە ئاینیەکان راڤە بکات، بەتایبەتی ئەو بزوتنەوەیەی کە ترۆلچ بە هیچ شێوەیەك قسەی لێنەکرد، مەبەست لە: یاخیبوونی جوتیارەکانی سەدەی شانزەهەمە.

ڕەنگە مانهایم بەو شێوەیەی کە ئێستا باوە سۆسیۆلۆگی ئاینەکان نەبێت، بەڵام کتێبەکەی لەسەر ئایدۆلۆژیا و ئیوتۆپیا کەمتر نیە لە بەشداری هەریەکێك لە سۆسیۆلۆگەکانی کێڵگەی ئاینەکان، بە پێچەوانەوە، مانهایم بە شێوەیەکی زۆر تایبەت بە خۆی کۆڵانە تاریکەکانی فاکتی ئاینی دەپشکنێ. بەشداری مانهایم لەسەر دوو ئاستە:

-چەمکە سۆسیۆلۆژیەکەی ئیوتۆپیا.

-بیناکردنی ئیدیالتیپی عەقڵی ئیوتۆپی ئاینی.

ئەم دوو ئاستە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشداریانکردووە لە ڕاڤەکردنی فاکتە ئاینیەکاندا. هەروەها کارایی زیندویاندانەوە بەسەر چوارچێوەکانی کێڵگەی سۆسیۆلۆژیای ئاینەکانەوە لە جیهاندا بە گشتی و لە فەرەنسادا بە تایبەتی داناوە. بە تایبەتیتریش لای ئەو توێژەرانەی کە بە دوای دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان دیاردە ئیوتۆپیەکان و دیاردە ئاینەکاندا دەگەڕان و دەگەڕێن.

دەکرێت ڕاڤەکردنەکانی مانهایم وەك داهێنانێکی ڕۆشنبیرانەی گەورە تەماشابکەین، بەڵام سەرەکیترین گرفتی ئەم داهێنانە بریتیە لە کەمی و لاوازی و لێکدژی بەشێکی زۆر لە کۆنسێپتەکانی. ئەو چەندین مەیدانی گرنگی توێژینەوەی هەبوو، بەڵام زۆر جار سەری لەو کۆڵانانەوە دەردەچوو کە قەپاتکرابوون. چەندین ئیشکالیەتی بەنرخی لەبەردەستدابوو، بەڵام زۆر کات دەبیردینەوە نێو لێکدژی ئەو ئەرگیومێنتانەی کە نەیاندەتوانی قەناعەتمان پێبکەن. بێگومان ئەمە مەیدانێکی دیکەیەو ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین کلیك بکەین لەسەر بەشداریە بەرچاوو گرنگەکانی لە مەیدانی سۆسیۆلۆژیای ئاینەکاندا بە شێوەیەکی گشتی.

لە فیکری مانهایمدا ئایدۆلۆژیا و ئیوتۆپیا دوو فۆرمی بیرکردنەوەو دوو دۆخی ڕۆحن و وەك ئەویتری هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی خۆیان دەردەخەن و هەوڵدەدەن تێیبپەڕێنن. لە هەمانکاتدا ئەم دووانە دوو سیستەمی بیرکردنەوەی لە یەکجیان:

-ئایدۆلۆژیا بەکەڵکی پارێزگاریکردن لە چوارچێوەی شتە دەقگرتووەکان دێت. پارێزەری سیستەمێك لە بیرکردنەوەو بەها و فۆرمی دامەزراوو جێگرتووە. گەرەنتی خۆ بەرهەمهێنانەوەی بەردەوامە. شتەکان وەك ئەوەی لە ئێستا و ئێرەدا هەن دەپارێزێت.

-ئیوتۆپیا، بە پێچەوانەوە، یاخیبوونە لە شتە جێگیربووەکان، کارکردنە بۆ هەڵوەشانەوەو لە ناوبردنیان، هەوڵدانە بۆ بیناکردنی جیهانێکی نوێ کە لەوەی ئێستا و ئێرە نەچێت.

ئەم جیاکردنەوەیە زۆر گرنگە، بەڵام لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە لە هەندێك دۆخی تایبەتیدا دەکرێت بۆچوونە ئیوتۆپیەکان خۆیان وەربگێڕنە سەر ئایدۆلۆژیا و بۆچوونە ئایدۆلۆژیەکانیش خۆیان وەربگێڕنە سەر ئیوتۆپیا. ئەمەش پەیوەندیەکی دیالێکتیکی لە نێوان هەردوولادا دروستدەکات.

مانهایم، بۆ سەلماندنی ئەم تێزە، نموونە بە بیرۆکەی بەهەشت دێنێتەوە: لە چوارچێوە ترادیسیۆنێلەکەیدا بەهەشت لە ئێرەدا نیە، بەڵکو لە قیامەتدایە و پەیامێکی ئایدۆلۆژی هەیە و بەکەڵکی شەرعیەتدان بە سیستەمی فیۆدال دێت. بەڵام کاتێك کە هەندێك گرووپی کۆمەڵایەتی هەوڵدەدەن بیکەن بە دروشمی ئێستا و ئێرەو لەسەر زەویدا دروستی بکەن، ئیتر دەبێت بە ئیوتۆپیا.

بە دیوێکی دیکەدا مانهایم دەیەوێت بڵێت:

کاتێك وێنە حەزلێکراوە ئاینی یان دونیاییەکان فۆرمێکی شۆڕشگێڕانە وەردەگرن، ئیتر دەبن بە ئیوتۆپیا.

دەبێت لێرەدا ئاماژە بەوە بدەین کە مانهایم باوەڕی بە کورتکردنەوەی ئایدۆلۆژیا لە درۆکردندا نیە و پێیوایە درۆکردن تەنها یەکێکە لە فۆرمەکانی وشیاری ئایدۆلۆژی. ئەوەی لای مانهایم گرنگە دوو فۆرمی دیکەی ئایدۆلۆژیایە:

-عەقڵی دووڕوو، کە دیوار لە نێوان بۆچوونەکان و ڕەفتارەکانیدا دروستدەکات. واتە گەردونێك بۆ بۆچوون و گەردونێك بۆ

ڕەفتــار دروســتدەکات و مــەرج نیــە هەمیــشە ڕەنگدانەوەی یەکتری بن.

–ستراکتۆری عەقڵی مێژوویی و کۆمەڵایەتی دەستنیشانکراو، کە ڕێگا نادات بە ئەکتەر تا وشیار بێتەوە بەرامبەر بەو دابڕانەی کە لە نێوان بۆچوونەکانی و واقیعدا هەیە.

لێرەوە ئەوەی زیاتر دەبێت بە مەیدانی سەرەکی کارل مانهایم ئیوتۆپیایە، کە لە هەناویدا سیستەمێك لە بۆچوون و بەها و ئارەزوی بەدینەهاتووی گروپێکی کۆمەڵایەتی تێبینی دەکرێت. ئەوەی ڕابوردوو و ئێستا و داهاتوو دەستنیشان دەکات ئومێد و ئارەزووەکانن. لەوەش زیاتر هەر ئەمانەن کە چوارچێوەی تێگەشتن لە کاتیبوونی شتەکان دەستنیشان دەکەن و مانای قۆناغێك وەك یەکەیەکی مەدلولدارمان پێدەناسێنن.

مانهایم تێگەشتنێکی "ئەکتیڤیستانە" بە چەمکی ئیوتۆپیا دەبەخشێت، تێگەشتنێك کە تەواو جیاوازە لەوانەی پێشخۆی، بە تایبەتی تێگەشتنی ترادیسیۆنێل. بەڵام گرفتی سەرەکی ئەم تێگەشتنە لەوەدایە کە هەندێکجار فۆرمێکی تاکڕەوانە وەردەگرێت، چوونکە هەموو ئیوتۆپیەکان بەو شێوە نین کە مانهایم باسیاندەکات. هەموویان بزوتنەوەی ئەکتیڤی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی نین، بەڵکو فۆرمی عەقڵی و فۆرمی وشیارین و دەکرێت لە هەندێك هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و مێژوویی تایبەتدا ببن بە سەرچاوەی ئیلهامبەخشین بە بزوتنەوەیەکی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی.

ئارەزووی کلیککردن لەسەر "ڕەهەندی گۆڕانکاری واقیع" هەندێکجار مانهایم تووشی داخران دەکات. کاتێك ئەو دەیەوێت تەنها ئەو بۆچوونانە بە ئیوتۆپی بناسێنێت کە دەکرێت لە واقیعدا بەدیبهێنرێن (ڕیالیزە بکرێن)، خۆی تووشی لێکدژی دەکات. چونکە چەندین بۆچوونی بەدینەهێنراومان هەیە کە تاسەر ئێستا ئیوتۆپین. ڕاستە بۆچوونەکانی تۆماس مۆر لە واقیعدا بەدینەهاتوون، بەڵام کێ دەتوانێت بڵێت ئیوتۆپی نین؟ یاخود با گریمانەی ئەوە بکەین کە یەکێتی سۆڤێت بەدیهێنانی بۆچوونە کۆلێکتیڤە سوڵتەویەکانی گەورە بیریاری کاتۆلیکی سەدەی شازدەمە، ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە پێش ١٩١٧ پرۆژەی شارە نموونەییەکەی ئەو بیریارە ئیوتۆپیا نەبووە؟ گومان لەوەدا نیە کە ئەم ئەرگیومێنتەی مانهایم لاوازە و توانای قەناعەتپێکردنی نیە و خۆشبەختانە خودی مانهایمیش زۆر بە تەنگیەوە نیە و نایەوێت داکۆی لەسەر بکات و نایکات بە چەقی کارکردنی.

مانهایم دڵنیایە لەوەی کە فۆرمە مێژوییە یەك لە دوای یەکەکانی ئیوتۆپیا لە نێو هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و مێژوییە تایبەتەکاندا دروستدەبن، نەك لە دەرەوەی شوێن – کات. لێرەوە بابەتی سۆسیۆلۆژیای مانهایم دەبێت بە فۆرمە فرەکانی ئیوتۆپیا و ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتیە– مێژووییەی کە تیایدا دروستدەبن و هەروەها ئەو چینە کۆمەڵایەتیەش کە لە ڕێگای ئیوتۆپیەکانیەوە دەیەوێت سیستەمی شتە دەقگرتووەکان بگۆڕێت.

ئیوتۆپیا پرسیاری تاکە یان گرووپ؟ ڕەگوڕیشەکانی نێو تاکدا دەدۆزینەوە یان لە نێو بزوتنەوەی کۆلێکتیڤی گروپێکدا؟

ڕاستە ئیوتۆپیا لەسەرەتاوە وەك خەون و حەزی کەسی تاك دروستدەبێت، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە دواتر بۆ ئەوەی ببێت بە ئیوتۆپیا، وەردەگێڕدرێتە سەر بزوتنەوەی کۆلێکتیڤی کۆمەڵایەتی. واتە تەنها و تەنها لەو کاتەدا دەکرێت ئیوتۆپیا ببێت بە هێزێکی مێژوویی کە

خۆی وەربگێڕێتە سەر خەون و حەزو پرۆژەی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی یان سیاسی گۆڕانکاریخواز. وەرگرتنی بۆچوونەکانی کەسێکی تاك لەلایەن گروپێکی کۆمەڵایەتیەوە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە لەسەر کۆمەڵایەتیبوونی ئەو بۆچوونانە. تاك سەرچاوەی فۆرمی بۆچوونەکانە، بەڵام ئەوە تەقینەوەیەتی لەسەر ئاستی گرووپ کە ژیانی پێدەبەخشێت.

بە کورتی لە فیکری مانهایمدا، ڕەگوڕیشەی ئیوتۆپیەکان لە نێو ستراکتۆری چینی کۆمەڵایەتیدا دەدۆزرێتەوە، نەك لە گەردونی تاکگەرای کەسەکاندا. ئیوتۆپیا بێ مانایە گەر لەلایەن گروپێکی کۆمەڵایەتیەوە باوەڕی پێنەهێنرێت و نەکرێت بە بەرنامەی کار، گروپێکی کۆمەڵایەتی گۆڕانخوازیش بێ مانایە گەر خاوەنی ئیوتۆپیای گۆڕانکاری نەبێت.

هەروەها نابێت پێمانوابێت کە ئیوتۆپیەکان یەك لە دوای یەك و بەپێی قۆناغە مێژووییەکان لەدایکدەبن. نەخێر، دەکرێت ئێمە لە یەك قۆناغدا چەندین ئیوتۆپیامان هەبێت و هەمووشیان پێکەوە لە ململانێدابن و هەریەکەیان گوزارشتبن لە خەون و ئارەزووەکانی گروپێکی کۆمەڵایەتی. سۆسیۆلۆگ ناتوانێت ئیوتۆپیاکان لەیەك جیا بکاتەوەو هەریەکەیان بە تەنها بخاتە ژێر چاودێریەوە، بەڵکو دەبێت پەیوەندی لە نێوانیاندا دروستبکات و بەراوردیان بکات و وەك گشتێکی جوڵاو بیانبینێت.

چەمکی ئیوتۆپیا وەك ئەوەی کە مانهایم پێناسەی کردووەو چوارچێوەی بۆ دیاری کردووە، ئامڕازێکی باش و کاراو بەکەڵکە بۆ خوێندنەوەی فاکتە ئاینیەکان بە گشتی و بزوتنەوە ئاینیەکان بەتایبەتی و گروپە ئائیفیەکان بەتایبەتیتر. خودی مانهایم، لە ئایدۆلۆژیا و ئیتۆپیادا، بزوتنەوەی شیلیاسمی خستوەتە ژێر چاودێرو پشکنینەوە.

مانهایم پێشنیاری چوار پارادیگمی وشیاریی ئیوتۆپی دەکات:

- ئیوتۆپیای شیلیاسم.
- ئیوتۆپیای لیبراڵ – مرۆڤدۆست.
- ئیوتۆپیای پارێزگاران.
- ئیوتۆپیای سۆسیالیست – کۆمۆنیست.

بێگومان هیچ یەکێك لەم ئیوتۆپیایانە لە هیچ قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژوودا بوونیان نەبووەو مانهایم وەك ئیدیالتیپ دەیانخاتە سەر شانۆ. ئیدیالتیپ بە تێگەشتنە ماکس ڤێبەریەکەی، واتە وەك چەند کەرەسەیەکی میتۆدۆلۆژی بۆ تێگەشتن و بەرهەمهێنانی زانست لەسەر شتەکانی ئەو بوارانە[1]. ئیدیالتیپی مانهایم ئەو لووتکانەن کە هەر تاکێك خەونی پێوە دەبینێت، ئەو مەترانەن کە نزیکی و دووری ڕەفتاری مرۆڤەکانی پێدەپێورێت. مانهایم دەڵێت:

"ڕۆحی هەر تاکێك، لە چرکەی سروشتی کامڵبوونیدا، ئارەزوو دەکات کە خۆی لە دەوری یەکێك لەو ئیوتۆپیایانە ڕێکبخات و بەپێی هێڵە ستراکتۆراڵە گشتیەکانی هەنگاو بنێت و گەشەکردنی مێژوویی خۆی پێ تەرتیب بکات" کتێبی ئایدۆلۆژیا و ئیوتۆپیا، ل ١٨٢.

گرفتی هەرە سەرەکی ئێمە لەگەڵ ئەم تیپۆلۆژیایەی مانهایمدا بریتیە لە ئیوتۆپیای پارێزگاران. ئێمە ئەم گرفتەمان نەدەبوو گەر مانهایم هەوڵیبدایە کۆی ئەو بزوتنەوەو گروپە کۆمەڵایەتیانە بخاتە ئەم چوارچێوەیەوە کە دەیانویست و دەیانەوێت ڕابوردو لە بەرامبەر ئێستادا بەرهەمبهێننەوەو بیکەن بە سەرچاوەی جوڵان و چالاکی و کارکردنیان. بۆ بەخشینی "میسداقیەت" بەم ئیوتۆپیایە، زۆر ئاسانتر بوو بۆ مانهایم کە نموونە بەو کەسایەتی و

بزووتنەوە سیاسی و کولتوری و کۆمەڵایەتیانە بێنێتەوە کە زۆر جار لە ژێر کارایی ئاینەکاندا دەجوڵێن و دەیانەوێت شتەکانی ئێستا و ئێرە بگۆڕن و لەسەر وێنەی ڕابووردو بینایان بکەنەوە. کارێکی ئاوا هارمۆنی دەبەخشێ بە خودی پێناسەکەی مانهایم بۆ ئیوتۆپیا و ئەو تیپۆلۆژیایەش کە دروستی کرد.

ئاخر ئەو پێشتر ئیوتۆپیای وەك گەردوونی ڕاپەڕیووی یاخیبووەکان لە دژی سیستەمی دەقگرتووی ئێستا و ئێرە پێناسە کرد. ئەمەش یەکناگرێتەوە لەگەڵ ئیوتۆپیای پارێزگاراندا کە دەیانەوێت پارێزگاری لەو بەها و نۆرم و مۆڕاڵ و پرانسیپانە بکەن کە لە واقیعی هەنوکەییدا هەیە. مەگەر باشتر نەبوو کە مانهایم ئەم کاتیگۆریە زیاتر وەك ئایدۆلۆژیا بناسێنێت نەك ئیوتۆپیا؟ ئەم جێگۆڕکێکردنە بە پێناسە و چەمکەکان مانهایم ڕووبەڕووی گرفتی میتۆدۆلۆژی دەکاتەوە.

ڕاڤەکردنی ئیوتۆپیای شیلیاسم گرنگترین بەشداریکردنی کارل مانهایمە لە سۆسیۆلۆژیای ئاینەکاندا. تێرمی "شیلیاسم" دەمانباتەوە سەر وشەی *Kilia* بە زمانی گریکی کۆن، واتە "هەزار". لە زمانی لاتینیشدا مورادیفەکەی بریتیە لە میلێناریسم. لێرەدا مەبەست لە چاوەڕوانکردنی ئەو شتەیە کە لە ئینجلدا بە "هەزار ساڵ لە ئاشتی و دادپەروەری و برایەتی لەسەر زەویدا" ناوبراوە. ئەمە کاتێك ڕوودەدات کە مەسیح دەگەڕێتەوەو زەوی لە خراپەکاری و ناپاکی و نادادپەروەری پاکدەکاتەوە.

ئەوەی بەلای مانهایمەوە گرنگە ڕەگوڕیشە ئاینیەکانی ئەم پرسیارە نییە، بەڵکو دەرکەوتنە مۆدێرنەکانیەتی، بە تایبەتی دەرکەوتنی لە ڕێگای بزوتنەوەی ئانباپتیست کە لە سەدەی شازدەهەمدا لەلایەن تۆماس مونزەرەوە سەرکردایەتی دەکرا[٢].

بزووتنەوەی ئانباپتیستەکان بە تەنها سەرەنجی کارل مانهایمی ڕانەکێشابوو، بەڵکو دەیان بیریاری شۆڕشگێڕی مۆدێرنی بەخۆیەوە سەرگەرم کردبوو. لەوانە فردریك ئینگلس، کە یەکێك لە کتێبەکانی بەناوی "جەنگی جوتیاران" بۆ تەرخان دەکات. هەروەها ئرنست بلۆچ کتێبێکی بۆ بە ناوی "تۆماس مونزەر، تیۆلۆگی شۆڕش" تەرخان دەکات و لیستەکە دەتوانین درێژبکەینەوە تا دەگاتە گوستاڤ لاندوێ. جیاوازی مانهایم لەگەڵ ئەو نووسەرانەدا لەوەدایە کە، بە پێچەوانەی سەرگەرمبوونی ئەوان بە ڕووداوە مێژووییەکەوە، ئەو دێت و ئیدالتیپێك بۆ عەقڵی ئیوتۆپی میلێناریستەکان دروستدەکات و پێیوایە ئەوان لە هەموو قۆناغ و جێگایەکدا ئامادەن و چوارچێوەی هەرە ڕادیکاڵی ئیوتۆپیای ژیانی نوێ پێکدەهێنن[٣].

فیکرەی گەڕانەوەی مەسیح و دروستکردنی ژیانێکی هەزار ساڵە لە دادپەروەری و ئارامی و ئاشتی مێژوویەکی درێژی هەیە. کەنیسە بۆ ماوەیەکی باش سەرکەوتو بوو لە بێلایەنکردنیدا. بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوەکەی تۆماس مونزەردا ڕەهەندێکی شۆڕشگێڕانە وەردەگرێت و دەبێت بە ئیوتۆپیای چینی کۆمەڵایەتی. لەم پرۆسێسەدا ئەوەی دەگۆڕێت پێگەی ئومێد و خەون و ئارەزووەکانی مرۆڤە. ئەگەر پێش تۆماس مونزەر باوەڕدارەکان ئەو پێگەیەیان دواخستبێت بۆ ژیانی داهاتوو، بۆ قیامەت، ئەوا لە پاش تۆماس مونزەر هەوڵدەدەن لە ژیانی ئێستای دونیایدا بەدییبێنن. لێرەوە جێگۆڕکێی پێگەی ئومێد و خەون و ئارەزوی باوەڕداران دەبێت بە دابڕان لە نێوان دوو مێژوودا، مێژوویەکی تراديسیۆنالیست و مێژوویەکی مۆدێرن کە تیایدا عەقڵی ئیوتۆپیا

بەشێوەیەکی جیاواز کێڵگەی سیاسی دادەمەزرێنێتەوە.

مانهایم هەوڵدەدات ئەم دیاردەیە بە "شیلیاسمی ئیکستاتیک" ناوبەرێت. بێگومان ئیکستاتیک وشەیەکی گریکی کۆنە و بریتیە لە: "کردەی بوون لە دەرەوەی خوود". هەروەها ئاماژەشە بە دۆخێکی دروستکراو لە بەختیاری، یان لە سەرسوڕمان/ دۆشدامان/ سەرسامبوون/ سەرخۆشبوون/ مەستبوون.

مانهایم هەوڵدەدات بە "شیلیاسمی ئۆرگیاستیك"یش ناوببات کە گوزارشتە لە دۆخێکی تایبەت لە زیادەڕەوی" و "مەستبوون" لەسەر ئاستی کۆلێکتیڤی کارا؛ وەك ئەوەی لە "ڕیتیولی ئۆرگیاستیکی ئەنتیکیتێدا" تێبینی دەکەین.

ئەم دوو تێرمە "ئۆرگیاستیك / ئیکستاتیك" گوزارشتن لە جۆرێکی تایبەت لە ڕەفتار و هەڵوێست و دۆخی عەقڵی قولبووەوەی نزیك لە ئەفسانەی چالاکی دابەشبوو بەسەر ئەندامانی گروپێکی کۆمەڵایەتی یان بزوتنەوەیەکدا.

مانهایم پێیدادەگرێت لەسەر ڕەهەندی ئاینی و سیاسی ئەم فۆرمە لە ئیوتۆپیا و بەڵگەشی ئەوەیە کە ئێمە لای ئانەباپتیستەکان لە یەککاتدا تێبینی شیلیاسم و شۆڕشیش دەکەین. واتە تێبینی ئاین و سیاسەت دەکەین. ئەوەی وا لە تۆماس مونزەر و پارتیزانەکانی دەکات کە بین بە شۆڕشگێڕی کۆمەڵایەتی ڕەهەندە ئاینیەکەیە.

لێرەوە مانهایم دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە:

بزوتنەوەیەکی ئاینی میلێناریست، بەبێ ڕەهەندی سیاسی، بەبێ ڕوانگەی شۆڕشگێڕی، بەبێ عەقڵی ئیوتۆپی، نابێت بەو شتەی کە ناویدەنێت "ئیدیالتیپی عەقڵی ئیوتۆپی شیلیستیك".

(تێبینی: خوێنەر ناتوانێت لەم هەموو زاراوەو چەمکانە تێبگات بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەو پێناسانەی کە پێشتر بە هەر یەکێك لەوانەمان بەخشی. ئیتر سروشتی نووسینی کێڵگە تایبەتەکان هەروایە و ئەمە بە تەنها گرفتی زمانێك نییە، بەڵکو هەموو زمانەکان. فەرەنسیەك بۆ ئەوەی بابەتێکی ئاوا بخوێنێتەوە، پێویستی بە چەند قاموسێکی فەرەنسی/ فەرەنسی هەیە. ئەمە گەر بۆ زمانی فەرەنسی وا بێت، بۆ زمانی کوردی بێگومان زیاتر قورسترە. باخەوان).

مانهایم لە سەرەتاوە شیلیاسم بە پانتایی جوتیارەکانەوە دەبەستێتەوەو پێیوایە کە لکاوە بە چۆنیەتی پێکهاتەی ڕۆحی و فیزیکیانەوە: ئەم چینە لە یەککاتدا پانتایی دەرکەوتنی هەردوو ڕەهەندی ماددی و مەعنەویە لە چلەپۆپەدا. دواتر گریمانەکەی فراوانتر دەکات و هەوڵدەدات شیلیاسم بەو وردە چینە دورخراوانەشەوە ببەستێتەوە کە هەڵگری ستراکتۆرێکی عەقڵی تایبەتن و دەکرێت بە مرۆڤی سەر جادەیان ناوبەرین. بەڵام مانهایم پێیوایە ڕۆشنبیران لەبەر ئەوەی کە بەردەوام هەوڵدەدەن شیلیاسم ڕاسیۆنالیزە بکەن، ناتوانن وەك جوتیاران یاخیبن و ڕاپەڕین ئەنجامبدەن و بین بە بازووی شۆڕش.

کاتێك مانهایم باس لە شۆڕش و یاخیبوونی ئانابابتیستەکان دەکات، مەبەستی ئەوە نیە کە ئەم شۆڕش و یاخیبوونە لە بەرامبەر گروپێکی دەسەڵاتدار یان چەوسێنەردا بێت، یاخود تەنها لە پێناوی گۆڕینی حکومەتێکدا بێت. بەڵکو شۆڕشە لە پێناوی کۆتایی هێنان بە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی کە نەك هەر بە تەنها سەرچاوەی دروستکردنی دەسەڵات و حکومەتە، بەڵکو سەرچاوەی بەها و نۆرم و یاسا و پرانسیپە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و

ئاینیەكانیشە. ئەم شۆڕشە پەلاماری تاكەكان نادات، بەڵكو پەلاماری ئەو ستراكتۆرە دەدات كە تاكەكان بینادەكات.

لێرەوە شۆڕش دەبێت بە دۆخێكی بەردەوامی ڕۆحی ئەو كەسانەی كە باوەڕیان پێیەتی. دەبێت بە بەهایەكی ئەخلاقی، دەبێت بە ئامانج نەك بە كەرەسە. بە ستراكتۆرێكی بیناكاری خولقێنەر، نەك ستراكتۆرێكی بیناكراوی خولقێنراو.

مانهایم بە وردی لەسەر تاقانەیی تێگەشتن لە "كات" لە عەقڵی شیلیاستیكدا دەوەستێت. لەم تێگەشتنەدا كات وەك پرۆسێس و وەك گەشەكردن و وەك خۆبەرجەستەكردن لە داهاتوودا ڕەددەكرێتەوە. كات بریتیە لەو چركەیەی كە لە ئێستا و ئێرەدا تێپەڕدەبێت. چركەیەك كە باركراوە لە مەدلول و مانا. شیلیاستیكەكان پێیانوایە كە دەسەڵاتی ڕەها دەبێت دەستوەربداتە "ئێستا و ئێرە"وە بەڕادەیەك كە ئێستا و ئێرە ببێت بە ڕەها و ڕەهاش ببێت بە ئێستا و ئێرە. بە كورتی شیلیاسم خۆی ناداتە دەست خەون و ئومێدەكانی داهاتوو یان جیهانێكی دیكە، بەڵكو دەیەوێت لە ئێستاو ئێرەدا خەون و ئومێدەكانی بەدیبهێنێت.

بۆ بەرهەمهێنانی تێگەشتنێكی دروست، مانهایم دێت و ئیوتۆپیای شیلیاستیك و ئیتۆپیای لیبراڵ بەراورد دەكات:

—ئیوتۆپیای شیلیاستیك هەستاوی و سۆزاویە.

—ئیوتۆپیای لیبراڵ عەقلانی و موجەڕەدە.

—ئیوتۆپیای شیلیاستیك دژایەتی جیهان و كولتورو سیستەم دەكات.

—ئیوتۆپیای لیبراڵ هەڵوێستێكی ئیجابیانە لەسەر كولتور و سیستەم هەیە.

—ئیوتۆپیای شیلیاستیك دەیەوێت لە ئێستا و ئێرەدا گۆڕانەكان جێبەجێ بكات.

—ئیوتۆپیای لیبراڵ باوەڕی بە گەشەكردن و بزوتنەوەی مێژوو هەیە و لە نێو پرۆسێسدا كاردەكات.

—ئیوتۆپیای شیلیاستیك گوزارشتە لە خواست و ئارەزووی چینی چەوساوەو پەراوێزكراو.

—ئیوتۆپیای لیبراڵ گوزارشە لە چینی بۆرژواو دەسەڵاتداران و چەوسێنەران.

ئەمە جیاوازی نێوان دوو جیهانی كۆمەڵایەتی لێكدابڕاوە، دوو ئیوتۆپیای دژ بەیەكە، دوو چینی بەگژیەكداچووە. ڕاستە لە كارگە كۆنسێپتیولەكەی مانهایمدا چەند لێكدژیەك هەیە، بەڵام ئەمە بەهیچ شێوەیەك نابێتە بەربەست بۆ كەڵكوەرگرتن لەو میتۆدۆلۆژیایەی كە ئەو بۆ خوێندنەوەی فاكتی ئاینی و كۆمەڵایەتی بەرهەمی هێنا.

## بیبلۆگرافیا


*Karl Mannheim, Idéologie et Utopie, Pouline Rollet, Paris, Marcel Rivière, 1956.*

*Raymond Aron, La sociologie allemande contempraine (1935), Pris, PUF, 1966.*

*Joseph Gabel, Mannheim et le marxisme hongrois, Paris, Méridiens-Klincksieck, 1987.*


## پەراوێزەكان:

١—ئێمە لە چركەی ماكس ڤێبەردا بە درێژی باسمان لە ئیدیالتیپ و پێناسە و چۆنیەتی دروستبوونی كرد. بۆ تێگەشتنی زیاتر خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە سەری. باخەوان

٢—ئانباپتیسم بزووتنەوەیەكی مەسیحی ڕیفۆرمخوازی سەدەی شانزەهەم بوو. لەگەڵ چركەی

ریفۆرمی پرۆتیستانتەکاندا دەرکەوت و لە ئەڵمانیا و هۆڵەنداو سویسرادا تەشەنەی کرد. گرنگترین ریفۆرمی ئەم بزوتنەوەیە بانگەشەبوو بۆ ناچارکردنی منداڵان بە پابەندبوونی ئاینی و ئیمانەوە. سیستەمی کەنیسەدا، کە منداڵێک لەدایکدەبێت دەبرێت بۆ کەنیسە و بەپێی مەراسیمێکی تایبەتی، وەک چۆن لە ئیسلامدا بانگدەدرێت بە گوێیدا، "تەعمید" دەکرێت و بانگی ئاینی خوای دەدرێت بە گوێداو بە رەسمی دەبێت بە مەسیحی. ئەم بزوتنەوەیە دەیویست منداڵان لەم کردەیە دوربخاتەوەو پاشان داوانش لە گەورەکان بکات بەپێی ئازادی خۆیان بگەڕێنەوە بۆ کەنیسە و سەر لە نوێ و لەسەر پرانسیپی ئازادی خۆیانبکەنەوە بە مەسیحی، چونکە مەسیحیبوونی منداڵیان بەتاڵە و لەسەر بنەمای ئازادی دانەمەزراوە. بێگومان ئەمە بەلای کەنیسەوە ئەو کوفرە گەورەیەبوو کە نەدەکرا هەرگیز بکرایە. باخەوان.

٣-تێبینی: لێرەدا هەردوو تێرمی مێلێناریسم و شیلیاسم وەک دوو موراتیف بەکاردەهێنرێن.

# هونەری شۆڕش

هوارد زین

لە فارسییەوە: کاوەی گوڵکار

هواردزین *Howard zinn* لە پێشەکیەکدا کە بۆ کتێبی "ئانارشیزم، سیاسەتی شاعیرانە" نووسیویەتی دەڵێ: "وشەی ئانارشی لە رۆژئاوادا ئاژاوەیەکی گەورەی لای زۆربەی خەڵك نایەوە. ئەم وشە بە مانای بێنەزمی، توڕەیی و گرژی و، دوو دڵی و دڵنیانەبوون و... هاتووە. ئێمە نەبێت لەم مانا گەلە بترسین چونکا دەیان ساڵە لەگەڵیدا ژیاوین. ئەڵبەتە نە لە کۆمەڵگایەکی ئانارشیستیدا کە هیچکاتێ بوونی نەبووە، بەڵکو دروست بە پێچەوانەوە لەو کۆمەڵگانەدا لە تەکیا ژیاوین کە زۆرترین ترسیان لە ئانارشی بووە واتە لەو دەوڵەت نەتەوە بەهێزانەی سەردەمی مۆدێرن.

بە درێژایی مێژووی مرۆڤ ئاژاوەی کۆمەڵایەتی وانەبینراوە. پەنجا ملیۆن کەس لە شەڕی جیهانی دووهەمدا کوژران: یەك ملیۆن لە کۆریا، یەك ملیۆن لە ڤێتنام، نیو ملیۆن لە ئەندونزیا، و بە سەدان هەزار کەسیش لە نەیجیریا و مۆزامبیك. بیست ساڵ پاش تەواو بوونی شەڕیش سەرەڕای ئەوە بڕیار وا بوو چیدی هیچ شەڕێك روونەدات، جیهان سەدان قەیرانی سیاسی پڕ لە گرژی و ئاڵۆزی بەخۆوە دیوە. ملیۆنا کەس دیلی دەقیری و برسیەتی و هەژارین یاخود لە زیندان و شێتخانەکاندا بەسەر ئەبەن. رووکاری ناوەوەی ئەم ئاڵۆزیە لە شێوەی نامۆیی و سەرلێشێواوی و بەدبەختی گشتی و رووکاری دەرەوەیشی لە شێوەی زۆری سپاو میلیتاریزەکردن، خەزن کردنی غازی کیمیاوی و بۆمبای هایدرۆژنی و ناوکیدا خۆی دەنوێنێ. ئەمڕۆکە پیاوان و ژنان و ئەو منداڵانەی کە ئاستی تێگەیشتنیان نەختێك بەرز دەبێتەوە و لە سنووری ناوچەیی تێدەپەڕێت ژیانی یان تەژی لە بێباوەڕی و زاری دڵەڕاوکە دەبێت و لە خۆ دەپرسن بڵێی نەوعی بەشەر یا مرۆڤ ■ بەرەو وەچەیەکی تر بڕی یانا؟

هەر بۆیە ئانارشیستەکان دەیانەوێت کۆتایی بەم بارودۆخە بهێنن و بۆ یەکەمجار ڕێکخستنێك بەم جیهانە ئاڵۆزکاوە بدەن. ئێمە هیچ کاتێك بەوردی گوێمان لە قسەی ئەوانە نەگرتووە. ئەوەش کە بیستوومانە لە رێگەی فیلتێرەکانی پاسدارانی ئاژاوەو رێبەرانی دەسەڵاتی میللی چ سەرمایەداری و چ سۆشیالیستیەوە بووە.

ئەو ڕێکخستنەی ئانارشیستەکان دەیانەوێت لەگەڵ ڕێکخستنی دەسەڵاتە نەتەوەییەکاندا کە ئەڵمانییەکان *Ordnung* و سیاسەتمەدارە ئەمریکییەکان "نەزم و یاسا"ی پێ دەڵێن، جیاوازی زۆرە. ئانارشیستەکان خوازیاری دروستبوونی جۆرێک پەیوەندی خۆویستانە لە ناو مرۆڤەدان کە لەویست و نیاز و پێداویستییەکانی خەڵکەوە سەرچاوەی گرتبێت. ئەم ڕێکخستنە لە ناوەوە هەڵدەقوڵێت و سروشتییە. جەماوەر بە دڵی خۆیان نەک لە ڕێگەی زۆر و تۆقاندنەوە، ڕێکخستنێکی ساکار هەڵدەبژێرن. ئەمەش شتێکە وەکو ئەو کارەی شێوەکارێک لەگەڵ ڕەنگەکان یا هونەرمەندێک لەگەڵ مادە سەرەکییەکان دەیکات. بەشێوەیەکی جوان شکڵێکی جوان و ڕازاوە و دڵڕفێنی پێ دەبەخشێت، و لەبەرئەوەی باوەڕ و ئیمانی بە ئیشەکەی خۆی هەیە، ئیشەکەی بە پیت و بەرەکەت دەردەچێت. هەر بۆیە لەم ڕوانگەوە سەیر نییە ئەگەر "هێربرت ڕید"ی شاعیر و فەیلەسووفی بواری هونەر بە ئانارشیست دابنێین.

ڕید لە ڕێگەی ئەزموونە تایبەتییەکانی خۆیەوە بە ئانارشیسمی فەلسەفی گەیشت. ئەو کوڕی جووتیارێکی ئینگلیزی بوو، لە (یۆرکشایەر) گەورە بوو، چەند ساڵێک لە شاری پیشەسازی دەوامی کرد و هەر لەوێ چۆتە زانکۆ. شیعری ئەزموونیەوە و حەزی لە هونەر و ئەدەبیات بوو.

لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا لە ڕیزی سوپای ئینگلیزدا ناچار بوو بڕۆن و بەرامبەر و دەنگ و هەرای شەڕ تەحەممول بکات. دواتر وەکو زۆربەی ڕۆشنبیران، شۆڕشی بۆلشەویکی ئۆکتۆبەری مەزن لە ڕووسیا، سەرنجی ڕاکێشا، بەڵام هەرزوو دیکتاتۆری حیزبی شیوعی بێزاری کرد و ڕووی کردە ئانارشیسم کە بە جۆرێک لەگەڵ حەز و ویستی ئەو بۆ هونەر یەکی دەگرتەوە. ئەو حەزی لە پەیکەرسازی، شیعر و ڕەخنەی هونەری و فەلسەفەی هونەر بوو و شیعرەکانی William *wordworth* شاعیر ئینگلیزی (١٧٧٠-١٨٥٠) و *Samuel taylor Coleridge* (١٧٧٢-١٨٤٣) کاریگەری زۆری لەسەر کەسایەتی ئەو دانا.

ڕید تا کاتی مەرگی لە ١٩٦٨دا، چل کتێبی نووسیوە کە زۆربەیان دەربارەی هونەر و ئەدەبیاتن.

لە ١٩٥٤ لە ئینگلیسدا کۆی وتارەکانی لەبارەی ئانارشیەوە لە ژێر ناوی "ئانارشی و ڕێکخستن"دا بڵاوبکرێتەوە. بەڵام نامیلکەی "شۆڕش و هزر" کە لە ١٩٥٣ دا نووسیبووی ڕێگەی پێنەدرا لە ئەمریکا بڵاوبکرێتەوە. هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە ئەمریکا لە دەیەکانی پەنجادا ڕێگەی بە هیچ جۆرێک ئانارشیسم و بەربەرەکانەی جدی نەدەدا. بەڵام لە ١٩٧٠ دا هەلومەرجەکە گۆڕاو "ڕید" دیارییەکی بۆ هێنان کە ئەوەی تازە نیازیان پێ بوو و خوازیاریشی بوون. ئەم دیاریەش "ئاوڕدانەوەی ئیستاتیکانە و جوانناسی لە سیاسەت"بوو.

ڕێکخستنی هەنووکەیی دنیای سیاسەت، بەو جۆرە کە دەیبینین، سەپێندراوە بەسەرکۆمەڵگادا، یانی نە خەڵک خوازیارین و نە ئەویش پێداویستی و نیازەکانی جەماوەر لەبەرچاو دەگرێت. هەر بۆیە ئاژاوە و وێرانکاری لێ دەکەوێتەوە.

سیاسەت تاپۆ و مۆتەکەیەکە لە بەرانبەر هەستی ئێمە و هەناسەی لێ بڕیوین. سیاسەت دژی بنەڕەتەکانی ئیستاتیکایە. لە جوانی بە دوورە. داسەپێنراوە بەسەرماندا. وەکو دەنگێکە کە لە گوێماندا بلەرێتەوەو ئازارمان بداو خاوەنی ئەو دەنگانەش ناوی مۆسیقای لێ بنێن.

دەنگ و هەرا و جەنجاڵی ڕێکخستنی ژیانی مۆدێرن وا ئێمەی کەڕ کردووە کە ئاوازی ناسک و جوان و لەسەرخۆ ناگاتە گوێمان. هەر بۆیە سەیر نییە کە لە سەردەمی مۆدێرنەدا، لە زەمانی شۆڕشی فەرەنسی و ئەمریکی، واتە لەو کاتەدا کە مرۆڤ زۆرترین غروری سەبارەت بە

دەستکەوتەکانی خۆی بوو، بیرۆکەی ئانارشیستی بەرانبەر بەم لووت بەرزی و لە خۆبایی بوونە راوەستا.

شارستانیەتی رۆژئاوا، لە وەسفی تایبەتمەندیەکانی خۆی وەکو پێشکەوتنێکی بەرچاو لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، هەرگیز نەیتوانیوە هاوتایی و هاوسەنگی بپارێزێت.

یەکە گەورەکانی دەوڵەتە نەتەوەییەکان جێگەی عەشایرو تایفەگەریان گرتەوە. حکومەتی پارلەمانی جێگەی بە ماف خودایی حکوومەتی پاشایەتی لێژکرد. هێزی هەڵم و کارەبا جێگەی پیشە دەستیەکانی گرتەوە. زانیاری و فێرکردن تەلیسمی خورافەی پووچەڵکردەوە. یاسا جێگەی ریش سپیگەری گرتەوە. بەلام سەرەڕای ئەمانە، ئانارشیزم دروست لە بەشکۆترین رۆژانی شارستانیەتی رۆژئاوادا سەری هەڵدا، لەبەرئەوەی مژەکانی ئەم شارستانیەتە پووکانەوە و بزربوون.

دەسەلاتی نەتەوەیی کە بە دروشمی کۆتایی هێنان بە زۆرەملێی دەرەکی و دابین کردنی ئاسایشی ناوخۆیی هاتە مەیدان ئەوەندەی تر دەسەلاتی ئیمپراتۆریە پاوانخوازە گەورەکان و قەیران و تەنگژە خوێناویەکانی لەرانی بەسەر خەڵکدا سەپاند و شەڕی ماڵوێرانکەری نێو ئیمپراتۆریەکانی زیاتر کرد. پەرەسەندنی ئیمپریالیزم و شەڕ هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتە نەتەوەییەکاندا جۆرێك لە خۆ کوشتن بوو. حکومەتی پەرلەمانی کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە خەڵك لە رێگەی دەنگدانەوە دەتوانن بەشداری لە چارەنووسی خۆیاندا بکەن، بە شێوەی دەوڵەتی یەك حیزبی یا دوو حیزبی خۆی پیشاندا و بوو بە پەردەیەك بۆ داپۆشینی سیمای نوێنەرانی پەرلەمان کە لە راستیدا نەك نوێنەری خەڵك، بەڵکو نوێنەرانی هەڵکەوتووی پارەو سامان و هێز و دەسەلات بوون. بەرهەمهێنانی چڕ نەیتوانی کۆتایی بە هەژاری و چەوساندنەوە بهێنێت.

بەرهەمهێنان و بلاوکردنەوەی کالاکان، بە هۆی تەکنۆلۆجیاوە مەعقولتر، بەلام لە ڕوانگەی مۆرالەوە نامەعقول و نادادپەروەرانە بوو. خوێندن و خوێندەواری نەیتوانی کۆتایی بە فریوخواردنی زۆرینە لە لایەن کەمینەوە بهێنێت و ئەمەش فریودانێکی تازە بوو.

سەرلێشێواوی و پەشێوی مێشکی خەڵکی داگیر کرد، کۆنترۆڵی کۆمەلایەتی لە جاران کاریگەرتر بوو، چونکە ئەمڕۆکە چەکداربوو بە دەزگای مەزنی کۆنترۆڵی دەروون. پرۆسەی ماف دادپەروەری بە دیاری بۆ کەس نەهێناو فاکتەری سەربەخۆی بێ دادپەروەری جێگەی خۆی بە ستەمگەرێکی مەجهول و نەناسراو دا. "حکومەتی یاسا" کە جێی بە حکومەتی "پیاوان" لێژکرد تەنیا دەسەلاتدارەکانی گۆڕی و ستەم و بێداد هەروەك خۆی مایەوە.

لە گەرمەی شۆڕشی ئەمریکادا، تام پەین هاوکات لەگەڵ ئەوەی بانگەشەی بۆ دامەزراندنی حکومەتی سەربەخۆی ئەمریکا ئەکرد، بە دڵنیاییەوە لەبارەی حکومەتی شۆڕشگێڕی نوێوە ■ "عەقڵی تەندروستدا" ئاوای نووسی: "کۆمەڵگا لە هەر شێوەیەکدا بێت، بەخشش و مەرحیمەتە، بەلام دەسەلات تەنانەت لە باشترین شێوەشیدا، جگە لە خراپەی پێویست هیچی تر نییە".

ئانارشیستەکان زوو تێگەیشتن کە رووخانی شا و میرەکان و بە دەسەلات گەیشتنی تاقمەکان و پەرلەمانەکان ناتوانێت دیموکراسی لەگەڵ خۆیدا بە دیاری بێنێت لەبەرئەوەی شۆڕشەکان چەندە توانا و قابیلیەتی ئازادی و سەربەستیان تێدایە، ئەوەندەش قابیلیەتی ملهوڕی و دیسپۆتیزمیان تێدایە. هەر بۆیە ژاك روو *Jacques Reux* کە قەشەیەکی دێهاتی بوو بۆ ژیانی دێهاتیەکان و کرێکارانی پاریسی نیگەران بوو لە ١٧٩٣ دژی "دیسپۆتیزمی سەناتۆری" خوتبەی خوێند و بە شتێکی "ترسهێنەر وەکو تارمایی پاشاکان"ی

شویهاند، چونکە پێی وابوو یاسا هەرچەند جەماوەر وا دەزانن خۆیان دایانناوە، بەڵام لە راستیدا زنجیر و کۆتە بۆ دەست و پێی هەر ئەو خەڵکە" یاسا خەڵک دەسەمۆ دەکات. لە شانۆی "پیتر وایس" دا لە ژێر ناوی "سادومارا"[1] ژاك روو کە بە تەناف (حبل) شەتەك دراوە، بۆ کورتە ساتێك بێدەنگی و سانسۆری شانۆکە دەشکێنێ و پێش ئەوەی فریابکەون و بێدەنگی بکەن هاوار ئەکا و ئەڵێ:

"کێن ئەوانەی بازارەکان کۆنترۆڵ دەکەن؟

کێن ئەوانەی قوڵف ئەدەن لە خەزێنەی دانەوێڵەکان؟

کێن ئەوانەی کاخ و کۆشکەکان تالآن دەکەن؟

کێن ئەوانەی دەست بەسەر ئەو زەویانەدا ئەگرن کە بڕیار وابوو بەسەر هەژارەکاندا دابەش بکرێن؟"

یەکێك لە هاوڕێیانی "روو" بە ناوی ژان وار لە jean varlet لە یەکەمین مانیفێستی ئانارشیستی شۆڕشی فەرەنسا لە ژێر ناوی "یاخیبوون"[2] دا ئاوا دەنووسێت:

"بەڕاستی کە ئەم حکومەتە شۆڕشگێڕە ج بێوێنکی کۆمەڵایەتی بەد و ج شاکارێکی مەکیاڤیلیستە Machiavellianism. بە هەر شێوەیەك سەرنج ئەدەم حکومەت و شۆڕش پێکەوە ناگونجێن. مەگەر ئەوەی رای دابنێین کە خەڵك دەیانەوێت دەزگای دەسەڵاتی خۆیان دابمەزرێنن و بەردەوامیش دژی خۆیان ڕاپەڕن، کە ئەمەش ئایدۆلۆجیایەکی زۆر بێ مانایە".

بەڵام ئانارشیەکان باوەڕێکی تەواویان بەم "ئایدۆلۆجیای بێ مانایە" هەیە. چونکە تەنیا دید و ڕوانگەیەکی "بێ مانا و جێی پێکەنین"ە ئەوەندە شۆڕشگێڕانەیە کە ئەتوانێت کەم و کوڕیەکانی شۆڕش بە روونی ببینێت. هێربرت دید لە تەمەنی هەفتا ساڵیدا لە ١٩٦٣ لە کتێبی "لەعنەت لە کولتور" نووسیویەتی:

"ئەوەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بایەخێکی بووە، لە دەستکەوتەکانی فیزیا و ئەستێرەناسی و دۆزینەوە جوگرافیایەکان و دەرمانی نەخۆشیەکان و فەلسەفە و هونەریشدا، تێکڕا دەرئەنجامی کرداری توندڕەوەکان و پەرگیرەکان بووە، ئەو شێتانەی کە بڕوایان بە "ئایدۆلۆجیا بێ مانا و پێکەنین هێنەرەکان" بووە و شەهامەت و جەسارەتی شتە نامومکینەکانیان بووە..."

شۆڕشی روسیا تەنانەت بەڵێنی لەمە زیاتری دەدا، ئەو ئازادیپەروەریە- کە شۆڕشی فەرەنسا و ئەمریکا نەیتوانی پێی بگا - لە هەموو شێوەیەکیدا لەناو ببات. بەڵام "ئێما گۆڵدمان Emma Goldman" لە ئامیلکەی "رابوون لە رووسیا" لە رەخنەیەکی توند و تیژی ئانارشیدا شۆڕشی رووسیا ئاوا هەڵدەسەنگێنێت: "شکست و تراجیدیای گەورەی شۆڕشی رووسیا ئەوە بوو کە دەیانویست تەنیا ناوی دەزگاکان و هەروەها بارودۆخەکە بگۆڕن. لە کاتێکدا بەها کۆمەڵایەتیەکان و مرۆڤایەتیەکانی شۆڕش لە بیرچووبوونەوە. هیچ شۆڕشێك ناتوانێت رزگارکەر بێت مادام کەرەستەو شێوەکانی گەیشتن و پەرەسەندنی شۆڕش لەگەڵ مەبەستەکانیدا لەیەك رەگەز نەبن. شۆڕش نەفی ئەو هەلومەرجەیە کە تێدایین. ناڕەزاییەکی توندوتیژە دژی هەموو پەیوەندیەکی نامرۆڤانەو تێکڕای ئەو کۆیلایەتیەی کە لەو پەیوەندیانەدا حەشاردراوە. شۆڕش لەناوبەری ئەو بەها سەپێندراوانەیە کە دەزگای بێ سەروبەری ئازادیپەروەری و ستەم و درۆ بە یارمەتی نەزانین و بەربەریەت لەسەر بناغەکانی دانراوە. شۆڕش بانگەشەی بەها تازەکانە کە گۆڕانکاریی پەیوەندیە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ - مرۆڤ و کۆمەڵگا - مرۆڤ بە دیاری دێنێت".

ئانارشیەکان پێیان وایە کە سیستەمی سەرمایەداری وێرانکەر و دژ بە ئەقڵ و نامرۆڤانەیە. سەرمایەداری کانزا و شتەکانی سەر

زەوی، چلێسانە هەڵدەلووشێت و دواتر شتگەلێکی لێ دروست دەکا کە هیچ فڕی بە نیازی خەڵکەوە نیە، ئەگەریش هەی بێت بە ڕێکەوتە، چونکە دروستکەرەکان و بڵاوکەرەوەکانی کاڵاکان، کارخانەی گەورەی بازرگانی و تەنیا قازانجی خۆیان لەبەرچاوە. هەر بۆیە لای ئەوان دروست کردنی بۆمبا و لوغم و بینای ئیداری و بۆیەی رەنگاو ڕەنگ گرنگترە لە دابینکردنی خواردن و خانوو و سەیرانگا. بەڕاستی وشەی ئانارشی بەو مانا ناسراوەیەوە کە ئاژاوەو ئاژاوەچیەتییە، باشترین وەسفی سیستەمی ئابوری درندە و ئیسرافکاری ئەمریکایەو پڕ بە پێستیەتی.

ئانارشیەکان لایان وایە کە گەنجینەکان و کانزاکان موڵکی هەموانە و دەبێ لەرووی نیازەوە بەسەر خەڵکدا دابەشبکرێت، نەك لە ڕێگەی سیستەمی ئازادپەروەری بانکی و دراوی و بەشێوەیەکی نامرۆڤانە. ئەوەتا بەپێی ئەم سیستەمە هەموو سامان و سەروەتی وڵاتەکان دەچێتە گیرفانی کەمایەتیەکی بچووك لە دەوڵەمەندەکانی ئەمریکا "ئەمریکا بە ٦٪ نفوسی لە ڕێژەی جیهاندا، ٥٠٪ بەرهەم و سەروەتی جیهانی بە دەستەوەیە" ئانارشیەکان لەگەڵ حیکایەت بێژی شانۆی "بازنەی گەچی قەفقازیا"ی "بێرتولێت برێشت" هاودەنگن کە لە کۆتایی شانۆکەدا ئەڵێت:

"گوێ رادێرە، حیکمەتی پێشینیان چی ئەڵێت:

هەرشتێك ئەبێ بسپێری بەو کەسەی قەدری دەزانێت

کەوا بوو: منداڵەکان بسپێرن بە دایکەکان ■ بەختەوەربن.

عەرەبانەکان بدەنە دەست پیاوی خۆی ■ بە جوانی بیبەن بەرێوە.

دۆڵەکان و پێدەشتەکان بدەنە دەست ئاودێرەکان تا سەمەرەکەی ببینین."

هەر لەم ڕوانگەوە بوو کە "جرارد ئانستانلی Gerard winstanely ڕێبەری جووتیارانی[٢] ئینگلیس لە سەدەی هەڤدەهەمدا بەلەبەرچاو نەگرتنی یاسای موڵکایەتی تایبەتی داوای لە لایەنگرانی خۆی کرد زەویە بەیارەکان بکێڵن و کشتوکاڵی تێدا بکەن. جرارد لەبارەی خەونەکانیەوە لە داهاتوودا دەڵێ:

"ئەو ڕۆژەی یاسای جیهانی بەرابەری لە دڵی هەموو پیاو و ژنێکدا سەرهەڵبدات، کەس بۆی نییە ئیدعای موڵکایەتی هیچ بونەوەرێك بکات و ئیتر کەس ناڵێت ئەمە هی منە و ئەوە ماڵی تۆیە، ئەمە ئیشی منە و ئەوە ئیشی تۆیە. بەڵام هەموو بە گەلە کۆمەکی کار دەکەن و زەوی دەکێڵن و ئاژەڵ پەروەردە ئەکەن. نیعمەتەکانی سەر زەوی بۆ هەموان دەبێت. هەر کەس نیازی بە دانەوێڵە، ئاژەڵ یا باڵندەیەك بێت، دەتوانێ لە یەکەمین سایلۆیا.. کە لەسەر ڕێگەکەیەتی هەڵی بگرێت. هیچ کڕین و فرۆشتن و بازاڕێك لە ئارادا نابێت. تەواوی زەوی گەنجی هاوبەشی هەموو مرۆڤەکانە چونکە زەوی موڵکی خودایە".

مەسەلەی ئێمە ئەوەیە کە چۆن لە تەکنۆلۆجیای بەهێزی سەردەم کەڵك وەربگرین بۆ دابین کردنی نیازەکانی مرۆڤ بە بێ ئەوەی ببینە قوربانی و کۆیلەی ڕێگا و شێوە بیرۆکراتیەکان. یەکیەتی سۆڤیەت نیشانی دا پرۆژەی ئابوری نەتەوەیی بۆ مەبەستە گشتییەکان جێگرێکی باشە، بۆ ئەو ئاژاوەو بێ سەرو بەرەیەی قازانجخوازیانەی سەرمایەداری. بەڵام ڕێبەرانی یەکیەتی سۆڤیەت نەیانتوانی پێشنیارەکانی "هربێرت رید" و ئانارشیەکانی دیکە بەکاربێنن. ڕزگاربوون لە دەستی بیرۆکراسی پیشەسازی مەزن، کە تایبەتمەندی هاوبەشی جیهانی پیشەسازی سۆشیالیزم و سەرمایەداریشە و ئەو کێشەیەی لێ ئەکەوێتەوە کە کرێکاران لە بەرهەمی کاریان، لە بەرهەمیان، لە هاوکارەکانیان و لە

سروشت و لە خۆشیان بێزار دەكات. "رید" پێشنیاری ئەوەی كرد كە گەر كۆنترۆڵی ئیشی كرێكاران بە خۆیان بسپێرن، ئەوا ئەم كێشەیە چارەسەر دەكرا بەبێ ئەوەی مەوهبەتی بەرنامەدارشتن و هاوئاهەنگی ببێتە قوربانی بەرژەوەندی كۆمەڵایەتی،

"پرۆدۆن"، ئەو كەسەی خۆی بە یەكەمین ئانارشیست دەزانی لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەڵێ: "دارایییەكان ئەدزرێن" سەرچاوەكانی زەوی و وزەی مرۆڤەكان چ لە ژێر چاودێری و كۆنترۆڵی شەریكەكانی سەرمایەداریدا بێ و چ لە دەست ئەو بیرۆكراسیانەی كە خۆیان بە "سۆشیالیست"دادەنێن، لە هەر شێوەدا، دزی مەزن رویداوە و ژیان و بەرهەمی كاری مرۆڤەكان بە تاڵان رۆیشتووە، و ئەم تاوانە سەرەتاییە، سەرچاوەی هەموو بەدبەختیەكانە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی. چەوساندنەوە، شەر، كۆلۆنیالیكردن، بە كۆیلەكردنی ژنان، بە"تاوان"دانانی هەر هێرشێك كە بكرێتە سەر موڵكایەتی و بە دادپەروەرانە زانینی ئەو سزا زاڵمانەی كە هەڵقوڵاوی "كۆمەڵگا پێشكەوتووەكانە" ئەمانەن ئەو نەهامەتی و بەدبەختیەی لەو تاوانە سەرەتایەوە سەرهەڵدەدەن.

ئانارشیەكان دەڵێن هەردوو جۆری بیرۆكراسی سەرمایەداری و سۆشیالیستیش، نەیانتوانی لە پراكتیكدا ئەو دیموكراسیە جێبەجێ بكەن كە بەڵێنیان دا بوو. جەوهەر و زاتی دیمۆكراسیەت ئەوەیە كە خەڵك خۆیان چارەنووسیان دیاری بكەن بەڵام ژیانی ئەمرۆی ئێمە بە دەستی جڵاتە سیاسی- عەسكەری و پیشەسازیەكانی ئەمریكا و حیزبی كۆمۆنیستی یەكیەتی سۆڤیەتە. دەولەتی دو حزبی (ئەمریكا) و یەك حزبی (سۆڤیەت) فۆتۆكۆپییەكی چەڵكنی یەكترن. هەردوكیان لە رێگەی نوێنەرانی بێ دەسەڵاتی پەرلەمانەوە وا پیشان ئەدەن كە خەڵك لە رێگەی دەنگدانەوە لە ژیانی خۆیاندا بەشدارن. لە واقیعدا "دەنگ" لە كۆمەڵگای مۆدێرندا، نەختینەگی دونیای سیاسەتە هەروا كە دراو نەختینەگی دونیای ئابوورییە. هەردوو بەتاوی دەسەڵاتی زۆرینە بەسەر كەمینەدا خەڵك تەفرە ئەدەن و ئەو راستییە ئەشارنەوە كە ئەوە كەمینەیەكی تایبەتە كە بەسەر زۆرینەی خەڵكدا دەسەڵاتی خۆیان دائەسەپێنن.

ئانارشیەكان دەڵێن "یاسا و ئاسایش" گەورەترین درۆی سەردەمی ئێمەیە. یاسا رێكخستنی لێ ناكەوێتەوە بە تایبەتیش ئەو رێكخستنە رێك و پێكەی كۆمەڵگا كە لە هاوریاری و گەلەكۆمەكی سەرچاوە ئەگرێت. یاسا دانراوە بۆ ئاسایشی دەوڵەتە پاوانخوازەكان و ئاسایشی زیندان و ئەو سپایە كە خەڵكی پێ بترسێنن.

تەنیا كارێك كە یاسا ئەنجامی ئەدات ئەوەیە لە رێگەی زۆر و داپڵۆسینەوە ئەهێڵێت ئەو خەڵكە رەش و رووتانەی كە خۆیان قوربانی و زادەی كۆمەڵگای گەندەڵن، سەركێشی و نافەرمانی بكەن.

رێكخستنێك كە ئەم یاسایە بە دیاری دەیهێنێت كاتی و كەم خایەنە، چونكە زۆرە ملێی خۆی بانگهێشتنێكە بۆ نافەرمانی و سەركێشی. یاسا ناتوانێت كۆمەڵگایەكی باش دروست بكات.

كۆمەڵگای باش تەنیا زۆرینەی خەڵك لە رێگەی خۆبەخشی و هاوكاری چەند لایەنەو دابەش كردنی سەروەت و سامان بە شێوەی دادپەروەرانە لەناوخۆیاندا ئەتوانن دیسپیلینی پێ بدەن. باشترین ئاسایش ئەوەیە كە خەڵك نە بە زۆری یاسا، بەڵكو بە ریست و حەزی خۆیان هەر كارێك كە بە پێویستی بزانن ئەنجامی بدەن. دیاری ئەم شارستانیەتە تازەیە بە حكومەتی قانون و دیمۆكراسی نوێنەرەكانیەوە چیە؟ هەم سەرچاوە سروشتیەكانی زەوی لەناو دەبات كە ئەتوانن خۆشی و بەختەوەری بە خەڵك

بیەخشن- و هەم سەرچاوە سروشتیەکانی مرۆڤەکان کە ئەمیشیان دەیتوانی هەوێنی خۆشەویستی و بلیمەتی بێت، بەرەو گەندەڵی و نەمان پەلکێش ئەکات.

بە سەمەر گەیشتنی ئەم توانا و قابلییەتە هەنووکەیانەش نیازی بە پەروەردەکردنی بەرەیەکی نوێ لە فەزایەکی تەژی لە مێهرەبانی و هونەردایە. مخابن ئێمە پەروەردەی دونیای سیاسەتین. هێربرت رید لە "هونەر و نامۆیی"دا لە وەسفی مرۆڤایەتی پێنەگەیشتوو ناتەواودا کە پەروەردەی رەحمی دونیای سیاسەتە ئەڵێ:

"ئەگەر بینایی و هەستی بیستن و چێژتن و لامیسە و هەموو وردەکاریەکانی جوانی هەستەکانمان، کە لە پرۆسەی زاڵبوون بەسەر سروشتدا و دەست تێوەردان و گۆڕانکاری مەواد بە شێوەی مێژوویی پەروەردە ئەبێ و بالاّ ئەکات هەر لە منداڵیەوە تا گەورەیی و پیری بەو جۆرە پەروەردە نەکرێت دەرئەنجامی ئەم کارە بوونەوەرێکی لێ ئەکەوێتەوە کە شیاوی ناوی مرۆڤ نییە. ئەم بوونەوەرە دەزگایەکی کوێر و کەڕو لاڵە کە تەنیا لە ناخەوە حەزی لە گرژیە. حەزی لە کرداری توڕەیی و زبری و دەنگی ناحەز و هەر جۆرە یارییەکی لێوانلێو لە هەراو هوریا کە بتوانێت درگای دەمارە داخراوەکانی بکاتەوە. سەرقاڵیەکانی ئەم بوونەوەرە ئەمانەن: ئیستادیۆم و مەیدانی وەرزشی، یاری پین باڵ، هۆڵەکانی هەڵپەڕین و ئاهەنگ و تەماشای تاوان و گاڵتەجاڕی سادیسم لە سەر شاشەی تەلەفیزیۆن، قومار و راهاتن بە مادە سڕکەر و هۆشبەرەکان".

ئەسەف بۆ پرۆسەی پەرەسەندن؟ کە دوای یەك میلیارد ساڵ ئەم مرۆڤانەی لێ کەوتەوە کە ئەگەر بیانویستایە دەیانتوانی کەرەستە خاوەکانی سەرزەوی و هەروەها خۆشیان بە شکڵ و شێوەیەك دەربهێنابێت کە جێگای رەزامەندی و حەزی تێکڕای ژنان و پیاوانی گشت جیهان بێت.

بەڵام ئایا ئێستاش دەتوانین لەم هەڵێژاردنەدا خۆمان سەر پشك بین؟! وا دیارە نیازمان بە گۆڕانکاریەکی قووڵی شۆڕشگێڕانە لە پرۆسەی کار و چۆنیەتی بڕیاردان و پەیوەندیە سێکسیەکان و.. تا بیروڕا و کولتوریشمان هەیە. ئەم گۆڕانکاریەش بە شێوەی ئاسایی دەرئەنجامی نابێت واتە نە بە سەرنگوونی حکومەتەکان لە ڕێگەی ئیزامییەوە (کە ڕادیکاڵە سوننەتیەکان لایەنگرین) و نە بە ڕیفۆرم و چاکسازی لە ڕێگەی هەڵبژاردن و دەنگدانەوە کە ریستی لیبراڵە سۆننەتیەکانە پێی ئاگەین. بارودۆخی جیهانی ئەمڕۆ ئەم ڕاستیە دەسەلمێنێت.

ئانارشیستەکان هەمیشە بەوە تۆمەتبارکراون کە لایەنگری توندوتیژین و بە ڕێگەیەکی دەزانن بۆ دروستکردنی گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانە. ئەم تۆمەتە لەلایەن ئەو حکومەتانەوە دەهێنرێتە ئارا، کە خۆیان بە توندوتیژی دروستبون، بە توندوتیژی پارێزگاری لە دەسەلاّت دەکەن و بەردەوام سود لە توندوتیژی بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکان و هێرشی نەتەوەکانی دی وەردەگرن. هەندێك لە ئانارشیستەکان - وەك هەموو شۆڕشەکانی دی دنیا، چ ئەمەریکی یان فەرەنسی، روسی یان چینی- جەختیان لە بەکارهێنانی توندوتیژی کردووە. هەندێکیشیان لایەنگری تیرۆر و ترس و تۆقاندنن و بگرە تەنانەت جێبەجێی دەکەن. لێرەشەوە هیچ جیاوازیەکیان لە کەسی شۆڕشەکانی دیدا نییە. ئەوەی ئانارشیستەکان لەوانی دی جیادەکاتەوە کە زۆریەیان شۆڕش بە پرۆسەیەکی کولتوری - ئایدۆلۆژی و داهێنەرانە دادەنێن، کە رەنگە وەکو هاوار و قیژەو ژانی لەدایك بوونی منداڵێك، توندوتیژی تێیدا شتێکی حەتمی بێت؛ چونکە مرۆڤ غەریزەتەن لە بەرانبەری هەر گۆڕانکاریەکدا دەوەستێت و شۆڕشیش خۆی لە خۆیدا جۆرێك گۆڕانکاری هەمە لایەنیە. بەڵام دەکرێ لە رەوتی

سەرهەڵدانی شۆڕشێکدا، ئاستی توندو تیژی کەم بکرێتەوە.

ئێلێکساندێر بێرکمەن *Alexander Berkman* کە لە تەمەنی گەنجێتیدا ویستبووی کارخانەدارێکی ئەمریکی بکوژێت، دواتر کە پێدەگاو تێدەگا، لەبارەی توندوتیژی و شۆڕش لە کتێبی "ئەلف و بێی ئانارشیزم" دا دەڵێ:

"بە ڕاستی ئەمانەوێ چی لە ناوببەین؟ سەروەتی دەوڵەمەندەکان؟ نا، ئەمە شتێکە ئێمە ئەمانەوێت هەموو خەڵك کەڵکی لێ وەربگرن هەروەها زەوی و مووچە و کانزاکان و ڕێگەی ئاسن و کارخانەکان و دوکانەکانیش نامانەوێت وێران بکرێن، بەڵکو ئەمانەوێت لە خزمەتی خەڵکدابن.

کەوابوو شۆڕشی کۆمەڵایەتی نایەوێت هیچێك نابوود بکات بەڵکو ئەیەوێت بە قازانجی گشتی دەست بەسەر هەموو ئەو سەروەت و سامانانەدا بگرێت. شۆڕش ئەبێت ئەوەی بۆ بەختەوەری گشتی پێویستە بیناسێت و ڕای بگرێت".

شۆڕش لە واقیعدا بە زۆر و لە ڕێگەی سوپا و تفەنگەوە، ناکرێت. شۆڕش دەبێ لە پێشدا لە هزر و بیرو کرداری مرۆڤەکاندا دروست بێت، تەنانەت پێش ئەوەی لە هیچ ئۆرگانێکدا گۆڕانکاری بنەڕەتی بکرێت، چونکە شۆڕش کردارێکی ساتەوەختی نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی درێژخایەنە.

"برکمەن" لەم بارەوە دەڵێ:

"ئەگەر مەبەستی ئێوە دابینکردنی ئازادییە، دەبێت فێربن ناچارکردن وەلا بنێن. ئەگەر ئەتانەوێت لەگەڵ خەڵکدا لە ئاشتیدا بژین، ئەبێ برایەتیتان بسەلمێنن و ڕێزو حورمەتی یەکتر و خەڵك رابگرن. ئەگەر بۆ قازانجێکی هاوبەش پێکەوە ئیش دەکەن، دەبێ مومارەسەی دەستگرۆیی و هاویاری بکەن. مانای شۆڕشی کۆمەڵایەتی تەنیا ئەوە نیە سەرلەنوێ ڕێکخراوێك جێگەی یەکێکی تر بگرێت، شۆڕش سەقامگیری بەهای مرۆڤایەتی تازە و پەیوەندی کۆمەڵایەتی تازەو ڕوانینێکی تازەی مرۆڤ بۆ مرۆڤە، ڕوانینی کەسێکی ئازادو سەربەخۆ بۆ هاوڕێکەی.

شۆڕش بە مانای ڕۆحی تازە کردن بەبەر ژیانی تاك و کۆمەڵە. ئەم ڕۆحەش بە شەوێك تازە ناکرێتەوە بەڵکو دەبێ وەکو تۆوی گوڵێکی ناسك بچێندرێت و ئاو بدرێت و پەروەردە بکرێت تا ئەم گوڵە ناسك و جوانە بەرهەم بێت. پێش هەر شۆڕشێك ئێمە ئەبێ فێربین بە جۆرێکی تر بیربکەینەوە".

ئانارشیەکان ئەڵێن گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانە ئەوەیە کە هەر لە ئێستاوە، لە هەر کوێ دەژین دەستی پێبکەین. ئەمەش بەو مانایە کە دەستبەرداری ئەو پەیوەندیە توندوتیژانە بین کە لەسەر بنەمای دەسەڵاتخوازی دامەزراون، چ لە نێوان ژنان و پیاوان و چ لە نێوانی منداڵ و باوك و یان کرێکار و خاوەن کاردا. ئەم شۆڕشە تێکشکانی بۆنییە، چونکە بەردەوام لە ژیانی ڕۆژانەدا لە سەرهەڵدانەوەدایە. لە ناو ماڵەکاندا، لە شەقامەکاندا، لە کۆڵان و گەڕەکەکان و لە شوێنی ئیشکردندا. ئەمە گۆڕانی تەواوی کولتورەو ئەگەر لەلایەکەوە پێشێل بکرێت لە لایەکی دیکەوە چرۆ ئەکات و سەرهەڵدەداتەوە. شۆڕشێکی لەم جۆرە هونەرە، چونکە ئەوەندەی کە نیازی بە خۆڕاگریی و بەرگری کردن هەیە، ئەوەندەش نیازی بە خەیاڵە. دیمۆکراسی مۆدێرن مانەوەی خەڵکە بۆ خۆویستی و بەشداری کردن لە تاوانەکاندا.

"هێربرت رید" لەبارەی ڕۆڵی هونەر لە کتێبی "هونەر و ئامۆیی" دا ئەڵێت: "هونەر تا ئەبەد ئاژاوەگێڕ و شۆڕشگێڕە. گەورەیی هونەرمەند لەوەدایە کە بەردەوام بە شوێن شتە نەناسراوەکاندا ئەگەڕێ و بەرهەمکاریان ئەبێتەوەو دەرئەنجامی ئەم کارەش داهێنان و نوێخوازییە. هەر ڕەمزێکی تازەش، ڕوانینێکی تازەیە بۆ ژیان، گرنگی ئەمەش لەوەدا نیە کە بیروباوەڕی

هەنووکەیی خەڵك بھەژێنێت یان ھەست و نەستی ئاڵۆزی ئەوان بە زمانێکی فەسیح و رەوان بڵێتەوە. ئەمەیان ئەرکی سیاسەتمەداران، رۆژنامەنووس و خەتیبەکانە. ھونەرمەند ئەو شتەیە کە ئەڵمانیەکان پێی دەڵێن *Ein Rotller* واتە ژێر و ژوورکەری نەزم و.. یاسا سەقامگیرەکان"

ئەم وتەیە بە مانای جیاوازی بەرچاو لە نێوان ھونەرمەندی داھێنەر و سەرکەوتو لەگەڵ خەڵکدا نیە. ئەبێ لەوە تێبگەین ھەرواکە ھێربرت مارکۆز وتویەتی: کۆمەڵگای مۆدێرن ئەیەوێت بە تەواوی ھێز و توانایەوە، مرۆڤێکی تاك رەھەند دروست بکات و ئەم ھەوڵە ئەبێ پووچەڵ بکرێتەوە.

نزیکبوونەوەی ھ. رید لە ھونەر و ئانارشی وەڵامێکە پڕ بە پێستی خۆی بۆ سەدەی بیستەم و تەرکیزکردنەوەی ئەو فکرەیە کە شۆڕش ئەبێ ھاوکات کولتوری و سیاسیش بێت.

ھەر بۆیە لە کتێبی "لەعنەت لە کولتور"دا دەڵێ:

"ئەورۆکە دەست و پێی ئێمە بەستراوەتەوە. ئەوەی کە دەیانکڕین و ئەیانفرۆشین، لە موبلیاتی ناومالەوە، تا قاپ و کەوچك و جل و بەرگمان، نە لەرووی نیازمەوەیە، بەڵکو بۆ قازانجە. تێکڕای فەرھەنگی سارمایەداری کۆمەڵگای ئێمە، قوماشێکی ڕەنگاو رەنگە بۆ داپۆشینی ناوەرۆکی ئەو کەلو پەلە چرووك و بێ نرخانەی دەوروپشتمان.

لەعنەت لەم فەرھەنگە، وەرن بۆ ڕێزگرتنی شۆڕشی ئیموکراتێك مەلھەلەبکێشین. وەرن شارەکان جۆرێك دروست بکەین کە زۆر گەورە نەبن بەڵام دڵڕفێن بن و خەڵك بە ئاسودەگیەوە لە شەقامەکانیدا پیاسە بکەن و لە پارك و باخە گشتیە سەوزو بەگوڵ خەملاوەکانیدا، زارۆکەکان یاری بکەن. لەخانووە رازاوەکانیاندا بەختەوەر بژین. وەرن لەنێوان کشتوکاڵ و پیشەسازیدا و لەنێوانی شارو دێدا. ھاوسەنگی و ھاوتابونێك دروست بکەین. دەبێ لەپێشدا ئەم ئەرکە سەرەکیانە و مەعقولانە بە ئەنجام بگەێنین و پاشتر لەبارەی کلتورەوە وتوێژ بکەین.

ھەروەھا درێژەی پێئەدات و دەڵێ:

"ناکرێت کلتور لەسەرەوە بەسەر خەڵکدا بسەپێنیت. کلتور لەخوارەوە و لەدڵی خەڵکدا وەکو کانی سەرھەڵئەدات و ئەتەقێتەوە. لە دەروونی جەماوەرو کار و ژیانی رۆژانەیاندا.

فەرھەنگ رەنگدانەوەی سەرخۆشیەکان و دڵ خۆشیەکانی گەلە لە پرۆسەی ژیان و ھەڵسوکەوتی رۆژانەیاندا"

شۆڕشگێڕان پێویستە ڕەگەزی جوانناسی و ئێستاتیك بۆ ھەڵاتن و رزگاربوون لەو کۆت و پێوەندانەی ڕابردوو، لە بیرنەکەن. بەدرێژایی مێژوو دیومانە چۆن شۆڕشگێڕان بە ھۆی پابەندی بە سونەتەکانەوە سەرکوت کراون یاخود لە ڕێگە لایان داوە. مارکسیەکان دەبێ ئەو ئاگاداریەی مارکس لە "ھەژدەی برۆمێرلویی بناپارت" دا وەکو گوارە لە گوێ بکەن بۆ ئەوەی لە بیری نەکەن. مارکس ئەڵێ:

"تێکڕای سونەتەکانی باوباپیرانی کۆچکردومان مۆتەکە و تارماییە کە بۆ مێشکی زیندووەکان چۆن دروست لە کاتێکدا ئەیانەوێت گۆڕانکاری لە ناو دەرەوەی خۆیاندا بکەن و داھێنەرانە شتێکی تازە بخولقێنن، بەڵێ لەم ساتەوەختی قەیرانی شۆڕشگێڕانەدایە کە ئارەزوومەندانە دەستەو دامێنی رۆحی مردووەکانیان ئەبن و ناو و دروشمەکانی بەرەنگاربوونەوەیان لێ وەرئەگرن، تا سەرلەنوێ دیمەنی نوێی مێژووی جیھان بەو دیکۆرە کۆنە برازێننەوە و ھەر بەو زمانە کۆنەش لەم شانۆیەدا قسە بکەن"

تەکنیك و ھونەری شۆڕش لەوەدایە ئەوەی عەقڵ و زانست نایبینن، ببینێت. بۆ تێکشکانی ئەم سنورانە و بۆ پەرەپێدانی عەقڵ تا

داماتوویەکی دوور، ئێمە پێویستمان بە شوور و غەریزە هەیە، ئەو هەستەی کە لە قووڵایی دڵی مرۆڤ دێتە دەرەوەو ناکرێ لە هیچ سەردەمێکدا بە درێژایی مێژوو، چوارچێوەیەکی بۆ دابنێیت.

هەر بۆیە لە ١٩٦١دا، هێربرت رید، دوای بەشداریکردنی لە خۆپیشاندانێکی مەدەنی دژ بە خستنە ئاوەوەی ژێر دەریایی ئاوەکی پۆلاریس لە لەندەن ئاوا دێتە ئاخافتن: "ئەم لەمپەرە دەبێ لابچێت، بەڵام ئەمە کاری عەقڵ نییە. هەردولا بەڵگەیەکی زۆری ڕاستیان بۆ کردەوە ناڕاستەکانیان لەلایە. ئەم دۆخە تەنیا بە کردارێکی غەریزی دەگۆڕدرێت. بانگهێشتن بۆ نافەرمانی و سەرکێشی کردارێکی جەمعی و غەریزیە و دەبێ هەرواش بێت. هەڵچوونی غەریزەکانی مرۆڤ دژی هەڕەشەی لەناوبردنی گشتییە. هەرچەند یاری کردن بە غەریزەکان جێگەی مەترسییە بەڵام هەر بەم دەلیلە لە باروئۆخی ئا هومێدیو ڕەشی ئێستادا، ئەبێ ئێمە غەریزەکان بجووڵێنین. دەبێ خەیاڵی خەڵك بەرفراوان بکەین تا لەو چارەنووسەی هەڕەشەی مردنیان لێ دەکا، ئاگاداریان بکەینەوە. بۆ گەیشتن بەم ئارمانجەش دەبێ بەکردەوە بیسەلمێنین لە ڕێگەی قوربانی کردنی گیان و ماڵمان بەبێ ترس ئەم ئاسایشە تێك ئەدەین تا لە کۆتاییدا مرۆڤایەتی لە دەرد و ئازار و مەرگی بە کۆمەڵ ڕزگار بکەین بۆ هەتاهەتایە".

ئانارشیزم باش ئەزانێت کە بۆ گەیشتن بە ترۆپکی ئازادی لەزەت بردن لە ژیاندا، گۆڕانکاری لە هەموو بوارەکانی کولتووری و ئابووری و رامیاری پێویستە. بەڵام لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئەم گۆڕانکاریە دەبێ هەر لە ئێستاوە دەست پێ بکات. لە پەیوەندییە هەنووکەییەکانی نێوان مرۆڤەکان کە زۆرترین کۆنترۆڵمان بەسەریاندا هەیە. ئانارشیزم دەزانێت کە ئێمە پێویستمان بە بیرکردنەوەی عاقڵانە هەیە، بەڵام نیازمان بەوەش هەیە ئەم بیرۆکە عیلمی و ئینتزاعیەش بە کردەوە ■ پراکتیکدا روونی بکەینەوە و دایبەزێنین.

هێربرت رید لە نامیلکەی "دەربارەی ئازادی" دا ئەڵێ:

ئێمە نیازمان بە بازاڕی ڕەشی کولتور هەیە، بۆ ئەوەی بە ئیرادەیەکی گەورەوە خۆمان لە پێگە عیلمی و جامعە (زانکۆ) و بەهاو تیوریە وشك و کڵێشەیەکانیان لەبارەی هونەر و ئەدەبەوە بپارێزین. ئەمەش بۆ ئەوە نیە ئەم کاڵا هونەریانە و مەعنویانە لە ڕێگەی کەنیسە و دەوڵەت و چاپەمەنی و میدیاکان بازرگانی پێوە بکەین بەڵکو بۆ ئەوەیە لە قاچاخ ڕێوە بیانهێنین" بەم جۆرەش یەکەم کاڵای قاچاخ ئەو ئەدەبیاتەیە، کە بە پێچەوانەی هەموو درۆ و دەلەسەیەك لە ئەندێشە و ئاوات و خەونەکانی ئانارشیزم بەشێوەیەکی ڕاستەقینە ئەدوێت.

**پەراوێزەکان:**

١-*JEAN PAVEL MARAT* لە ڕێبەرانی شۆڕشی فەرەنسا (١٧٤٣-١٧٩٣).

*MARQUISDE SADE* ڕۆمانتوسی فەرانساوی (١٧٤٠-١٨١٤)

٢-*EXPLOSION* وشەیەکی لاتینیە بە مانای تەقینەوەیە بەڵام لێرەدا بە مانای شۆڕش و یاخیبوون هاتووە.

٣-*DIGGERS* گروپی مساوات مللی کە لە ١٦٤٩ لە ئینگلیس بۆ ماوەیەك پەرەی سەند لە دژی مالکیت خصوص "زەویە گشتییەکانی" ئەو وڵاتەیان داگیر کرد.

**سەرچاوە:**

کتێبی (سیاست و هزر شاعرانە).

# شانشینی عەرەبستانی سعودییە لە ئاوێنەی ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوادا

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

## بەشی دووەم

"جێل کێبیل" یەکێکە لە پسپۆڕە گەورەکانی بواری توێژینەوە لەسەر بزوتنەوە فێندەمێنتالیزمەکان لە جیهانی عەرەبیدا، بەتایبەتی بزوتنەوەکانی بەشی ڕۆژهەڵاتی جیهانی عەرەبی. هەر لە سەردەمی گەنجییەوە دەستیکردووە بە توێژینەوە دەربارەی ئەم بزوتنەوانە، لە میسر خوێندویەتی و سوریاو لوبنانیش گەڕاوە. یەکەم کتێبی گرنگی بریتییە لە کتێبی (پێغەمبەرو فیرعەون، زادگای بزوتنەوە فێندەمێنتالیزمەکان)، تێیدا باس لە بزوتنەوەی ئیخوان موسلمین لە میسرو ئەو گروپو تاقمە توندڕەوانە دەکات کە لە ئیخوان جیابونەتەوە، وەك تاقمی جیهادو ئەوانی تر. پاشان دەستدەکات بە توێژینەوە دەربارەی درێژبونەوەی ئەم بزوتنەوانە بۆ ناو خودی ئەورووپاو بەتایبەتی فەرەنسا. لەمبارەیەوە کتێبە ناسراوەکەی (گەڕەکەکانی ئیسلام، لەدایکبونی ئاینێکی تازە لە فەرەنسا) بڵاودەکاتەوە، بێگومان ئەو ئاینە تازەیە ئیسلامە. ئاشکرایە گەڕەکەکانی دەوروبەری شارە گەورەکانی وەك پاریس و لیۆن و مارسیلیا و ئەوانی تیکە، ڕەوەندێکی عەرەبی و ئیسلامی گەورەیان لەخۆگرتووە. ئەو ڕەوەندانە بەتەواوی لە فەرەنسا جێگیربوون و چیتر ناگەڕێنەوە بۆ وڵاتانی خۆیان جەزائیرو مەغریب و تونس...هتد. لەبەر ئەم هۆیەیە لە فەرەنسادا دوای ئاینی مەسیحی لە نوسخە کاسۆلیکیەکەیدا، ئیسلام بووەتە ئاینی دووەم. پێنج ملیۆن موسڵمان لە فەرەنسادا هەیەو هەندێك دەڵێن شەش ملیۆنە. بەدوایانە بەهۆی کێشەی کۆمەڵایەتی و هەژاری و بێکارییەکی

لەڕادەبەدەر، پەشێوی و بارگرژییەکی گەورە کەوتە ناو ئەم گەڕەکانەوە.

"جێل کێبیل" ساڵی ٢٠٠ کتێبە گەورەکەی بەناونیشانی (جیهاد: فراوانبوونی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی و ئاوابونی و لەناوچونی) بڵاوکردەوە، ئەم کتێبە ڕاستەوخۆ دوای بڵاوبونەوەی وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئینگلیزی و زمانەکانی دیکەش. پاشان کتێبە تازەکەی (فیتنە، جەنگ لەناوجەرگەی ئیسلامدا)ی بڵاوکردەوە، ئەم کتێبە پێش ماوەیەك لەمەوبەر بڵاوکراوەتەوە و لە بڵاوکراوەکانی (گالیمارە) لە پاریس. دەکرێ ئەم کتێبە تازەیەی دانەر بە درێژکراوەی کتێبەکەی پێشوی (جیهاد: فراوانبونی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی و ئاوابونی و لەناوچونی) دابنێین و لەهەمانکاتدا دەکرێ بە تێپەڕاندنی هەمان کتێبی دابنێین. ئەم پیاوە بە حوکمی زەمەن و پسپۆڕییە زۆرەکەی و سەفەرکردنی بەردەوامی بۆ وڵاتانی عەرەبی و پاشان بە حوکمی ئەوەی سەرپەرشتی تێزی ئەو خوێندکارە عەرەبانە دەکات کە لە پەیمانگای زانستی سیاسەت لە پاریس دکتۆرا دەخوێنن و خۆشی مامۆستای ئەو پەیمانگایەیە و بەدیاریکراوی سەرپەرشتیاری بەشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە و سەرپەرشتیاری ئەو لێکۆڵینەوانەیە لەسەر جیهانی عەرەبی و ئیسلامی ئەنجامدەدرێن. بەحوکمی هەمو ئەوانە تایبەت زانیارییەکانی دەربارەی بزوتنەوە فێندەمێنتالیزمەکان زیاترو قوڵتر دەبێت.

گومانی تێدا نییە ئەم کتێبە تازەیەی دانەر ڕوداوێکی فیکری گرنگە و لە میدیاکانی ڕاگەیاندن و شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە ستایشێکی زۆری کرا، ئەم کتێبە لەبەرئەوەی لەم کەشوهەوایەی ئێستادا باس لە بابەتێکی مەترسیدارو هەستیار دەکات، بۆیە چاوەڕوان دەکرێ پیاوانی سیاسەتمەدارو ڕۆشنبیران و بڕیاربەدەستەکان زۆر بە وردی بیخوێننەوە. ئەو بابەتەی کتێبەکە باسی لێوەدەکات و جیهان هەموی پێیەوە سەرقاڵە، بریتییە لە بابەتی: ئیسلام و ڕۆژئاوا، ململانێی شارستانییەتەکان، کێشەکانی تیرۆر، ململانێی نێوان فەلەستین- ئیسرائیل، یاخود ململانێی نێوان فەلەستین و گۆنزەرڤاتیفە تازەکان، هەوڵی ئیسرائیل بۆ دەستگرتن بەسەر ناوچەکەدا بە زەبری هێزو سەرەڕۆیی، چارەنوسی عێراق یان چارەنوسی "بن لادن" و قاعیدە، پاشان چارەنوسی پەیوەندییەکانی ئەمریکا- سعودییە کە لە دوای ١١ سێپتێمبەرەوە توشی لەرزینێکی مەترسیدار هاتووە. "جێل کێبیل" بەیەکجار باس لە هەموو ئەو بابەتانە دەکات و بەیەکتریانەوە دەبەستێتەوە، چونکە ناکرێ لە یەکێکیان تێبگەین بەبێ تێگەشتن لە فاکتەرەکانی دیکە. دانەر تێزە گەورەکەی لەم کتێبەدا ڕوندەکاتەوە و دەڵێ: مێژوی کۆمەڵگا ئیسلامییەکان بە درێژایی ئەم ١٤ سەدەیەی ڕابردوو، بریتییە لە ململانێی نێوان دوو بەرەی دژ بەیەك: بەرەی جیهادو بەرەی فیتنە. ئەم کۆمەڵگایانە بەردەوام لەنێوان ئەم دووبەرەیەدا هاتون و چوون. بێگومان چەمکی جیهاد لە تێڕوانینی ڕۆشنبیری تەقلیدی ئیسلامدا چەمکێکی پۆزەتیڤە. جیهاد مانای ئەو توانایەیە کە پێویستە هەموو ئیماندارێکی موسڵمان بیخاتەگەڕ لەپێناو فراوانکردنی چوارچێوەی ئەم ئاینە، تاکو ڕۆژێ لە ڕۆژان سەرجەم مرۆڤایەتی دەگرێتەوە و گەر بکرێ هەموو مرۆڤایەتی ملکەچی یاسا ئەبەدییەکانی قورئان بکات. بڵاوبونەوەی پێشتری ئاینی ئیسلام لەیەککاتدا لە ڕێگەی شمشێرو قەناعەتپێکردنەوە بووە، وەلێ تاکو ئێستا چواریەکی مرۆڤایەتی لەدەرەوەی ئەم ئاینەیە،

لێرەوە پێویستە هەوڵ و توانایەکی زۆر زیاتر بخرێتەگەڕ تاکو ئەو بەشەی دیکەی مرۆڤایەتی درەنگ یان زوو بێنەسەر ئەم ئاینە. لە تێڕوانینی فێندەمێنتالیستەکاندا ئەم ئاینە تاقە ئاینی حەقەو هەمو ئاینەکانی دیکە باتڵن. هەمو ئاینەکانی دیکە هیچ مانایەکیان نییە، چونکە لایانداوە یاخود ناتەواون یان هەڵەن...هتد

هەرچی چەمکی دووەمە، واتە چەمکی فیتنە، مانای ئەو یاخیبون و ڕاپەڕینانە دەگەیەنێ کە ڕەنگە لەناوجەرگەی ئیسلامدا یان لەناوەوەی ئیسلام خۆیدا ڕوبدات. لێرەوە ئەم چەمکە چەمکێکی نێگەتیڤە، چونکە لەوانەیە ببێتە هۆی دوولەتبون و جیابونەوەی موسڵمانەکان لەیەکترو بەرپاکردنی جەنگی ناوخۆ لەدژی یەکترو ڕەنگە دواجاریش ببێتە هۆی وێرانبونیان. دواتر "جێل کێبیل" بەردەوام دەبێ و دەڵێ: لەبەر ئەوە زانا گەورەکان، واتە فوقەهاکان، هەمیشە سڵیان لە فیتنە کردۆتەوەو زیاد لەجارێك هۆشداریان لەسەر داوە. ئاشکرایە فیتنە پێشتر لەنێوان "عەلی" و "معاوییە" ڕویداوەو بووە هۆی دابەشبونی ئیسلام بۆ دوو بەشی گەورەی سونی و شیعی. بەڵام لە ئێستادا ئیسلام ڕوبەڕوی فیتنەیەکی دیکە دەبێتەوە کە هیچی لەو فیتنەیەی یەکەمجار کەمتر نییە کە لەسەرەتادا ڕوبەڕوی بوەوە. ئەوە کێیە تۆوی ئەم فیتنەیەی چاندووە یاخود هۆکارەکەی کێیە؟ ئەوە بزوتنەوە فێندەمێنتالیزمە ڕادیکاڵەکانن کە دەیانەوێ هەموو موسڵمانان لە جەنگێکی سەرتاپاگیر لەگەڵ ڕۆژئاوا تێوە بگلێنن. ئەویش لەمیانەی لێدانەکەی ۱۱ سێپتێمبەرو ۱۱ مارس لە مەدریدو لێدانەکەی لەندەن و تەقینەوە زۆرەکانی دیکە کە ڕویانداوەو لە داهاتوشدا ڕودەدەن.

"جێل کێبیل" پێیوایە، (ئەمە تێزی دووەمیەتی لەم کتێبەیدا) "بن لادن" و "زەواهیری" و "زەرقاوی" و ئەوانی دیکە، هەستیان بە نائومێدی و ناڕەحەتی کردووە، چونکە جیهاد دژ بە دوژمنە نزیکەکە، واتە حاکمە عەرەبەکان، نە بەرهەمی هەبوو نە ئەو ئامانجانەی بەدیهێنا کە خوازیاربوون. چاوەڕوانی ئەوە دەکرا ڕژێمی "حوسنی موبارەك" دوای ئەوەی لە نەوەدەکانداو لەسەر دەستی تاقمی جیهاد چەندین گورزی بەئازاری بەرکەوت، بڕوخێ. تەنانەت ئەو تاقمە هەوڵیاندا "حوسنی موبارەك" لە ئەسیوبیا تیرۆربکەن، بەڵام شکستیان هێنا و دواجار ڕژێمی میسری بە خۆڕاگری مایەوە. هەروەها لە ڕوخاندنی ڕژێمی جەزائیرو سوریا و تونس..هتد شکستیان هێنا و نەیانتوانی جەماوەری عەرەبی و ئیسلامی بەشێوەیەکی تەواو لەدوای خۆیانەوە کۆبکەنەوە. لەبەر ئەوە بڕیاریاندا لێدانە گەورەکەی خۆیان ئاراستەی دەرەوە بکەن، لێدانێك ئاراستەی دوژمنە هەرە دوورەکە بکەن، واتە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەویش کارەساتەکەی ۱۱ سێپتێمبەر بوو، ئەم کارەساتە دوای شکستهێنانی ئۆسلۆو دەستپێکردنی کردەوە خۆکوژییەکانی حەماس و جیهاد دژ بە هاوڵاتیانی مەدەنی لەناو شارەکانی ئیسرائیلدا ڕویدا. لەبەرئەوە دەکرێ ۱۱ سێپتێمبەر بە درێژکراوەی ئەو کردەوە خۆکوژیانە دابنێین، بەڵام بێگومان لە چوارچێوەیەکی زۆر بەرفراوانتردا. لەو سەروبەندەدا بە هۆی ئەنجامدانی کارە دڕندانەییەکانی "ئێرل شارۆن" لەپێناو سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی دووەمی فەلەستینیەکان، جیهانی عەرەبی خرۆشابوون. بۆیە "بن لادن" لەو بڕوایەدابوو لێدانەکەی ۱۱ سێپتێمبەر ئەو هیوایەی بۆ دێنێتەدی کە

بریتییە لە کۆکردنەوەی هەموو موسڵمانەکان لەدەورەی خۆی، تاکو جەنگی یەکلایکەرەوەی دژ بە ئەمریکاو ڕۆژئاوا بەگشتی بەرپابکات.

دانەری کتێبەکە دەڵێ دامەزرێنەری سەرەکی قاعیدە "بن لادن" نییە، بەڵکو "ئەیمەن زەواهیری"یە کە لە ڕووی فیکری و زانستییەوە لە "بن لادن" بەتواناترو بەهێزترەو هەردوو زاراوەی دوژمنی نزیک و دوژمنی دوور لە داهێنانەکانی "زەواهیری"ن، ئەم دوو زاراوەیە لە کتێبەکەیدا (سوارچاکان لەژێر ئاڵای پێغەمبەردا) هاتووە. بەڵام کێشەکە ئەوەیە لێدانەکەی ١١ سێپتێمبەر، پاشان ١١ مارس لە مەدریدو ئینجا لێدانە یەسوێکەی لەندەن، موسڵمانانی بۆ دوو بەش دابەشکرد: بەشێکیان لەگەڵ "بن لادن"و توندڕەوە ڕادیکاڵەکانن، بەشەکەی دیکەمیان بەشێکی میانڕەوی عەقڵانین، گوێ بۆ بیروڕاکانی شێخ "یوسف قەرەزاوی" ئەستێرەکەی کەناڵی جەزیرەو شێخی ئەزهەرو فوقەها گەورەکانی دیکەی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی، دەگرن. ئەم بەشەی دواییان بەم کردەوە دەرەکیانە ڕازینین، بگرە بەوپەڕی ڕاشکاوییەوە ئیدانەیان کردووە. دروست ئائەمەیە فیتنەو "بن لادن"یش بەرپرسییەتی، چونکە ئەو موسڵمانانی لە جەنگێکەوە گلاندووە نەک تەنها دژ بە ئەمریکایە، بەڵکو جەنگێکە دژ بە هەموو جیهانە. وەلێ وەك دانەری کتێبەکە دەڵێ کێشەکە ئەوەیە فێندەمێنتالیستە ڕادیکاڵەکان وەك ئێمە بیرناکەنەوە. بەڵکو ئەوانە خەڵکانێکن عەقڵیان لەدەستداوەو لەو بڕوایەدان بەڕاستی ئیسلام هەموو ئەورووپاو ئەمریکا داگیردەکات و ئاڵای ئیسلام لەسەر کۆشکی ئەلیزێ و داونگ ستریت و کۆشکی سپی دەشەکێتەوە! بگرە ڕۆژێ لە ڕۆژان تەنانەت ڕوسیاو هندو چینیش ڕادەماڵێ... لێرەوە ئەوانە خەڵکانێکی

سەرکێشن و قەبارەی ئەو مەترسییە نازانن کە ڕووبەڕووی خۆیان و موسڵمانانی دەکەنەوە. لەبەر ئەوەیە زانا موسڵمانەکان وەك شێخی ئەزهەرو ئەوانیتر زۆر بەڕوون و ئاشکرایی ئیدانەی لێدانەکەی ١١ سێپتێمبەرو ئەوانەی دواتریشیان کرد.

لێرەدا ئێمە تێبینی ئەوەدەکەین دانەر بەرپرسیارەتی تێکچوونی بارودۆخی ئێستا، لەیەککاتدا دەخاتە ئەستۆی فێندەمێنتالیستە ڕادیکاڵەکان و کۆنزەرڤاتیفە تازەکان. ئەمریکاش بەشێکی گەورەی بەرپرسیارەتیەکەی دەکەوێتە ئەستۆ، چونکە ئەوە ئەمریکا بوو ئیمازی دایە "شارۆن" ڕێکەوتننامەی ئۆسلۆ پێشێل بکات و "عەرەفات" بەبێ ئەوەی ئاگای لێبێ لە ڕاپەڕینەوە گلا. مەبەست لەو قسانەی سەرەوە ئەوەیە کۆنزەرڤاتیفە تازەکان لەسەرووی هەموویانەوە "ریچارد بیرل" سوکایەتیان بە "شەمعون پێرێز"و پارتی کرێکارانی ئیسرائیل دەکرد، چونکە ئەوان لایەنگری ئۆسلۆ بوون، ئەم کۆنزەرڤاتیفە تازانە هانی پارتی لیکودو توندڕەوە ئیسرائیلیەکانیان دەدا گورزێك لە پرۆسەی ئاشتی بوەشێنن، بۆیە پێشنیاری ئەوەیان کرد کە پێویستە دروشمەکە زەوی بەرامبەر ئاشتی نەبێت، بەڵکو ئاشتی بەرامبەر بە ئاشتی بێت!. لێرەوە ئەو کۆنزەرڤاتیفە تازانەی ئەمریکا ئیمازیان دایە "شارۆن" سەردانی مزگەوتی ئەقسا بکات، تاکو "عەرەفات" پەرچەکردارێکی توند بنوێنێت و لە ڕاپەڕینە چەکدارییەکەوە تێوەبگلێ. ئیدی ئەوکات دەتوانن "عەرەفات" تۆمەتبار بکەن بەوەی کەسێکی دووڕووەو پیاوی ئاشتی نییە، هەر ئەمەش بوو ڕوویدا. لێرەوە "عەرەفات" کەوتە ناو ئەو تەڵەیەی لەلایەن کۆنزەرڤاتیفە تازەکان و "شارۆن"ەوە، بۆی نرابووەوە.

"عەرەفات" لەو بڕوایەدابوو ڕێکخستنی کردەوە چەکدارییەکان بەشێوەیەکی ڕێک‌وپێک‌و پلەپلەو حساب بۆکراو، پێگەی لە دانوسانەکانی لەگەڵ ئیسرائیلدا بەهێزدەکات. ئیدی "عەرەفات" لە ترسی ئەوەی نەبادا حەماس بە ناپاک تۆمەتباری بکات، هەڵوێستێکی توندی وەرگرت‌و لە ڕۆحی ئۆسلۆ دوورکەوتەوەو پشتگیری ئەو کردەوانەی دەکرد کە ڕاپەڕین پێیهەڵدەسا. بەڵام لەهەمان کاتدا پشتی بۆ ئیسرائیل‌و ئەمریکییەکان ئاشکرابوو، ئیسرائیل‌و ئەمریکییەکان لەناوەندە نێودەوڵەتییەکاندا دەستیان کرد بە ناشیرینکردنی وێنەی "عەرەفات" بەو پێودانگەی پیاوی توندوتیژی‌و تیرۆرە، نەک پیاوی ئاشتی، وەک ئەوەی لە دوای ئۆسلۆوە دەیەوێ خۆی واپیشانبدات‌و وێنەی خۆی لە ڕۆژئاوا جوانبکات. بەم شێوەیە ئیسرائیلییەکان توانیان "عەرەفات" گەمارۆبدەن‌و لە (رام الله) کەنارگیری بکەن، ئەمە دوای ئەوە دێت "عەرەفات" سەفەری زۆری بۆ دەرەوە دەکردو لە پایتەختەکانی ڕۆژئاوا وەک سەرۆکی دەوڵەت پێشوازی لێدەکرا! لە ڕاستیدا "عەرەفات" خۆی لەنێوان دوو ئاگردا بینییەوە: ئاگری حەماس‌و ئاگری ئیسرائیل‌و ئەمریکا، ئیدی نەیدەزانی چی بکات.

دواتر "جێل کێبیل" لە کتێبەکەیدا بەشێکی گەورە بۆ دورگەی عەرەبی یاخود ڕاستتر بۆ شانشینی عەرەبی سعودییە لەژێر ئەم ناونیشانە: (سعودییە لە چاوی باوبۆرانەوە) تەرخاندەکات‌و تێیدا دەڵێ: دوای تێپەڕبونی چەند ڕۆژێکی کەم بەسەر ڕوداوەکەی ۱۱ سێپتێمبەردا، بۆ هەموو جیهان ئاشکرابوو لەو ۱۹ تیرۆرستەی ۱۱ سێپتێمبەریان ئەنجامدا، ۱۵ تیرۆریستیان ڕەگەزنامەی سعودییەیان هەبووە. لێرەوە شتێکی زۆر سەیر ڕویدا، شتێک هیچ کەسێ گوێی لێ نەبوو، ئەویش بریتی بوو لەوەی لەژێر تاریکی نیوەشەودا ۱٤۰ کەس کە سەر بە "ئال سعود" و "ئال بن لادن" بوون، دەستبەجێ لە ئەمریکاوە ناردرانەوە بۆ سعودییە. لەکاتێکدا ئاسمانی ئەمریکا بەڕوی هەموو فڕۆکەیەکدا بەتەواوی داخرابوو، کەچی لەوکاتەدا چەند فڕۆکەیەکی تایبەت ئەرکی ناردنەوەی ئەو کەسانەیان جێبەجێکرد. دوای تێپەڕبونی دوو ساڵ بەسەر ئەم ناردنەوەیەدا، کاتێ ڕۆژنامەکانی ئەمریکا بە مەسەلەکەیان زانی، زۆر توڕەبوون‌و پرسیان بۆچی ئەو کەسانە بەم شێوە زۆر تایبەتە مامەڵەیان لەگەڵدا کراوەو کەسێک نەبووە بیانپشکنێت یاخود لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات؟ باشە لەوکاتەدا گەلی ئەمریکی بەهۆی سعودییەکانەوە هەر هەموویان لەحاڵەتی پرسەو ماتەمینیدا نەبوون؟

دواتر پاش تێپەڕبونی دوو ساڵ بەسەر ڕوداوی ۱۱ سێپتێمبەردا، ڕاپۆرتێکی کۆنگرێس لەسەر ۱۱ سێپتێمبەر بڵاودەکرێتەوە، لەو ڕاپۆرتەدا ۲۸ لاپەڕەی سپی هەیە، گوایە ئەو لاپەڕانە تەواو نەهێنین. بۆچی؟ پڕوپاگەندەکان دەڵێن ئەو لاپەڕە سپیانە دەیسەلمێنن سعودییە لەو ڕوداوەوە تێوەگلاوە. لێرەوە بڵاوکردنەوەیان دەبێتە هۆی لێدانی پەیوەندییەکانی نێوان ئەمریکاو سعودییە کە زیاد لە ۵۰ ساڵە بەهێزترین پەیوەندییە لەناوچەکەدا. بۆیە ناکرێ ئەو پەیوەندییە تێکبدرێ یاخود هەڕەشەی لێبکرێ، چونکە ئەو بەرژەوەندییە ئابوری‌و ستراتیجی‌و نەوتییانەی لەسەر ئەو پەیوەندییە دامەزراون، هێجگار گەورەیە، بگرە زۆر لە گەورە گەورەترە.

"جێل کێبیل" بەردەوام دەبێ‌و دەڵێ: کاتێ باڵیۆزی سعودییە لە ئەمریکا "بەندەر بن سوڵتان" گوێبیستی ئەو پڕوپاگەندانە دەبێ،

شێت و هاردەبێ و داوادەکات ئەو لاپەڕە تهێنیانە بڵاوبکرێنەوە، تاکو بزانێ چۆن و بە چ شێوەیەك بەرگریکردنەکانی ڕێکبخات، وەلێ سەرۆك "بۆش" بەوە ڕازی نابێت. ئاشکرایە "بەندەر بن سوڵتان" عەمیدی سلکی دیبلۆماسییە لە واشنتۆن، چونکە ساڵانێکی درێژە ئەو پۆستەی داگیرکردووە، بەم دواییانە ئەو پۆستەی بەجێهێشت. هەروەها ئەو هاوڕێیەکی شەخسی "بۆشی باوکە" و هاوڕێی پاوشکاریەتی. لێرەوە پەیوەندییە دارایی و شەخسی و نەوتییەکانی نێوان "ئال بۆش" و "ئال سعود" بۆ هیچ کەسێ شاراوە نییە. مەسەلەکە هەرچۆنێك بێت، لێدانەکەی ١١ سێپتێمبەر تیشکی خستە سەر پەیوەندییە غەریبەکەی نێوان سعودییە و ئەمریکا، ئەو پەیوەندییە پێدەچێ لەیەککاتدا پەیوەندییەکی عەقڵانی و ناعەقڵانی یاخود نامەنتقی بێت. ئاخۆ دەبێ چ پەیوەندییەك لەنێوان وڵاتێکی تەواو داخراو یاخود وڵاتێکی سەر بە سەدەکانی ناوەڕاستی وەك سعودییە، لەگەڵ وڵاتێکی کراوەی دیموکراتی وەك ئەمریکادا هەبێ؟ ئەی ئەم چیرۆکی خۆشەویستییە چۆن ڕوویدا کە هەمو عەقڵ یان مەنتقێکی تێپەڕاندووە؟

"جێل کێبیل" ئاوا وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە: دەبێ ئەوە بزانین ئەم پەیوەندییە لە ١٤ شوباتی ساڵی ١٩٤٥ دەستی پێکردووە، لەو کاتەدا سەرۆك "فرانکلین ڕۆزفێلت" و شا "عەبدولعەزیز" لەسەر کەشتی جەنگی ئەمریکی (کوانسی) کە لە دەریای سور لەنگەری گرتبوو، ئەو پەیوەندییەیان مۆرکرد. لەو کاتەدا شا "عەبدولعەزیز" وەبەرهێنانی نەوتی سعودییەی بەخشییە کۆمپانیاکانی ئەمریکا، لەبەرامبەردا ئەمریکا شانشینی سعودییە لە هەمو هەڕەشەیەکی دەرەکی دەپارێزێت، هەر ئەوکات ئەمریکا وەك (عەرابێك) بۆ سعودییە شوێنی ئینگلتەرەی گرتەوە. لێرەوە ئەوە ژنهێنانێك بوو لەسەر بنەمای عەقڵ و بەرژەوەندی، نەك ژنهێنانێك لەسەر بنەمای هەست و سۆزداری یاخود خۆشەویستی بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پەیوەندییە توانیویەتی لەوکاتەوە تاکو ڕۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامبێت، یان ڕاستتر توانیویەتی تاکو ١١ی سێپتێمبەر بەردەوامبێت. لەڕاستیدا دوای ئەو لێدانە چیتر دڵ و دەروونەکان لەبەرامبەر یەکتردا بە پاك و بێگەردی نەماونەتەوە، گەرچی ڕواڵەتە ڕوکەش و موجامەلەکان هێشتا هەر بەردەوامن.

لەڕووەوە چاوەڕوان دەکرا ئەم پەیوەندییە دژ بە عەقڵ و مەنتیقە لەبەر دوو هۆکاری بنەڕەتی تێکبچێت: یەکەمیان باڵادەستی وەهابیەتی توندڕەوە لە سعودییە، دووەمیان پشتگیریکردنی ئەمریکایە بۆ ئیسرائیل بەبێ هیچ مەرجێك. وەلێ پەرجووە ڕاستەقینەکە ئەوەیە، سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا، بەدرێژایی ٥٠ ساڵە توانیویەتی لەیەککاتدا پارێزگاری لە پەیوەندییە تایبەتەکانی لەگەڵ سعودییە و ئیسرائیلدا بکات و ئاگرو ئاوی لەیەك دەستدا کۆکردووەتەوە. بێگومان لەمیانەی ئەو چەندین ساڵە دوورودرێژەدا، کەلێنی مەترسیدار کەوتووەتە ناو ئەو پەیوەندییەوە، بەڵام لە هەمو جارەکاندا پیاوانی ئاگرکوژێنەوەی هەردوولا، هەستاون بە هێورکردنەوەی مەسەلەکان و ئاگرەکەیان کوژاندووەتەوە، چونکە بەرژەوەندییەکان هێجگار گەورەن و ناکرێ دەستبەرداریان بین. بەڵام دوای ١١ سێپتێمبەر مانەوەی ئەو پەیوەندییە بەو شێوەیە مەحاڵە. ئەمریکا چیتر ناتوانێ لەیەك کاتدا پارێزگاری لە پترۆل و ئیسرائیل بکات، پێویستە لەسەری یەکێکیان هەڵبژێرێ. ئەمریکا بە ئیعازی کۆنزەرڤاتیفە تازەکان کە زۆربەیان

جوولەکەن، ئیسرائیلی هەڵبژارد. لێرەوە بۆ ئەوەی ئەمریکا بتوانێ تاڕادەیەکی زۆر دەستبەرداری نەوتی سعودییە ببێت، داگیرکردنی عێراق ڕوویدا. بەڵام پەیوەندی نێوان ئەمریکاو سعودییە هێشتا نەگەشتووەتە ڕادەی دابڕانی تەواوەتی. پەیوەندی دۆستانە، لانی کەم لە ڕواڵەتدا، هێشتا لەنێوان ئەم دوو وڵاتەدا بەردەوامەو نەوتی سعودیی لە ئەمریکا نەپچڕاوە. وەلێ ئاخۆ ئەمریکا تاکو چەندی دیکە دەتوانێ هەردوو لایەنی ئەم هاوکێشە مەحاڵە پێکەوە کۆکاتەوە: نەوتی سعودییەو پشتگیریکردنی ئیسرائیل.

دواتر "جێل کێبیل" دەستدەکات بە توێژینەوەیەکی دوورودرێژ دەربارەی واقعی ناوخۆی شانشینی عەرەبی سعودییەو دەڵێ: بەدرێژایی نیو سەدەی ڕابردوو، بە فەزڵی هاریکاری نێوان کۆمپانیاکانی ئەمریکاو بنەماڵەی سعودییە، سەروەت و سامانێکی هێجگار زۆر کۆکراوەتەوە. تەنها شازادەکان مافی ئەوەیان هەیە بەشی خۆیان پارەی نەوت ببەن، تەنانەت پێش ئەوەی ئەو پارەی نەوتە ڕەوانەی میزانیەی دەوڵەت بکرێت. ئەو پارە زۆرەی شازادەکان دەستی بەسەردا دەگرن و دەیبەن بۆخۆیان، هەرگیز لە هیچ حساباتێکدا دەرناکەوێت، شارەزایان بڕی ئەو پارەیە بە ٥٪ی پارەی نەوت مەزەندە دەکەن، بەڵام ئەو پارەیە ڕاستەوخۆ دەچێتە گیرفانی شازادەکانەوە، ئەویش بەپێی گەورەو بچوکی و پێگەی شازادەکە. بۆ ئەوەی خوێنەر بیرۆکەیەکی سەبارەت بە بڕی ئەو سەروەت و سامانە هەبێت کە بنەماڵەی پاشایەتی لەچاو هەموو دانیشتوانی سعودییەدا هەیانە، هێندە بەسە ئەمەی خوارەوە بڵێین: لە ساڵی ٢٠٠٣ سعودییە ڕۆژانە (٨٨ ٦٦٠ ٠٠٠) هەشتاو هەشت ملیۆن و شەش سەدو شەست هەزار بەرمیل نەوتی بەرهەمهێناوە، نرخی هەر بەرمیلێك ٢٧,٣٩ دۆلاری ئەمریکی بووە، بەڵام ئێستا نرخی بەرمیلێك نەوت گەشتووەتە ٤٢ دۆلار (کاتی بڵاوبونەوەی کتێبەکە).

جگە لەوانە پەیوەندی نێوان کۆمپانییاکانی دروستکردنی چەك و کۆمپانیاکانی ئەشغاڵی گشتی ئەمریکی لەلایەك، لەگەڵ حکومەت و کۆمپانیاکانی سعودییە لەلایەکی ترەوە پەیوەندییەکی زۆر توندوتۆڵە. شانشینی سعودییە چەك لە ئەمریکاو لەڕێگەی سەفقەی زۆر گەورەوە دەکڕێ کە ملیارات دۆلارە. شازادەکانیش ڕێژەیەکی دیاریکراو یان حەقدەستی خۆیان لەو سەفقانە وەردەگرن. لێرەوە ئەو شازادانە دەوڵەمەندییەکەیان بەپێوانە بە دەوڵەمەندی کوڕوکاڵی میللەت، هەر حساب ناکرێ. پەیوەندی نێوان ئەم دوو وڵاتە لەلایەنی هێزو متمانەکردن بەیەکتر، گەشتبووە ئاستێك، حکومەتی ئەمریکا لە هەشتاکاندا و لەپێناو جەنگی ئەفغانستاندا، ڕێگەیدا ناوەندی مەشق و ڕاهێنان لەسەر خاکەکەی بۆ موجاهیدەکان بکاتەوە. ئەوکات بۆ لەناوبردنی کۆمۆنیست، هاوپەیمانییەکی تۆکمەو متمانەپێکراو لەنێوان هەردوو وڵاتدا هەبوو. ئەمریکا ئەوکات نەیدەزانی ئەو موجاهیدانە ڕۆژێ لە ڕۆژان لێی هەڵدەگەڕێنەوەو لێدانێکی وای لێدەدەن بەدرێژایی هەمو مێژوی خۆی شتی وای بەخۆیەوە نەبینیبێ. لەبەر ئەم هۆیە تاڵاوی ئەمریکا بەرامبەر بە سعودییە زۆر گەورەیە، بەتایبەتی دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت زۆرینەی ئەو خۆکوژانەی ناوەندی بازرگانی جیهانی لە نیویۆرك و بەشێك لە پەنتاگۆنیان وێرانکرد، سعودی بوون! ئەمریکییەکان سەرەتا واقیانوڕمابوو، باوەڕیان نەدەکرد. دواتر ئەو ڕاستییە تاڵەیان بۆ دەرکەوت، ئیتر بڕیاریاندا سیاسەتیان لە

بنەڕەتەوە بگۆڕن. بەڵام "بۆش" لەوە دەترسا فشارە زۆرەکەی بۆ سەر سعودییە ببێتە هۆی لەناوچوونی ڕژێمی سعودی و جێگرتنەوەیان بە تاقمەکەی "بن لادن". لەبەر ئەوە ناچاربوو موجامەلەمیان بکات و بێ ویستی خۆی پشتگیرییان بکات. وەلێ گۆنزەرڤاتیفە تازەکان دوای ئەوەی دەستیان لە جەنگی عێراق دەبێتەوە چی دەکەن؟ ئەمە ئەو پرسیارە گەورەیەیە کە خۆی دەخاتەڕوو، هەندێ دەڵێن گرنگی بە ئێران دەدەن، هەندێکی دیکە دەڵێن گرنگی بە سعودییە دەدەن، ڕەنگە گرنگی بەهەردوکیان بدەن.

دواتر دانەر بەردەوام دەبێ و دەڵێ: خاڵێك هەیە ئەمریکا هەرگیز سازشی لەسەر ناکات، ئەویش بریتییە لە گۆڕینی پرۆگرامەکانی خوێندن لە سعودییە بە شێوەیەکی تایبەتی و لە وڵاتانی عەرەبیدا بەشێوەیەکی گشتی. لەبەرئەوەیە وەهابییەت بووەتە دوژمنە هەرە سەرسەختەکەی ڕۆژئاوا. وەهابییەت مەزهەبێکی توندڕەوە، سەختگیرە، بێ بەزەییە. لەکاتێکدا ئەورووپا و ئەمریکا، ڕۆشنگەری و شۆڕشی فەرەنسی و شۆڕشی ئەمریکی و مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە دیموکراتییەکانیان بەخۆیانەوە دەبینی، "محەمەد بن عەبدولوەهاب" کە ساڵی ١٧٩٢ کۆچی دوایی کردووە، سەرقاڵی گەڵاڵەکردنی ئەم مەزهەبە توندڕەوە بووە. دەکرێ بڵێین عەقیدەی وەهابی بە ڕەهایی دژی هەموو بەها ئەورووپییەکانە. بەم مانایە بە فیعلی جەنگی شارستانییەتەکان لەنێوان وەهابییەت و ڕۆشنگەری ڕۆژئاوا لەئارادایە. ئەوانە دوو شتن بەهیچ شێوەیەك بەیەك ناگەن. وەهابییەت دایکی سەلەفییەتە لە جیهانی عەرەبیدا. هەر سەلەفیەتیش بوو "بن لادن" و ئەوانی دیکەشی بەرهەمهێنا. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا تیۆریستە گەورەکەی وەهابییەت "ئەحمەد بن تەمیمە ١٢٦٣–١٣٢٨" بوو. ئەو توندڕەوترین فوقەهای ئیسلامە. سەرۆکی ڕۆحی هەموو بزوتنەوە فێندەمێنتالیزمەکانی ئێستایە. هەیبەت و شان و شکۆی لە سعودییە نە شوێنی مشتومڕە و نە دەستکاری دەکرێ.

ئەوە "ئەحمەد بن تەمیمە"یە دەڵێ پێویستە لە ژیانی ڕۆژانەدا شەریعەتی ئیسلامی بە شێوەیەکی توند پیادەبکرێ. لێرەوە پۆلیسی ئاداب سعودییە کە هەنووکە دەستی خستۆتە بینەقاقاکان، بەشێوەیەك لە شێوەکان ئەوەی ئەون. بەلای ئەو پۆلیسانەوە عەقڵ لەبەردەم دەقدا یاخود لەبەردەم لێکدانەوەی حەرفی دەقدا ڕەتدەکرێتەوە. مرۆڤ ملکەچی دەقە، واتە مرۆڤ بێ هیچ گفتوگۆ و قسەکردنێك ملکەچی دەقی قورئان یان فەرموودە یاخود تەنانەت دەقی "ئەحمەد بن تەمیمە"یە. لێرەوە وەهابییەکان نە دان بە بیرکردنەوە لە دواڕۆژی مرۆڤدا دەنێن نە دان بە توێژینەوەی ڕەخنەگرانە بۆ دەقەکان و عەقیدەکاندا دەنێن. ئەوان بەشێوەیەکی ئالی یان ئۆتۆماتیکی یاساکانی پێغەمبەری خودا جێبەجێدەکەن. باوەڕیان بە پێشکەوتنی مێژوو نییە، بگرە دەیانەوێ مێژوو ملکەچی دەق بێت، نەك دەق ملکەچی ژیان و پێشکەوتنی مێژوویی بێت. بەڵام لەبەرئەوەی دەق پێش ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر دەرکەوتووە، بۆیە ناتوانێ هەموو پێداویستییەکانی کۆمەڵگا عەرەبی و ئیسلامییە هاوچەرخەکان دابینبکات. هەندێ کێشەی تازە، یاخود کۆمەڵێ پێداویستی تازە بۆ کۆمەڵگا و مرۆڤ هاتونەتە ئاراوە، لە سەردەمی پێغەمبەردا یان لە سەردەمی سەلەف سالحدا نەبوون. لێرەوە ئێمە پێویستیمان بە لێکدانەوەی تازە هەیە تاکو لەبەرامبەر ئەو لێکدانەوە کۆنەدا ڕابوەستین. پێویستمان بە عەقڵی مرۆڤایەتی هەیە، تاکو لەژێر ڕۆشنایی پێداویستییە

هاوچەرخەکان و ڕۆشنایی پێشکەوتنی مێژوودا، دەقەکانمان بۆ لێکبداتەوە. بەڵام وەهابییەکان ئەو شتانە ڕەتدەکەنەوەو بانگەشەی ملکەچکردنی ژیان دەکەن بۆ دەق، نەك ملکەچکردنی دەق بۆ ژیان. ئەوان زیاد لەپێویست پابەندی حەرفیانەی دەقن یاخود زیاد لە پێویست ڕوکەشن. لەبەر ئەم هۆیەیە ناکۆکی نێوان وەهابییەت و هەمو جیهان، لە ئێستادا تەقیوەتەوە. جگە لەوە وەهابییەکان کوڕوکاڵی ئاینەکانی دیکە وەك مەسیحییەکان، جولەکە، هندۆس، چینییە کۆنفۆشیۆسییەکان..هتد، بێ ئاوارتەکردن، بە کافردادەنێن. تەنانەت شیعەش بە کافر دادەنێن، چونکە ئینتیمایان بۆ مەزهەبێکی دیکە هەیە، گەرچی شیعەش وەك ئەوان باوەڕیان بە قورئان و "محەمەد" پێغەمبەر هەیە. بگرە تەنانەت مەزهەبە سوننییەکانی دیکەی وەك (حەنەفی) و (شافعی)یش بە کافردادەنێن، چونکە باوەڕیان بە بیروڕاو پێوانەو عەقڵ... هەیە.

ئاشکرایە (ئیخوان)ە وەهابییەکان کە شا "عەبدولعەزیز" بۆ یەککگرتن و یەکخستنی دورگەی عەرەبی بەکاریهێنان یاخود بۆ دەستبەسەراگرتنی دورگەی عەرەبی بەکاریدەهێنان، خوێنی ئەو شیعانەیان حەڵاڵکرد کە لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی شانشینیدا، ناوچەی (الاحساء)دا کۆببونەوە. تەنانەت خوێنی حیجازییەکان و دانیشتوانی شاخەکانی (عەسیر)یشیان حەڵاڵکرد. شا "عەبدولعەزیز" دوای ئەوە هەستیکرد ئەوانە، واتە شیعەکان، شوێنی مەترسین بۆی و، دوای ئەوەی ئینگلیزەکان داوایان لێکرد لەناویان ببات، ناچاربوو لێیانبدات و لە ڕەگ و ڕیشەوە دەریانبێنێ. هەربۆیە کوشت وبڕێکی ترسناك ڕویدا، بەڵام دوای ئەنجامدانی کوشت وبڕەکە، ڕاستەوخۆ ئەو کوشت وبڕە دیزەبەدەرخۆنە کراو شاردرایەوە. لێرەوە داتەر پێیوایە کۆمەڵگای سعودی توشی شیزۆفرینیای کەسێتی بووە. چونکە ناوەڕۆکی عەقیدەی وەهابی بە تەواوی پێچەوانەو دژ بە واقیعی ژیانی ڕۆژانەی وڵاتێکە بەهۆی سەروەت و سامانی نەوتەوە، گۆڕانی هێجگار گەورە لە بواری ئابوری و کۆمەڵایەتی و تەکنەلۆژیدا بەخۆیەوە دەبینێ. لێرەوە لەلایەکەوە عەقیدەیەك هەیە تابڵێی دواکەوتوو، توندڕەو، کۆنەپەرستە، واتە عەقیدەی سەدە تاریکەکانی ناوەڕاستە. لەلایەکی دیکەوە تازەترین جۆری شەقام و فڕۆکەخانەو ئۆتۆمۆبێل و باڵەخانەو ئامێری تەکنەلۆژی هەیە، باشە چۆن دەکرێ ئەم دوانە لەگەڵ یەکتر کۆبکرێنەوە؟ ئایا تەقینەوە ڕونادات؟ ئاخو دەکرێ ئەم ناکۆکییەی نێوان پێشکەوتنی مادیی کە سعودییە بەم دواییانە بەدەستیهێناوە، لەگەڵ عەقڵێکی دواکەوتوو، تا هەتاهەتایە بەردەوامبێت؟ ئێمە لەو بڕوایەداین ئەم ناکۆکییە گەورەو بەرچاوە ناکرێ تا ئەبەد بەردەوامبێت. لێرەوە هیچ چارەیەك نییەو تەقینەوە هەر ڕودەدات، بگرە هەر لەئێستاوە ڕویداوە. ئەوەتا پرۆگرامە دواکەوتووەکانی ئاین بەردەوام لە شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە یاخود لە ڕادیۆکانەوە بڵاودەکرێنەوە، سێیەکی بابەتەکانی فێرکردن لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا بابەتی ئاینین، دواتر لە ناوەندی و ئامادەیدا دەبێتە چارەك، تەنانەت لە خوێندنی زانکۆشدا تێبینی دەکەین بابەتەکانی ئاین لە هەر کۆلیژێك، زانستی بێت یاخود ئەدەبی هەیمەنەی کردووە.

پاشان "جێل کێبیل" باس لەو ئاستەنگانە دەکات ڕوبەڕوی بنەماڵەی حوکمڕان لە سعودییە دەبێتەوەو دەڵێ: دەوڵەتی سعودییە بە درێژایی مێژووەکەی لەلایەن هاوپەیمانییەتی نێوان بنەماڵەی حوکمڕان و بنەماڵەی "ئال

شێخ"، واتە بنەماڵەی وەهابییەت بەڕێوەبراوە. هەر هەموو میللەتیش لە دەرەوەی حوکم بوون و پرس وڕا بەهیچ کەسێ نەکراوە، وەك ئەوەی بوونیان هەر نەبووبێ. ئەم بارودۆخە دوای ١١ سێپتێمبەر، دوای ئەوەی چاوەکان خراونەتە سەر سعودییەو ئایدۆلۆژیا مەترسیدارەکەی، چیتر ناکرێ بەردەوامبێت. لەبەر ئەوەیە وەلی عەهد هەوڵدەدات کۆمەڵێ چاکسازی ئەنجامبدات و، سەبارەت بە کاروباری حوکمڕانی، بیروڕای هەندێ لە بەشەکانی کۆمەڵگای مەدەنی وەربگرێ. لە ئێستادا دوای ئەوەی شا "عەبدوڵلای کوڕی عەبدولعەزیز" بووە پاشای شانشین، هەوڵێك بۆ نزیکبونەوەی فێندەمێنتالیستە میانڕەوەکان لەگەڵ ڕۆشنبیرانی لیبرال یان ڕۆشنبیرانی تازەگەردا هەیە. بۆ یەکەمجارە سەرکردە شیعەکان یاخود ڕۆشنبیرە (عەلمانییەکان) بەشداری کۆبونەوەکان دەکەن، بۆ یەکەمجارە وەك هاوڵاتی دانیان پێدادەنێن. هەروەها دانیان ■ بەو ئیسماعیلیانەی لەناوچەی (نەجران)دان، بەڵام تەنها دانپیانانێکی مەدەنی یان زارەکییە. لە ڕاستیدا ئەم پرۆسەیە پرۆسەیەکی دوورو درێژو سەختەو کاتێکی تابڵێی زۆر دەخایەنێت. ئێمە ئەمە دەڵێین و دەزانین هیچ بەدیلێکی دیکە بۆ ئەو پرۆسەیە لەئارادانییە. فێندەمێنتالیستە تازەکان، یاخود وەك پێیان دەڵێن سەلەفییە تازەکان، ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینن لە نزیکبونەوەی نێوان ڕژێم و میللەت، بۆ نمونە دەکرێ ناوی ئەم سەرکردانە بێنین کە بەو کارە هەڵدەستن "سەلمان ئەلعۆدە" لە ناوچەی (بەریدە)و "سەفەر ئەلحەوالی" لە ناوچەی (عەسیر). ئەو دوانە هەردوکیان دوو سەرکردەی فێندەمێنتالیستی میانڕەون لە سعودییە. لە ڕاستیدا ئەو دوانە پێشتر لە دژی ڕژێمی سعودییە یاخیبوون و بۆ ماوەیەك زیندانی کرابوون، وەلێ لە ئێستادا هاتونەتە پاڵ ڕژێمی سعودییە. ئاشکرایە "سەلمان ئەلعۆدە" بە ڕوونی و ڕاشکاوانە ئیدانەی لێدانەکەی ١١ سێپتێمبەری کرد. لێرەوە سەفەلییە میانڕەوەکان، لەبەرامبەر سەلەفییە ڕادیکاڵە زۆر توندڕەوەکاندا کە شوێنکەوتوانی "بن لادن"ن، زەمانەتێکی ئاینی پێشکەش بە ڕژێم دەکەن، بەم شێوەیە فتنەیەك یاخود ئینشقاقێك لەناو خودی سەلەفییەکاندا هاتووەتەئارا.

لەپاڵ ئەو سەلەفییە میانڕەوانەدا، چەندین ڕۆشنبیری سعودی لیبرال هەیە، گەرچی پێگە جەماوەرییەکەیان زۆر لە پێگە جەماوەرییەکەی فێندەمێنتالیستەکان لاوازترە، بەڵام ئەو ڕۆشنبیرانە نوێنەرایەتی هەندێ ناوەندی زانکۆو ڕۆژنامە سعودییەکان و میدیاکانی ڕاگەیاندن دەکەن، ئەو ڕۆشنبیرانە لەگەڵ ئاقاری ئاینی میانڕەو یاخود عەقڵانی هیوای دواڕۆژن. دوای تەقینەوە تیرۆرستانەکەی شاری ڕیاز، سەرنوسەری ڕۆژنامەی (الوطن) نەترساو وتارێکی لەژێر ناونیشانی (میللەت لە بن تیمیە گرنگترە) نوسی! بەم شێوەیە ڕاستەوخۆ هێرشی کردە سەر بنەماکانی عەقیدەی وەهابییەت. دواتر هەمان ڕۆژنامە نەترساو کاریکاتێرێکی بڵاوکردەوەو تێیدا هاتبوو: ئەوەی تەقینەوەکانی ئەنجامدا تیرۆریستە، ئەوەشی فەتوای بۆ دەرکردبوو ئەویش تیرۆریستە! ئەمە مانای هێرشکردنێکی ڕاستەوخۆیە بۆسەر پیاوانی ئاینی. لەو سەروبەندەدا پیاوانی ئاینی کۆنەپارێز فشاریان خستە سەر وەزیری ناوخۆو داوایانکرد "جەمال خاشقجی"سەرنوسەری ڕۆژنامەی (الوطن) دەست لەکار بکێشێتەوە، ئەوەی ویستیان بۆیان چووەسەرو ناوبراو دوورخرایەوە. بەڵام دواتر بینیمان "جەمال

خاشقجی" سەفەر دەکات بۆ لەندەن و لەوێ لە باڵیۆزخانەی سعودییەو لەلای شازادە "ترکی ئەلفەیسەل"دەبێت بەڕاوێژکار. لێرەوە ڕژێم بۆ ئەوەی خۆی لە تووڕەبوونی پیاوانی ئاینی بپارێزێ، ئەو سەرنوسەرەی دوورخستەوە بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵام لەهەمانکاتدا دەستبەرداری نەبوو.

دواجار "جێل کێبیل" پێیوانە پەیمانی کۆمەڵایەتی پێشوو (واتە هاوپەیمانی نێوان ئال سعودو ئال عەبدولوەهاب) چیتر بەس نییە بۆ حوکمڕانیکردنی سعودییە. لەبەر ئەم هۆیەبوو شازادە "عەبدوڵڵا" لە کۆنگرەیەکدا هەموو پێکهاتەکانی گەلی سعودییەی کۆکردەوەو هەندێ ماف بەخشییە سونەی شافیعی لە هەرێمی حیجاز، هەروەها کۆمەڵێ ماف بەخشییە تەریقەتی سۆفی، پاشان کۆمەڵێ ماف بەخشییە شیعەکانی ناوچەی (الاحساء)، دواتر چەند مافێکی بۆ ئیسماعیلییەکانی (نەجران) دەستەبەرکرد. ئەوانە هەر هەموویان بەدرێژایی حەفتا ساڵ لەژێر سایەی وەهابییەکاندا چەوساابونەوە. واتە هەر لەسەرەتای دامەزراندنی شانشینی عەرەبی سعودییە لەسەر دەستی شا "عەبدولعەزیز" ساڵی ١٩٣٢. لە ڕاستیدا بنەماڵەی حوکمڕان لەو هەڕەشانە ترسا کە لە ناوەندە هەمەجۆرەکانی لەندەن و واشنتۆن و تەل ئەبیبەوە دەکرایە سەری. ئەو هەڕەشانە داوایان لە هەرێمە چەوساوەکان دەکرد لە ڕیازی پایتەختی نەجد جیاببنەوە. هەرێمی (الاحساء)ی شیعی گەر ڕەگەزپەرستی تایفەگەری لەدژی بەردەوامبێت، ئەوا بیر لە جیابونەوە دەکاتەوە. بەهەمان شێوە هەرێمی حیجازیش کە شوێنە پیرۆزەکانی ئیسلامی تێدایە بیر لەجیابونەوە دەکاتەوە. هەروەها هەرێمی (عسیر)یش کە لەتەنیشت یەمەنەوەیە.

لەبەر هەمو ئەو هۆکارانە، وەلی عەهد ڕازیبوو دایەلۆگێکی نیشتیمانی لەنێوان سەرجەم توێژەکانی میللەتدا ئەنجامبدرێ. وەلێ توێژێکی دیکەش هەیە هەڕەشەی تەقاندنەوە دەکات، ئەوانیش بریتین لە توێژی ئافرەتان. ئافرەتانی سعودییە ناتوانن تا ئەبەد بەزیندویی لەگۆڕبنرێن! درەنگ یان زوو داوای مافەکانی خۆیان دەکەن و چیتر ناکرێ ئەو بارودۆخەی کە تێیدان بەردەوامبێت. لێرەوە ململانێی نێوان ئافرەتان و پیاوانی ئاینی کۆنەپەرست و کۆنەپارێز ڕۆژێ لە ڕۆژان دەتەقێتەوە. پێشەنگی ئەو ئافرەتانە شازادە "ڕیم ئەلفەیسەل"و خانمی زۆر دەوڵەمەند "لوبنا عەلیان"ە. ئەوکات ئیدی لە وەهابییەت هیچ نامێنێتەوە تەنها ناوەکەی نەبێت. چونکە ئافرەت نیوەی کۆمەڵەو ڕازینابێ بۆ هەتاهەتایە بە کۆیلەیی و چەوساوەو موحەجەبەیی لە تەوقی سەریەوە تاکو پاژنەی پێی بمێنێتەوە.

سەرچاوە:

www.alawan.com

٢٠٠٧/٩/٢٥

SARDAM No. 57 2008

# ئەنتی یەهوودی، ئوستورەی سیاسی لادان

شیریندوخت دەقیقیان

لە فارسییەوە: دڵشاد خۆشناو

مرۆڤەکان عەقڵیان هەیە، ئایا مێژوویش جۆرێك عەقڵی هەیە؟ ئەمانوئێل کانت لە دەربڕینی بەڕێوەبردنی ڕەفتاری کۆمەڵگە و نەتەوەکان لەگەڵ یەکتر، زاراوەی عەقڵی حیلەبازی بەکاردەهێنا. کانت دەیگووت: سروشت لە کەسانی ناکۆمەڵایەتییەوە دەستی پێکردوە کە لەگەڵ هاوجۆرەکانی خۆیان خەریکی شەڕ و کوشتار دەبوون. هێندە وێرانی، کوشتار، بریندارکردنی بەرانبەر، جێگۆڕکێی کەلە براوە و دۆڕاوەکان لەگەڵ یەکتر ڕووی دا تا مرۆڤ گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە پێویستە خۆی دووربخاتەوە لە سروشتی دڕندانەی خۆی و لەگەڵ مرۆڤەکان و کۆمەڵگەکانی تر بحەوێتەوە. عەقڵ لەو چەمکە مێژوویی و دەستەییە، عەقڵی پێشگرانە نەبوو، بەڵکو عەقڵێك بوو کە تەنیا زیانەکان و وێرانییە مەزنەکان دەیانتوانی بیجوڵێنن و گەلان و کۆمەڵانی تر تێبگەیەنن کە نزیك ببنەوە لە یەکتری و بە پێچەوانەی سروشتی دڕندەیی کە حەزی لە خراپەکردنە، هاوئاهەنگیەکی ڕێژەیی بەرقەرار بکەن.

دوای کانت و ئوتاپییەکەی، فریدریك هیگڵ، بە ئیلهام وەرگرتن لەو بەڵام لە ڕێڕەوێکی ترەوە، قوتابخانەیەکی نوێی لە زەمینەی فەلسەفەی مێژووی بنیات دروستکرد کە بە پێی ئەو، مێژووی مرۆڤ لە ڕەوتێکی دیالیکتیکی ڕوو بە تەکامول و نابووتی خودی دڕندەیی مرۆڤەکان پێشدەکەوێت، تەنانەت ڕەوتە بەرەو دواوەکانیش کاتێ و هەڵگری کۆتایی بزاوت، بەرەو ئامانجی باشبوون و تەکامول دەڕوات. لە لێکچوونی دیدگای کانت و هیگڵ لە زەمینەی مێژوودا، دەتوانرێت بگوترێت کە هەردوکیان پێیانوایە مێژوو جۆرە عەقڵ و لۆژیکێکی هەیە، جا چ ئەوەی کە کانت دەڵێت عەقڵ و لۆژیکی پەندوەرگرتوو یان ئەوەی بەگوێرەی دیدگای هیگڵ، ڕۆحێك کە خاوەنی بەرەو جۆرە تەکامولێکە.

بەڵام خۆشبینی و ڕۆمانتیکانە بیرکردنەوەی ئەم دوو فەیلەسوفە ئەڵمانییە، سەدەیەك دواتر

لە کوورەکانی مرۆڤ سوتاندندا بووە دوکەڵ و لەگەڵ پێست و گۆشت و ئێسکی ملیۆنان ئەسیری ئۆردوگاکانی مەرگی نازی، لە یەهوودی، سۆسیالیست، پارتیزان، کێوەلی، پێست ڕەنگاوڕەنگ و هاوڕەگەزباز و چەندانی تر لە ڕێگای دوکەڵکێشەکان بە ئاسماندا چوو. ئەو دوکەڵە فرێ و هەندێکیان وەکو دوکەڵی کوورەی مرۆڤ سوتاندنی بوخنوالد، باڵندەکانی لە وایمار، زادگای گۆتە و مەڵبەندی کلتووری و شارستانیەتی ئەڵمانیا هەڵفڕاند. جەنگەڵەکانی ئترسبێرگ، ئەو شوێنەی کە گۆتە و ئیکرمان تێیدا باسی ڕەسەنایەتی ڕۆحی مرۆڤیان دەکرد، تا چەندین ساڵ باڵندەی بە خۆیەوە نەبینی.

شەڕی یەکەمی جیهانی لە هەلومەرجێکدا ڕووی دابوو کە مرۆڤ گەورەترین هەنگاوی زانستی و پیشەسازی خۆی دەهاویشت، لەگەڵ ئەوەشدا، شێوە ناشیرنەکانی کۆمەڵکوژی، وەکو بەکارهێنانی گازی کیمیایی کە بۆ یەکەمین جار لە شەڕەکانی دەشتی فلاندر دەیان هەزار کوشتە و بریندارى لێ کەوتەوە، یەکێك بوو لە ئەنجامە شوومەکانی ئەم شەڕە. لە شەڕی جیهانی دووەم، ئەوەی مرۆڤ بە مرۆڤی کرد، ئەنجامی گۆڕانی عەقڵ و زانست بە ئامێری دەسەڵاتخوازی و دەرەنجامی سروشتی دروستبوونی ئایدیۆلۆژیا و توستوورە سیاسیەکان ترسناك بوو. دوو فەیلەسووفی ئەڵمانی، یەکیان مەکس هیورکهایمەر یەکیشیان مارتین بوبەر، ئەوەی بەسەر مرۆڤایەتیدا هات بە (عەقڵ گیران) و (خودا گیران)یان ناو برد، تەنانەت ئەو عەقڵە پەندوەرگرە کانتییەش نەیدەتوانی ئەم وەرچەرخانە ترسناکە مێژووییە ئاراستە بکات.

" لەڕاستیدا شتێك نییە بە ناوی مێژوو" ئەمە دەرەنجامێك بوو کە کارل پۆپەر لە هەمان ساڵانی شەڕی جیهانی دووەم پێی گەیشت. پۆپەر وێناکردنی ئارمانجداری و ڕەوتی تەکامولی بۆ مێژوو خستە ژێر پرسیارەوە و بڕوای نەبوو بەو دیدگایەی کە دەڵێت مێژوو ڕووبارێکە لە جوڵەدایە و بەرەو شوێنێك کە هەر ئەو سەرەدەمە زێڕینە بەباچووەی مرۆڤە. پۆپەر شتێکی بە ڕەسمیەت نەناسی بەناوی مێژوو و مێژووی بە شتێکی کشتبێژیی و گومڕاکەر زانی. تەنیا دەتوانرێت بۆ دیاردە دیار و جیاکانی ژیانی مرۆڤ جۆرێکی تایبەت لە مێژوو هەبێت، وەکو مێژووی پەیوەندی سیاسی، مێژووی زانست یان مێژووی پێڵاو! پۆپەر ئەم وێناکردنەی کە بە هەرحاڵ بە ڕابووردنی کات و ئەزموون کۆکردنەوەی مرۆڤ، مێژوو دەگاتە قۆناغی کاملتر و پۆشتتر، بە تەوەهومێکی ترسناکی دەزانی. لە تێڕوانینی ئەودا ئاکە زامنی گەیشتن بە هەلومەرجی باشتر و بەکەڵکی حورمەتی مرۆڤایەتی، پاراستنی هەستی لێپرسراویەتی و "ئاگاداریە لە هەر ساتێکدا"یە.

ترسی گەڕانەوە و دواکەوتن بەردەوام لە بۆسەی کۆمەڵگە و گەلاندایە، هۆشیاری، ڕەتکردنەوەی خۆشبینی و بیرکردنەوەی پۆزەتیڤانە نییە، بە پێچەوانەوە هیچ کامیان بێ ئەوەی تر ناگەنە ئەنجام.

جۆرج سامپرن، وەزیری پۆشنبیری ئیسپانیا لە دەوڵەتی فیلیپ گنزالس لە ساڵی ۱۹۹۵، لە بیرەوەرییەکانی خۆی لە سەردەمی یەخسیر بوونییدا لە ئۆردوگای بوخنوالد بە ناونیشانی ئەندامی ڕاپەڕینی بەرگری فەرەنسا، بیرمان دێنێتەوە کە بۆ بەرگرتن لە داڕوخانی مرۆڤ و دووبارەبوونەوەی ڕەوتە بەرەودواوەکان، پێویستە لەگەڵ بیرچوونەوە ململانێ بکرێت و بیرەوەری مێژوو بەردەوام بە زیندووی بهێڵدرێتەوە. گەلان و کۆمەڵگەکان تەنیا لەم

ڕێگەیەوە دەتوانن خۆیان بپارێزن لە کەوتنە داوی ئوستورە سیاسییەکان و ئەو ڕێگەیە هەڵنەبژێرن کە خەڵکانی تر بە قوربانییەکی زۆرەوە پێیداڕۆیشتوون. سامپرن دوکەڵی کوورەکانی مرۆڤ سووتاندن بە دوکەڵێکی زیندوو دەزانێت لە بیرەوەری کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا کە هیچ کات نابێت لەبیر بکرێت.

مێژووی جەنگی جیهانی دووەم، پەیدابوونی ئەو ئایدیۆلۆژیایانەی کە ملیۆنان کەسیان کێشایە قورگی مردنەوە، دروستبوون و لفاوپساندنی بیرە نەژادپەرستییەکان، دیاردەی (ئەنتی سمیتیزم) تەنیا بەشێکە لەو، بەڵام بەشێکی زۆر پەندوەرگرە، لەوانە هەڵچوون و داچوونی مێژوون کە هەرچەند بگوترێتەوە و لێبکۆڵدرێتەوە هێشتا کەمە.

هاینریش هاینە دەیگووت: لە هەر شوێنێک کە بانگەشە بۆ ئەنتی سمیتیزم دەکرێت، هیچ گومانتان نەبێت کە مافی چینەکانی زەحمەتکێش و بێگوناه پێشێل دەکرێت. بۆ دۆزینەوەی ئەو لۆژیکەی کە لە پشت ئەو قسەیەی هاینەیە، دەبێ بە مێژوودا بچینەوە، کاروبار و لادانی ئوستوورە سیاسیەکان شرۆڤە بکەین. لەم بنەمایە، بەبێ جیاوازی لە هەموو وڵاتانی جیهان و بە درێژایی دوو سەدەی ڕابردوو ڕاست بووە. هەڵسانی شەپۆلەکانی ئەنتی سمیتیزم بە هەڵسانی کۆنەپەرستی لە ئەورووپا لە دوای شکستی شۆڕشەکانی ١٩٤٨ و کۆمۆنی پاریس ١٨٧١، بەرقەراری دیکتاتۆری پرۆسی لە ئەڵمانیا، هاوکات بووە لەگەڵ سەرکوتکردنی خەڵکی ڕوسیا و پۆڵۆنیا بە دەستی تزارەکانی ڕوسیا و سەرەنجام دروستبوونی تۆتالیتاریزمی هیتلەری و ستالینی. بەرپاکردنی تۆزوخۆڵی ئەنتی سمیتیزم بۆ هەموو ئەو هێزە تاریکانە، حوکمی پرژاندنی خۆڵ بە چاوی گەلان، بە لادابردنی داواکاری کۆمەڵایەتی و چینایەتی و شاردنەوەی ڕیشە ڕاستەقینەکانی ڕۆژە ڕەشەکان و مافکوژەکانی بەدەست بووە.

ئەمڕۆکە ئارمانجی سەرەکی توێکاری ئەم دیاردەیە، ناتوانرێت بەرگری بێت لە یەهوودییەکان، لەگەڵ ئەوەش بە هەبوونی وڵاتێکی سەربەخۆ، ئیتر ئاوارەی وڵاتان نین، جگە لە هەندێ باروودۆخی کەم نەبێت، لەژێر گووشار و چەوساندنەوە ناژین. لە سەردەمی شەڕی دووەمی جیهانیدا، ژان پۆل سارتەر نووسی: "تا ئەو کاتەی یەک یەهوودی بچەوسێتەوە و یەخسیر بێت، هیچ مرۆڤێک ئازاد نییە" ئەمڕۆکە ڕەنگە بە هۆی پێگەی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی یەهوودیەکان، بتوانرێت تەنانەت ئەم حوکمە پێچەوانە بکەینەوە بڵێین: هیچ یەهوودییەک ئازاد نییە، تا ئەو کاتەی کە لە گۆشەیەکی ئەم جیهانەدا مرۆڤێک لە هەلومەرجی ناڕێکی کۆمەڵایەتی، ئابووری و لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمە دژەدیموکراتییەکان بژین. ئەمڕۆکە تەنانەت دیاردەی تیرۆریزمی خۆکوژی کە هاوڵاتیانی سڤیلی ئیسرائیلی کردۆتە ئامانج، ئیتر نێچیرەکانی خۆیان تەنیا لەنێوان یەهوودیەکان هەڵنابژێرن، بەڵکو تەشەنەی کردوە بۆ تەواوی کونجەکانی دونیا. لەم ڕووەوە، توێکاری دیاردەی ئەنتی سمیتیزم تەنیا بەشێکی بچوکە لە بەکارهێنان کە خۆی لە بەرگری یەهوودیەکان دەبینێتەوە. ڕێک هەروەکو تیرۆریزم، ئەنتی یەهوودیش زۆرترین زیانی خۆی بە کۆمەڵگەیەک دەگەیەنێت کە تێیدا گەشە دەکات. بەرفراوان بوونی گووتاری نکوڵی کارەساتەکانی نازییەکان پێش ئەوەی زیانێک بە یەهوودیەکان بگەیەنێت، زەنگێکی ترسناکە بۆ کۆمەڵگەکان و نیشانەی هەوڵێکە بۆ تەمێشتنی بیرەوەری مێژوو و لە ئەنجامدا کێشانی خەڵک

بەرەو زەلکاوی تۆتالیتاریزم، دانەدەستی ئامێرێک بۆ ئەوان و زیان گەیاندن بە ماف شارستانیەتی و بەرژەوەندی گشتی ئەوان لە دونیای شارستانی ئەمڕۆیی هەیە. ڕژێمە نیمچە فاشیستەکانی وەکو بەعسی یان کۆنەپەرستەکانی عەرەب لە دەیەکانی شەست و حەفتا، لە ڕێگەی ئەو گووتارە ناڕاست و دژە مێژووانە، زیانیان بە دیموکراسی و بەرژەوەندی گشتی گەیاند، متمانەی ئەندێشە و هۆشیاری خەڵکی جیهانیان بە گاڵتە وەرگرت و ماف فەلەستینییەکانیان بۆ هەبوونی وڵاتێکی سەربەخۆ بریندار کرد. تەنیا خراپترین دوژمنانی ماف شارستانیەتی و دیموکراتی فەلەستینییەکان دەیانتوانی سەلماندنی ئەو مافانە ببەستنەوە بە سەلماندنی گوتاری خۆیان لە نکۆڵیکردنی کارەساتی نازییەکان و ئۆردوگای مەرگ. ئەم گوتارە ناگاتە هیچ شوێنێک چونکە دژەکانیان هەزاران بەڵگەی ڕەسمیان پێشکەشی دادگای نۆرنبێرگ کردوە، فیلمی بەڵگەیی سوپای هاوپەیمانان لە کێوە مەزنەکانی لاشە دۆزراوەکان لە ئۆردوگاکانی مەرگ، بیرەوەری ناوداران و گەورە سیاسەتمەداران، زانست و هونەری ئەورووپا و هەروەها ئەندامانی ڕاپەڕینەکانی بەرگری و بینینی ئەوان لە ئۆردوگای مەرگ و زیندانەکانی نازی لە وڵاتە داگیرکراوەکان بوو.

لەگەڵ ئەوەی ئەنتی یەهوودی ئەمڕۆکە فراوانترین پێگەکانی لە وڵاتە عەرەبییەکان و هەندێ وڵاتی ئیسلامیدا هەیە، بەڵام ئەم دیاردەیە بە گشتی دیاردەیەکی خۆرئاواییە کە یان، هەناردە کراوە، وەکو مەسەلەی ئەنتی سمیتیزم لە دەرباری سەفەوی کە یەکەمین جار لە لایەن لۆردە ئینگلیزییەکانەوە هەناردەی ئێران کراوە، یانیش تۆخمێکی هێنراوە وەکو ئەوەی لە سەرچاوەکانی ئەنتی یەهوودی سەدەی نۆزدەهەمی روسیا و ئەورووپا، هەروەها ئایدیۆلۆژی نازیزم لە لایەن کۆنەپەرستە ناوخۆییەکان هاتۆتە ناو وڵاتە موسڵمانەکان، پەیوەندی حزبە بەعسیەکان بە هیتلەر و شێوازی وڵاتداری ئەوان شتێکی ئاشکرا و دەربڕاوە.

شارستانیەتی ئیسلامی لە سەدەکانی پشکوتنی خۆیدا، واتا سەدەی هەشتەم تا پانزەهەمی زاینی، بە پێچەوانەی ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست، زەمینەی گونجاوی بۆ سەرکوتکردن و چەوساندنەوەی کەمایەتییە ئاینییەکان نەدەڕەخسا و کۆمەڵگە کەمایەتییەکان، بە تایبەتی یەهوودیەکان، پەناگەی ئاسایشی خۆیان لە هەڵاتن لە بەدواداگەڕانی بیروبڕواکانی کەنیسە و هێزە خاچپەرستەکان، لە حەوزەی ئەم شارستانیە دەیاندۆزییەوە. لە وڵاتە ئیسلامییەکانی وەکو ئێران، میسر، بابل (تورکیای ئەمڕۆ) و هەروەها لە هەرێمەکانی ژێر دەستەڵاتی ئیسلامەکان، وەکو ئیسپانیا، کۆمەڵگەی یەهوودی خۆشبژی دروست ببوون، کە تێیاندا زانایان و سیاسەتمەدارانی ناوداریان لێ دەرچوو. دەکرێ لەوانەدا باسی وەزیرە یەهوودیەکانی ئێران لە سەردەمی خواجە ڕەشیدەدین فەزلوڵلا هەمەدانی و سەعدولدەولەدا بکەین. وەزیرە حاکمەکانی موسڵمانانی ئیسپانیا لە گرانادا، و قورتبە و هەروەها ڕاوێژکارانی دەرباری خەلیفەکانی فاتیمی یەهوودی بوون. ئیبن مایمون، فەیلەسوف زیرەکی یەهوودی لە سەدەی دوازدەهەمدا، پزیشکی دەرباری سەلاحەددین ئەیوبی بوو لە میسر و لەگەڵ زانایانی سەردەمی خۆی و ئیبن ڕوشد، وتووێژی زانستیی و فیکری نزیکی هەبوو. نووسەرانی دائیرەتولمەعاریفی ئیخوانولسەفا لە سەدەی یازدەمی زاینیدا، کە پێشەوایانی

ڕۆشنگەری، ئەویش چەندین سەدە پێش بە کتێبەکانی دائیرەتولمەعاریفی فەڕەنسا دەژمێردرێن، بە ئاشکرا کردنی خۆیان لە سەرچاوە زانستی و فەلسەفییە یەهودیەکان و دینەکانی تر لە نووسینی بەرهەمی خۆی سودیان وەرگرت. عارفە موسڵمانەکان دەرگای خانەقاکانی خۆیان بەڕووی پەیڕەوانی هەموو ئاینەکاندا دەکردەوە و لە عیرفاندا خوێندنەوەی بەرفراوانیان هەبووە بۆ قەباڵەکانی یەهوود و عیرفانی مەسیحییەکان. کۆمەڵگە یەهودییەکان لە شارستانیەتی ئیسلامیدا بە کۆمەڵگەیەکی پشتیوانی لێکراو دەژمێردران، هەرچەندە بە ناونیشانی خەڵکانی کەفالەت کراو لەسەریان بوو کە جزیە بدەن و هەروەها بە هاوڵاتیی پلە دووش باسیان دەکرا، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ ڕەفتاری ئەورووپای مەسیحی لە سەدەی سێیەمی زاینی و بە ڕەسمیەت ناسینی مەسیحیەت لەلایەن کنستاتین، ئیمپراتۆری ڕۆم، بە دواوە ڕەفتاری مرۆڤانە و نەرمیان هەبوو.

برتاند ڕاسل لە کتێبی مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوا لەبارەی یەهودیەکانی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاست دەنووسێت: "ئەوان چەندین ئەشکەنجە و ئازاریان دەبینی کە نەیاندەتوانی جگە لە پارەدان بۆ دروستکردنی کەنیسەکانی کۆبوەوە لە شارستانیەتەکان بەشێکی تریان هەبێت، لەم سەردەمەدا تەنیا لە نێوان موسڵمانەکاندا بوو کە بە میهرەبانی و ڕێزەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرا، یەهودیەکان دەیانتوانی فەلسەفە و ئەندێشەکانی ڕۆشنگەری بخوێنن. لە سەدەکانی ناوەڕاست موسڵمانەکان لە مەسیحییەکان شارستانیتر و مرۆڤانەتر بوون."

کورتەمێژووی هاتنە ناوەوەی ئەنتی سمیتیزم بۆ قەڵەمڕەوی شارستانی ئیسلامی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاوابوونی ئەم شارستانیەتە و دواکەوتنی لە لایەنەکانی ئابووری، بازرگانی، زانستی و کۆمەڵایەتی لە شارستانیەتی خۆرئاوا. بێرنارد لوییس، پسپۆڕی مێژوو و شارستانیەتی ئیسلامی دەنووسێت: "لە مێژووی ئیسلامدا هیچ شتێك وەکو ئازار و بەدواداگەڕانی بیروباوەڕەکانی ئیسپانیا، ڕووداوی کوشتاری یەهودیەکانی ڕوسیا یان هۆڵۆکۆستی نازییەکان بوونی نییە" لە مێژووی ئێراندا تا هێرشی مەغۆل لە هیچ شوێنێك کوشتنی یەهوودی تۆمار نەکراوە. دوای ئەویش تا سەردەمی سەفەوییەکان هیچ خورافاتێك لە بارەی ئەنتی یەهودیەوە لە کۆمەڵگەی ئێرانیدا قوڵایی و ڕیشەیی نەبووە.

دوژمنکاری و پێشبڕکێی بەریتانیا لە سەدەکانی شانزە و حەڤدەی زاینی لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ئەوانی کێشایە دزەکردن بۆ دەرباری شا عەباس. شا عەباس بۆ ڕازیکردنی سەفیرانی بەریتانیا، یەهودیەکانی ئەسفەهانی بێرەحمانە کوشت. هەرچەندە ئەو شتە و ئەو کارەی بەناوی دینەوە دەکرد، بەڵام کردنەوەی بارەکان و دامەزراندنی ئۆردوگایەك بۆ پەروەردەکردنی بەراز بۆ خواردنی سەفیرەکان ئەو بیروڕایەی پوچەڵ دەکردەوە. تەنانەت جۆری ئەو تۆمەتانەی کە بۆ یەهودیەکان هەڵبەسترا، هاوردە و پەیوەست بوو بە سەردەمی خاچپەرستەکانی ئەورووپا، لەوانە ڕژاندنی خوێن لە جەژنی فەتیردا و ژەهراویکردنی چاڵەئاوەکان. لەگەڵ ئەوەش بیرمەندان و ڕۆشنبیرانی ئێرانی بۆ پاککردنەوەی ئەو لەکە شەرمەزارییە هەوڵی زۆریان دا، یەکێك لەوانە ئاپەزایی مەلا حەسەن فەیزی کاشانی لە زەمینەی ستەم لە یەهودییەکان، یەکێك لە لاپەڕە کاریگەرەکانی مێژووی ئەو هاودەردیە ڕۆشنبیرانەیە کە نیشانەی ڕیشەی هۆشیارییە لەبارەی ئەنتی

یەهوودی لە نێوان نوخبەکانی ئێراندا، دەتوانرێت لە دانپێدانانەکانی میرزا ڕەزای کرمانیدا بدۆزینەوە. ئەو دەڵێت کە: جارێك لە باغێکدا هەلێکی باشترم هەبوو بۆ تیرۆرکردنی ناسرەدین شا، بەڵام چونکە لە گۆشەیەکی باغەکەدا ژمارەیەك یەهوودی هەبوون، پەشیمان بوومەوە، چونکە ئەگەر شام بکوشتبایە خوێنیان دەخستە ئەستۆی یەهوودییەکان و کارەسات بەرپا دەبوو.

لە سەردەمی سەفەوییەکان بەدواوە جزیە بەسەر یەهوودیەکان قورستر بوو. یەهوودیەکان بێبەشکران لە پۆشینی جلوبەرگی نوێ و کڕینی میوەی تازە. ماڵەکانیان دەبوایە لە ئاستێکی خوارتری ماڵە ئاساییەکان دروست بکرابایە. ئەوان مافی ژیان لە ماڵی نوێیان لەدەست دا، پیاوان تەنیا مافی پۆشینی جلوبەرگی خام و ژنانیش عەبای دوو ڕەنگ و بە زەنگوڵەیان هەبوو. پارچە پەڕۆیەکی زەردیش کە نەریتێکی تری ئەورووپا بوو بۆ ئازاردانی و ڕقلێبوونەوەی یەهوودیەکان لە کوچە و بازاڕدا لە لایەن کۆڕە دینییەکان وەکو بانگەشەیەکی نیمچە ئاینی دانرا. ئەوان مۆڵەتی ئەوەیان نەبوو کە زبڵ و خاشاك فڕێ بدەنە دەرەوەی شوێنی بەستراویان یان پەرستگاکانیان.

بە دەستپێکردنی بزوتنەوەی مەشروتیەت، ئومێدی زۆر کەوتە دڵی یەهوودیەکان و لە پەرستگای تارانەوە چەند کەسێك هاتنە ناو شۆڕشەکەی مەشروتەوە. دوای ئازادکردنی تاران لە لایەن مەشروتەخوازەکان، یەهوودیەکان دەستیان هێنا بە گەڕەك و کۆڵانە یەهوودی نشینەکان و ئایەتوڵڵا بەهبەهانی بوو بە نوێنەری پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان لە ئەنجومەنی شورای میللی. دوای شکست و سەرکوتکردنی بزوتنەوەی مەشروتە، سیاسەتەکانی نوێی و سەرکوتکردنی لاتەکانی ولات لە لایەن ڕەزا شاوە، ئاسایش و خۆشبژێیەکی زیاتری بەخشی بە کۆمەڵگەی یەهوودیەکان. بەم شێوەیە لە ساڵەکانی کۆتایی دەستەڵاتی ڕەزاشا، لایەنگری ئەو بۆ هیتلەر و یەکگرتن لەگەڵ ئەڵمانیای نازیدا کە هاوکات بوو لەگەڵ ڕفاندنی مەڵبەندە کلیلیەکانی دەستەڵات لە لایەن ڕاوێژکارانی ئەڵمانیا، ئەو ئاسایشەی خستە مەترسییەوە. سادق هیدایەت لە جوێندان بە بازرگانەکانی تاران لەبارەی لایەنگری هیتلەر و پشتیوانی لەوان و پەیوەستن بە ئەڵمانیای نازی لە ڕۆمانە بەناوبانگەکەی خۆیدا بە ناوی(حاجی ئاغا) نووسی: "لە بازاڕ بڵاوبۆتەوە: ئەگەر هیتلەر بگاتە ئێران، هەموو بەیانیەك بە هەلیکۆپتەری ئەڵمانی، کارتۆنی گیپە و سەروپێی خۆڕایی دیاری هیتلەر دەرژێندرێتە خوارەوە کە لەسەریان نووسراوە: ئەگەر ئێران نەبێت، منیش نابم!" سەرەنجام بەهۆی ئەوەی کە هێزەکانی ئەڵمانیا لە ڕێگەی تورکیا و دواتر ئازەربایجانی ئێران چەك و جبەخانەی بۆ سوپا گرفتارەکەی دەنارد لە قەوقاز، هێزەکانی هاوپەیمانان، ڕەزا شایان لابرد و تا کاتی دەستەڵات گرتنەدەستی محەممەد ڕەزا شا، هەرخۆیان دەسەڵاتیان گرتە دەست.

لە کەشوهەوای دیموکراتیدا کە تا شکستی دکتۆر موسەدەق و بزوتنەوەی خۆماڵی کردنی نەوت درێژەی هەبوو، هێزە پێشکەوتووەکان، میللی، مەزهەبیەکانی میانڕەو، و چەپەکان لەژێر کاریگەری هەواڵە ترسناکەکەی کارەساتی نازیەکان کە لە جیهاندا بڵاودەبوەوە، لەبەرانبەر نەژادپەرستی، ئەنتی یەهوودی و سەرکوتکردنی کەمینە مەزهەبیەکان کەشەیان کرد و کەشوهەوای ڕای گشتی ئێرانیەکان، جارێکی تر، ئەمجارە لە کەشوهەوای مۆدێرن، بەڕێوەبەری کۆنی شارستانیەتی ئیسلامی و

ئێرانی، لەگەڵ بیرجیاوازەکانیان تاقیکردەوە. خەڵکی ئێران لە سەرتاسەری ئەو کورتە مێژووە پڕ هەوراز و نشێوەدا، لە سەردەمی محەمەد ڕەزا شا و دواتر تەنانەت دوای شۆڕشی ئیسلامیش، نیشانیان داوە کە زەمینێکی نەگونجاو بوون بۆ چاندنی تۆوی ئەنتی سمیتیزم، وەك ئەوەی لە ئەورووپا گەشەی کرد. ئەم مەسەلەیەش کە دەگەڕێتەوە بۆ بنیاتەکانی پتەوی کلتووری ئێرانییەکان، کۆمەڵگەی ئێرانی جیا دەکاتەوە لە تەواوی کۆمەڵگەکانی جیهان.

## پەیدابوونی ئایدیۆلۆژیای نەژادی و ئەنتی سمیتیزم لە ئەورووپا

لەسەردەمی زۆر کۆندا، نەریت وابوو کە نەتەوە و گەلی براوە، بۆ ئاراستەکردنی سەختگیری، وەبەرهێنان، تالان و کوشتاری نەتەوە دۆڕاوەکان، بەڵگەی نیمچە عەقلانیان دروست دەکرد، بە هۆی ئەوەی یەهوودییەکان گەلێکی شوانکارە بوون، بە پیس و پۆخڵ و دواکەوتوویان دەژماردن، یۆنانییەکان لە کاتی هێرشی ئەسکەندەر بۆ ئێران، ئێرانییەکانیان بە گەلێکی خاوەن شارستانییەت و وەحشی دەژمارد، ڕزگارکەرە عەرەبەکانیش ئێرانییەکانیان بە عەجەم و کەڕولاڵ دەزانی، تەنها بەهۆی ئەوەی کە بە عەرەبی قسە ناکەن. ئەم هەراو هۆریایە لە دیدی ئیبن خەلدون، کە ئەو چەندین سەدە پتر لە ئاگۆست کانت بنیاتنەری کۆمەڵناسی بە زانستی دەزانێت، نەشاردرابووەوە. ئەو لە کتێبی (پێشەکی)دا، ڕەفتاری توندوتیژانەی و ڕقلێبوونەوەی نەتەوەکانی ژێردەستە بە یاسایی دەزانێت، ڕەفتاری گەلانی براوە بەرانبەر یەهوودییەکان بە نموونە دێنێتەوە. ئەم شیکردنەوەیەی ئیبن خەلدون کلیلی دۆزینەوەی ڕیشەکانی ئایدیۆلۆژیای نەژادییە لە دونیای مۆدێرندا.

ڤۆڵتێر، ناوداری ڕۆشنگەری و خاوەنی دائیرەتولمەعاریفی فەڕەنسا، لە "نامەیەك لەبارەی میتافیزیك"دا، چەوساندنەوەی نەژادی بەم شێوەیە لێکدەداتەوە: "سپیپێستەکان لەسەرووی ڕەشپێستەکانن، بەهەمان ڕێژەش ڕەشپێستەکان لە سەرووی مەیموونەکانن، مەیموونەکانیش لەسەرووی مێلکە شەیتانۆکەکانن." بەوەی کە ڤۆڵتێر بە یەکێك لە داڕێژەرانی ماف تاك و مافەکانی مرۆڤ دەناسین، ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە کە چ مەبەستێك لە پشت داڕشتنی ئەم تیۆرەدا هەیە. برنارد لوییس، مێژووناسی هاوچەرخ، هۆکاری ئەو تێڕوانینەی ڤۆڵتێر بۆ ڕەشپێستەکان دەگێڕێتەوە بۆ سوودوەرگرتنی زۆری ڤۆڵتێر لە بازرگانیکردن بە کۆیلەکان لە ئەفریقاوە بۆ فەڕەنسا، ڤۆڵتێر یەکێك بوو لە هاوبەشە گشتیەکانی ئەو کەشتییە فەڕەنسیانەی کە لە بەندەری نانتی فەڕەنساوە بازرگانیان بە کۆیلەکانەوە دەکرد، هەندێك بە یەکێك لە بیست سەرمایەدارەکانی یەکەمی ئیمپراتۆرییەتی فەڕەنسایان دەزانی. برنارد لوییس بەبیرمان دێنێتەوە کە تیۆرەکانی نەژادی لە سەرەتادا بۆ لێکدانەوەی مامەڵەی ناڕەوا و دژی مرۆڤایەتی کۆیلە دانران و دواتر ئاراستەی نیمچە زانستی پێ زیادکرا. کەسانی ئاسایی کە لەم ڕێگەوە سودیان وەردەگرت، هێندە پێویستیان بە ئاراستەکردنی کارەکانی خۆیان نەبوو لەڕوی فیکرییەوە، بەڵام کۆمەڵگەی ئەورووپا و ئەمریکا کە دروشمی ئازادی و یەکسانییان خستبووە ناو دەستووری ئەمڕۆیان، بە هۆی کۆتوپێوەندی فیکری یان مەزهەبی خۆیان، پێویستیان بە ئاراستەکردنی مامەڵەی کۆیلە

هەبوو. لە نێوان هەندێ لە بیرمەندانی سەردەمی ڕۆشنگەریدا بیرۆکەی بەدبینی و نەفرەت لە یەهوودییەکانیش بوونی هەبوو کە ڤۆلتێر یەکێك بوو لەوان. ئەگەر لە سەدەکانی ناوەڕاستدا یەهوودیەکانیان بە دوژمنی مەسیح لەقەڵەم دەدا، هەندێ لە بیرمەندانی ڕۆشنگەری بە مەبەستی پچڕاندنی سەختگیری کۆتوبەندی و کەنیسە، هێرشیان دەکردە سەر یەهوودیەکان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانیان بە سەرچاوەی مەسیحییەت دەزانی. لەوەی کە لەو سەردەمەدا هێشتا لە ئەورووپا قسەپێکوتن و جوێندان بە ئینجیل و مەسیحیەت شتێکی قەبوڵکراو نەبوو، زۆرێك لە دژەکانی دەستەڵاتی کەنیسە بە ئاسانتریان دەزانی کە هێرش بکەنە سەر ئەندێشەی کۆنتر واتە یەهوودیەت، گاڵتە بە ئەندێشەکانی تەورات بکەن، ژێرخانی ئیلاهیاتی مەسیحی بکەنە نیشانە. ئەمە باشترین حاڵەت بوو لە نێوان ئەنتی سمیتیەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری بوو، بەڵام لە لایەنی زۆرتر، ناکۆکی دارایی لەگەڵ یەهوودییەکان، شکستی عەشقی و مەسەلە تاکەکەسیەکان ئەم ڕقلێبوونەوەیان وەدیهێنابوو.

پلە بە پلە، هەندێك لە مرۆڤناسان دەستیان کرد بە دابەشکردنی مرۆڤەکان بە گوێرەی ڕەنگی پێست، ئەندازەی لەش، هێلکاری دەموچاوو کەللەسەر. تیۆرداڕێژەرانی نەژادیی تەشەنەیان بەو بیرۆکەیە دا کە ڕەشپێستەکان نەك تەنیا شارستانی نین، بەڵکو توانای وەرگرتنی شارستانیەتیشیان نییە و تەنیا بۆ بەردەیی بە باش دەژمێردرێن. بەستنەوەی ئەم تیۆرە بە یەهوودییەکانەوە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم لەلایەن ئەڵمانیەکانەوە ڕوویدا لە کاتی هێرشەکەی ناپلیۆن بۆسەر ئەڵمانیا. ناپلیۆن بۆ یەکەم جار لە ئەورووپا ماف هاوڵاتیبوونی بەخشی بە یەهوودییەکان، هەربۆیەش یەهوودیەکان پشتیوانیان لێ دەکرد. لەساڵی ١٨٧٩ یەکەمین دامەزراوی سیاسی لەسەر بنەمای دژایەتی لەگەڵ یەهوودییەکان لە ئەڵمانیا، لەلایەن ڕۆژنامەنووسێکی ئەنارشیست و ئەناس بە ناوی ویلهلم مار بنیات نرا. ئەو دەستەواژەی ئەنتی سمیتیزم یان ئەنتی یەهوودی هێنایە ناو فەرهەنگی سیاسی مۆدێرن. مار باوەڕی بە خوا نەبوو و بەرەی ئەنتی سمیتی لەسەر بنەمای دوژمنکاری نامەزهەبی لەگەڵ یەهوودیەکان بنیات نا، ئەوانی بە دوژمنی سەرەکی و نەژادی بێگانە دەزانی. لەگەڵ ئەوەشدا تێگەیشتنی ئەو لە یەهوودیەکان جیاوازیەکی بنەڕەتی لەگەڵ خورافاتەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا نەبوو. لە سەدەکانی ناوەڕاست یەهوودیەکانیان بە ڕەگەزێکی شەیتانی دەزانی کە بە دوژمن دەژمێردرێن و لە هەموو شوێنێك دەوڵەت لەناو دەوڵەت دروست دەکەن، پیلان دەگێڕن، بۆ پێشبردنی کۆمەڵگەی خۆیان بەرژەوەندی ئەوانی تر دەخەنە مەترسییەوە. ئەم دوژمنکارییە لایەنی مەزهەبی هەبوو، تاوانی یەهوودیەکان، هیچ کات بوونی نەژادی بێگانە نەبوو. بۆ یەکەمین جار حاکمەکانی ئیسپانیا لە سەدەی پانزەیەمدا کە یەهوودیەکان و مەسیحیەکانیان بەزۆر دەکردە ئیسلام، بەڵام گومانیان هەبوو لە گۆڕانی ڕاستەقینەی باوەڕەکانیان، پێوەری نەژادیان بۆ ناسینی ئەوان بەکارهێنا. برنارد لویس یەکێکی تر لە ڕیشەکانی نەژادپەرستی لە سوننەتەکانی ئاشکراکردنی بیروباوەڕەکان لە ناسینی یەهوودی و موسڵمانەکان بێڕەحم دەزانن. بەم شێوەیە، نەژادپەرستی مۆدێرنی ئەڵمانی، هەمان ڕەگەزەکانی پاکی خوێن و نەژاد ئاشکراکردنی بیروباوەڕەکانیان کردە

سەرمەشقی خۆیان. بەڵام خاڵی سەرنجدان ئەمەیە کە نەژادپەرستەکانی ئەڵمانیا لە سەدەی نۆزدەیەمدا تۆمەتی سامیگەراییان دەخستە پاڵ کەنیسەکانی کاسۆلیکی. دواتر هیتلەریش ئەم تۆمەتەی باسکرد لە کاتی دژایەتیکردنی ئەم کەنیسەیە بەرانبەر کۆمەڵکوژی یەهوودییەکان.

لە سەدەی نۆزدەیەمدا، بیرمەندانی ئەڵمانی پێشڕەویش بوون لەوەی کە ئەو تیۆرەیان بە ترسناك دەزانی. ئەلکساندەر فون هومبلۆت دەیگووت: "بۆ پاراستنی یەکێتی جۆری مرۆڤ، پێویستە خۆیان بپارێزن لە هەموو جۆرە دەربڕینێکی سەرووتر یان ژێردەستەیی بەرانبەر نەژادەکان. دەبێ مرۆڤایەتی بە گشتی لەبەرچاوبگیرێت و هیچ جیاوازییەك نەکرێت لە نێوان مەزهەبەکان، نەتەوە و نەژادەکان، تا هەموومان وەکو خێزانێکی مەزن و یەك لەش بەرەو ئارمانجی هاوبەش، کە هەمان بەرفراوانکردنی بیرکردنەوەی ئازادانە و هێزی ئەخلاقییە، بەرەو پێش بچین." ئەم بیروڕا پێشڕەویانە لە کەشوهەوای فیکری ڕۆشنگەری کە کەشوهەوایەکی یەکدەنگی بوو و بەگوێرەی ئەو تەنیا ئەوروپاییەکان خاوەنی ژیار و شارستانیەت بوون، دەرەنجامێکی بەهێزی پەیدا نەکرد. بەڕەسمیەت ناسینی مافی یەکسانی بۆ نەژادەکانی تر، بە مانای شکستخواردنی ئابووری و سیاسی نەبوو. لەم ڕووەوە زانستی نوێی وەکو زمانناسی و مرۆڤناسی بۆ ئاراستەکردنی کۆیلەداری مۆدێرن بە خراپی سودیان لێ وەرگیرا. لە لایەکی تر ئەنتی یەهوودیەت کە پێش هەزار و حەوت سەد ساڵ لەلایەن کەنیسەوە بانگەشەی بۆ کرابوو، بوو بەشێك لە گوتاری نەژادپەرستی. گوناهێکی گەورەی کە بووە هۆی برەودانی پەیوەست بە تیۆری ژێردەست بوونی نەژادی سامی، سەرەتا لە نێوان زمانناسەکان دروست بوو. بە تایبەتی کە ئەوان لە کتێبی پیرۆزەوە بەدوای هەموو سەرچاوە نەژادی و نەتەوەکاندا دەگەڕان و بە سەرچاوەی باوەڕپێکراویان دەزانی بۆ دۆزینەوەی ڕیشەی نەتەوە و زمانەکان. واژەی سامی لە ناوی (شەم)ەوە وەرگیراوە کە کوڕە گەورەکەی نوحە، لە وەرگێڕدراوەکانی یۆنانی و لاتین گۆڕاوە بۆ سەم، چونکە لە زمانی لاتین و یۆنانیدا، دەربڕینی ئەم واژەیە وەکو عیبریەکە نییە. لە چیرۆکی نووحدا هاتوە کە هەموو خەڵکی سەر زەوی نغرۆ بوون، جگە لە نووح و بنەماڵەکەی، بەو مانایەیە کە هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەڕاستیدا نەوەی نووحن و دەگەڕێنەوە بۆ هەرسێ کوڕەکانی، شەم، هام، یافت کە ناوی دواترینیان لە بەشی دەیەمی کتێبی دروستبوون تۆمار کراوە. برنارد لوییس لە کتێبی (سامییەکان و دژە سامییەکان) بەم شێوەیە دەنووسێت: "دواتر ئەم بیرۆکەیە بووە جێگەی سەرنجی بەرفراوانی مەسیحییەکان و بەڕێژەیەکی کەمتر موسڵمان و یەهوودیەکان و سێ کوڕەکانی نوحیان بە نوێنەری باپیرانی سێ زمانی نەژادی دەزانی: هام، باپیری خەڵکە ڕەشپێستەکانی ئەفریقایە، شەم، باوکی عەرەبەکان و عیبریەکانە، یافت، باپیری مادەکان، ئێرانی و یۆنانیەکان. ئەم تێڕوانینە بە گشتی باوەڕپێکراو نەبوو و هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی، زمانناسی و دێرینەناسی و نەتەوەناسی نەبوو کە ئەم بۆچوونە پشتڕاست بکاتەوە. بەڵام بەردەوام لێکۆڵەرەوان لە سەدەی نۆزدەیەمەوە بەملاوە پشت بەوەوە دەبەستن. ئەم تیۆرە بە پێوەرێکی بەرفراوانتر لە لایەن سەرچاوە سیاسی و نازانستییەکان گەشەی کردوە." ئەو خاڵەی کە لە چیرۆکەکەی نووح، تیۆرە نەژادیەکانی بۆخۆی کێش دەکرد،

ئەوەبوو کە هام لە ئەنجامی دوعالێکردن، بووە خاوەن چەهرەیەکی ڕەشی وەك شەو.

لێکۆڵەرەوە ئەوروپاییەکان، ئەو دوو گروپە گشتیەی زمانییان پۆلێن کردوە کە زۆریەی شارستانیەکان لەخۆوە دەگرێت: گروپێکی زمانیی کە بەرفراوان بوو، پێکهاتبوو لە زمانی سانسکریت و ئەو زمانانەی کە لەوەوە سەرچاوەیان گرتوە و هیند، کە دواتر فارسی، کوردی، لاتین، یۆنانی و زۆریەی زمانەکانی ئەوروپی لەوانە سلاڤی، ئەڵمانی،ئیتالی و سلتیك لەو جودا بوونەوە. زمانناسەکانی ئەڵمانی ئەم گروپە زمانەیان ناو نا ئیندۆ-ژێرمەنیك کە خۆرئاواترین قەلەمڕەوی ئەڵمانیا و خۆرهەلاتترینیشی هیند بوو. بەلام زمانناسەکانی فەڕەنسی، دەستەواژەی هیندۆ ئەوروپاییان پێ باشتر بوو، کە نیشانەی بەشداری سلتیکەکان(فەڕەنسیەکان) و ئیتالیەکان لە شارستانیەتەکانی خۆرئاوا بوو. بە زمانەکانی هیندی و فارسی دەگووت هیندۆئاریایی، کە بە ڕێکەوت واژەی ئاریایی بە مانای نەجیب و شەریف بوو. لەنێوان ئەو زماننااسانەی کە بانگەشەی ئەم تیۆرەیان دەکرد، کەسانی نەناسراوی وەکو لودویك شلۆیتزر هەبوو، بەلام ئێرنست ڕەنان، زمانناسی بەناوبانگی فەڕەنسی لە ساڵی ١٨٨٥ مەترسی ئەو تیۆرەی لە سەرلێشێواندنی زماننااساندا نیشان دا: "ئێستا دەبینین کە ئایکۆن بیرۆکەی بەدبەختی برەو پێدا، کە بە بنەماڵەی و مانەکانی سیرو. عەرەب ناوی سامی بەسەردابڕین. ئەم ناوە کە بەهۆی باوبوونەکەی ناچارمان دەکات کە بەکاری بهێنین، هۆکاری زۆرێك لە سەلێشێواویەکانە. دووبارەی دەکەمەوە کە واژەی سامی، تەنیا بە خەڵکانێك دەگوترێت کە زمانەکانی عیبری، سوریایی، عەرەبی و هەندێك زاراوەی دراوسێکانیان قسە دەکەن؛ بەلام بە هیچ مانایەك ناتوانرێت بەو کەسانە بگوترێت کە لە بەشی دەیەمی کتێبی(گەشتی پەیدابوون) بە ناونیشانی منداڵانی شەم هاتوون، بە سامیان بزانین، لانی کەم دەکرێ نیوەی ئەوان بخەینە ناو نەژادی ئاریاییەکان." زمانناسێکی تری ئەڵمانی، نۆدلکە لە سەدەی نۆزدەیەمدا، ناونانی سامی بە یەهوودیەکان بە هەڵە دەزانێت، چونکە ئەوان لە زۆر لایەنەوە ببون بە ئەوروپایی.

لە دوای شکستهێنانی ئەڵمانیا لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا، بەسەردابڕانی سزا قورسەکانی شەڕ و هەستی ڕقلێبوونەوەی خەڵکی ئەڵمان و قەیرانی ئابووری ڕیشەدار لە دەیەی بیست و سی سەدەی بیستەم لە ئەڵمانیا، حزبی نازی دەستەلاتی گرتە دەست. تیۆری هیتلەر لەبارەی ناخۆشی بۆ ئەڵمانەکان دەیگەڕاندەوە بۆ پیلانی یەهوودیەکان و لەم ڕووەوە هیتلەر، لەناوبردنی نەژادی بە هەنگاوی یەکەم دەزانی لە چارەسەرکردنی قەیرانی ئەڵمانیادا. ئەو لە شەڕدا دەینووسی: "یەهوودیەکان لێپرسراوی هەموو شتێکن... یەهوودیەکان هۆکاری بەدبەختی و ناخۆشی ئێمەن." ژان پۆل سارتەر لە نووسینەکەی خۆیدا بە ناوی(چەند تێڕامانێك بۆ مەسەلەی یەهوود) ئەم پێناسەیە بە ئەنتی سمیتیزم باس دەکات: "ئەگەر کەسێك تەواوی بەدبەختییەکانی خۆی یان بەشێکیان بگەڕێنێتەوە بۆ بوونی یەهوودیەکان لە کۆمەڵگەدا، ئەگەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، یەهوودییەکان لە هەندێ ماف خۆیان بێبەش بکات، وەکو نەهێشتنی ئەنجامدانی چالاکی ئابووری، کۆمەلایەتی، دەریان بکات لە وڵات و یان بە کۆمەڵ بیانکوژێت، دەڵێین کە ئەم کەسانە دیدی ئەنتی یەهوودیان هەیە." چەندین سەدە پێش هیتلەر، کەنیسە بۆ زاڵبوون

بەسەر هەژاری و تاعووندا، شۆڕشی شەڕەکانی خاچپەرستانی دروستکرد و جوتیارانی سەردەمی ڤاتوقڕی و لاتەکانی ئامادەکرد بۆ وەرگرتنەوەی وڵاتی پیرۆز لە موسڵمانەکان. قەشە خاچپەرستەکان برەویان بەم دورشمە دا کە: بۆ دەبێ ئێمە بچینە ئەوبەری دونیا تا لەگەڵ میللەتانی تر شەڕ بکەین، بەڵام کەسانێك کە زۆرترین دوژمنکاریان لەگەڵ مەسیح هەبووە و لەوڵاتی خۆماندا دەژین، دەستیان لێ نەدەین. دەرەنجامی ئەم بانگەشەیە، کوشتار و بەتاڵان بردنی یەهوودیەکان بوو بە دریژایی قەراغی راین لە لایەن سوپای خاچپەرستەکانەوە. هیتلەر هەمان بەڵگەی دووبارە هێنایەوە گۆڕێ، ئەنتی سمیتیزم وەکو شێوازێکی فیکری نەخۆش لە کۆڕوکۆبوونەوە رۆشنگەرییەکان بانگەشەی بۆ دەکرا، بوە بڕیارێکی کارپێکراوی سیاسی لە وڵاتی ئەڵمانیادا. حزبی نازی لەگەڵ ئەوەی دەستەڵاتی گرتەدەست، دەستی کرد بە سنووردارکردنی ماف هاوڵاتییە یەهوودیەکان، تەنانەت فیزیا و بیرکاری ئەنیشتاینیش بە ناونیشانی فیزیای یەهوودی مەحکوم کرا. لە کتێبی سوزان بەرلین، نووسینی فەیلەسووف و بیرمەندە یەهوودیەکانی ئەورووپا سوتێندران و لەو شەوەی کە بە "شەوی شووشە" ناسراوە، پەرستگای یەهوودیەکان ئاگریان تێبەردرا و تەوراتەکان سوتێندران.

ئەنتی یەهوودی جۆرە هیستریایەکی تاکی و دەستەییە و رەخنەگران ئەو نەخۆشیەیان بە نەخۆشی دەروونی دەستەیی زانیوە. سۆل فریدلاندەر بە لێکۆڵینەوەی راپۆرتە سەرینیی و پراکتیکیەکانی رێبەرانی نازی و نەخۆشانی ئەنتی سمیت، دەگاتە ئەو ئەنجامەی دژە یەهوودیەکانی دەمارگرژ زۆربەیان، پەرێشانیەکی جیدیان هەیە لە رەفتار و کەسایەتیاندا. بە تایبەتی ڤاگنەر، مۆسیقازانی نازی، بە گوتەی ژیاننامەنووسان ئەو تووشی نەخۆشیەکی دەروونی تۆڵەسەندنەوە ببوو. سەرگی نیلۆس، رۆژنامەنووسی پلە سێی رووسی کە بە فەرمانی ئاسایشی تزارەکان لە سەدەی نۆزدەیەمدا کتێبی ساختەی "پرۆتۆکۆلی پیرانی سیون" ی نووسی و ئەو شتانەی وەکو نهێنیەکانی پشتی پەردەی یەهوودیەکانی جیهان بڵاوکردەوە (کە ئەمڕۆش هێشتا پایەی ئەنتی سمیتیزم لە وڵاتە دواکەوتوو و بێئاگاکان هەیە)، بە گەواهی پزیشکان، تووشی وەهمەکانی پارانۆیا بوە و بەردەوام لە مەزرای عەقڵ و شێتی ڕۆیشتوە. زیگمۆند فرۆید، ئەنتی سمیتیزم بە تێرنەبوونی خواستی هێرشبردنی مرۆڤی کۆمەڵایەتی دەبەستێتەوە و دەنووسێت: "مرۆڤەکان ناتوانن ئاشکرا و بە ئاسانی خواستی هێرشبردنی دەروونیان دابمرکێننەوە. ئەوانەی لە تێرکردنی ئەم خواستە قەدەغە کراون، هەست بە ناڕەحەتی دەکەن. چەند کۆمەڵگەیەکی بچووك ئەم دەستکەوتەیان هەیە کە غەریزەی هێرشبردن تیایاندا دەتوانێت لە ڕێگای دوژمنکاریی لەگەڵ کەسانی دەرەوەی گرووپ وەدیار بخەن."

ئەو ئەنتی یەهوودیانەی کە دەتوانن پێشداوەرییەکانی زەینی خۆیان پراکتیزە بکەن، زۆربەیان لە لێکۆڵینەوە دەروونییەکان گرێی ئۆدیپیان لەخۆیاندا نیشان داوە. ئەوان کە یەهوودیەکان بە باوکی مەسیحییەکان دەزانن، بەرانبەری ئەو باوکایەتیە هێماییە حاڵەتی هێرشبردنیان هەیە. سۆل فریدلاندەر ئەفسانەی ئازاردانی منداڵ لە لایەن یەهوودیەکانەوە، بە ڕەنگدانەوەی ئەو ترسە نەخۆشانەیە لە باوکی ستەمکار دەزانێت. تیۆدۆر ئادورنۆ و مەکس هۆرکهایمەر لە وتارە بەناوبانگەکەی خۆیدا بە ناوی "ڕەگەزەکانی

ئەنتی سمیتیزم" کە بەشی کۆتایی نووسینەکەیان بە ناوی "دیالیکتیکی ڕۆشنگەری"یە، پەیوەندی ئەنتی یەهوودی لەگەڵ پارانۆیای خەساندن باس دەکات، چونکە یەهوودیەکان خەتەنەکردن بە نەریتی ئیبراهیم و بە پێویستی دەزانن. ژان پۆل سارتەریش هەر کەسێکی ئەنتی یەهوودی لە بوونی خۆیدا بە یەك بکوژ دەزانێت کە هەرچەند خواستی کەسەکە بۆ کوشتن دەشارێتەوە، بەڵام ڕقلێبوونەوە و ئازار و بێبەشکردنی یەهوودیەکان بۆ ئەو، هێمایەکە بۆ کوشتن دەژمێردرێت. سارتەر دەنووسێت: "ئەنتی سمیت کەسێکە کە دەیەوێت بێڕەحم بێت، گەردەلولێکی توورە، زریانێکی وێرانکەر بێت بە هەموو شتێك بێت جگە لە مرۆڤ."

ئەوەی نازییەکان دوای دەستەڵات گرتنە دەست، نەك تەنیا لەگەڵ یەهوودیەکان، بەڵکو لەگەڵ گەلانی ئەورووپا کردیان، دەستەواژەی "نازی" لە هەموو فەرهەنگەکان، تەنانەت لە وڵاتە عەرەبییەکان، لەژێر کاریگەری سۆڤیەتی دەیەی پەنجا، هاومانای خوێنخۆر، ڕەوشت نزم، و ئازارەکانی تری دروستکرد. دەرەنجامی ئایدیۆلۆژیی نەژادی نازییەکان، ئەزموونە پزیشکییە ناخۆشەکانی منداڵانی یەخسیر، داهێنانی شێوەکانی ئەشکەنجە و دانپێدانان و بەرپاکردنی دەزگاکانی جەهەنەمی کوشتارە ملیۆنییەکان بوو. هەموو ئەوانە، خۆیان تاقیگەیەك بوون کە ئەگەری زیندانیکردن و تاکیەتی مرۆڤ و خستنە قەفەسی سەربەستی مرۆڤەکانی تێدا تاقیکرایەوە. لەگەڵ ئەم هەموەشدا، سەرەنجام، ئەمە نە سەربەستی و تاکیەتی مرۆڤایەتی، بەڵکو ئادۆڵف ئایشمەن بوو کە بە قەفەسی شوشەیی دادگا سپێردرا.

**سەرچاوە:**

سایتی "ایران امروز" - بەرواری ٢٠٠٦/٣/٢٥.





# فایلی تایبەت..

## جان ماری گۆستاڤ لۆکلیزیۆ

## خاوەنی خەڵاتی نۆبڵی ئەدەب

## بۆ ساڵی ٢٠٠٨










# نیكۆلا ساركۆزی:

## جان ماری گۆستاڤ لۆكلیزیۆ هاوڵاتییەكی جیهانییە و كوڕی هەموو كیشوەرەكانە

ئامادەكردنی: هەورامان وریا قانع

وەك چاوەڕوان دەكرا نوسەری فەرەنسی " جان ماری گۆستاف لۆكلیزیۆ "تەمەن ٦٨ ساڵ، خەڵاتی نۆبلی بۆ ئەدەب وەرگرت، لەمڕۆدا ئەم نوسەرە بەپەیكێك لە كۆڵەكە هەرە گرنگەكانی ئەدەبی فرانكفۆنی دادەنرێت، خاوەنی بەرهەمێكی ئێجگار زۆرە، لە فەرەنسا ڕێزێكی زۆر لە بەرهەمەكانی دەگیرێت و پێشوازییەكی باشییان لێدەكرێت. ئەم نوسەرە لە ناوەندە ڕۆشنبیرییەكاندا ئامادەییەكی باشی هەیەو بەوە ناسراوە كە ڕەخنەی توند لە ڕۆژئاوای مادیی دەگرێت و یەكێكە لەو نوسەرە ئەوروپییانەی زۆر دژی هەیمەنەی ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوایە، هەروەها بەوە ناسراوە كە ئارەزوویەكی لەڕادەبەدەری بۆ سەفەركردن و گەڕان هەیە. كۆمەڵێ ڕۆشنبیری عەرەب خۆشحاڵبوون بەوەی ئەو ڕۆماننوسە فەرەنسییە خەڵاتی نۆبلی ئەم ساڵی ئەدەبی پێبەخشرا، تەنانەت هەندێك لەو ڕۆشنبیرانە دەڵێن ئەم نوسەرە (كوڕی گەڕەكی خۆمانە)و عەرەبی خۆشدەوێت و لە نوسینەكانیدا پشتگیری لە كێشەی فەلەستین دەكات.

لەپاڵ " جان ماری گۆستاڤ لۆكلیزیۆ " كۆمەڵێ ناوی دیكە هەبوون كە پاڵێورابوون بۆ وەرگرتنی خەڵاتی نۆبلی ئەمساڵ، لەوانە ژنە ڕۆماننوسی جەزائیری "ئاسیا جەبار"و "سیس نۆتبوم"ی هۆڵەندی و "مارگرێت ئاتوود"ی كەنەدی و "هێرتا مۆلەر"ی ئەڵمانی كە بەڕەگەز ڕۆمانییە. جگە لەو خانمانە كۆمەڵێ نوسەری پیاویش پاڵێورابوون لەوانە شاعیری كۆری "كو ئون"، ڕۆماننوسی مەكسیكی "كارلۆس فۆینتس"و ڕۆماننوسی بۆلیڤی "ماریۆ فارگاس یۆسا".

### جان ماری گۆستاڤ لوكلیزیو كێیە؟

لە ١٣ نیسانی ساڵی ١٩٤٠ لە شاری (نیس) كە دەكەوێتە باشوری فەرەنسا لە باوكێكی بەریتانی بەڕەگەز بریتۆنی و دایكێكی فەرەنسی لەدایكبووە، باوكی لە دارستانەكانی ئەفریقا پزیشك بووە، ئەندامانی ئەم خێزانە پێش ئەوەی لە ساڵی ١٩٤٨ پەیوەندی بە باوكیانەوە بكەن كە لە نێجیریا بووە، " لوكلیزیو"ی منداڵ لەلای دایك و داپیری بووەو ئەوان بەخێویان كردووە، ئەم

قۆناغە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر " لوکلیزیو" هەبووەو وایکردووە ڕوویکاتە خوێندنەوەو نوسین، لەم قۆناغەدا بەهۆی ئەو هەموو کتێبەوە کە ماڵەکەیانی پڕ کردبوو، ئاشنایەتی لەگەڵ کتێبدا پەیدادەکات، جگە لەو کتێبانە داپیرەکەی گەنجینەیەکی گەورەی چیرۆک بووەو بەردەوام چیرۆکو بەسەرهاتی بۆ گێڕاوەتەوە. ئەمانە وایانکردووە لە تەمەنی هەشت ساڵیدا، واتە لە ساڵی ١٩٤٨، کاتێ لەگەڵ خێزانەکەی فەرەنسا بەجێدەهێڵن و دەڕۆن بۆ نێجیریا، لەو گەشتەدا کە مانگێکی خایاندووە، یەکەم نوسینی خۆی بەناوی (گەشتێکی درێژ) دەنوسێت.

لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردودا بە سەفەر دەڕوات بۆ مەکسیکو پەنەما، لەوێ بۆ چەند مانگێک لەگەڵ هیندییەکاندا ژیان بەسەردەبات، سەبارەت بەو سەفەرەی دەڵێ: (ئەم ئەزمونە ژیانو بیرکردنەوەمی گۆڕی، بووە هۆی ئەوەی تێڕوانینم دەربارەی هونەرو هەڵسوکەوتکردنم لەبەرامبەر ئەوانی دیکەدا گۆڕانی بەسەردابێت، وایلێکردم بزانم چۆن دەڕۆمو ئاندەخۆمو دەنومو خۆشەویستی دەکەم، تەنانەت فێریکردم چۆن خەون ببینم).

لە نێوان ساڵانی ١٩٧٨-١٩٧٩ هەردوو کتێبی (ئەناساراوێك لەسەر زەوی)و (مۆندۆو چیرۆکەکانی تر) بڵاودەکاتەوە. کتێبی (مۆندۆو چیرۆکەکانی تر) سەرکەوتنێکی گەورە بەخۆیەوە دەبینێت، (ئەم کتێبە لەلایەن "کافییە جەوانرودی"یەوە کراوە بەکوردیو دەزگای چاپو پەخشی سەردەم لە ساڵی ٢٠٠٣ بڵاویکردوەتەوە-و-).

ئاشکرایە ئەم ئەدیبە فەرەنسییە یەکێکە لەو نوسەرە بەهەڵوێستانەی پشتگیری لە میللەتو کەمینە چەوساوەو ستەملێکراوەکان دەکات، ئەم نوسەرە کاتێ لە هەشتاکاندا بەشێك لە ڕۆمانی (ئەستێرەیەکی ونبوو)ی لە گۆڤاری (الدراسات الفلسطينية) چاپە فەرەنسییەکەی، بڵاوکردەوە، ناوەندە ئیسرائیلیەکان لە فەرەنسا، وەك چۆن پێشتر لەدژی "جان جینیە" ڕاوەستان، بەهەمان شێوە لە دژی " لۆکلیزیۆ" ڕاوەستانو بەوە تۆمەتباریان کرد کە دژایەتی سامییەت دەکات، چونکە لەو ڕۆمانەیدا باس لە کۆچکردنی جوولەکە بۆ فەلەستین دەکات و باس لە بارودۆخی خراپی پەنابەرانی فەلەستینو دانیشتوانی ئۆردوگاکان دەکات، جگە لەوە ئەم نوسەرە پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ هیندییە سورەکانی ئەمریکاو ئەمریکای لاتینیدا هەیە، تەنانەت بەشی زۆری ڕۆمانەکانی بەزۆری باس لە خەڵکانی پەراوێزخراو دەکات، ئەو لە نوسینەکانیدا بەشوێن (دەنگی ئەوانی دیکەدا) دەگەڕێت.

ساڵی ١٩٨٠ ساڵی ناوبانگدەرکردنی ئەم نوسەرەیە، لەو ساڵەدا ڕۆمانی (بیابان) بڵاودەکاتەوە، بەلای ئەکادیمیای سویدییەوە ئەم ڕۆمانە: (وێنەیەکی نایاب لەسەر ئەو کەلتوورە پێشکەشدەکات کە لە بیابانی باکوری ئەفریقادا ونبووە)، لەسەر ئەم ڕۆمانە خەڵاتی کۆنکۆر وەردەگرێت، هەر لە هەمان ساڵدا ڕۆمانی (سێ شارە پیرۆزەکە) بڵاودەکاتەوە. خاوەنی خەڵاتی نۆبڵی ئەمساڵ چەند کتێبێکی بۆ منداڵانیش نوسیوە، لەوانە (لولابی) ساڵی ١٩٨٠، (بالابیلۆ) ساڵی ١٩٨٥. جگە لەم خەڵاتەی ئەمساڵ، پێشتر هەر لە فەرەنسای نیشتیمانی چەند خەڵاتێکی دیکەی وەرگرتووە، وەك خەڵاتی (لاریۆ) ساڵی ١٩٧٢، خەڵاتی (جان جینیەی گەورە) ساڵی ١٩٩٧.

"جان ماری گۆستاڤ لوکلیزیۆ" یەکێکە لەو ئەدیبانەی لەهیچ شوێنێکدا ئۆقرە ناگرێتو وەك کۆچەری وایەو هەمیشە لەگەڕانو سوڕاندایە. ئەم نوسەرە ناسراوە چەند ساڵێکە لە فەرەنسا پێگەیەکی گەورەو بەرزی داگیرکردووە، بەچاوی ڕێزو ستایشەوە لێیدەڕوانن، یەکێکە لەو ئەدیبە

دەگمەنانەی بەرهەمەکانی پێشوازییەکی زۆری لێدەکرێت و ژمارەیەکی زۆریشی لێدەفرۆشرێت. ئەم ڕۆماننوسە مەزنە گەرچی تەمەنی گەشتووەتە شەست و هەشت ساڵ، کەچی لەگەڵ ئەوشەدا بە باڵا بەرزو چاوە شینەکانییەوە وەك گەنجێك دەردەکەوێت. کەم قسە دەکات، بەڵام کاتێ قسە دەکات وشەکانی بەجوانی هەڵدەبژێرێت و بە ڕوونی و متمانەیەکی زۆرەوە دەریاندەبڕێت. بەهۆی ئەوەی حەزێکی زۆری لە سروشتە و هۆگری ڕۆشنبیرییە کۆنەکان و ئاسۆ دوورەکانە، نازناوی (گەڕیدەیەکی نوسەر) و (هندییەك لە شارەکەدا)ی لێنراوە، لە کارەکانیدا جیهانێکی خەیاڵی پێکهێناوە، جیهانێك تێیدا لەگەڵ هیندییە سورەکانی پەنەمادا قسەدەکات، هەر لەو جیهانە خەیاڵییەی خۆیدا دەشتەکییەکانی باشوری مەغریب تێکەڵ بە کۆیلە ڕاکردووەکانی دورگەی (مۆریشیۆس) دەکات.

بەرهەمەکانی بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان وەرگێڕدراوە، لەو بەرهەمانەیدا حەزێکی زۆری نوسەر بۆ جیهانە سەرەتاییەکان دەردەکەوێت، تاکو ساڵانی هەشتاکان وەك نوسەرێکی تەلیعی و یاخی دەبینرا، لە نوسینەکانی ئەو سەردەمەیدا قسەوباسی لە چارەسەرکردنی شێتی و زمان و پرۆسەی نوسین کردووە، دواتر نوسینەکانی شێوازێکی هێمن و ڕونتر لەخۆدەگرن، بابەتەکانی منداڵی و حەزی گەڕان و بایەخدان بە کەمایەتییەکان، دەبنە ئەو بابەتە سەرەکییەکانەی لە نوسینەکانیدا گرنگییەکی زۆریان پێدەدات. لە زانکۆیەکی بەریتانیا فێری زمانی ئینگلیزی دەبێت، دوای ئەوەی بڕوانامە لە ئەدەبدا وەردەگرێت، لە زانکۆی (بریستۆل) و پاشان لە زانکۆی لەندەن وانە دەڵێتەوە، جگە لەو دوو زانکۆیە، لە پەیمانگا جۆراو جۆرەکانی شارەکانی بانکۆك و مکسیکۆ و بۆستن وەك مامۆستا وانەی وتوەتەوە. " لۆکلیزیۆ" دەڵێ: (من واهەستدەکەم لەسەر ئەم گۆی زەوییە شتێکی بچوکم، ئەدەب یارمەتیم دەدات گوزارشت لەو شتە بچوکە بکەم. گەر موجازەفەم کردو قسەم لەسەر بواری فەلسەفە کرد، ئەوا لە کلۆڵێکی شوێنکەوتوی ڕۆسۆ دەچم کە هیچ تێناگات).

"جان ماری گۆستاڤ لۆکلیزیۆ" یەکەم ڕۆمانی خۆی (مەحزەرێکی ڕەسمی)لە ساڵی ١٩٦٣ بڵاوکردۆتەوەو خەڵاتی (ڕەنۆدۆ)ی لەسەر وەرگرتووە. دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٤دا لێکۆڵینەوەیەك لەسەر "هێنری میشۆ" بە ناونیشانی (تەنیایی لە کارەکانی هێنری میشۆدا) بڵاودەکاتەوە، بڕوانامەی دبلۆمی باڵای لەسەر وەردەگرێت. ساڵی ١٩٦٥ کتێبی (پەتا) بڵاودەکاتەوە، ئەم کتێبە بریتییە لە نۆ چیرۆك، چیرۆکەکان باس لە مەسەلەی شێتی دەکەن. ساڵی ١٩٦٧ ساڵێکی گرنگە لە ژیانی ئەم نوسەرە گەورەیەدا، لەو ساڵەدا بۆ بەجێهێنانی خزمەتی سەربازی دەینێرن بۆ بانکۆك، بەڵام لەبەرئەوەی لە بانکۆك قسە بۆ ڕۆژنامەی (فیگارۆ)ی فەرەنسی دەکات و باس لەوەدەکات لە تایلەند بازرگانی سێکس بە منداڵەوە دەکەن و منداڵ بۆ کاری بەدڕەوشتی بەکاردەهێنن، لە بانکۆك دەردەکرێت و دەنێردرێت بۆ مەکسیك.

لە مەکسیك دەستدەکات بە ئیشکردن لەسەر کەلتوری هیندییە سورەکان. لەنێوان ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤ لە هەرێمی (دارین)ی سەر بەوڵاتی پەنەما، لەگەڵ هیندییە سورەکانی ئەو هەرێمەدا ژیانی بەسەربردووە، سەبارەت بەو ئەزموونەی دەنوسێ: (هەستم بە شۆکێکی گەورەو قورس کرد، کەشوهەوایەکی زۆر گەرمی هەبوو، دەبوایە مارەی درێژ درێژ بە پێ بڕۆم، پێویست بوو لەسەرم ببمە کەسێکی توندو زیرو ڕەق. لەو چرکەساتەوە، ئەو چرکەساتەی پێم خستە ئەو جیهانە، چیتر وەك بونەوەرێکی عاقڵ نەمامەوە، دواتر ئەم ناعەقڵانییە لە هەموو کتێبەکانمدا

ڕەنگدەداتەوە). بەم شێوەیە " لۆکلیزیۆ" کۆمەڵێک کتێب دەربارەی مەکسیک و هیندییە سورەکان دەنوسێت، لەوانە (پێشبینییەکانی شیلام بالام) ساڵی ١٩٧٦، (خەونی مەکسیکی) ساڵی ١٩٨٥، (گۆرانییەکانی جەژن) ساڵی ١٩٩٧..هتد.

" لۆکلیزیۆ" لە کارەکانیدا هەوڵدەدات ئەفسانەی درۆزن و وێرانکەری جیهانی خۆرئاوا ڕەتبکاتەوە و خۆی لەدەست مەرج و پێدراوەکانی بەسووربگرێت، لەبارەیەوە دەڵێت: (لەمیانەی پەیوەندییەکانم لەگەڵ هیندییە سورەکاندا، ئەو وێنەیەی سەبارەت بە زەمەن هەمبوو، گۆڕانی بنەڕەتی بەرسەردا هات، پێشتر لە زۆر شت دەترسام کە لە ئێستادا چیتر لێیان ناترسێم، لەوانە ترس لە مردن، نەخۆشی، دودڵی بەرامبەر بە ئاینده، من ئێستا لەو شتانە ناترسێم. هەنوکە بیرۆکەی ئەوە دەمترسێنێ کە مندالەکانم لەوانەیە توشی نەخۆشی ببن یاخود بمرن، هەروەها لەو جەنگە بێهودە یاخود لەو جەنگە وەحشیانە دەترسم کە بینیمانن، هەروەها لە ئەگەری ڕودانی کارەساتی سروشتی دەترسم. ئێمە لەبەردەم ئەوەکانی داهاتودا تەواو بەرپرسیارین.. گەر فێرببین وەک هیندییە سورەکانی ئەمریکا یاخود وەک دانیشتوانی بیابانەکان بژین، ئەوا بەدڵنیاییەوە هەرگیز توشی ئەم هەموو کارەساتە نابین. زۆر پێویستە گوێ لە دەنگی ئەوانی دیکە بگرین، گوێ لەو دەنگانە بگرین کە لێناگەڕێن پێمانبگەن، دەنگی خەڵکانێک لەبەرئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ سوکایەتیان پێکراوە، یاخود لەبەرئەوەی ژمارەیان کەمە، نایانبیستین. بەڵام ئەو دەنگانە شتگەلێکی زۆریان هەیە کە دەکرێ لێیانەوە فێرببین).

لێرەوە بەشی زۆری کارەکتەری ڕۆمانەکانی لە جیهانێکی وێڵی پڕ گەڕان و سوڕاندا دێن و دەچن، زۆرجار ئەم کارەکتەرانە کەسایەتی هەرزەکاری پاک‌وبێگەرد، لەهەمانکاتدا زۆر توندو دڵڕەقن. ئەرکی ئەوەیان لەسەرشانە بەسەر نەهامەتی و سەختییەکاندا سەرکەون، تاکو هەم جیهان و هەم خۆشیان لە گەندەڵی و هەرەسهێنان ڕزگاربکەن. هەروەها ڕەگەزی مێ لەکارەکانیدا ئامادەییەکی بەرچاوی هەیەو شوێنی گرنگیپێدانە، ئەوە ڕەگەزی مێیە یادەوەری و ئەزمون و پاکیەتی دەگوێزێتەوە. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەبدرێت کە "لۆکلیزیۆ" لەگەڵ هاوسەرەکەی کە بەڕەگەز خەڵکی بیابانی مەغریبە، کتێبێک بەناوی (اناس الغمام) بلاودەکەنەوە، لەو کتێبەدا بەسەرهاتی گەشتەکەیان لە بیابانی ڕۆژئاوا دەگێڕنەوە، "لۆکلیزیۆ" سەبارەت بەو گەشتەیان دەڵێ: (من بەرەو نادیار دەڕۆشتم، بەڵام جیمای هاوسەرم بەرەو ڕابردوی خۆی دەگەڕایەوە).

سکرتێری ئەکادیمیای سویدی لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا کە بۆ ئاشکراکردنی ناوی براوەی خەڵاتی نۆبڵی ئەمساڵ سازیکردبوو، دەڵێ: (کارەکانی خەسڵەتێکی جیهانیان هەیە، ڕاستە ئەو پیاوێکی فەرەنسییە، بەڵام لەهەمانکاتدا سەفەر زۆر دەکات و هاوڵاتی و گەڕیدەیەکی جیهانییە). ماوەیەکی درێژە "لۆکلیزۆ" لەگەڵ هاوسەرو هەدوو مندالەکەی لە شاری نیو مەکسیکۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەژی، دەڵێن "لۆکلیزیۆ" ڕۆژنامە ناخوێنێتەوە و گوێ لە ڕادیۆ ناگرێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە ئەو لە فەرەنسا دابڕاوە، چونکە زۆرجار سەردانی شاری نیس و خانووەکەی لە ناوچەی بریتانیا کە دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای فەرەنسا دەکات.

سەرچاوە:

ڕۆژنامەی القبس، ژمارە ١٢٧٢٥

ماڵپەری www.echoroukonline

ماڵپەری: www.Google

# زمانی فەرەنسی تاقە وڵاتی راستەقینەی منە

گفتوگۆیەك لەگەڵ جان ماری گۆستاڤ لوكلیزیۆی

خاوەن خەڵاتی نۆبڵی ئەدەب بۆ ساڵی ٢٠٠٨

---

سازدانی گفتوگۆ: تیریانکر شاندا

لە عەرەبییەوە: ساكار رەئوف

---

جان ماری گۆستاڤ لوكلیزیۆ پێگەیەكی ناوازەی لە ئەدەبی فەرەنسیدا داگیركردووە لە پاڵ گروپ و قوتابخانەو شێوازە ئەدەبییەكان. لوكلیزیۆ لەنێو كلتووری فەرەنسیدا گەورە بووەو لەبەرئەوەی لەیەك كاتدا فەرەنسی و مورشیوسییە، بەو پێیە زۆر باش شارەزای ئەدەبی ئەنگلۆ-ساكسۆنی بووە، هەربۆیە ئەم رۆماننوسە لای ئەوە لێنەدا كە سروشی ئەو هەڵێنجاوی تەنها لوتریامون و زۆلا نییە بەڵكو ستیڤنسون و جویسیشە. لە راستیشدا هەر لە یەكەم رۆمانیەوە (كۆنوسی رەسمی ساڵی ١٩٦٣) كە بەهۆیەوە خەڵاتی(رۆندۆ)ی پایە بەرزی لە تەمەنی ٢٣ ساڵیدا پێبەخشرا، هەر لەو كاتەوەش نووسینەكانی تا رادەیەكی زۆر گۆڕانیان باسەردا هاتوە.

بەرهەمەكانی نووسەر كە زیاد لە سی كتێب لەخۆ دەگرێ لەنێوان (رۆمان، وتار، كۆمەڵە چیرۆك و كاری وەرگێڕان) رەنگدانەوەی خولیای ئەو ناوەندو ژینگەییە كە تیا دەژی و یاخیبوونێتی لەسەر دەمارگیریی هزری ئەقڵانی خۆرئاوا، شەیدابوونێتی بە جیهانی هیندیە ئەمریكیەكان كە ئەم لە تەمەنێكی كەمدا پەی پێبردن. وەك خۆی لە وتارە ناوازەكەیدا دەربارەی (دۆخی هیندیە ئەمەریكیەكان)( خانەی گالیمار ١٩٩٧)دا نووسیبووی (ئەم ئەزموونە ژیان و بیركردنەوەمی سەبارەت بە جیهان و هونەر گۆڕی، هەڵسوكەوتكردنم بەرامبەر بە خەڵك، شێوازی رۆشتنم، نانخواردنم، خەوتنم، خۆشەویستی كردنم، تەنانەت شێوازی خەوبینینیشمی گۆڕی). لوكلیزیۆ لە رۆژنامەی (لیبل فرانس)دا باس لەم چاوپێكەوتنە چاوەڕواننەكراوە و لە رەچەڵەكە موریشیۆسیەكەی و تێڕوانینی خۆی سەبارەت بە پەیوەندی نێوان رەگەزەكان و بیروڕای خۆی لەسەر ئەدەب و رۆمان، دەكات.

***لیبل فرانس: بەرهەمەکانت بە سۆفیەت و فەلسەفی و تەفانەت ژنگەییەیش وەسف دەگری، ئایا لەمیانەی ئەم وەسفانەوە خۆت دەناسیت؟**

—لوکلیزیو: ئەستەمە وەسفی ئەو شتە بکەم کە تۆ کردت، ئەگەر پێویست بێت گرنگی کتێبەکانم دەستنیشان بکەم، ئەوا دەبێ بڵێم کە زۆر لە خۆم دەچن. زۆر گرنگ نییە بەلامەوە وەسفی ئایدیاکان بکەم هێندەی گرنگیدانم بە وەسفی خۆم و ئەو شتەی کە باوەڕم پێیەتی. کە دەنووسم بە پلەی یەکەم هەوڵ دەدەم راڤەی پەیوەندی خۆم لەگەڵ ژیانی رۆژانە و رووداوەکاندا بکەم. ئێمە لە سەردەمێکی پڕ لە کێشەو گیروگرفتدا دەژین کە ژمارەیەکی زۆر لە ئایدیاو وێنە دەستاودەستمان پێدەکەن، لانی کەم رۆڵی ئەدەب لە ئێستادا دەبێ دەنگدانەوەی ئەم هەراوزەنایانە بێت.

***لیبل فرانس: ئایا ئەدەب دەتوانێ کار لەم پشێویە بکات و لە بارێکەوە بۆ بارێکی دی بیگۆڕێ؟**

—لوکلیزیۆ: ئێمە چیتر زاتی ئەوە ناکەین، وەك خەڵکانی سەردەمی سارتەر، باوەڕ بەوە بێنین کە رۆمان دەتوانێ جیهان بگۆڕێ. نووسەرەکان ئەمڕۆ تەنها دەتوانن نەزۆکی سیاسی خۆیان تۆمار بکەن. کاتێ سارتەرو کامۆ و دوس پاسوس یان شتاینبیك دەخوێنیتەوە، دەتوانی بەڕوونی ئەوە ببینی کە ئەم نووسەرە مەزنانە متمانەی تەواویان بەداهاتووی بەشەریەت و بە هێزی وشەی نووسراوەوە هەبوو، بەبیرم دێ کاتێ تەمەنم هەژدە ساڵان بوو، هەندێ سەروتارم خوێندەوە کە سارتەر، کامو و موریاك لە رۆژنامەی (ئیکسپرێس) نووسیبوویانن. ئەمانە چەند چراوگێك بوون ڕێگایان رۆشن کردەوە. ئایا کەس دەتوانێ لەم رۆژەدا وێنای ئەوە بکات کە سەروتارێك لە رۆژنامەیەکدا دەتوانێ چارەسەری ئەو کێشانەی ژیانی رۆژانەمانی داغان کردووە، بکات؟ ئەدەبی هاوچەرخ بریتییە لە ئەدەبی نائومێدیی.

***لێبل فرانس: ئەگەر خەڵك وابزانێ کە تۆ نووسەرێکی ناخرێتە ژێر هیچ پۆلێنکردنێکەوە، لەوانەیە ئەمەش لەبەرئەوە بێت کە فەرەنسا چیتر تاقە سەرچاوەی ئیلهامبەخشی تۆ نییە، رۆمانەکانت بەشێکن لە جیهانێکی فەنتازیای بەجیهانیبوو، کەمێك لە بەرهەمەکانی رامبۆ یان سیگالین دەچن، کە ئەم دوو نووسەرەش، رەخنەگرانی ئەدەبی فەرەنسی بە زەحمەتی دەزانن پۆلێنیان بکەن.**

—لوکلیزیۆ: سەرەتا ئەبێ ئەوە بڵێم کە من هەرگیز بێتاقەت نابم بەوەی ناخرێمە ژێر هیچ پۆلێنکردنێکەوە. بە بۆچوونی من سیفەتی سەرەکی رۆمان ئەوەیە کە قابیلی پۆلێنکردن نییە، بە واتایەکی تر، رۆمان رەگەزێکی ئەدەبی فرە شێوەیە، بەشێکە لە تێکەڵەیەك. شەرابێکە مەوێنەکەی بیروبۆچوونی جیاجیایە، دواجار رەنگدانەوەی ئەو جیهانە فرە جەمسەرەی ئێمەیە. من وەك تۆ پێم وایە دەزگای ئەدەبی فەرەنسی میراتگری ئەو شتەیە کە پێی دەوترێ ئایدیا گەردوونییەکانی ئینسایکلۆپیدیا. بەردەوام ئەنگێزەیەکی هەبوو کە مایەی دڵتەنگی بوو ئەویش بە پەراوێزخستنی هەموو ئەو ئایدیایانەی لە جێگایەکی تر بهاتایە بە بیانووی ئەوەی ئەو ئایدیایانە (نامۆن). رامبۆ و سیگالین لە کاتی خۆیدا باجی ئەمەیان دا. ئەو نووسەرانەی سەر بە وڵاتانی پاشووین تائێستاش بەرهەمەکانیان کاتێ بەچاپ دەگەیەنرێ کە خۆیان رازی بن بەوەی بخرێنە خانەی (نامۆ)کانەوە. ئەو نموونەیەی ئێستا لەبیرمدایە، نووسەری مورشیوسی (ئاناندا دیفی)ە کە داکۆکیم لە بەرهەمەکەی کرد ئەو کاتەی لە لیژنەی هەڵسەنگاندنی خانەی (گالیمار) بوو. پەرچەکرداریشیان ئەوە بوو کە دەستنوسەکەی وەکو پێویست نامۆ نەبووە!

***لیبل فرانس: بۆچی هێندە شەیدای کلتوری تری؟**

– لوکلیزیو: کلتووری خۆرئاوا زۆر ئاشکرا بۆتە یەك قەوارەو هارمۆنییەکی گشتیش لەنێوانیاندا هەیەو ئاڕادەیەکی زۆریش جەخت لەسەر لایەنی ژیاری و تەکنەلۆژی دەکاتەوە، بەمەش دەبێتە ڕێگر لەبەردەم دروستبوونی شێوازی تری گوزارشت کردن. بۆ نموونە خواپەرستی و هەست و سۆز. لایەنە شاراوەکەی مرۆڤ بەتەواوی بە ناوی ئەقڵانییەتەوە فەرامۆش کراوە. پەی بردنم بەم ڕاستییە بەرەو شارستانییەتەکانی تر هانیان دام.

* لیل فرانس: ئەو شوێنەی لێت پشکنی، مەکسیك بەتایبەتی و جیهانی هیندیە ئەمریکیەکانیش بە گشتی جێگایەکی باو داگیر دەکەن، چۆن توانیت لەو شتانە بگەیت کە پەیوەندیان بە مەکسیکەوە هەبوو؟

– لوکلیزیۆ: بۆ خزمەتی سەربازی منیان ناردە مەکسیك، لەماوەی دووساڵی مانەوەم لەو وڵاتەدا دەرفەتی سەفەرکردنم هەبوو. بەتایبەتی سەفەرم بۆ پەنەما کرد، لەوێ چاوم بە (ئەمبیراس) کەوت. ماوەی چوار ساڵ (١٩٧٠-١٩٧٤) ژیانم لەگەڵ ئەو هیندیانەدا بەسەربرد کە لە دارستانادا دەژیان. ئەم ئەزموونە کاریگەرییەکی قووڵی هەبوو، لەبەرئەوەی شێوازێکی تری ژیانم دۆزییەوە کە هیچ پەیوەندییەکی بەو ژیانەوە نەبوو کە ئەبوایە لە ئەورووپا ئەزموونم بکردایە. ئەمبیراسەکان بە هارمۆنی لەگەڵ سروشت و ژینگەی خۆیان و لەگەڵ خۆشیاندا، بە بێئەوەی پێویستیان بە هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی شەرعی و دینی هەبێت، دەژیان. من ئەمەم بە پەشێوی زانی، کاتێکیش لە گەڕانەوەمدا ویستم باس لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایە بکەم، ڕەخنەگرەکان بە ساویلکەو زیادەڕۆ لە ساناکردنەوەی شتەکان و فریووخواردوو بە ئەفسانەی (مرۆڤی خانەدانی سەرەتایی) تاوانباریان کردم، کە ئەمەش هەرگیز ئەوە نەبوو من مەبەستم بێ. ناتوانم بەو هۆزەی لەگەڵیاندا ژیام بڵێم سەرەتایی یا خانەدان. ئەوان بەپێی پێوادانگی دیکەو بەهای تر دەژین.

* لیل فرانس: لە ئێستادا تۆ ژیانی خۆت لە نێوان بوکوریکو لە نیومەکسیکو، موریشیوس کە بنەماڵەکەتی لێوە هاتوەو شاری نیس کە تیایدا لەدایك بوویت و تا ئێستاش دایکت تیایدا دەژی، بەشکردووە. کاراکتەری ناو ڕۆمانەکانت هەروەك خۆت لەنێو کیشوەرەکاندا پەرتەوازەن. بۆ نموونە کۆمەڵە چیرۆکی (دڵێکی سووتاو و ڕۆمانسیاتی تر) هەندێ ڕووداوەکانی لە مەکسیکدان. بەشی یەکەمی ئەم کۆمەڵەیە، باس لە چیرۆکی دوو کچی گەنج دەکات کە لەمنداڵیدا لە مەکسیکدا ژیاون، منداڵییەکی ناخۆش و بەسوێ. پێدەچێ ئەم ڕابووردوە دوچاری دڵەڕاوکێی کردبن و تەواوی بیرکردنەوەی داگیرکردبن. ئایە ئەتوانین بڵێین کە ئەم دوو خوشکە قوربانیەکی ترن لە قوربانییەکانی ژیانی سەرەتایی؟

– لوکلیزیۆ: ئەوان قوربانی ئینتما بوونیانە بۆ دوو کلتووری جیاواز لە یەك کاتدا. ئەستەمە بۆ منداڵ کە پەیوەندی بە دوو کەلتووری جیاوازەوە هەبێ، وەك کەلتووری مەکسیکی کە بە ڕادەیەکی زۆر کەلتووری سەرشەقام وخێراو دەرەوەیە، لەگەڵ کلتووری ئەورووپی کە پشت بە ڕێساکانی ناوماڵ و قوتابخانە و دامودەزگا دەبەستێ. ئەوەی من ویستم باسی بکەم پێکدادانی کلتورەکان بوو.

* لیل فرانس: ئەی بۆ وشەی "ڕۆمانس"ت بەکار هێناوە؟

– لوکلیزیۆ: ئەوە تەنها وشەیەکی گاڵتەئامێزبوو بۆ وەسف کردنی هەندێ حاڵەتی تراژیدی. کتێبەکە لە حەوت چیرۆکی کورتی خەمناك پێکهاتووە. لە چیرۆکی ڕۆمانسیی خەیاڵیدا، هەست پێش هەقیقەتی کۆمەڵایەتی دەکەوێت. من پێم وایە ڕۆڵی چیرۆکی خەیاڵی، تیشك خستنە سەر ئەو هەڵخلیسکانە بەردەوامیە کە لەنێوان سۆزو جیهانی کۆمەڵایەتی واقیعیدا هەیە، لەلایەکی ترەوە هەموو چیرۆکەکانی ئەم کۆمەڵەیە پشتی بە ڕووداوی ڕاستەقینە بەستوە و

من هەستاوم بە گونجاندنی، کەوابوو چیرۆکی واقعین. توخمێك لە توخمەکانی (سۆزداری) تێدایە کە ئەتوانری لە رۆژنامەکانیشدا لە بەشی (کورتە هەواڵ) دا بیبینیت.

* لیبل فرانس: لە کتێبەکانتا سنووری نێوان جۆرەکانی ئەدەب تەمومژاوییە و زۆر دوورە لە گێرانەوەی رۆمان بەشێوەیەکی تەقلیدی. پێت وایە کە رۆمان بەو وەسفەی جۆرێکە لە جۆرەکانی ئەدەب و لەسەدەی نۆزدەوە بۆمان ماوەتەوە، هێشتا وابەستەی رەچەڵەکە بۆرژوازییەکەیەتی و ناتوانێ رەنگدانەوەی ئەو ئاڵۆزیەی جیهانی پاش مۆدێرنەو پاش گلۆبالی بێت؟

– لوکلیزیۆ: رۆمان بە تەواوی رەگەزێکی ئەدەبی بورژوازییە. بە درێژایی ساڵەکانی سەدەی نۆزدە، بە شێوەیەکی جەوهەری چارەنووسە خۆش و ناخۆشەکانی جیهانی بۆرژوازی بەرجەستە دەکرد. پاش ئەوەی سینەما پەیدابوو، ئەو رۆڵەی لە رۆمان دزی و ئەوەشی سەلماند کە رۆڵی ئەم لە دەرخستنی جیهاندا کاریگەرترە لە رۆڵی رۆمان. هەربۆیە نووسەرەکان خێرا هەوڵی ئەوەیان دا بواری رەگەزی رۆمان فراوانتر بکەن و وای لێبکەن تاڕادەیەك وەسفی ئایدیاو هەست و سۆزەکان بکات. دواتریش بۆیان دەرکەوت ئەم رەگەزە ئەدەبییە چەند نەرم و نیانەو بە ئاسانی خۆی دەداتە دەست ئەزموونی شێوازگەری، لەو کاتەوە ئەوە دوای ئەوە رۆمانیان تازەکردەوەو بژاریان کردو سەرلەنوێ دۆزینەوەیان بۆ کرد بە هێنانی توخمی نوێ بۆی. من ئێستا بیر لە رۆماننوسی مورشیۆسی (ئیهیمانیو ئونوث) دەکەمەوە کە بەم دواییە پاش ئەوەی وەرگێرانێکی نوێی کتێبی (لال باسینا)ی بڵاوکرایەوە توانیم درکی پێ بکەم. ئەم رۆمانە تاڕادەیەك (یوجین سو) ت بیردەخاتەوە. ئونوث فۆرمی تەقلیدی رۆمان بەکاردەهێنێ بەڵام کارێکی باشی کرد کە رەگەزی داستانئەنگێزو گۆرانی و ریتمی سەردەمی شیعریەتی هیندی تیا بەکار هێنا. دەرئەنجام (یەهودیە وێڵگەردەکە) و (نهێنیەکانی پاریس) و (رامایانا)م جارێکی تر خوێندەوە!

* لیبل فرانس: رۆمانەکانت هەروەها لایەنی بایۆگرافی تیایە. ئایا پێت وایە کە خۆت پارێزەری دۆکیومێنتی مێژووی تایبەتی خۆت و ئەزموونی تایبەتی خۆت بیت لە ژیاندا؟

– لوکلیزیۆ: ئەو دوو رۆماننووسەی هەرە پەسەندن لای من ستیفنسون و جویسن، کە ساڵە بەراییەکانی ژیانی خۆیان ئیلهامبەخشیان بووە. ئەوان لەرێی نووسینەکانیانەوە توانیان سەرلەنوێ ئەزموونی ژیانی رابووردووی خۆیان بکەن و و هەوڵیاندا لە هۆکارو چۆنێتیەکانی ئەو رابووردوە بگەن. سەرەوەختێك (یولیسیس)ی جویس دەخوێنیتەوە ئەو باری سەرنجەت لا دروست دەبێ کە ئامانجی جۆیس گێرانەوەی چیرۆکی ئەو ساتەی نەبوو، بەڵکو گوزارشت کردن بوو لە هەموو ئەوەی لە ناخیدابوو، هەموو ئەو شتانەی وایلێکرد بەو جۆرە بێت. رۆچووە ناو بێئەرخترین دەنگی شەقام و رۆحی کردەوە بەبەری بچووکترین مشتومڕەکانی، تەنانەت ئەو سزا جەستەییەی بە منداڵی لە قوتابخانە بەدەستیەوە دەیناڵاندو تا ئێستاش لێی نابێتەوە. هاوکات نایپۆلیش بەخەیاڵ دەگەڕێتەوە بۆ ساڵە سەرەتاییەکانی خوێندنی. ئەدەب کاتێ بەهێز دەبێ کە بتوانێ وەسفی هەستی سەرەتایی، ئەزموونی سەرەتایی، بیرۆکەی سەرەتایی و نامورادییە سەرەتاییەکان بکات.

* لیبل فرانس: ئەوەی بەرهەمە ئەدەبیەکانت دەخوێنێتەوە سەرنجی ئەوە دەدات کە کاراکتەرەکانت بەبۆچوونی خۆت، چاویان لە نیشتمانێك بڕیوە لەوەیو چەمکە تەقلیدی و بەرتەسکەکان بۆ نەتەوە. سەلمان روشدی باس لە (نیشتمانە فەنتازیکراوەکان) دەکات کاتێ وەسفی ئەو پەیوەندییە نوێیە دەکات کە نووسەری ئاوارگە دەیەوێ لە نێوان خۆی و ئەو

**وڵاتــەی لێــوەی هــاتووە دەیمــەزرێنێ. نیــشتیمانە فەنتازیکراوەکەت چۆنە؟**

لوکلیزیۆ: خۆم بە تاراوگەکراو دەزانم چونکە بنەماڵەکەم بەتەواوی مورشیوسیە. بۆ ماوەی چەند نەوەیەك لەسەر فۆلکلۆری مورشیوسی ژیاین، خواردنەکان، ئەفسانەکان، کەلتوری مورشیوسی، ئەم کلتورە کلتورێکی تەواو جیاوازە، تواناوەی هیندە لەگەڵ ئەورووپاو ئەفریقیادا.لە فەرەنسا لەدایك بووم و لەناو کەلتوری ئەو وڵاتەدا پێگەیشتم. بەدرێژایی ساڵانی گەشەکردنم بە خۆم دەوت کە شتێکی تر وڵاتە راستەقینەکەی خۆم بەرجەستە دەکات، رۆژێك لە رۆژان دەچمە ئەوێ و ئەزانم کە چۆن بووە. هەربۆیە هەمیشە لە فەرەنسادا تاراوەیەك خۆم بە (نامۆ) ئەزانم. لەلایەکی ترەوە، زمانی فەرەنسیم خۆش دەوێ کە بەلامەوە وڵاتی راستەقینەی خۆمە! بەڵام هەرچی پەیوەندی بە فەرەنساوە هەبێت وەکو نەتەوەیەك، ئەوا دەبێ ئەوە بڵێم کە من بەدەگمەن ئەبێ هەستم بەوە نەکردووە کە جیاوازی لەنێوان فەرەنسی ئەژادێك و پەنابەرێکا بکات.

*** لیبل فرانس: وا بزانم باوو باپیرانت فەرەنسی بوون؟**

– لوکلیزیو: لەڕاستیدا بنەماڵەی لوکلیزیۆ لە رەچەڵەکدا سەر بە موربیهانن لە بریتانی. لە سەردەمی شۆڕشدا یەکێك لە باپیرانم کە رازی نابێ پەیوەندی بکات بە سوپای (شۆرش)ەوە لەبەرئەوەی زۆری لێدەکرێ پرچە درێژەکەی ببڕێت، ناچار دەبێت لە فەرەنسا هەڵبێت و بڕیار ئەدات لەگەڵ هەموو ئەندامانی خێزانەکەی بە پاپۆڕێك بەرەو هیند بچێت. کاتێکیش پاپۆڕەکە لە مورشیوس لائەدا، ئەم واز لەو بیرۆکەیە ئەهێنێ چونکە ژنەکەی خەڵکی ئەو دوورگەیە بوو و تا ئەو کاتەش خێزانەکەی لەوێدا مابوونەوە. لقە مورشیوسیەکەی بنەماڵەی لوکلیزیو دەگەڕێتەوە بۆ ئەم باپیرە سەرکێش و یاخیە. لەڕاستیدا ئەو پاڵەوانی رۆمانە نوێکەی منە (نووسەر مەبەستی رۆمانی "ئەفەریکاییەکە" یە و.عەرەبی) لەم کاتەدا بەتایبەتی سەرقاڵی نووسینی چیرۆکی چۆنیەتی مانەوەی ئەوم لە دوورگەی مۆرشیۆسدا. وا هەست ئەکەم من زۆر لەم پیاوەوە نزیکم کە تاراوگە دەکرێ بۆ ئەوپەری جیهان تا لە شتێك هەڵبێ. هەست ئەکەم من لەو تێدەگەم.

*** لیبل فرانس: دەڵێن تۆ کاندیدێکی نزیکی بۆ وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ، با وای دانێین کە سبەینێ خەڵاتی نوبڵ دەبەخشرێ بە تۆ، دەتەوێ بەو بۆنەیەوە چی بڵێی؟**

– لوکلیزیو: ئەمە پرسیارێکی شێتانەییە، هیچ لەبارەی ئەو خەڵاتەوە نازانم، وەلێ دەزانم چیم دەوێ لەبەردەم جەماوەردا بیڵێم. حەز دەکەم باس لەو جەنگە بکەم کە منداڵ دەکوژێ، ئەم مەسەلەیە بەلای منەوە دڕندەترین شتێکە لەم سەردەمەدا، ئەدەبیش هۆیەکە بۆ وەبیرهێنانەوەی خەڵك بەو تراژیدیایە و هێنانەوەیەتی بۆسەر شانۆ، لەم دواییەدا لە پاریس هەموو پەیکەری ژنان داپۆشران بۆ مەحکومکردنی ئەو راستیەی دەڵێ ژنان لە ئەفغانستان بێبەشن لە ئازادی. ئەمە شتێکی گەلێ باشە. بەهەمان شێوە، ئەبێ پەڵەی گەورەی خوێن لەسەر دڵی پەیکەرەکانی منداڵان دابنێین تا بە بیری خەڵکی بێنینەوە کە لە هەموو ساتێکدا لە شوێنێکدا لە فەلەستین، ئەمەریکای باشوور یان ئەفەریقا منداڵێك بە گوللە دەپێکرێ، بەڵام کەس باس لەوە ناکات!

**سەرچاوە:**

رۆژنامەی (المدی) ژمارە ١٣٤٦ –٢٠٠٨/١٠/١٨

# مۆندۆ

جان ماری گۆستاڤ لۆکلێزیۆ

لە فەرەنسییەوە: کافیە جەوانرودی

کەس نەیدەزانی "مۆندۆ" لە کوێوە هاتووە. رۆژێ بەرێکەوت، بێئەوەی کەس ئاگای لێ بێت، هات بۆ شارەکەمان، ئەمجا عادەتمان پێکرد، کوڕێکی دە ساڵان، بە ڕوخسارێکی خڕ و هێمن و دوو چاوی جوانی ڕەشی کەمێ خێلەوە. بە تایبەت قژی سەرنجڕاکێش بوو، قژە خورمایی و خۆڵەمێشییەکەی کە لەگەڵ رووناکیدا ڕەنگی ئەگۆڕا، شەوانە، بە تەواوی خۆڵەمێشی ئەنواند. سەبارەت بە کەسوکاری هیچمان نەئەزانی، لەوانەیە بێ کەسوکار بووبێت، هەمیشە ئەو کاتەی چاوەڕوانی نەبووین، لە سووچی شەقامێکەوە لە کەنار دەریا یان لە گۆڕەپانی بازاڕەکەدا دەرئەکەوت، بە دەم روانینی دەوروبەری خۆیەوە بە تەنیا پیاسەی ئەکرد، حاڵەتێکی لێبڕاوی هەبوو، هەمیشە هەر ئەو جلانەی لەبەردا بوو: پانتۆڵێکی شینی جین، پێڵاوی تنیس و تیشێرتێکی پانوپۆڕ.

کاتێ نزیک ئەبۆوە، ڕاستەوخۆ ئەیڕوانی، بزە ئەیگرت و چاوە تەنگەکانی ئەبوون بە دوو درزی گەشاوە، ئاوها سڵاوی ئەکرد. کاتێ خۆشیی لە کەسێ بهاتایە، ئەوێستاو ساکارانە ئەیپرسی:

-"ئەمکەن بە کوڕی خۆتان؟"

جا بەرلەوەی ئەو کەسە لە سەرسووڕمان ڕزگاری بووبێ، ئەو دوورکەوتبۆوە.

"مۆندۆ" بۆچی هاتبوو بۆ ئەم شارە؟ رەنگە لە دوای سەفەرێکی دوور و درێژ لە ئەنباری کەشتییەکدا گەیشتبێتە ئێرە. یان لە دوایین واگۆنی شەمەندەفەرێکی شتومەکدا کە رۆژان و شەوان بە وڵاتاندا تێپەڕیبوو. لەوانەیە بە بینینە هەتاو دەریا و ڤیلا سپییەکان و دارستانەکانی خورمای، بڕیاری مانەوەی دابێت. شتێ کە گومانی تێدا نییە، ئەوەیە کە لە شوێنێکی زۆر دوورەوە هاتبوو، لەوبەر کێوەکانەوە، لەوبەر دەریاوە. هەر بە دیتنی، بە هۆی نیگا ڕەش و درەوشاوەکەی و پێستە رەنگ مسینەکەیەوە ئەزانرا کە خەڵکی شوێنێکی دیکەیە و وڵاتی زۆریشی دیوە، ڕێگەڕۆیشتنی نەرم و لەسەرخۆ بوو. جۆرە قسەخۆشی و دڵنیاییەکی تێدابوو کە بۆ منداڵانی لە تەمەنی ئەودا ئاسایی نەبوو.

حەزی لە پرسیاری سەیر سەیر بوو کە لە مەتەڵ ئەچوون، بەڵام خوێندن و نوسینی نەئەزانی. کاتێ هات بۆ ئێرە، بۆ شارەکەمان، هێشتا مابووی بۆ هاوین.

هەوا زۆر گەرم بوو، هەموو شەوێ لەسەر تەپۆلکەکان چەند شوێنێ ئاگری ئەگرت. بەیانیان ئاسمان هەمیشە شین بوو، کشراو و ساف و سامالێ. "با" لە دەریاوە هەڵی ئەکرد. لەو پۆژە رۆژی بازاڕ بوو، "مۆندۆ" لە ناو کامیۆنە بچوکە شینەکانی بێسان کارەکاندا ئەخولایەوە. خێرا کاری پەیدا کردبوو، چونکە بێسان کارەکان بۆ داگرتنی سندوقی میوەکان پێویستیان بە یارمەتی بوو. "مۆندۆ" بۆ کامیۆنێکی بچوك کاری ئەکرد، کاتێ تەواوی کرد، چەند دراوێکی گرت و ئەوسا چوو بۆ لای کامیۆنێکی تر. خەڵکی بازار چاکیان ئەناسی، بەیانی زوو ئەهاتە گۆڕەپانەکە بۆ ئەوەی دڵنیا بێت کە کاری دەست ئەکەوێ، کاتێ کامیۆنە بچوکە شینەکان، بەرەبەرە ئەهاتن و خەڵکەکە "مۆندۆ"یان ئەبینی، بە دەنگی بەرز بانگیان لێ ئەکرد:

–"مۆندۆ، ئۆهۆ مۆندۆ"

کاتێ بازار تەواو ئەبوو، "مۆندۆ" خۆی لە نێوان پێشخوانەکاندا جێئەکردەوەو سێو و پرتەقاڵ و خورما داکەوتوەکانی کۆئەکردەوە. مندالی تریش هەبوون کە کۆیان ئەکردنەوە، هەروەها پیرە پیاوەکانیش کە جانتاکانیان پڕ ئەکرد لە گەلای سالادی و سێوزەمینی. فرۆشیارەکان مۆندۆیان زۆر خۆش ئەویست، هەرگیز هیچیان پێ نەئەوت، میوە فرۆشێکی قەڵەو کە ناوی "رۆزا" بوو بڕێ جار لەسەر پێشخوانەکەی سێوزەمینی و مۆزی پێ ئەدا. گۆڕەپانەکە سیخناخ بوو لە دەنگە دەنگ و قرمەقرم، زەردەواڵەکان لەسەر کۆگای خورما و ترێ وشکەکاندا ویزەیان ئەهات. مۆندۆ تا کاتی رۆیشتنی کامیۆنە بچوکەکان بە تەمای ئاوپرژێنە گشتییەکەی هاوڕێیدا لە گۆڕەپانەکەدا ئەمایەوە. پیاوێکی بالابەرزی لەڕ بوو کە کەوایەکی شینی دەریانەوەردی لەبەر ئەکرد. مۆندۆ زۆری حەز ئەکرد سەیری ئاوپرژێنییەکەی بکات، بەڵام ئەو هەرگیز قسەی لەگەڵ نەئەکرد.

ئاوپرژێنە گشتییەکە ئاوەکەی ئەگرتە زبلەکان و زبلەکان لەبەر هوروژمی ئاوەکە وەك زیندەوەر هەڵئەهاتن. تنۆکە فزیوەکان، بە دەنگی تۆفان و هەورە تریشقە بەرز ئەبوونەوەو لەسەر جادەکە ئەتوانەوە. ئەستێرە زێرینەیەکی کەمڕەنگ لەسەر ترۆمبێلە وەستاوەکان پێك ئەهات. هەر لەبەر ئەوە بوو کە مۆندۆ هاوڕێی ئاوپرژێنەکە بوو.

حەزی لە تنۆکە وردەکان بوو کە ئەفڕین و وەك باران لەسەر ترۆمبێل و شووشەکانی پێشەوە ئەنیشتنەوە، ئاوپرژێنە گشتییەکەیش مۆندۆی زۆر خۆش ئەویست، بەڵام قسەی لەگەڵ نەئەکرد. سەرەڕای ئەوەیش لەبەر دەنگی ئاوەکە نەیشیئەتوانی شتێکی وا بڵێ. "مۆندۆ" سەیری لوولە درێژە رەشەکەی ئەکرد کە وەك مار ئەلەرییەوە. مۆندۆ زۆری حەز ئەکرد ئاو بپرژێنێ، بەڵام زاتی نەئەکرد داوای لێ بکات.

پێدەچوو توانای راگرتنی نەبێ، چونکە هەردەم ئاوەکە زۆر بوو. مۆندۆ تا ئاوپرژێنە گشتیەکە کارەکەی تەواو ئەکرد لە گۆڕەپانەکەدا ئەمایەوە، تنۆکە ئاوە وردەکان وەك مژ سەرو روخساریان تەڕئەکرد کە هەستێکی خۆشی پێئەدا. کاتێ ئاوپرژێنە گشتییەکە کاری تەواو ئەبوو، شلنگەکەی کۆ ئەکردەوەو ئەرۆیشت. هەمیشە ئەو رێبوارانەی کە شۆستە تەڕەکەیان ئەبینی ئەیانوت:

–"سەیرە! باران باریوە؟"

ئەمجا مۆندۆ بۆ بینینی دەریا و تەپۆلکەکان (کە ئەسوتان) ملی ئەنا، یان ئەرۆیشت بۆ لای

هاوڕێکانی تری. لە ڕاستیدا لە هیچ جێگایەك نەئەمایەوە، لە حەشارگەکاندا ئەنوست، کەنار دەریا یان تەنانەت دورتریش، لە ناو تاشەبەردە سپییەکانی بەردەمی شار، کە حەشارگەیەکی باش بوو تا کەس نەیدۆزێتەوە. پۆلیسەکان و یاریدەدەرەکان حەزیان نەئەکرد منداڵەکان بەو جۆرە بژین. بە ئازادی و خوا ئەزانێ چی ئەخۆن و لە کوێ ئەنوون. بەڵام مۆندۆ زیرەك بوو، کە ئەیزانی بە دوایدا ئەگەڕێن خۆی دەرنەئەخست. هیچ کاتێ هەستی بە مەترسی نەئەکرد، تەواوی ڕۆژ لە ناو شاردا پیاسەی ئەکرد.

زۆری حەز لە پیاسەکردنی بێئامانج بوو، لە سوچی شەقامێکدا ئەگەڕایەوە، ئەمجا یەکێکی تر و قەدبڕی ئەکرد. لە باخێکدا تاوێ ئەوێستاو بەری ئەکەوتەوە. کاتێ کەسێکی ئەبینی کە خۆشی لێ بهاتایە، بەرەو ڕووی ئەچوو و بە ئارامی پێی ئەوت:

-ئەمکەن بە کوڕی خۆتان؟

کەسانێ بوون کە بە ڕاستی پێیان خۆش بوو، چونکە مۆندۆ، بە سەرە خڕەکەی و چاوە بریقەدارەکانییەوە، میهرەبان دیار بوو. بەڵام دژوار بوو، خەڵکی خێرا نەیانئەویست بیکەن بە منداڵی خۆیان. دەستیان ئەکرد بە پرسیار کردن، تەمەنی چەندە، ناوی چییە، نیشانی کوێیە، دایك و باوکی لە کوێن. مۆندۆیش کە بێگومان لەم پرسیارانە خۆشی نەئەهات، وەڵامی ئەدایەوە:

-"من نازانم، نازانم" و بە هەڵهاتن دوور ئەکەوتەوە

مۆندۆ بە پیاسەکردن لە شەقامەکاندا هاوڕێی زۆری پەیداکردبوو، بەڵام لەگەڵ هەموو کەس قسەی نەئەکرد. هاوڕێی قسەکردن و کایەکردن نەبوون، هاوڕێی چاك و چۆنییەکی خێرای سەرەڕێکەبوون، بەنیشارەی چاو یان جوڵانەوەی دەست لە دوورەوە، لەوبەر شەقامەکەوە.

هاوڕێکەلێکی تر هەبوون بۆ خواردن، وەك خانمێکی نانەوا کە هەر ڕۆژەی نانێکی ئەدایە. ڕوخسارێکی پیری سوری زۆر ڕێك و ساق وەك پەیکەرە ئیتالییەکانی هەبوو. هەمیشە جلی ڕەشی لەبەردا بوو، پەلکە سپییەکەی لە پشتە ملییەوە ئەبەست. ناوێکی ئیتالیایی هەبوو: "ئیدا"، مۆندۆ زۆری حەز ئەکرد بڕواتە دوکانەکەیەوە، بڕێ جار کاری بۆ ئەکرد، نانی بۆ دوکانداەرەکانی هاوسێی ئەبرد، کاتێ ئەگەڕایەوە، لەتێ نانی گەورەی لەناو کاغەزێکی ناسکدا ئەپێچایەوەو ئەیدایە. مۆندۆ هەرگیز پێی نەگوتبوو کە بیکات بە منداڵی خۆی، ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بووبێ کە زۆری خۆش ئەویست و هەر ئەوەش لەو گوتنە ئەیترساند. مۆندۆ بە دەم خواردنی نانەکەوە، بە ئارامی بەرەو دەریا ئەچوو، پارووی ورد وردی ئەگرت بۆ ئەوەی دیرتر تەواوی کات، بە ئارامی و بێ پەلە پڕێی ئەبڕی.

ئەتوت لەو زەمانەدا خواردنی هەر نان بوو، سەرەڕای ئەوە نەختێکی بۆ گاکیە هاوڕێکانی لێ هەڵئەگرت. بەر لەوەی هەست بە بۆن و بەرامەی دەریا بکات ئەبوو بە چەند شەقام و کۆڕەپان و باخێکی گشتیدا تێپەڕبوایە. لە ناکاو لەناو"با" و دەنگی یەکنەواختی شەپۆلەکاندا ئەگەیشت. ئەوپەڕی باخەکە کیوسکێکی ڕۆژنامەی لێ بوو، مۆندۆ ئەوێستا و گۆڤارێکی وێنەداری هەڵئەبژارد، لە نێوان چەندین چیرۆکی "ئاکیم"دا دوو دڵ بوو.

ئەمجا بەسەرهاتێکی "کیت کارسۆن"ی ئەکڕی، "کیت کارسۆن"ی لەبەرخاتری ئەو وێنەیەی کە کۆتە تەسمەییە بەناوبانگەکەی لەبەردابوو، ئەکڕی. ئەمجا ئەگەڕا بە دوای نیمکەتێکدا بۆ خوێندنی گۆڤارە وێنەدارەکەی، ئەمەش ئاسان نەبوو، چونکە جگە لە پەیداکردنی نیمکەت ئەبوایە کەسێکیش لەویا

بوایە بۆ ئەوەی بۆی بخوێنێتەوە. بەر لە نیوەڕوان کاتێکی باش بوو، چونکە لەو کاتەدا کەم و زۆر ماڵنشینی ئیدارەکانی لێ بوو کە بێحاڵ لەسەر نیمکەتەکان جگەرەیان ئەکێشا. کاتێ مۆندۆ یەکێکی پەیدا ئەکرد، لەلای دەستییەوە لەسەر نیمکەتەکە دائەنیشت و بەدەم ڕوانینی وێنەکانەوە گوێی لە چیرۆکەکە ئەگرت:

(سورپێستەکە دوو دەستی لەسەر یەك دانا و لە بەرانبەر "کیت کارسۆن"دا وتی: دە مانگ تێپەڕیوە، خەڵکەکەم ئیتر ئۆقرەیان نەماوەو ئەیانەوێ تەوری پێشینیان لە خاك دەربێنن! "کیت کارسۆن" دەستی بەرز ئەکاتەوە.

—گوێ لە توڕەییەکەت مەگرە، ئەسپی سور، بە زوویی تەسلیمی عەدالەت ئەکرێیت. ئەسپی ئاگرین ئەڵێن زۆر دیرە، بڕوانە.

لە داوێنی تەپۆڵکەکەدا شەرکەرەکان نیشان ئەدات: خەڵکەکەم گەلێ چاوەڕوانن شەڕ دەست پێکات، ئێوە بمرن و هەروەها تۆ "کیت کارسۆن!" شەڕکەرەکان گوێڕایەڵی فەرمانی ئەسپی ئاگرین بوون، بەڵام "کیت کارسۆن" هەموویانی غافڵگیر کرد و پەڕییە سەر ئەسپەکەی. جارێکی تر ئاوڕی دایەوەو وتی: ئەگەڕێمەوە و تۆ تەسلیمی عەدالەت ئەکەم).

کاتێ مۆندۆ بەسەرهاتی "کیت کارسۆن"ی ئەبیست، گۆڤارە وێنەییەکەی ئەگرت و سوپاسی ماڵنشینەکەی ئەکرد. ماڵنشینەکەش ئەیوت: "خوات لەگەڵ".

مۆندۆ ئەیوت: "خوات لەگەڵ".

مۆندۆ بە خێرایی تا لەنگەرگەکە ملی ئەنا. ساتێ سەیری دەریای ئەکرد و توند توند چاوی ئەتروکاند بۆ ئەوەی تیشکەکانی هەتاو کوێری نەکات. ئاسمان گەلێ شین و بێ هەور بوو، شەپۆلە کورتەکان ئەدرەوشانەوە. مۆندۆ لەو پلیکانە بچوکانەی کە بەرەو تاشەبەردەکانی هاوتەریبی ئاوەکە ئەڕۆیشتن، دادەگەڕا.

زۆر حەزی لێرە ئەکرد. خاکڕێژە بەربینەکە زۆر بەرز بوو و بە بلۆکی چیمەنتۆیی درێژکۆلە دەوری گیرا بوو. لەسەر سەدەکە لەنتەرێکی دەریایی هەبوو. باڵندەکانی دەریا لە بادا ئەخزان، باڵیان ئەکردەوەو بە دەم ناڵەناڵەوە بۆ ئاستی سەر مۆندۆ ئەهاتن و لێی نزیك ئەبوونەوەو دەنگیان ئەدا. مۆندۆ تا ئەیتوانی وردەنانی بەرز دەهاویشت و باڵندە دەریاییەکانیش بە دەم فڕینەوە ئەیانگرتەوە. مۆندۆ پێی خۆش بوو لێرە پیاسە بکات و بەدەم ڕوانینیەوە بۆ دەریا، لە بەردێکەوە بۆ یەکێکی تر بپەڕێتەوە.

هەستی بە پاڵهێزی "با" لەسەر گۆنای ڕاستی ئەکرد کە قژی لائەدا. سەرەڕای "با"، هەتاو گەلێ داخ بوو. شەپۆلەکان خۆیان لە بلۆکە چیمەنتۆییەکان ئەکوتا و گەردە شەپۆلیان لە ڕوناکی ڕۆژدا ئەپرژاند. جار جار بۆ سەیرکردنی قەراخەکە ئەوەستا. هێشتا دور بوو، هێڵێکی قاوەیی کە بە شەشپالوی بچوکی سپی داپۆشرابوو. تەپۆڵکەکان لە ئاستی سەر خانوەکانەوە خۆڵەمێشی و سەوز بوون. لەبری شوێندا دوکەڵی ئاگرەکان بەرز ببوونەوەو خاڵێکی سەیریان لە ئاسمان پێکهێنابوو، بەڵام شەپۆلەکان دیار نەبوون.

مۆندۆ وتی: "ئەبێ بڕۆم بیبینم".

بیری لە شۆلە سورە گەورەکان ئەکردەوە کە دەوەنەکان و دارستانەکانی چیوپەمەی هەڵئەلوشی، هەروەها کامیۆنی ئاوپرژێنەکان کە لە جادەکان وەستابوون، چونکە زۆری حەز لە کامیۆنە سەوزەکان ئەکرد. هەروەها لە ڕۆژئاوا، شتێ وەك ئاگر بەسەر دەریاوە بوو، بەڵام هەر گەڕانەوەی پڕشنگەکانی هەتاو بوو. مۆندۆ جوڵەی لە خۆی بڕیبوو، هەستی بە سەمای شۆلەکان بەسەر پێڵوەکانیەوە ئەکرد. ئەمجا بە پەڕینەوە بەسەر شەپۆل شکێنەکاندا ڕێگاکەی

گرتــەوە بــەر. مۆنــدۆ یــەك بەیــەكی بلۆكــە چــیمەنتۆییەكانی ئەناســی، لــە زینــدەوەری زەبــەلاحی خــەوتوو ئەچــوون، نیوەیــان لــە نــاو ئاوەكــەدا و نیوەیــان لەبــەر هــەتاو، خــەریكی گەرمكردنەوەی پشتە قەڵەوەكانیان بوون. لەسەر پشتیان نیشانەی سەیر سەیر هەڵكەنرابوو. لە خوار شەپۆل شكێنەكانەوە، شوێنێ كە دەریا خــۆی پێــدا ئــەكوتا، نــەرم لاشــەكان و گیــا ئاوییەكان وەك فەرشێكی راخراو بوون.

بــە تایبــەت هــەموو جــار لەســەر یــەكێ لــە بلۆكــەكانی ئەوپــەڕی ســەدەكەوە دائەنیــشت، ئەوێی لە هەموو جێگایەكی تر لا خۆشتر بوو، بلــۆكێكی ئــەختێ كۆمــاو بــوو، چــیمەنتۆكەی دارزابــوو. مۆنــدۆ بــە چــوار مــشقی لەســەری دائەنیشت و بە دەنگێكی نزم رۆژباشی پێئەوت. بــڕێ جار تەنانــەت چیرۆكی بۆ ئەگێڕایــەوە، بۆ ئــەوەی ســەرگەرمی بكــات، چونكە دڵنیــابوو لــە نیــشتەجێبوون لەوێــدا، بێئــەوەی بتــوانێ بجوڵێتەوە، بێتاقەت ببوو.

باســی ســەفەرەكانی بــۆ ئــەكرد، باســی كەشتییەكان و دەریا و هەروەها ئاوبازەكان كە لەمپــەڕ بۆ ئەوپــەڕ ئــەهاتن و ئەچــوون. شــەپۆل شكێنەكە ورتەی لێوە نەئەهات، جوڵەی نەئەكرد. بــەڵام چــیرۆكەكانی مۆنــدۆی پــێ خــۆش بــوو. بێگومــان لەبــەر ئــەوەبوو هێنــدە ئــارام بــوو. ماوەیەكی زۆر هەر وا لەسەر شەپۆل شكێنەكە ئەمایــەوەو بــۆ پرشــە و بڵقــەكانی ســەر دەریــای ئــەڕوانی و گوێی لــە دەنگــی شــەپۆلەكان ئــەگرت، دەمەو ئێوارە كاتێ هەتاو هێشتا داخ بوو، گۆنای لەســەر چــیمەنتۆ فێنكەكــە ئــەناو خــۆی گرمۆڵــە ئەكرد و بۆ تاوێ ئەخەوت.

یەكێ لەو دوانیوەڕوانە بوو كە "ژیــۆردۆن"ی ماســیگری ناســی. مۆنــدۆ تەپــەی هــەنگاوی كەســێكی لەســەر چــیمەنتۆكە بیــستبوو، قــنج ببووەوە و ئامــادە ببوو كە خۆی وەشارێ، بەڵام پیــاوێكی تەمــەن دەوری پەنجا ســاڵی دیتبوو كە دارقــولاپێكی ماســیگرتنی بەســەر شــانەوە بــوو، لێــی نەترســابوو. پیاوەكــە تــا لای بەردەمێژەكــەی نزیكــی هــاتبوو و بــە میهرەبانییــەوە دەســتی بــۆ بەرزكردبۆوە:

-لەوێدا چی ئەكەی؟"

لەســەر شەپۆلشكێنەكە دانیشتبوو و لــە نــاو كیسە چەرمینەكەی زۆر جۆری تەناف و قولاپی ماسیگرتنی دەرهێنــابوو. كــاتێ دەســتی كــرد بــە ماسیگرتن، مۆندۆ لەسەر شەپۆل شكێنەكە لــە تەنیــشتییەوە دانیــشتبوو و چــاوی بڕیبــووە ماسیگرەكە كە قولاپی ئامادە ئەكرد. ماسیگرەكە پێــی نیــشاندابوو كــە چــۆن چەشــەی لــێ ئــەدەن چــۆن تــوڕی ئــەدەن. لــە پێــشەوە بــە ئــارامی و بەرەبــەرە تونــدی ئــەكردەوە تــا هــەموو تەنافەكــە ئەكرایەوە. دارقولاپی ماسیگرتنەكەی بە مۆندۆ دابــوو بۆئــەوەی فێــری بكــات تەنافەكــەی بچەرخێنێ، بە بزاوتی توند بۆ راست و بۆ چەپ دیلانێی پێ بكات.

مۆنــدۆ، "ژیــۆردۆن"ی ماسیگری زۆر خــۆش ئەویست، چونكە هەرگیز پرسیاری لێ نەئەكرد، روخسارە پڕ لە چرچ و لۆچەكەی لەبەر هەتاودا ڕەش داگــەڕابوو، دوو چــاوی بــچوكی ســەوزی تــۆخی هــەبوو كــە ڕەنگەكــەی زیــاتر ســەرنجی مۆندۆی بۆ لای خۆی ڕائەكێشا.

ماوەیــەكی زۆر تــا كــاتێ كە هــەتاو جوان لــە ئاســۆ نزیــك ئــەبۆوە، لەســەر شــەپۆل شــكێنەكە ماســی گــرت. "ژیــۆردۆن" زۆری قسە نەئــەكرد. بێگومان بۆ ئــەوە بــوو كە ماسییەكان نەترسێنێ، بەڵام هەر جار كە ماسییەكی ئەگرت، پێئەكەنی. بــە بزاوتــی ورد و بــە ســەرنجەوە شــەویلكەی ماســییەكەی لــە قــولاپی ماســییەكە ئــەكردەوەو نێچیرەكەی ئەنایە ناو ساكە چەرمینەكەی.

جار جار مۆندۆ لە بناری شەپۆل شكێنەكەدا بە دوای قرژانگە ڕەنگ خۆڵەمێشییەكاندا ئەگەڕا،

که لەناو گیا ئاوییەکاندا خۆی ئەشاردەوە. کاتێ شەپۆلەکان پاشەکشێیان ئەکرد، قرژانگە بچوکە رەنگ خۆڵەمێشییەکان ئەهاتنە دەرو مۆندۆ ئەیگرتن، "ژیوردۆن"ی ماسیگر لەسەر بەردە درێژە چیمەنتۆییەکە بە چەقۆیەکی بچوکی ژەنگاوی لەتلەتی ئەکردن. رۆژێ کەشتییەکی گەورەی رەشی چاو کرد کە بێدەنگ ئەخزا. مۆندۆ پرسیاری کرد:

—ناوی چییە؟

"ژیوردۆن"ی ماسیگر دەستی لە لێواری کڵاوەکەیدا داناو چاوی تەنگ کردەوەو وتی:

—ئیریترە".

پاشان بە کەمێ سەرسوڕمانەوە وتی: تۆ چاوت باش نابینێ؟

مۆندۆ وتی: نە، وا نییە، بەڵکو من خوێندەوار نیم.

"ژیوردۆن" وتی: ئێی؟

ماوەیەکی زۆر سەیری تێپەڕینی کەشتییەکەیان کرد. مۆندۆ پرسیاری کرد:

—ئەو ناوی کەشتییە یانی چی؟

—"ئیریترە"، ناوی وڵاتێکە لە کەناری ئافریقا، لەسەر دەریای سور.

مۆندۆ وتی: ناوێکی جوانە، ئەبێ وڵاتێکی جوانیش بێت.

مۆندۆ ناوێ ڕاما: ئەی دەریاکەی، ناوی دەریای سورە؟

"ژیوردۆن"ی ماسیگر پێکەنی.

—تۆ پێت وایە ئەو دەریایە لە ڕاستیدا سوورە؟

مۆندۆ وتی: من نازانم.

—کاتێ هەتاو دائەچێ، دەریا سور ئەنوێنێ، وایە، بەڵام بە بۆنەی ئەو مرۆڤانەوەیە کە لەمەوپێش لەوێ ژیاون.

مۆندۆ بەردەوام بۆ کەشتییەکەی ئەڕوانی کە دور ئەکەوتەوە.

—بێگومان بەرەو ئافریقا ئەڕوا.

"ژیوردۆن"ی ماسیگر وتی:

—دورە، ئەوێ زۆر گەرمە، هەتاو بە هەموو هێزیەوە ئەسوتێ، قەراخەکەی وەك بیابانە.

—دارخورمای لێیە؟

—ئەرێ، قەراخێکی درێژی لمینیش، دەریا گەلێ شینە، پڕێتی لە کەشتی بچوکی ماسیگری کە بایەوانەکانیان ■ یاڵ ئەچن و شار بۆ شار لە قەراخەوە ئەڕۆن.

—دەی ئەتوانن لە قەراخ دانیشن و بۆ تێپەڕینی کەشتییەکان بڕوانن؟ لە سێبەر دائەنیشن و بەدەم ڕوانینی کەشتییەکانی سەر دەریاوە بەسەرهات ئەگێڕنەوە؟

—پیاوەکان کار ئەکەن، تۆڕەکان ئەدورنەوە، لاشەی کەشتییەکان لە قەراخ مێخکاری ئەکەن، منداڵەکان بە دوای چیلکەدا ئەگەڕێن بۆ کردنەوەی ئاگر و کوڵاندنی قیر کە درزی کەشتییەکانی پێ پڕ بکەنەوە.

"ژیوردۆن"ی ماسیگر ئیتر بۆ تەنافەکەی ئەنەڕوانی، بۆ دور ئەیڕوانی، بەرەو ئاسۆ، ئەتوت ئەو شتانە ئەبینێت کە باسیان ئەکا.

—دەریای سور کۆسەماسی لێیە؟

—ئەرێ، هەمیشە یەك یان دوو کۆسە ماسی ئەکەونە دوای کەشتییەکانەوە. بەڵام خەڵك پێی ڕاهاتوون و لێیان ناترسن.

—بەدڕەسەن نین؟

—کۆسە ماسییەکان لە ڕێوی ئەچن، هەمیشە ئەکەونە دوای زبڵەکانی ناو ئاوەکەوە بۆ ئەوەی شتێ پەیدا بکەن، بەڵام بەدڕەسەن نین.

مۆندۆ وتی: ئەبێ دەریای سور زۆر گەورە بێت.

—ئەرێ، زۆر گەورەیە، شارگەلێکی زۆری لە قەراخدایە، بەندەرەکان بە ناوی سەیرەوە، "بالول، بریزلی، دبا، .. ماساوا" شارێکی گەورەی سپییە. کەشتییەکان لە درێژایی ساحل

دوور ئەکەونەوە، شەو و ڕۆژ لە دەریا ئەچنە پێش، بەرەو باکور ئەڕۆن، تا "ڕازکازار" یان بەرەو دورگەکان. لە "داملاك کەبیر"، لە مەجمەعولجەزایری "نۆرا"، تەنانەت بڕێ جار تا دورگەکانی "ڤاراسان".

مۆندۆ زۆر خۆشی لە دورگەکانی ئەهات.

ماسیگر بەردەوام بوو:

–ئەرێ، دورگەی زۆر هەن، دورگەی پڕ لە تاشەبەرد کە قەراخەکەیان لمە و دارخورمای زۆری لێیە. لە وەرزی باراندا لافاو هەڵئەکات، "با" مێندە توند هەڵئەکات کە دارخورما لە ڕەگەوە هەڵئەکێشێ. سەربانی خانووەکان تێك ئەدات.

–کەشتییەکان تێك ئەشکێنێ؟

–نە، خەڵك لە ماڵەکانیاندا ئەمێننەوە، پەنا ئەگرن، کەس ناچێ بۆ دەریا، بەڵام بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام نییە. ماسیگرێ لەگەڵ خێزانەکەیدا لە دورگەیەکی بچوکدا ئەژی، خانوەکەیان لە کەڵای دارخورما لە کەنار دەریا دروست کردەوە. کوڕە گەورەکەی ئێستا گەورە بووە، لەوانەیە هاوتەمەنی تۆ بێت. لەگەڵ باوکیدا بە کەشتی بۆ دەریا ئەڕۆن و تۆڕەکانیان ئەخەنە ناو دەریاوە. کاتێ هەڵی ئەکێشنەوە سەرێ، پڕن لە ماسی، ئەو کارەی زۆر پێ خۆشە. کاتێ هەوا خۆشە و دەریا ئارامە، ماسیگرەکە هەموو خێزانەکەی ئەبا و ئەڕۆن بۆ سەردانی کەس و کار و هەڤاڵەکانیان لە دورگە هاوسێکانیان و شەو ئەگەڕێنەوە. کەشتییەکە بێنەوە دەنگی لێوە بێت، بە تەنیا ئەچێتە پێش و"دەریای سور"، سوری سورە، چونکە کاتی داچوونی هەتاوە.

لەو ماوەیەدا کە ئەوان قسەیان ئەکرد، کەشتی باری "ئیریترە" لە بازنەیەکی گەورەدا دەوری دایەوە. ئاو بەرە ساحیلەکە، لەرلەر، لەسەرهێڵەکانی خۆیدا گەڕایەوە، کەشتییەکەیش بە هۆڕن لێدان خواحافیزی ئەکرد.

مۆندۆ پرسیاری کرد:

–کەی تۆیش ئەڕۆی بۆ ئەوێ؟ بۆ ئافریقا، بۆ "دەریای سور"؟

"ژیوردۆن"ی ماسیگر پێکەنی:

–من ناتوانم بڕۆم، ئەبێ لێرە لەسەر سەدەکە بمێنمەوە

–بۆ؟

بە دوای وەڵامدا ئەگەڕا: –ئاخر.، ئاخر من دەریاوانێکی بێ کەشتیم.

ئەمجا چاوی بڕییە قولاپەکەی. کاتێ هەتاو جوان گەیشتە هەن ئاسۆ، "ژیوردۆن"ی ماسیگر قولاپەکەی لەسەر بەردەریژە چیمەنتۆییەکە دانا، بابۆڵەیەکی لە گیرفانی کەواکەی دەرهێناو نیوەی دا بە مۆندۆ و پێکەوە بە دەم ڕوانینی لێکدانەوەی هەتاوەوە لەسەر دەریا دەستیان کرد بە خواردنی. مۆندۆ بەر لە داهاتنی شەو بۆ دۆزینەوەی حەشارگەیەك بۆ خەوتنی، ڕۆیشت.

مۆندۆ وتی: "خوات لەگەڵ".

"ژیوردۆن" وتی: "خوات لەگەڵ".

کاتێ مۆندۆ کەمێ دوور کەوتبۆوە، دەنگی هەڵبڕی:

–بۆ دیتنم وەرە، من خوێندنت فێر ئەکەم، دژوار نییە.

تا ئەو کاتەی کە بە تەواوەتی شەو داهات و لەنتەرە دەریاییەکە هەر چوارچرکەجارێ دەستی کردبوو بەعەلامەت دان، هەر ماسی ئەگرت.

*****

هەموو شت بە باشی ئەچووە پێش، بەڵام ئەبوایە ئاگای لە "سیاپاکان" بوایە، هەر ڕۆژ لەگەڵ هەڵهاتنی ڕۆژدا، کامیۆنە بچوکە ڕەنگ خۆڵەمێشییەکە، بە دەلاقەی تەلبەندکراوەوە، بە ئارامی لە شەقامەکانی شاردا لە ڕاستی شۆستەکانەوە بێدەنگ ئەخولایەوە، لە شەقامە خەوتوە تەمارییەکاندا، بە دوای سەگ و منداڵە ونبووەکاندا ئەگەڕا.

مۆنـدۆ، ڕۆژێ کـاتێ لـە حەشـارگەکەی لـە کـەناری دەریـا دەرهـاتبوو، بـەری زانیبـوو. کامیۆنـە بـچوکەکە چـەند مـەتر لـەولاترەوە لەبەردەمیدا وەستابوو، ئەو هەر ئەوەندەی پێکرا کە لە پشت بنە گیایەکدا خۆی کرۆشمە بکات. دەرگـا پشتوەکەی کرابۆوەو دوو پیاو بە کۆتی ڕەنگ خۆڵەمێشییەوە دابەزیبوون، دوو جانتـای گـەورەی پـڕ لـە قوماش و تـەنافیان پـێ بـوو. گوزەرەگاکانی باخەکەیان پشکنیبوو، کاتێ لای بنەگیاکـەوە تێپـەڕیبوون: مۆنـدۆ گـوێی لـە قسەکانیان ببوو:

—لێرەوە ڕۆیشت.

—تۆ چاوت کرد؟

—ئەرێ، لەوە ناچێ زۆر دوور کەوتبێتەوە.

دوو پیـاوە جل خۆڵەمێشییەکە هـەر کامیـان لەلایەکەوە دوور کەوتبوونەوەو مۆنـدۆ لـە پشت بنەگیاکەوە جوڵەی لە خۆی بڕیبوو و هەناسـەی ڕاگرتبـوو. سـاتێ دواتر قیرەیـەکی گڕ و خنکـاو بەرز بۆوە و دیسان بێدەنگی. کاتێ دوو پیاوەکە گەڕابوونـەوە، لـە نـاو یـەکێ لـە جانتاکانـدا شـتێکیان پێبـوو. جانتاکـەیان لـە پـشت کامیۆنەکەوە دانابوو و مۆنـدۆ دیـسان قیرە کپـە ئازارهێنەرەکـەی بیـستبۆوە. لـەناو جانتاکـەدا سەگێکیان گرتبوو. کامیۆنـە بچوکەکە لەسـەرخۆ ڕێکـەوتبوو و لـە پشت درەختـەکانی ناو باخەکە گوم ببوو. ڕێبوارێ کە لـەوێوە تێنەپـەڕی وتی کە ئەوە "سیاپاکان"ە و سەگە بێخاوەنـەکان ئـەگرێ، بە سەرنجەوە بۆ مۆندۆی ڕوانیبـوو و بۆ ئـەوەی بیترسێنێ، دریژەی پێ دابوو:

"کامیۆنە بچووکەکە، بڕێ جار ئەو منداڵانـەی کە لە بری ئـەوەی لە قوتابخانە بن، لـە کوچە و کـۆڵان وێڵـن، لەگـەڵ خـۆی ئـەبات. لـەو ڕۆژە بـەدواوە، مۆنـدۆ هەمیشە ئاگـای لـە دەوروبـەری خۆیـەتی. بۆ ئـەوەی دڵنیـا بێـت ئەگـەر کامیۆنـە بچوکەکە لێی نزیک بۆوە بیبینێ.

کاتێ منداڵان لە قوتابخانە ئەڕۆشتنەوە، یان ڕۆژانی جەژن، ئەیزانی کە هیچ مەترسییەك نییە، ئـەو کاتانـەی کـە تـاك و تـراك لـە شـەقامەکانیدا پەیـدا ئـەبوون، بەیانیان زوو یـان کاتی داهاتنی شـەو، ئەبوایـە ئاگـای لـە خۆی بوایـە. ڕەنگە هـەر لەبـەر ئـەوە بـووبێ کـە مۆنـدۆ وەك سـەگ هەڵئـەهات. لـەو ماوەیـەدا بـوو کـە "ژیتـان"، "کـۆزاك" و مەقاڵـە پیرەکـەی ناسـیبوو. ئـەوە ناوگەلێ بوون کە لە شارەکەماندا لێیان نابوون، چونکە ناوە ڕاستەقینەکانیان نەئەزانی. "ژیتان" قـەرەج نـەبوو بـەڵام وایـان پـێ ئـەوت، بـە خـاتر ڕەنگی سوتاوی پێستی و قژە هەرە ڕەشەکەی و لوتـە قەڵاتگەکـەی، بـەڵام بێگومـان ئـەوە نازنـاوێ بوو کە لەوە گیرابوو کە ئەو لە "ئوتۆشکیسێکی" ڕەشـی کۆنـدا لـە گۆڕەپانەکـەی لـە ڕێگـای چـالاکییەوە ژیـانی بەسـەر ئـەبرد. "کۆسـاك" پیـاوێکی سـەیر و ڕواڵـەتێکی وەك مەغۆلـەکانی هـەبوو و هەمیـشە کڵاوێکـی لـە پێستی خـەزی بەسەرەوە بوو کە وەك ورچی لێکردبوو.

لەبەر کافەکانـدا "ئاکاردیۆن"ی لـێ ئـەدا، بـە تایبەت شـەوانە، چونکە بە ڕۆژ ئەو بە تەواوەتی مەسـت بـوو. مۆنـدۆ زۆرتـر لـە هـەموو کـەس "دادی"ی پـیری خـۆش ئەویـست. ڕۆژێ کـە لـە کەنار دەریاوە تێنەپەڕی ئەوی دیتبوو کە لەسەر لاپەڕەیـەکی ڕۆژنامـە دانیشتبوو. پیـاوە پیرەکـە بێئـــەوەی ســـەرنجی خەڵکەکـــە بـــدات کـــە لەبەردەمیـەوە تێئەپـەڕین، خـۆی دابـووە دەس تیـــشکەکانی هـــەتاو. چـــەمەدانێکی بـــچوکی کارتۆنی کون کون کە "دادی"ی پیر لەسەر زەوی و لەسـەر لاپـەڕە ڕۆژنامەیـەکی تـر دایئـابوو، سەرنجی مۆندۆی بۆ خۆی ڕاکێشابوو.

"دادی" ئارام و هێمن دیار بوو، مۆندۆ سڵی لێ نەکردبۆوە. لێی نزیك ببۆو پرسیبووی:

—ئەوە چی تیایە؟

پیاوەکە چاوی کردبۆوە و بێئەوەی ورتەی

لێوە بێت، چەمەدانەکەی ئابووە سەر ئەژنۆی و تۆزێ لە سەرەکەی لادابوو. بە شێوەیەکی پڕ ڕەمز و ڕاز بزە گرتبووی و دەستی هێنابوو بە ژێر سەرەکەیدا، ئەمجا جوتێ کۆتری دەرهێنابوو.

—زۆر جوانن، ناویان چییە؟

"دادی" پەڕی باڵەکەی ساف کردبوو و نزیکی کردبۆوە لە کۆناکی:

—ئەوە ناوی "پیلو"ەو ئەویشیان "زوێ".

کۆترەکانی لە ناو دەستیدا گرتبوو و زۆر بە ئارامی دەستی ئەهێنا بە روخساریاندا. بە چاوە تەڕە رووناکەکانییەوە کە جوان نەیانئەبینی، بۆ دووری ئەڕوانی. مۆندۆ بە ئارامی سەر کۆترەکانی ئەوازش کرد. روناکی هەتاو بە شەوارەی خستبوون و ئەیانویست بگەڕێنەوە ناو چەمەدانەکەیان. "دادی" بە دەنگێکی نزم قسەی بۆ ئەکردن بۆ ئەوەی هێمنیان بکاتەوە، پاشان لە چەمەدانەکەدا زیندانی کردنەوە.

—زۆر جوانن. مۆندۆ ئەمەی دوپات کردبۆوە و دوور کەوتبووەوە. لە کاتێکدا پیاوەکە چاوی بەستبوو و بە دانیشتنەوە، لەسەر رۆژنامەکە خەوتبوو.

کاتێ کە شەو دامات، مۆندۆ بۆ دیتنی "دادی" چوو بۆ گۆڕەپانەکە. ئەو و "ژیتان" و "کۆساك" پێکەوە نمایشی گشتییان بەڕێوە ئەبرد. ئەو دورتر لای چەمەدانەکەی دانیشت. لە کاتێکدا "ژیتان" "باندۆ"ی لێ ئەداو "کۆساك" بە دەنگە بۆرەکەیەوە وێلکەردەکانی کۆئەکردەوە. "ژیتان" بە توندی مۆسیقای لێ ئەدا، بە دەم ڕوانینی بزاوتی قامکەکانیەوە ئاوازی ئەوتەوە.

روخسارە ماتەکەی لەبەر رۆشنایی گڵۆپەکاندا ئەدرەوشایەوە. مۆندۆ لە ریزی پێشەوەی تەماشاکەرەکاندا وەستاو سەلامی لە "دادی" کرد. "ژیتان" نمایشەکەی دەست پێکرد، لەبەر تەماشاچییەکاندا وەستا، بە خێراییەکی باوەڕپێنەکراوەوە، لە مشتە بەستراوەکەیەوە هەموو جۆرە دەستەسڕێکی دەرئەهێنا. دەستەسڕەکان ئەکەوتنە سەر زەوی و کاری مۆندۆیش ئەوە بوو کە بەزریان بکاتەوە. ئەمجا "ژیتان" هەموو جۆرە شتێکی سەیری لە دەستیەوە دەرئەهێنا، کلیل، ئەنگوستیلە، قەڵەم، وێنە، تۆپی پینگ پۆنگ و تەنانەت جگەرەی داگیرساو کە بەناو خەڵکەکەدا بڵاوی ئەکردەوە. ئەو کارەی هێندە بە خێرایی ئەکرد کە خەڵك تەنانەت بزاوتی دەستیان نەئەدی.

خەڵك پێئەکەنین و چەپڵەیان لێئەدا و پارەی وردە ئەکەوتە سەر زەوی. "کۆساك" وتی: "بچکۆل یارمەتیمان بدە ئەو پارانە کۆبکەینەوە". دەستەکانی "ژیتان" هێلکەیەکیان ئەگرتەوەو لە دەستەسڕێکی سووردا ئەیانپێچایەوە. پاشان ساتێ ویستا:

—بڕ..وا..نن، سەرنج.. بدەن.

دوو دەستی بە خێرایی کوتا بە یەکدا، کاتێ دەستەسڕەکەی کردەوە، هێلکەکە نوقم ببوو، خەڵکەکە توندتر چەپڵەیان بۆ لێ ئەدا و مۆندۆ پارە وردەکانی کۆئەکردەوەو ئەیخستە ناو قوتویەکی ئاسنەوە، کاتێ هەموو پارەکەی کۆ کردەوە، بە چیچکانەوە دانیشت و دیسان چاوی بڕیە دەستەکانی "ژیتان" کە وەك سەربەخۆ بن بەخێرایی ئەبزوان. ژیتان" لە دەستە بەستراوەکەیدا هێلکەیەکی تری دەرهێنا و پاشان لە پڕ لە ناو دەستیدا نوقمی کردەوە. هەر جارەی کە هێلکەکە نوقم ئەبۆوە، بۆ مۆندۆی ئەڕوانی و چاوی ئەقرتاند.

"هۆپ! هۆپ".

بەڵام شتێك کە "ژیتان" زۆر پێی شارەزا بوو، ئەوە بوو کە دوو هێلکەی زۆر سپی ئەگرتەوە، بێئەوەی تەماشاکەرەکان بزانن لە کوێوە هاتووە، ئەهاتە ناو دەستی، لە ناو دوو دەستە سڕی

سوورو زەردا ئەپێچانەوە، پاشان هەردوو دەستی بۆ هەوا بەرز ئەکردەوەو ساتێ بێ جوڵە ئەمایەوە، هەموو هەناسەیان لە خۆیان ئەبڕی و بۆیان ئەڕوانی.

"سەرنج بدەن". "ژیتان" بە کردنەوەی دەستە سڕەکان دەستی ئەهێنایە خوارەوەو دوو کۆتری سپی لە دەستەسڕەکان دەرئەهاتن و بەر لەوەی بەسەر شانی "دادی" پیرەوە بنیشنەوە، لە نزیکی سەریەوە ئەفڕین.

کاتێ نمایشەکە تەواو بوو، "ژیتان" ساندویچ و ئاوجۆی بۆ هەموان کڕی و لەسەر پلەی "ئۆشکیس"ە رەشەکە دانیشتن.

"ژیتان" بە مۆندۆی وت: بچکۆل تۆ باش یارمەتی منت دا.

"کۆساك" کە ئاوجۆی ئەخواردەوە، لە پڕا بە شەوقەوە وتی: "ژیتان، ئەوە کورتە؟".

—نە مۆندۆی هاوڕێمە.

—دەی بەسەلامەتی تۆ، هاوڕێ مۆندۆ.

کەمێ ماست ببوو، "ئەزانی مۆسیقا بژەنی؟"

مۆندۆ وتی: نەخێر ئاغا.

"کۆساك" تریقایەوە: نەخێر ئاغا! نەخێر ئاغا و بە قیژەوە دوبارەی کردەوە.

بەڵام مۆندۆ تێئەگەیشت بەچی پێئەکەنێ. "کۆساك" ئاکاردیئۆن"ە بچوکەکەی بەرز کردەوەو دەستی کرد بە لێدان. لە ڕاستیدا ئاواز نەبوو، بەڵکو زنجیرە سەدایەکی سەیر و یەك جۆر بوو کە بەرز و نزم ئەبوونەوە، ئاوێ توند و ئاوێ ئارام. "کۆساك" پێی ئەکوتا بە زەویدا و ئاهەنگی لێئەدا، بە دەنگە بۆرەکەیەوە هەر یەك بڕگەی دووبارە ئەکردەوە: "ئای ، ئای، یایا، یایا، ئایایا، ئایایا، یایا، ئای، ئای!".

ئەیوتەوە و "ئاکاردیئۆن"ی لێئەدا و خۆی ئەشەکاندەوە. مۆندۆ پێی وابوو کە لە ورچێکی قەڵەو ئەچێ. ڕێبوارەکان بۆ ساتێ ئەوەستان و سەیریان ئەکرد، کەمێ پێئەکەنین و ڕێگاکەیان ئەگرتەوە بەر. دواتر، کاتێ شەو ئەنگوستە چاو بوو، "کۆساك" دەستی لە لێدان هەڵگرت و لای "ژیتان" لەسەر پلەکە دانیشت. جگەرە توتنییە رەشکانیان داگیرساند کە بۆنێکی توندی بوو و بەدەم ئاوجۆ خواردنەوە قسەیان ئەکرد. باسێکی دوریان ئەگێڕایەوە کە مۆندۆ تێنەئەگەیشت، بیرەوەری سەفەر و شەڕەکانیان. بڕێ جار "دادی" پیریش ئەکەوتە قسە، مۆندۆ گوێی بۆ ڕائەگرت. چونکە ئەو بە تایبەت باسی باڵندەکانی ئەکرد، کۆترە کۆچەرییەکان.

"دادی" بە دەنگە بۆرەکەیەوە ئەدوا، تۆزێ هەناسەبڕکێی پێکەوتبوو، بەسەرهاتی ئەو باڵندانەی ئەگێڕایەوە کە ماوەیەکی زۆر لە دەورو دەشتدا ئەفڕین و زەوی بە رووبارە پێچ و پلوچەکانییەوە لە خواریانەوە ئەخزا. درەختە بچوکەکان کە لە درێژایی جادەکاندا وەك هێڵی رەش روابوون، خانووەکان بە سەریانە سوورو خۆڵەمێشییەکانەوە، کێڵگە رەنگاو ڕەنگەکان، لەوەڕگەکان، تەپۆلکەکان، کێوەکان کە لە کۆگای بەردە وردە ئەچوون، ئەخزان و پێش ئەچوون.

پیاوە بچوکەکە هەروەها باسی ئەوەی ئەکرد کە چۆن باڵندەکان بە خوێندنەوەی دیمەنەکان، هەموو کات ئەگەڕێنەوە بۆ ناو هێلانەکانیان، وەك ئەوەی نەقشەیەك بخوێننەوە یان وەك خەلەبان و دەریانەوەردەکان کە یارمەتی لە ئەستێرەکان ئەگرن.

هێلانە باڵندەکان لە قەڵایەکی بێ دەرگا ئەچن، تەنیا چەند دەلاقەیەکی تەنگ لە ژێر سەربانەکەیاندایە. کاتێ هەوا گەرم ئەبێت، گومەگومیان لە قەڵاکانەوە بەرز ئەبێتەوە، ئەو ساتە ئەزانن کە باڵندەکان گەڕاونەتەوە.

مۆندۆ گوێی لە دەنگی "دادی" ڕاگرتبوو. پزیسکی جگەرەکانی ئەبینی کە لە تاریکی شەودا ئەدرەوشانەوە. لە دەورو بەری گۆڕەپانەکە، ترۆمبیلەکان بە دەنگێکی نەرم وەك

ئاو دەمناژوتن و روناكی خانوەكان یەك لە دوای یەك ئەكوژانەوە.

زۆر دیر بوو، مۆندۆ هەستی ئەكرد خەو زۆری بۆ هێناوە. "ژیتان" ناردی لەسەر تیمكەتی پشت "ئۆشیكسە" كە بخەوێ و هەر لەویا شەوی بەسەر برد "دادی" پیر گەڕایەوە بۆ ماڵەكەی خۆی بەلآم "ژیتان" و "كۆساك" نەخەوتن، هەروا لەسەر پلیكانەكە دانیشتن و تا بەیانی بەدەم خواردنەوەو جگەرەكێشانەوە قسەیان ئەكرد.

******

مۆندۆ زۆری حەز ئەكرد لە كەنار دەریا دانیشێ، ئەژنۆی لە نێوان هەردوو باسكیدا بگرێ و چاو ببڕێتە هەلآتنی هەتاو. لە سەعات چوار و پەنجا دەقیقەوە، ئاسمان ساف و خۆڵەمێشی بوو، هەرچەند هەوری تەمومژ بەسەر دەریاوە بوو. هەتاو خێرا خۆی پیشان نەئەدا، بەلآم كە بە ئارامی وەك شولەیەك لەوبەر ئاسۆوە بەرز ئەبۆوە، مۆندۆ هەستی بە هاتنی ئەكرد. لە پێشدا خەرمانەیەكی بێڕەنگ بوو كە خاڵەكەی لە هەوادا بلآوئەبۆوەو ئەو لە ناخیدا هەستی بە لەرزشیكی سەیر ئەكرد كە ئاسۆی ئەلەرانەوە، پاشان جەغزەكە لەسەر ئاوەكە دەرئەكەوت و شۆلەیەكی روناكی دەماویشت بۆ چاوی، دەریا و زەوی ئەتوت یەك رەنگن. دوای ساتێ یەكەمین رەنگەكان دەرئەكەوتن، یەكەمین سێبەرەكان، بەلآم دار چرا برقەكانی شار بە رووناكییە بێڕەنگە مانەوەكەیانەوە ئەمانەوە، چونكە هێشتا دڵنیا نەبوون كە رۆژ دەستی پێكردووە.

مۆندۆ سەیری هەتاوی ئەكرد كە سەر دەریا ئەكەوت، خۆی ئەشەكاندەوە و لە ژێر لێوەوە گۆرانییەكەی "كۆساك"ی بۆ دوپات ئەكردەوە:

"ئایایا، یایا، یایایا، یایا.."

كەس لە قەراخ نەبوو، هەرچەند كاكی بە ئاستی سەر ئاوەكەوە ئاوێزان بوون ئاوەكە گەلێ روون و خۆڵەمێشی و سور بوو و ریخەكانی سپی بوون. مۆندۆ بیری لە رۆژ ئەكردەوە كە لە ناو دەریایشدا هەر بەو شێوەیە بۆ ماسیی و قرژانگەكان هەڵئەهات.

لەوانەیە لە قولآیی ئاوەكەیشدا هەموو شتێ وەك سەرزەوی سور و روناك بێت. ماسییەكان لە خەو هەڵئەسان و بە ئارامی لە ژێر ئاسمانەكەیاندا كە وەك ئاوێنەیە، ئەبزوان. ئەوان لە نێوان هەزاران هەتاودا سەمایان ئەكرد و ئەسپە دەریاییەكانیش بەختەوەر بوون كە بە درێژایی لاسكی گیا ئاوییەكان بۆ باشتر دیتنی روناكییە لەدایكبووەكە سەرئەكەوتن.

تەنانەت گوێماسییەكان نەختێ سەرپۆشەكانیان لائەدا بۆ ئەوەی رۆژ بڕواتە ناخیانەوە.

مۆندۆ بیری لێ ئەكردنەوەو بۆ شەپۆلە ئارامەكانی ئەڕوانی كە بریقە بریق ئەكەوتنە سەر ریخەكانی قەراخ. كاتێ هەتاو كەمێ هەڵكشا، هەڵسایەوە، چونكە هەوا سارد بوو و ئاوی دەریا لە هەوا نەرمتر و گەرمتر بوو، جلەكانی داناو تا گەردن خۆی كرد بە ناو ئاوەكەدا . سەری دانەواندەوەو چاوی لە ناو ئاوەكەدا كردەوە بۆ ئەوەی بێخەكەی ببینێ. شڵپەی نەرمی شەپۆلەكانی ئەبیست كە تێك ئەشكان و مۆسیقایەكی بێوێنەی پێك ئەهێنا.

مۆندۆ ماوەیەكی زۆر لە ئاو ئاوەكەدا مایەوە، تا كاتێ كە قامكەكانی سپی بوونەوەو ئەژنۆكانی كەوتنە لەرزین. پاشان گەڕایەوەو لە قەراخ، لە پشت دیواری بەرجادەكە دانیشت. بە چاوی قوچاوەوە بە تەمای گەرمای هەتاو مایەوە كە جەستەی داپۆشێ.

تەپۆلكەكان لەسەر شارەوە ئەتوت نزیكتر بیوونەوە، رووناكییەكی جوان درەختەكان و

روکاری ڤیلاکانی ئەدرەوشاندەوە. مۆندۆ دیسان وتی: ئەبێ بڕۆم ئەوە ببینم.

ئەمجا جلەکانی لەبەرکردەوەو بەڕێ کەوت.

ڕۆژی جەژن بوو. لە "سیاپاکان" ئەئەترسا. ڕۆژانی جەژن سەگەکان و منداڵەکان ئەیانتوانی بە ئازادی بە شەقامەکاندا بگەڕێن، بەڵام ئەوەی کە دوکـان و بازاڕەکـان داخرابـوون، مۆنـدۆی وەڕەس ئەکرد. سەوزە فرۆشەکان سەوزەیان بۆ فـرۆش نەئـەهێنا، نانـەواکان دەرابـەکانیان دادابۆوە. مۆندۆ زۆری برسی بوو. لە دوکانێکی بەستەنی – فرۆشی کە ناوی "تۆپەڵە بەفر" بوو بەسـتەنییەکی فیلـی ڤـانیلی کـڕی و بـەدەم پیاسـەکردنەوە بە نـاو شـەقامەکاندا ئـەیخوارد. هەتاو شۆستەکانی رووناك کردبۆوە، بەڵام خەڵك خۆیان دەرنەئەخست، لەوانەیە زۆر ماندو بووبن. جار جار کەسێ تێئەپەڕی و مۆندۆ سەلامی لێ ئەکرد بەڵام ئەو بە سەرسوڕمانەوە بۆی ئەڕوانی چونکە خۆی قژو برژانگەکانی سپی کردبۆوەو هەتاو روخساری برۆنزی کردبوو. رەنگە خەڵك پێیان وابوو سواڵکەرە. مۆندۆ بەدەم لستنەوەی بەسـتەنییەکەیەوە بـۆ ریکلامـی دوکانـەکانی ئەڕوانی. لە یەکێ لەواندا کە گلۆپەکانی ڕۆشن بوو، قەرەوێڵەیەکی گەورە لە داری سور دیار بوو و چـەند مەلافـەو سـەرینێکیش لـە گـوڵ، وەك ئەوەی کەسێ لەسەری ڕاکشابێ.

کەمێ لەولاتر، دوکانێ پڕ لە ئاگردانی زۆر سپی و برژێنـەرێك کـە مریشکێکی کاغـەزی بـە ئارامی لە ناویدا ئەخولایەوە. هـەموو ئەمانـەی بـەلاوە سەیر بـوو. لـە ژێـر دەرگـای دوکانێکدا، گۆڤـارێکی "وێنـەیی"ی چـاو کـرد. لەسـەر نیمکەتێك بۆ خوێندنەوەی دانیشت. گۆڤارەکە بە وێنـەی رەنگینـەوە چیرۆکی ژنێکی جوانی کاڵی ئەگێڕایەوە کە خەریکی چێشتلێنان و کایەکردن بوو لەگەڵ منداڵەکانیدا. چیرۆکێکی درێـژ بـوو. مۆنـدۆ بـە دەنگـی بـەرز ئەیوتـەوە، وێنـەکانی لـە

چـاوی نزیـك ئـەکردەوە تـا رەنگـەکانیان تێکـەڵ ئەکات.

"کوڕەکـە نـاوی "ژاك"ە کـچەکەیش "کامیـل" دایکیـان لـە چێـشتخانەکەدایەو هـەموو جـۆرە خواردنێکی خۆشیان بۆ لێئەنێ: نان، مریشکی برژاو، شیرینی.

لێیان ئەپرسی "ئەمڕۆ حەز لە چی ئەکەن؟"

"ژاك" ئـەڵێ: "ئەگـەر زەحمـەت نییە تـارتێکی گەورەی تووەسورەمان بۆ دروست بکە.

بـەڵام دایکی ئـەڵێ تووە سورەمان نییـە، هـەر سێوەمان هەیە. پاشان "کامیل" و "ژاك" پێستی سێوەکان ئەگرونەوەو لەتلەتیان ئەکەن و دایکیان تارتی لێ دروست ئەکات و بە فڕنەکە ئەیبرژێنێ، بـۆنێکی خـۆش هـەموو ماڵەکـە ئـەگرێ. کـاتێ تارتەکە ئەبرژێ، دایکیان ئەیخاتە سەر مێزەکە و لەتی ئەکات. "کامیل" و "ژاك" لەگەڵ شوکولاتی گەرمدا تارتە خۆشەکە ئەخۆن، ئەمجا ئەڵێن کە هەرگیز تارتی هێندە خۆشیان نەخواردووە".

کاتێ مۆندۆ خوێندنـەوەی چیرۆکەکەی تەواو کرد، گۆڤارەکەی لە ناو بنە گیایەکدا شاردەوە بۆ ئەوەی دوایـی جارێکی تـر بیخوێنێتـەوە. حەزی ئەکرد گۆڤـارێکی تـر بکـڕێ. بـۆ وێنـە چیرۆکی "ئـاکیم لـە نـاو دارسـتاندا"، بـەڵام دوکـانی ڕۆژنامەفرۆشـییەکە داخرابـوو. لـە ناوەڕاسـتی باخەکـەدا، مالنـشینێك لەسـەر نیمکـەتێك نوستبوو، ڕۆژنامەیـەکی کـراوەو کڵاوێـك لەسـەر نیمکەتەکە بوو.

کـاتێ هـەتاو لـە ئاسمـان سـەرکەوت، روناکییـەکی دڵبزوێن و فێنك بوو. ترۆمبیلەکان بە هۆڕن لێدان کەوتبوونە شـەقامەکان، لەوپـەڕ باخەکـە، لای دەرگاکـە، کـوڕێکی بـچوك بـە سـێ چەرخەیەك کایەی ئەکرد. مۆندۆ لایدا و وەستا:

–هی خۆتە؟

کوڕە بچوکەکە وتی: ئەرێ.

–ئەیدەی بە دەستمەوە؟

کوڕە بچوکە توند دەستەکەی گوشی و بە هەموو هێزییەوە وتی: "نە، نە، لاچۆ".

–چەرخەکەت ناوی چییە؟

کوڕە بچوکەکە بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە سەری داخست. پاشان بە توندی وتی: "میني".

مۆندۆ وتی: جوانە.

دیسان تۆزێ سەیری سێ چەرخەکەی کرد، سور بوو و زینەکەی رەش، دەستەو گلگیرەکەی رەنگ کرۆمی. دوو سێ جار دەستی هێنا بە رەنگەکەدا، بەڵام کوڕە بچوکەکە دووری خستەوە و بە رکێف لێدان رۆیشت. گۆڕەپانی بازاڕەکە خەڵکێکی کەمی لێ بوو، لە دەستەگەلی چەند کەسیدا بۆ کەشی "عشای رەبانی" بەرەو دەریا بە پیاسەکردن ئەچوون.

رۆژانی جەژن، مۆندۆ زۆری حەز ئەکرد بە کەسێ بگات و بڵێ:

–ئەتەوێ بمکەیت بە کوڕی خۆت؟

بەڵام رەنگە لەم رۆژانەدا کەس نەیەوێت. مۆندۆ بە رێکەوت رۆیشتە سالۆنی خانویەکەوەو بۆ سندوقی خالیی نامەکان و تابلۆی ئاگر کوژێنەرەوەکەی روانی. دەستی نا بەسەر دوگمەی تایمەرەکەدا و ساتێ گوێی لە تیك تاکەکەی گرت، تا کاتێ کە رۆشناییەکەی کوژایەوە. پلیکانەکە بە نەردەی دارین و بۆیاخکراوەوە لەوپەڕی ماڵەکەوە بوو و ئاوێنەیەکی مات کە بە پەیکەری گەچین دەوری گیرابوو. مۆندۆ پێی خۆش بوو سوار ئاسانسۆرەکە بێت بەڵام نەیئەوێرا، چونکە بۆ منداڵان قەدەغە بوو بە تەنیا سواری بن.

ژنێکی شۆخ و شەنگ رۆیشتە ناو بیناکەوە، قژێکی گەنم رەنگی لولی هەبوو.و تەنورەیەکی رەنگ رۆشنی لەبەردا بوو کە لە کاتی رۆیشتندا خشەخشی ئەهات. بۆنێکی خۆشی لێوە ئەهات. مۆندۆ لە گۆشەی دەرگاکەوە دەرپەڕییە دەرەوە:

–چیت ئەوێ؟

–ئەتوانم لەگەڵتان سوار ئەسانسۆرەکە بم؟

ژنە لاوەکە بە میهرەبانییەوە بزە گرتی: بێگومان، بابڕۆین.

ئاسانسۆرەکە لە ژێر پێیاندا وە کەشتییەك ئەلەرییەوە.

–بۆ کوێ ئەڕۆی؟

–بۆ سەری سەرەوە.

–بۆ نهۆمی شەشەم؟ منیش.

ئاسانسۆرەکە بە ئارامی سەرئەکەوت. مۆندۆ لە شوشەکانەوە بۆ سەقفەکەی ئەڕوانی کە بەدوادا ئەچوو. دەرگاکان ئەلەرینەوەو لە هەر نهۆمێکدا تەقەتەقێکی سەیر ئەبیسترا. هەروەها لە قەفەسەی ئاسانسۆرەکەوە فیکەی کابلەکانی ئەبیست.

ژنە لاوەکە بە سەرنجەوە بۆ مۆندۆی ڕوانی:

–تۆ لێرە ئەژیت؟

–نە خانم.

–بۆ دیتنی هاوڕێکانت ئەڕۆی؟

–نە خانم، من بۆ پیاسەکردن ئەڕۆم.

–ئێ؟

ژنە لاوەکە چاوی بڕیبوە مۆندۆ، دوو چاوی گەورەی هێمن و ئارامی کەمێ تەڕی هەبوو. کیفەکەی کردەوەو نوقلێکی دایە. مۆندۆ بۆ نهۆمەکانی ئەڕوانی کە یەکلەدوای یەك تێئەپەڕین.

مۆندۆ وتی: وەك فڕۆکە بەرزە.

–تا ئێستا سوار فڕۆکە بووی؟

–نێ، نە خانم، نە هێشتا، ئەبێ زۆر سەرنجڕاکێش بێ.

–ژنە لاوەکە پێکەنی.

–ئەزانی زۆر خێراتر لە ئاسانسۆر ئەڕوا؟

–زۆر بەرزتریش

–ئەرێ، زۆر زۆر بە زۆرتر.

ئاسانسۆرەکە بە ناڵەناڵ لەپڕ گەیشت، ژنە لاوەکە رۆیشتە دەرەوە.

—دێیته دەرەوە؟

مۆندۆ وتی: نە، ئەمەوێ خێرا بگەڕێمەوە خوارەوە.

—ئا، ئەرێ، هەر جۆر پێت خۆشە. بۆ چوونە خوارەوە ئەبێ دەست بنێی بە دوگمەیەك بەر لە دوایین دوگمەدا. ئاگادار بە دەست بە دوگمە سورەکەدا نەنێیت، زەنگی ئاگادارییە.

بەر لەوە دەرگاکە ببەسترێ، دیسان بزەیەك گرتی:

—سەفەر خۆش!

مۆندۆ وتی: خوات لەگەڵ.

کاتێ لە بیناکە هاتە دەر، هەتاو لە ئاسمان هەڵکشا بوو و ئەوەندەی نەمابوو بگاتە دڵی ئاسمان.

ڕۆژەکان خێرا تێئەپەڕین، لە بەیانییەوە تا شەو، ئەگەر ئاگایشیان لێ نەبێت، لەوێش خێراتر تێئەپەڕن هەر لەبەر ئەوەیە کە خەڵکی هەمیشە بە پەلەن، بە پەلەن کە هەموو کارەکانیان بەر لە داچوونی هەتاو ڕێك بخەن. کاتی نیوەڕۆ، لە شەقامەکانی شاردا هەنگاوی گەورە گەورە هەڵئەگرن، لە ماڵ ئەڕۆنە دەر، سوار ترۆمبیلەکان ئەبن، دەرگاکانی توند پێوە ئەدەن. مۆندۆ زۆر حەز ئەکات پێیان بڵێت: "ئاگادار بن، ئاگادارین". بەڵام کەس سەرنجی ئەوی نەئەدا.

دڵی توندتر و بەهێزتر کەوتە لێدان. ئەویش لە کونجێکدا وێسا، جوڵەی لە خۆی بڕی، باڵی لەسەر یەك دانا و چاوی بڕیە حەشاماتەکە کە لە شەقامەکەدا لە هاتوچۆدا بوون.

ئیتر وەك بەیانی ماندوو دیار نەبوون. خێراتر ئەڕۆیشتن، بە دەم قسەکردن و پێکەنینەوە شەقەی پێیان بەرز ئەبۆوە. لە ناویاندا، ژنێکی بە ساڵاچووی پشتکۆماوە بە ئارامی، بێئەوەی کەس بیبینێ، لەسەر شۆستەکە ئەچووە پێش. کیسەیەك پڕ لە ئازووخەی پێ بوو کە هێندە قورس بوو لەگەڵ هەر هەنگاوێك ئەیدایە سەر زەوی.

گوێی لە ژنە پیرەکە بوو کە هەناسەبڕکێی پێکەوتبوو، ژنە پیرەکە لە بەر دەرگای خانوویەکی ڕەنگ خۆڵەمێشی وەستاو مۆندۆ لەگەڵیدا بە پلیکانەکەدا سەرکەوت. پێی وابوو کە ژنە پیرەکە لە دایە گەورەی یان پوری ئەچێت. بەڵام قسەی لەگەڵ نەئەکرد، چونکە گوێی گران بوو. ژنە پیرەکە لە نهۆمی چوارەمدا دەرگایەکی کردەوە، ڕۆیشتە چێشتخانەکە و لەتێ نانی دا بە مۆندۆ و وتی: خوا لێت ڕازی بێت. مۆندۆ دیتبووی کە دەستی ئەلەرزێ.

دورتر، لە شەقامەکە، مۆندۆ هەستی ئەکرد کە زۆر بچوك بۆتەوە. لە ڕاستای دیوارەکەوە ئەڕۆیشت، خەڵکەکەی دەوروبەری ئەوەندەی درەختەکان بەرز ببوونەوەو ڕوخساریان وەك بانێژەی خانوەکان دوردەست بوون. مۆندۆ لە ناو ئەم هەموو دێوە زمانەدا کە هەنگاوی هێندە بەرزیان هەڵئەهێنا، خۆی جێ کردبۆوە.

خۆی لەو ژنە بەرزانە لائەدا کە بە تەنورەی گەورەی خاڵخاڵەوە وەك بورجی کلیساکان بەرزبوون، لەو پیاوانەش کە بە کۆت و پانتۆڵی شین و کراسی سپییەوە وەك تاشەبەردەکانی کەنار دەریا کەلەگەت بوون، خۆی دوور ئەخستەوە. ڕەنگە بەهۆی ڕوناکی ڕۆژەوە بووبێ کە ئاوای ئەبینی. ڕوناکییەك کە شتەکانی گەورە و سێبەرەکانی بچوکتر ئەکردەوە.

مۆندۆ خۆی بە نێوانیاندا ئەخزاند، هەر ئەو کەسانەی کە بۆ خوارەوەیان ئەڕوانی ئەیانتوانی بیبینن.

نەئەترسا، مەگەر ئەو کاتانەی کە لە شەقام ئەپەڕیەوە. بەڵام ئەو لە هەموو جێگایەکدا، لە شار، لە باخە گشتییەکان، لە کەنار دەریا بە دوای کەسێکدا ئەگەڕا. خۆیشی نەیئەزانی بە دوای کێدا ئەگەڕێ و بۆچی ئەگەڕێ، بەڵام

کەسێ کە هەر خێرا پێی بڵێ و خێرایش وەڵامەکەی لە ناو چاوەکانیدا بخوێنێتەوە: ئەتانەوێ بمکەن بە کوڕی خۆتان؟

لەو ماوەیەدا بوو کە مۆندۆ "تی شان"ی چاوپێکەوت. کاتێ ڕۆژەکان جوان بوون و شەوەکان درێژ و گەرم. مۆندۆ لە حەشارگەی شەوانەی خۆی لە خوار سەدەکەوە دەرکەوت. "با"یەکی فێنك لە زەوییەوە هەڵی کرد، "با"یەکی وشك بوو کە قژی ئەلەکتریکی ئەکرد و دارستانی چیوپەمەییەکانی ئەسوتاند. لە سەرو شارەوە، بەسەر تەپۆلکەکانەوە، مۆندۆ دوکەڵێکی سپی گەورەی چاو کرد کە لە ئاسماندا بڵاو بیۆوە. ساتێ سەیری تەپۆلکەکانی کرد کە هەتاو ڕوناکی کردبوونەوەو جادەکەی ڕووەو ئەوێی گرتە بەر. جادەیەکی پێچاو پێچ بوو کە جار بە جار شێوەی پلیکانەی بوو، لەملاولای جادەکەوە جۆگەلەکان پڕ بوون لە گەڵای وشك و لەتە کاغەز.

مۆندۆ زۆری حەز ئەکرد بە پلیکانەکاندا سەرکەوێ. پلیکانەکان لە نێوان تەپۆلکەکەوە بە خوارو خێچی ملیان نابوو. وەك ئەوەی ڕێ بۆ هیچ شوێنێ نەبەن، درێژایی ڕێگاکە دیواری بەرزی بەردین بوو کە سەرەکەی بە وردە شوشە گیرابوو. مۆندۆ بە ئارامی لە پلەکان سەرئەکەوت و بۆ جۆگەکانی ئەڕوانی، بەڵکو شتێکی سەرنجڕاکێش ببینێ. بڕێجار پارەی وردە، بزمارێکی ڕەنگاوی، وێنەیەك یان میوەیەکی سەیری ئەبینی. تا زیاتر سەرئەکەوت، شار پان و بڵاوتر دەرئەکەوت، بە خانوبەرە درێژکۆلەکانییەوە و هێڵی ڕاستی شەقامەکان کە ترۆمبیلە سورو شینەکان ئەیبزواند. دەریایش لەسەر تەپۆلکەکەوە، پان و بڵاو ئەبۆوە و وەك پلاکێکی تەنەکە ئەدرەوشایەوە. مۆندۆ بۆ دیتنی هەموو ئەوانە لە نێوان لاسکی درەختەکان و سەر دیواری ڤێلاکانەوە، ئاوڕی ئەدایەوە. کەس لەسەر پلیکانەکان نەبوو، تەنیا جارێ پشیلەیەکی قەڵەوی پێست پلنگی، لە ناو جۆگەلەکە خۆی داشاردبوو و پاشماوەی گۆشتی ناو قتویەکی ڕەنگاوی ئەخوارد. پشیلەکە خۆی درێژکردبۆوە و گوێی داخستبوو. بە گلێنە گردبوەکانییەوە لە ناو چاوە زەردەکانیدا بۆ مۆندۆی ئەڕوانی. مۆندۆ بێئەوەی ورتەی لێوە بێت، تێپەڕی. هەستی بە گلێنەی چاوە ڕەشەکانی کردبوو کە بێوچان تا کاتێ گەیشتبووە پێچەکە، چاوی لێ نەئەبڕی.

مۆندۆ بێدەنگ سەرئەکەوت، بە ئارامی هەنگاوی دائەنا بۆ ئەوەی پێ بەسەر لاسکە ناسکەکان و تۆمەکاندا نەنێت. زۆر بێدەنگ، وەك سێبەرێك ئەخزا، پلەکان زۆر لەبار نەبوون. بڕێجار لە لێژاییەکی زۆر بەرزەوە پلەکانی بچوك و کورت بوو کە مەناسەبڕکێی پێ ئەخست، بڕێجاریش زۆر بە ئارامی بە نێوان زەوی و زار و زەوییە بایەرەکاندا ئەکێشرا.

بڕێجار تەنانەت حەزی ئەکرد دابەزێ. مۆندۆ پەلەی نەبوو، ئەویش بە خواروخێچی، لە دیوارێکەوە بۆ دیوارێکی تر ئەچووە پێش، بۆ سەیرکردنی ناو جۆگەکان، یان بۆ بەرزکردنەوەی گەڵای درەختەکان ئەوەستا. گەڵای برکە بیبارەکانی بەرز ئەکردەوە لە ناو قامکەکانیدا ئەیپرواند بۆ ئەوەی بۆنەکەی هەست پێبکات کە لوت و چاوی ئەتۆزاندەوە.

گوڵی "یاس"ی ئەکەندەوەو تنۆکە بچوکە شیرینەکانی ئەمژی کە بە ڕێك و پێکی لە خوار کاسەی گەڵاکانەوە ڕازابوونەوە، یان بە گەڵایەك لە نێو لێوەکانیدا ئاوازی لێئەدا.

مۆندۆ زۆری پێ خۆش بوو بە تەنیایی لە تەپۆلکەکانەوە تێپەڕێ، زۆرتر سەرکەوتایە، ڕوناکی هەتاو زەردتر و گونجاوتر ئەینواند، ئەتوت لە گەڵای گیاکان و بەردی دیوارە کۆنەکانەوە دەرئەهات. بە درێژایی تەواوی ڕۆژ

روناکی هەموو زەویەکەی تێوە تلاندبوو و ئێستا دەرئەمات و گەرماکەی بڵاو ئەکردەوەو هەورەکانی دەتاوساند.

سەر تەپۆلکەکە کەسی لێنەبوو، بێگومان لەبەرئەوە بوو دوانیوەڕۆ بوو، هەروەها ئەوێ مەڵبەندێکی چۆڵ و دور بوو. ڤێلاکان لە ناو درەختەکاندا گوم ببوون. خەمین نەبوون، بەڵام بە پەنجەرە کرکرەییەکانیانەوە کە بە دژواری داخرابوون، خەوالوو دیاربوون.

مۆندۆ جریوە جریوی باڵندەکان لەناو درەختەکاندا و خشەخشی ئارامی لاسکی درەختەکانی لەبەر "با"دا ئەبیست. بە تایبەت کوللەیەك کە بە ویژەیەکی گویدر ئەبزوا، ئەتوت لەگەڵ مۆندۆ ڕێی ئەبڕی. جار جار دوور ئەکەوتەوە، ئەمجا ئەگەڕایەوە، هێندە نزیك ئەکەوتەوە کە مۆندۆ لای ئەکردەوە بۆ ئەوەی دەعباکەی ببینێ، بەڵام دەنگەکە نەدەما، یان لە سەرەوە، لەسەروی دیوارەکەوە دەرئەکەوتەوە.

مۆندۆیش بە کەڵای گیایەك فیکەی ئەکێشا و بانگی لێ ئەکرد، بەڵام کوللەکە خۆی نیشان نەئەدا، پێی خۆشتر بوو هەر وا شاراوە بمێنێتەوە. هەورەکان لەبەر گەرما تا ئاست سەر تەپۆلکەکان داگەڕابوون، بە ئەسپایی بەرەو باکور ئەخزان، کاتێ لە نزیك هەتاوەوە تێئەپەڕین، مۆندۆ هەستی بە سێبەرێك بەسەر روخسارییەوە ئەکرد. رەنگەکان ئەگۆڕان، ئەبزوان، رووناکیە زەردەکە دائەگیرساو ئەکوژایەوە. ماوەیەکی زۆر بوو حەزی ئەکرد بە تەپۆلکەکاندا سەرکەوێ. زۆربەی کات لەناو حەشارگەکەیەوە لە کەنار دەریاوە بۆی ئەڕوانی. بە هەموو درەختەکان و روناکییە جوانەکەیەوە کە لەسەر روکاری ڤێلاکانەوە ئەدرەوشایەوە وەك خەرمانەیەك پرشنگی ئەپرژاند.

هەر بۆ ئەوە تامەزرۆی سەرکەوتنی سەر تەپۆلکەکە بوو، چونکە ڕێگای پلیکانەکان وا دیار بوو کە بەرەو روناکی و ئاسمانی ئەبات. بەڕاستی تەپۆلکەیەکی جوان بوو، دروست لەسەر دەریا، نزیك هەورەکان. مۆندۆ ماوەیەکی زۆر بینایی لەسەر ئەگیرساندەوە. بەیانیان، کاتێ هێشتا خۆڵەمێشی و دوور دەست بوو، تەنانەت شەوانیش، کە بە روناکییە ئەلەکترکییەکانی ئەدرەوشایەوە.

مۆندۆ لەوەی کە بە چوار پەل سەرئەکەوت خۆشحاڵ بوو. قورناویلکەکان لەناو کۆگا زەردەکاندا، ▪ درێژایی دیوارەکانەوە مەڵئەماتن. مۆندۆ ئەیویست دایانچڵەکێنێ، بێدەنگ لێیان نزیك ئەبۆوە، بەڵام ئەوان هەر کە دەنگیان ئەبیست، هەڵئەماتن و لەناو درزەکاندا خۆیان ئەشاردەوە. مۆندۆ بە فیکە بانگی ئەکردن. زۆری حەز ئەکرد قورناویلکەیەکی بۆ خۆی هەبێت، بەخێوی بکات و لە ناو گیرفانیدا پێکەوە پیاسە بکەن. مێشی بۆ بگرێ و ئەو کاتانەی لەبەر هەتاو، لە کەنار دەریا، یان لە ناو تاشەبەردەکانی سەدەکە دائەنیشێ، لە گیرفانی بێتە دەرەوەو لەسەر شانی بنیشێتەوەو گەروی تریە ترپ بکات، ئاخر قورناویلەکان هەمیشە ئەمرخێلن.

پاشان مۆندۆ گەیشتە بەر خانوی "روناکی زێرین". یەکەمجار کە بچێتە ناو خانوەکەوە، خۆی ئەو ناوەی لێ نابوو و هەر بەو ناوەشەوە مابۆوە. خانویەکی جوانی کۆن بوو بە شێوەی ئیتالیایی، بە گەچی زەرد و نارنجی داپۆشرابوو. بە پەنجەرەیەکی بەرزی کرکرەیی شکاو و دارسێوێکی دەستتەمخوارد و کە پلیکانەی ماڵەکەی گرتبوو. ماڵەکە لە باخێکدا بوو کە زۆر گەورە نەبوو، بەڵام گژوگیاکەی هێندە چرو پڕ بوون کە سنورەکانی دیار نەمابوو. مۆندۆ پاڵی نابوو بە دەرگا ئاسنینەکەوە. لەو گوزەرگا ریخییەی کە بەرەو ماڵەکە ئەڕۆیشت، بێئەوەی چرکەی لێوە بێت، ملی نابوو. ماڵە

زەردەکە ساکار بوو. سەرستوون و گەچی رازاوەی نەبوو.

بەڵام مۆندۆ پێی وابوو کە هەرگیز خانوی هێندە جوانی نەدیوە. لە ناو باخە شپرزەکەدا، لەبەر خانوەکەدا، دوو دار خورمای جوان تا سەربانەکە بەرز ببوونەوە. کاتێ سروەیەك هەڵی ئەکرد لاسکەکانی ناو دان و سواڵەتەکانی ئەروشاند. کژۆکیا دارخورماکانی ئابلۆقە دابوو. شاخەی گەورەی وەنەوشەکان وەك مار لەسەر زەوی راکێشرابوون و لە ناویاندا تێپەڕیبوون. ئەو شتەی کە بە تایبەت جوان بوو، روناکییەك بوو کە دەوری ماڵەکەی گرتبوو. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە مۆندۆ خێرا ئەو ناوەی لێ نابوو: خانووی "روناکی زێرین".

هەتاو روناکی ئاخرو ئۆخری دوا نیوەڕۆیەکی زۆر مولایم و ئارامی هەبوو.

لە کاتێکدا بە ئارامی لەسەر جادە رێخییەکە ئەچووە پێش، هەستی بە روناکی ئەکرد کە روخساری ئەوازش ئەکرد. حەزی ئەکرد بنوێ، دڵی ئارامتر لێی ئەدا، هەناسەی هەڵنەئەمات، ئاوازی کوللەکە بیسان توندتر دەستی پێ کردبۆوە، ئەتوت لە کژۆکیای باخەکەوە دەرئەمات. مۆندۆ تاوێ وەستاو گوێی لێگرت، پاشان بە ئارامی بەرەو خانوەکە بەڕێ کەوتەوەو ئامادەی ئەوە بوو کە ئەگەر سەگێ لێی نزیك بێتەوە هەڵبێت، بەڵام هیچ شتێکی بەدی نەکرد.

کژۆکیای باخەکە بێ جوڵە بوون، گەڵاکانیان لەبەر گەرما قورس ببوون. مۆندۆ بە چوار پەل لە ناو لقی گیاکاندا خۆی ئەخشاند و بە دەستی دڕکەکانی لائەدا. لە حەشارکەیەکدا دانیشت و چاوی بڕییە خانووە زەردەکە. روناکی بە شێوەیەکی ئاشیار لەسەر روکاری خانوەکە دائەمرکایەوە. جگە لە دەنگی کوللەکە و گیزەگیزی گومی مێشولەکان کە لە دەورقژیا سەمایان ئەکرد، دەنگێکی تر نەبوو.

لە ژێر گەڵاکانی گەڵابۆیەکدا دانیشتبوو و چاوی لەسەر دەرگای ماڵەکەو پلیکانەکان کە لە سێگۆشەیەکدا بەرەو پلەی بەرماڵەکە ئەگەڕانەوە، هەڵنەئەگرت. لە قەراخ پلەکاندا کژۆکیا روابوو. سەری نایە سەر ئەژنۆکی و خۆی گرمۆڵە کرد. خەوتنی ئاوای زۆر پێ خۆش بوو، لە ژێر درەختێکدا کە بۆنێکی توندی لێ بێت و نزیك خانوی "روناکی زێرین" و گەرما و هێمنی ئابلوقەی دابێت، لەگەڵ دەنگی گویدری کوللەکە کە بێوچان ئەمات و ئەچوو.

مۆندۆ! کاتێ تۆ ئەخەوتی، لەویا نەبووی. دوور ئەکەوتیتەوە، لە جەستەت دەرئەهاتی، جەستەت بە خەوتوویی لەسەر زەوی، چەند میترێ لەولای جادەکەوە بەجێ ئەهێشت و لە جێگایەکی تر پیاسەت ئەکرد، سەیر ئەوە بوو کە جەستەت لەسەر زەوی ئەمایەوە بە ئارامی هەناسەت ئەکێشا، "با" سێبەری هەورەکانی ئەهێنایە سەر روخسارە چاو بەستراوەکانتەوە. مێشولە پێست بە برینەکان لە دەور گۆناتدا سەمایان ئەکرد. مێرولە رەشەکان هەموو جەستەتیان ئەپشکنی. قژەکانت لەبەر "با"ی شەودا ئەشەکانەوە، بەڵام تۆ لەوێ نەبوویت، لە جێگایەکی تردا بوویت، لە روناکی گەرمی خانووەکەدا لە بۆنی گوڵەکانی گەڵابۆدا، لە نمێکدا کە لەسەر زەوی دەرئەمات، نوقم ببووی.

جاڵجاڵۆکەکان بەسەر تاڵەکانیانەوە ئەلەرزین، چونکە کاتی خەبەربونەوەیان بوو. قورناویلکە زەرد و رەشەکان، لە درزەکانیان لە سەر دیواری ماڵەکە ئەخزانە دەرەوەو بە چنگە قامك بڵاوەکانیانەوە، ئاوێزان، سەیری تۆیان ئەکرد.

هەموو کەس سەیری تۆی ئەکرد، چونکە چاوەکانت بەسترابوون. لە جێگایەك لەو پەر باخەکە لە ناو دڕك و دەوەنە چڕەکانی درەختی "ڕاج" نزیك "سەوڵ"ێکی وشك هەڵهاتوو، سیسرکەکە بێ ماندوبوون بە دەنگە هەلال

هێنەرەکەی قسەی لەگەڵت ئەکرد، بانگی ئەکردی بەڵام تۆ گوێت لێی نەبوو، دورکەوتبوویتەوە.

دەنگە زیکەکە پرسیاری کرد: تۆ کێی؟

لەبەردەم مۆندۆدا ژنێك هەبوو، بەڵام هێندە بچوك بوو مۆندۆ بۆ ساتێ وای زانیبوو منالە. قژە رەشەکەی لە دەوری روخسـاریدا خـڕ بڕیبووی، بەرهەڵبێنەیەکی خۆڵەمێشی لەبەردا بوو. بزە گرتی:

–تۆ کێی؟

مۆندۆ هەڵسابۆوە، تۆزێ لەو بچوکتر بوو، باوێشکێکی دا.

خەوتبوی؟

مۆندۆ وتی: ببوورە، من هاتمە باخەکەتان، ماندو بووم، کەمێ نوستم، ئێستا ئەڕۆم.

–خێرا ئەڕۆی؟ خۆشیت لە باخەکە ئەمات؟

مۆندۆ وتی: نا، زۆر جوانە..

لە روخساری ژنە بچوکەکەدا بە دوای نیشانەی توڕەبووندا ئەگەڕا، بەڵام ئەو بەردەوام بزە لەسەر لێوی بوو. چاوە بادامییەکانی وەك چاوی پشیلە، حاڵەتێکی سەیری بوو. چرچ و لۆچ دەوری چاو و دەمی گرتبوو. مۆندۆ پێی وابوو کە ژنەکە پیر بووە.

–وەرە ماڵەوەش ببینە.

لە پلیکانە بچوکە سێگۆشەکە سەرکەوت و دەرگاکەی کردەوە.

–دەی وەرە.

مۆندۆ لە دوایەوە رۆیشتە ماڵەوە. ساڵۆنێکی گەورەی چۆڵ بوو. چەند پەنجەرەی بەرز لە چواردەوریدا روناکی کردبۆوە، لە ناوەڕاستی ساڵۆنەکەدا مێزێکی دارین و چەند کورسییەکی لێ بوو. قۆرییەکی رەش و چەند کاسەیەك لەسەر سینییە بریقەدارەکەی سەر مێزەکە بوو. مۆندۆ لە نێوان دەرگاکەدا بێ جوڵە مابۆوە و بۆ ساڵۆنەکەو پەنجەرەکانی ئەڕوانی. پەنجەرەکانی چوارخانە و شوشەکانی مات بوون. رووناکییەکە کە ئەهاتە ماڵەوە گەرمتر و زێڕینتر بوو.

ژنە بچووکەکە بەسەر پێوە چایی تێئەکرد.

–حەز لە چایی ئەکەی؟

مۆندۆ وتی: ئەرێ.

–دەی وەرە لێرە دانیشە.

مۆندۆ بە ئەسپایی لە لێواری کورسییەکە دانیشت و چاییەکەی خواردەوە. خواردنەوەکەیش بە رەنگی زێڕ بوو لێوو گەروی سوتاند.

مۆندۆ وتی: داخە.

ژنە بچوکەکە بێدەنگ قومێکی خواردەوە.

–پێت نەووتم کە تۆ کێی؟

دەنگی لە مۆسیقایەکی نەرم ئەچوو.

مۆندۆ وتی: من مۆندۆم.

ژنە بچوکەکە بە بزەوە بۆی ئەڕوانی. لەسەر کورسییەکە بچوکتر دیار بوو.

–من ناوم "تی شان"ە.

مۆندۆ پرسیاری کرد: تۆ خەڵکی چینیت؟

ژنە بچوکەکە سەری لەقاند: من ڤێتنامیم نەك چینی.

–وڵاتەکەتان دورە؟

–ئا، زۆر زۆر دوورە.

مۆندۆ چاییەکەی خواردەوە، ماندوێتییەکەی رەوییەوە.

–ئەی تۆ خەڵکی کوێیت؟ تۆ هی ئێرە نیت، نە؟

مۆندۆ نەیدەزانی لە وەڵامدا چی بڵێ:

–نە من ئێرەیی نیم.

بە داخستنی سەری، دەستەیەك لە قژی لادا. بێوچان بزە بەسەر لێوی ژنە بچوکەکەوە بوو بەڵام چاوە تەنگەکانی نیگەران دیار بوون.

–تۆزێ تر بمێنەوە، ناتەوێ خێرا بڕۆی؟

–من نەئەبوایە بهاتمایەتە ناو باخەکەتان، بەڵام دەرگاکە کرابۆوەو منیش کەمێ ماندوبووم.

"تی شان" ساکارانە وتی: کارێکی باشت کرد هاتیتەماڵەوە. خۆ دیت من دەرگاکەم لەبەر تۆ کردبۆوە.

مۆندۆ وتی: ئێوە نەتانزانی کە من دێم؟

ئەم بیرە دڵنیای کردبوو.

"تی شان" بە لەقاندنی سەری وتی: "ئەری" و دەفرێکی فافۆنی پڕ لە ماکارۆنی پێ دا.

—برسیتە؟

—ئەری.

بە دەم سەیرکردنی پەنجەرەکان کە روناکی لەوێوە ئەهاتە ماڵەوە، دەستی کرد بە خواردنی ماکارۆنییەکە.

—جوانە ، ئەم هەموو زێڕە چۆن دروست ئەبێ؟

"تی شان" وتی: لە روناکی هەتاوەوە.

—دەی تۆ دەوڵەمەندی.

"تی شان" پێکەنی: ئەو زێڕە هی کەس نییە.

ئەوان سەیری روناکییە جوانەکەیان ئەکرد، ئەتوت لە خەودان.

"تی شان" بە دەنگێکی نەرم وتی:

—وەک وڵاتەکەی منە، کاتێ هەتاو دائەچێ، ئاسمان ئاوای لێ دێت، زەردی زەرد، لەگەڵ چەند هەورێکی رەشی زۆر ناسک کە ئەڵێی پەڕی باڵندەکانە.

هۆڵەکە لێوان لێو ببوو لە روناکییە زێڕینەکە، مۆندۆ هەستی ئەکرد وەک دوای خواردنەوەی چاییە داغەکە، ئارامتر و بەهێزتر بووە.

"تی شان" پرسیاری کرد: خۆشیت لە ماڵەکەم دێ؟

مۆندۆ وتی: بەڵێ خانم.

چاوەکانی رەنگی هەتاویان لێک ئەدایەوە.

—دەی هەرکات پێت خۆش بێت، ماڵی خۆتە.

ئاوابوو کە مۆندۆ لەگەڵ "تی شان" و ماڵی "روناکی زێڕین" ئاشنا ببوو. ماوەیەکی زۆر چاوی بڕیبووە پەنجەرەی ساڵۆنەکە. تا ئەو کاتەی کە هەتاو بە تەواوەتی لە پشت تەپۆڵکەکانەوە گوم ببوو. روناکییەکە مابۆوە. تەنانەت لەو کاتەیشدا، روناکییەکە هێندە تەشەنەی کردبوو دیوارەکانی ساڵۆنەکە ئەتوت توانای کوژانەوەیان نییە.

پاشان تاریک داهاتبوو و هەموو شت خۆڵەمێشی ببوو، دیوارەکان، پەنجەرەکان، قژی مۆندۆ، سەرمایش هاتبوو. ژنە بچوکەکە هەستابوو بۆ ئەوەی گلۆپێ داگیرسێنێ. دواتر بۆ سەیرکردنی شەو، مۆندۆی بردبوە ناو باخەکە. لە ئاست سەر درەختەکانەوە ئەستێرەکان و خەرمانەی ئاسکی مانگ ئەدرەوشانەوە.

ئەو شەوە مۆندۆ لەسەر سەرینەکان لە کونجێکی ساڵۆنەکە نوست. شەوانی تریش لەویا ئەنوست، چونکە ئەو ماڵەی زۆر پێ جوان بوو. بڕێجار، کاتێ شەوانە هەوا گەرم دەبوو، لە باخەکەدا لە ژێر "داربۆ"کەدا لەسەر پلیکانەی بەرماڵەکە، ئەنوست.

"تی شان" زۆر قسەی نەئەکرد، بۆیە مۆندۆ زۆری خۆش ئەویست. لەو کاتەوەی کە بۆ یەکەمجار، پرسیاری لێکردبوو ناوی چییە و خەڵکی کوێیە، ئیتر پرسیاری لێ نەکردبوو.

هەر دەستی ئەگرت و شتە سەرنجڕاکێشەرەکانی ناو باخەکە و خانوەکەی نیشان ئەدا. بەردە وردەکانی نیشان ئەدا کە فۆرم و نەقشی سەیریان لەسەر بوو، گەڵای درەختەکان بە رەگبەرگە ناسکەکانیانەوە، گوڵە سپی و زەردە بچوکەکان کە لە بەین بەردەکانەوە روابوون.

ئەو گوگلینکە و خشخشۆکەی ئەنایە ناو دەستی مۆندۆ و مۆندۆیش لە جیاتی ئەو گوێچکە ماسی و پەری کاکی ئەدایە کە لە کەنار دەریا دۆزیبوونیەوە. "تی شان" برنج و کاسەیەک سەوزەی نیوە کوڵاوی پێئەدا و هەموو

جارێکیش لە کاسەیەکی سپیدا چایی گەرمی بۆ تێئەکرد.

بڕێجار، کاتێ شەو گەلێ تاریک ئەبوو، "تی شان" کتێبێکی وێنەیی ئەهێناو چیرۆکێکی کۆنی بۆ ئەگێڕایەوە. چیرۆکێکی زۆر درێژ کە لە وڵاتێکی نەناسراودا رویدا بوو، شوێنێ کە سەربانی خانووەکان، نووکتیژبوون و ئەژدیها و حەیوانەکان وەك مرۆڤەکان قسەیان ئەکرد.

چیرۆکەکە هێندە جوان بوو کە مۆندۆ تا کۆتایی نەیئەتوانی گوێی بۆ بگرێ، خەوی لێ ئەکەوت و ژنە بچوکەکە بێدەنگ ئەچوو گڵۆپەکانی ئەکوژاندەوە. ئەو لە نهۆمی یەکەم، لە ژوورێکی تەنگدا ئەخەوت. بەیانیان کاتێ لە خەو هەڵئەسا، دەمێك بوو مۆندۆ رۆیشتبوو.

****

لە زۆربەی تەپۆلکەکانەوە، ئاگر هەڵی کردبوو چونکە نزیك هاوین بوو. لە رۆژدا، ئەستونی دوکەڵی سپی ئاسمانیان لەکەدار ئەکرد. شەوانەش پزیسك وەك سوتوی جگەرە روناکییەکی سوری هەبوو کە ئەبوە هۆی دڵەڕاوکێ و نیگەرانی. مۆندۆ کاتێ لە کەنار دەریا بوو یان لە پلیکانەکانەوە بەرەو ماڵی "تی شان" ئەرۆیشت، سەیری ئاگرەکانی ئەکرد.

دوانیوەڕۆیەك زوتر لە هەموو کات گەڕابۆوە و دەستیکردبوو بە هەڵکەندنی گژوگیای دەوروبەری ماڵەکە، کاتێ "تی شان" لێی پرسیبوو کە خەریکی چییە، وتبووی:

—بۆ ئەوەی ئاگرەکە نەگاتە ئێرە.

ئێستاکە زۆربەی شەوانە لە خانوی "روناکی زێڕین" یان لە باخەکەیدا ئەخەوت، کەمتر لە کامیۆنە بچوکە خۆڵەمێشییەکەی "سیا پاکان" ئەترسا. ئیتر بۆ حەشارگەکەی ناو تاشەبەردەکانی نزیك سەدەکە نەئەچوو.

رۆژکە هەڵدەهات، لە دەریادا مەلەی ئەکرد. زۆری حەز لە دەریای رونی بەیانیان و قیژە قیژی گاکیەکان بوو لە ئاسماندا، یاخود دەنگی سەیری شەپۆلەکان کاتێ سەری ئەکرد بەناو ئاوەکەدا.

ئەمجا بۆ داگرتنی چەند سندوق و کۆکردنەوەی سەوزەو میوە، ئەچوو بۆ بازاڕ و بۆ نانی شێو ئەیبردەوە بۆ "تی شان". دوانیوەڕۆ ئەچوو بۆ لای "ژیتان" کە بە دانیشتنەوە لەسەر پلەی ماشێنەکەی خەوی لێ ئەکەوت. قسەیەکی وایان نەئەکرد، بەڵام "ژیتان" لە دیتنی مۆندۆ خۆشحاڵ دیار بوو. ئەمجا "کۆساك" بە بوتڵێ شەرابەوە ئەهات، هەمیشە کەمێ مەست بوو و بە دەنگە بۆرەکەیەوە ئەیقیژاند: ئێ مۆندۆی هاوڕێم.

ژنێکیش بوو کە بڕێجار ئەهات، ژنێکی قەڵەو بە روخسارێکی سورو دوو چاوی زۆر گەشەوە کە بە خوێندنەوەی دەستی رێبوارەکان، داهاتوویانی ئەوت. بەڵام هەر کە ئەو ئەهات، مۆندۆ ئەرۆیشت، چونکە خۆشی لێ نەئەهات. بەدوای "دادی" پیرەدا ئەچوو، پەیداکردنی ئاسان نەبوو.

پیاوە پیرەکە جێگاکەی زوو بەزوو ئەگۆڕی. لەسەر لاپەڕە رۆژنامەیەك دائەنیشت. چەمەدانە بچوکە زەردە کونکونەکەی لە پاڵ دەستیدا دائەنا، رێبوارەکان پێیان وا بوو سواڵکەرە. زۆربەی کات لە گۆڕەپانی بەر کڵێساکە پەیدای ئەکرد و لە تەنیشتیەوە دائەنیشت.

مۆندۆ قسەکردنی ئەوی زۆر پێ خۆش بوو، چونکە چیرۆکی زۆر سەبارەت بە کۆترە کۆچەرییەکان ئەزانی. باسی وڵاتەکەی ئەکرد، وڵاتێکی پڕ دارو درەخت، روباری ئارام و کێڵگەی زۆر سەوز و ئاسمانێکی نەرم و هێمن. لە تەنیشت خانوەکاندا، قەڵایەکی نووك تیژ کە بە سواڵەتی سور و سەوز داپۆشرابوو، جێگایەك کە کۆترەکانی تیا ئەژیان.

"دادی" پیر بە دەنگێکی ئارام ئەدوا، وەک فڕینی باڵندەکان لە ئاسماندا، کە ساتێ ئەوەستان و لە ئاستی سەر گوندەکاندا ئەخولانەوە. بەڵام ئەمانەی بۆ کەسی تر نەئەگێڕایەوە. کاتێ مۆندۆ لەگەڵ "دادی" پیر دائەنیشت، خەڵکی پێیان سەیر بوو، ئەوەستان و بۆ کوڕێکی بچوک و پیاوێکی پیر بە کۆترەکانییەوە ئەیانڕوانی و پارەی زۆرتریان ئەدا، چونکە وێنەیەکی پڕ لە پەژارە بوو. بەڵام مۆندۆ ماوەیەکی زۆر بە گەدایی کردن نەئەمایەوە، چونکە هەمیشە یەک یان دوو ژن ئەوەیان پێ خۆش نەبوو و دەستیان ئەکرد بە پرسیارکردن و ئەبوایە ئاگای لە "سیاپاکان" بوایە. ئەگەر لەو کاتەدا کامیۆنە بچوکەکە بەوێدا تێپەڕیایە، بێگومان پیاوە ئونیفۆرم لەبەرەکان دائەبەزین و ئەویان ئەبرد. تەنانەت لەوانە بوو "دادی" پیر و کۆترەکانیشی بەرن.

ڕۆژێ بایەکی توند هەڵی کردبوو، "ژیتان" بە مۆندۆی وت:

-بڕۆین بۆ سەیری کۆلارەکان.

یەک شەممانەی "با"ی گەورە، ڕۆژی بەرانبەرکێی کۆلارەکان بوو. بەیانی زوو گەیشتنە کەنار دەریا. منداڵەکان لە مێژبوو بە کۆلارەکانیانەوە لەوێ بوون، هەموو جۆرە ڕەنگ و فۆرمێکی لێ بوو: کۆلارەی لەوزی، چوارگۆشەیی، یەکباڵ، یان بێباڵ، کە بەسەریانەوە سەری حەیوان کێشرابوو، بەڵام جوانترین کۆلارە، هی پیاوێکی دەور پەنجا ساڵان بوو لەوپەڕ کەنار دەریاوە، لە پەپولەیەکی زەرد و ڕەش ئەچوو بە باڵی زۆر گەورەوە. کاتێ هەڵیدا بوو، هەموو کەس بێ جوڵە ماقی بیوون. پەپولە گەورە زەرد و ڕەشەکە ساتێ لە ئاست سەر دەریاوە باڵی گرتبۆوە، ئەمجا پیاوەکە پەتەکەی گرتبوو لەسەر دوو پێی بەرز ببۆوە. "با" هێرشی بردبوە ناو باڵەکانی و هەڵچووبوو. کۆلارەکە لەسەر دەریاوە بەرز ببووەوە. کاتێ "با" ئەیویژاند، پەڕی باڵەکانی شەقەشەقیان دەست پێئەکرد. پیاوەکە بێ جوڵە لە قەراخ دەریا مابوەوە، مەکارەکەی ئەکردەوەو نیگای بەسەر پەپولە زەرد و ڕەشەکەوە گیرسانبۆوە، جار جار پەتەکەی ئەکێشایەوەو بە دەوری مەکارەکەدا ئەیپێچایەوەو کۆلارەکە لە ئاسماندا بەرز ئەبۆوە. لە هەموویان بەرزتر ببۆوە، بە باڵە گەورەکانییەوە لە ئاست سەر ساحلەوە بڵاو ببۆوە، هەر لەویا مابۆوەو بێئەوەی هەوڵ بدات، لە "با"یەکی تونددا لە ئاسمان هەڵواسرابوو. هێندە لە زەوی دوور بوو کە ئیتر پەتەکەی نەئەبینرا. کاتێ مۆندۆ و "ژیتان" نزیک ببوونەوە، پیاوەکە مەکارەکەی دابوو بە مۆندۆ.

-توند بیگرە.

لە قەراخ دانیشتبوو و جگەرەیەکی داگیرساندبوو، مۆندۆ هەوڵی ئەدا لەبەر "با"دا ڕای بگرێ.

-کاتێ زۆر ئەکێشرێ، تۆ تۆزێ شلی کە، ئەمجا بیکێشە.

مۆندۆ و "ژیتان" و پیاوەکە بە نۆرە کۆلارەکەیان ئەگرت. کاتێ هەموو کۆلارەکانی تر، ماندوو و شەکەت کەوتنە ناو دەریاوە، هەموو سەریان بەرەو پەپولە زەرد و ڕەشەکە وەرچەرخاندبوو کە هێشتا لە ئاسماندا مەلەی ئەکرد. بە ڕاستی قارەمانی کۆلارەکان بوو. هیچیان نەیانتوانیبوو هێندە بەرزببنەوەو ماوەیەکی زۆر ئاوا بفڕن. ئەمجا پیاوەکە زۆر بە ئارامی، میتر بە میتر، پەپولە گەورەکەی هێنابووە خوارەوە. کۆلارەکە لە "با"دا ئەلەرایەوە، تەقینەوەکانی هەوا لە ناو پەڕەکانیدا و ڕیژەیەکی زیقەئاسا لە پەتەکەیدا ئەبیسرا.

ترسی ئەوە هەبوو کە بە کێشاندن، پەتەکەی بقرتایە. پیاوەکە بە دەم هەڵسوڕاندنی مەکارەکەوە کەم کەم ئەچووە پێشەوە. کاتێ

کۆلارەکە جوان لە قەراخ نزیک بووەوە. پیاوەکە تۆزێ جێبەجێ بوو و خێرا لە تەنافەکەی کێشایەوەو پاشان بەرەبەرە شلی کردەوە، کۆلارەکە بە ئەسپایی، وەك فرۆکەیەك هاتبووە خوارەوە بۆ سەر ریخی قەراخ.

هەموو ماندو ببوون، لە قەراخ دەریا دانیشتن. "ژیتان" "هات داگ" ی کڕیبوو و بە دەم سەیرکردنی دەریارە خواردبوویان. پیاوەکە شەڕی کۆلارەکانی ئەگێڕایەوە کە لەسەر قەراخەکانی "تورکیە" تیغی ریشتاشینیان بە کلکی کۆلارەکانەوە ئەبەستەوە، کاتێ لە ئاسمان بەرز ئەبوونەوە، توند لە یەکیان ئەداو دائەکەوتن چونکە تیغەکان پارچەکانی ئەدڕاند. تەنانەت جارێك توانیبووی پەتی کۆلارەیەك بقرتێنێ، کۆلارەکە گوم ببوو و "با" وەك گەڵایەکی وشك لەگەڵ خۆی بردبووی. لەوێ ڕۆژانی "با"ی گەورە، منداڵان سەدان کۆلارەیان هەڵئەدا و خاڵ ڕەنگاو ڕەنگ ئاسمانی دائەپۆشی.

مۆندۆ وتی: ئەبێ زۆر جوان بووبێت.

پیاوەکە وتی: ئەرێ، جوان بوو، بەڵام ئێستا خەڵك ئیتر نازانن.

هەڵسایەوەو کۆلارە گەورە زەرد و ڕەشەکەی لە نایلۆنێکدا پێچایەوە.

–جاری داهاتوو فێرت ئەکەم چۆن کۆلارەیەکی راستەقینە دروست بکەی. مانگی سێپتەمبەر وەرزێکی باشە و تۆ ئەتوانی کۆلارەکەت وەك باڵندەیەك بفڕێنی، بێنەوەی دەستی بۆ بەری.

مۆندۆ بیری کردەوە کە هێنەکەی خۆی وەك گاکیەکی زۆر سپی دروست ئەکات.

******

شتێکیش کە مۆندۆ زۆری حەز ئەکرد بیبینێ، کەشتییەك بوو بە ناوی "ئۆگزیتۆن". جاری یەکەم دوانیوەڕۆیەك دیتبووی، نزیك سەعات دوو، کاتێ هەتاو لە ئاوی بەندەرەکەی ئەکوتا. کەشتییەکە لەناو کەشتییەکانی تردا بەسترابۆوەو لەسەر ئاوەکە ئەلەرییەوە. کەشتییەکی گەورە نەبوو. وەك هەموو ئەوانەی کە بەردەمەکانیان وەك لوتی کۆسەماسی بوون و بایەوانی زۆر گەورەیان هەبوو، نە. کەچی "ئۆگزیتۆن" لای مۆندۆ، زۆر دڵڕفێن بوو. ناوەکەی لە یەکێ لەوانەی کە لە بەندەر کاریان ئەکرد، پرسیبوو. ناوەکە هێنابوویە گریان.

هەر کات لەو دەوروبەرە بوایە، یان ئەرۆیشت بۆ دیتنی یان لە قەراخ لەنگەرەکە ئەوەستاو ناوەکەی بە دەنگی بەرز و بە ئاوازەوە ئەوتەوە:

"ئۆگزیتۆن! ئۆگزیتۆن"

تەنافەکە کەشتییەکەی ئەکێشا، ئەگەڕایەوەو ئەکوترا بە لەنگەرەکەدا. بەرەکەی شین و سور بوو بە نیوبەندێکی سپییەوە. مۆندۆ لەسەر لەنگەرگەکە دائەنیشت و بە دەم خواردنی پرتەقاڵەوە بۆ "ئۆگزیتۆن"ی ئەڕوانی و هەروەها بۆ گەڕانەوەکانی هەتاو لەناو ئاوەکەدا و شەپۆلە بێهێزەکان کە لاشەی کەشتییەکەیان ئەبزواند. "ئۆگزیتۆن" ماندو و بێتاقەت دیار بوو، چونکە هەرگیز کەسی لێوە دەرنەئەمات.

مۆندۆ پەڕییە ئاوی، لەسەر نیمکەتێکی دارین لە دوای کەشتییەکەوە دانیشت. چاوەڕوان بوو. هەستی بە بزاوتی شەپۆلەکان ئەکرد، کەشتییەکە بە ئارامی ئەجولایەوە، کەمێ ئەخولایەوە، دورئەکەوتەوەو تەنافەکە جیڕەی ئەهات. مۆندۆ زۆری حەز ئەکرد لەگەڵی بڕوات، لەسەر دەریا، لەسەدەکە تێپەڕی بە "ژیوردان"ی ماسیگر بڵێ سوار بێت و پێکەوە بەرەو دەریای سور بڕۆن.

مۆندۆ ماوەیەکی زۆر لە پشت بەلەمەکەوە دانیشت و بۆ زایەڵەکانی هەتاوی ئەڕوانی و کۆمەڵی ماسیە وردەکان کە ئەلەرینەوەو ئەچونە

پێش. بڕێجار بۆ کەشتییەکە کە ئاوازی ئەوت، گۆرانییەك کە خۆی دروستی کردبوو:

ئۆگزیتۆن، ئۆگزیتۆن، ئۆگزیتۆن.

ئێمە ئەڕۆ ۆ ۆ ین

ماسی ئەگرین

ساردین، مەیگو، تۆن

پاشان مۆندۆ لەسەر لەنگەرەکە لای کەشتییە بارییەکان کەمێ پیاسەی کرد چونکە ئەو هەروەها هاوڕێیەکی جەرسەقیلی هەبوو. بۆ سەیرکردن شتگەلێکی زۆر هەبوون، لە هەموو جێگایەکدا، لە شەقامەکان، لە قەراخ و لە زەوییە بایەرەکاندا، مۆندۆ خۆشی لەو شوێنە پڕ حەشامەتە نەئەمات. جێگاگەلی سەربەتاڵی پێ خۆشتر بوو، شوێنێ کە لەوێوە دور ئەبینرا، گۆڕەپانەکان، لەنگەرەکان کە تا دەریا پێش ئەچوون، لە شەقامە راستەکاندا کە کامیۆنە مەخزەندارەکان دەتاژوتن. لەو شوێنانەدا بوو کە ئەیتوانی کەسانێ بۆ قسەکردن پەیدا بکات و هەر تەنیا پێیان بڵێت:

ئەمکەن بە کوڕی خۆتان؟

کەسانێك بوون لە دونیای خەو و خەیاڵدا، لە کاتی ڕێ ڕۆیشتندا، دەستیان ئەنایە پشتیان و بیریان لە شتانێکی تر ئەکردەوە، دەستێرەناسەکان، مامۆستاکانی مێژوو، مۆسیقازانەکان، گومرگچییەکان و بڕێجاریش نیگارکێشێك کە یەکشەممانە، لەسەر کورسییەکی بەرزك دائەنیشت و کەشتی و درەخت و داچوونی هەتاوی ئەکێشا.

مۆندۆ بۆ سەیر کردنی تابلۆکەی راوەستا، نیگارکێشەکە ئاوڕی دایەوە و وتی:

–پێت جوانە؟

مۆندۆ سەری لەقاند. پیاوێك و سەگێکی نیشان ئەدا کە لەسەر لەنگەرەکە دور ئەکەوتنەوە.

–ئەی ئەوانە، ئەوانیش ئەکێشی؟

نیگارکێشەکە وتی: ئەگەر تۆ بتەوێ.

بە ناسکترین پەرەمووچ لەسەر بوومەکە تارماییەکی رەشی بچوکی کێشا کە زۆرتر لە دەعبایەك ئەچوو. مۆندۆ تاوێ راماو وتی:

–ئەی ئەزانی ئاسمان بکێشی؟

نیگارکێشەکە دەستی لە کێشاندن هەڵگرت و بە سەرسوڕمانەوە بۆی ڕوانی.

–ئاسمان؟

–ئەرێ، ئاسمان و هەورەکان و هەتاو، زۆر جوان ئەبێت.

نیگارکێشەکە هەرگیز بیری لێ نەکردبووەوە، بۆ ئاسمانی ئاست سەری روانی و پێکەنی:

–هەق بە تۆیە، تابلۆی داهاتوم جگە لە ئاسمان شتێکی تر نییە.

–لەگەڵ هەورەکان و هەتاودا؟

–ئەرێ لەگەڵ هەموو هەورەکان و هەتاوێ کە ئەدرەوشێتەوە.

مۆندۆ سەلماندی: جوان ئەبێت، زۆر حەز ئەکەم بە زویی بیبینم.

نیگارکێشەکە بۆ ئاسمانی ڕوانی:

–من سبەینێ بەیانی دەست پێ ئەکەم، هیوادارم هەوا خۆش بێت.

مۆندۆ وتی: ئەرێ، بەیانی خۆش ئەبێت، ئاسمان لەمڕۆیش جوانتر ئەبێت

ئاخر لە پێش وتنی هەوادا راستی ئەکرد.

هەروەها کابرایەك کە کورسییەکانی لە "کا" پڕ ئەکردەوە.

مۆندۆ زۆربەی کات دوانیوەڕوان بۆ دیتنی ئەچوو. لە حەوشی خانویەکی کۆندا، لەگەڵ کوڕە بچوکەکەی کە ناوی "پیپۆ" بوو، کاری ئەکرد؟. "پیپۆ" کە لە ناو کەوا گەورەکەیدا گوم ببوو لە تەنیشتیەوە دائەنیشت. مۆندۆ زۆر حەزی ئەکرد بۆ کارکردنەکەی بڕوانێ، چونکە پیاوێکی پیر بوو کە قامکەکانی بەکارامەیی "کا"کەی گرێ ئەدا و ئەیتەنییەوە. کوڕە

بچوکەکە بێ جوڵە لەناو کەواکەیدا کە وەك پاڵتۆیەك داپۆشرابوو، ئەمایەوە. مۆندۆ کەمێ لەگەڵیا خۆی سەرگەرم ئەکرد، شتانێ کە لە کاتی پیاسەکردندا دۆزیبوویەوە بۆی ئەهێنا، وردە بەردە سەیرەکانەی کەنار دەریا، تەوقەی گیا دەرياييەکان، گوێچکە ماسی، شتە وردەی جوانی سەوز و شینی کەنار دەریا کە دەریا ساف کردبوون.

"پیپۆ" بەردەکانی ئەگرت و ماوەیەکی زۆر سەیری ئەکردن ئەمجا ئەیدایە گیرفانی کەواکەیەوە. "پیپۆ" قسەکردنی نەئەزانی، بەڵام مۆندۆ زۆری خۆش ئەویست، چونکە بێ جوڵە لای باوە گەورەی ئەمایەوە، لە ناو کەوا خۆڵەمێشییەکەیدا کە تا لاقی دائەقۆشاند و وەك جلی چینیەکان دەستی دائەپۆشی. مۆندۆ لە کەسێ خۆشی ئەهات کە بزانێ بێ جوڵە لەبەر هەتاودا بمێنێتەوە، بێ قسە، چاوی لە خەو و خەیاڵدا بێت.

مۆندۆ لەم شارەدا خەڵکی زۆری ئەناسی، بەڵام هاوڕێی زۆری نەبوو. ئەوانەی حەزی ئەکرد بیانبینێ کەسانێ بوون کە نیگایان گرشدار بوو و کاتێ ئەیانبینی بزە ئەیگرتن، وەك ئەوەی لە دیتنی مۆندۆ بەختەوەر بووبن. ئەمجا مۆندۆ ئەوەستا و کەمێ لەگەڵیان ئەدوا، چەند پرسیاری لێ ئەکردن سەبارەت بە دەریا و ئاسمان و باڵندەکان. کاتێ خەڵکەکە ئەڕۆیشتن، گۆڕا بوون، چونکە مۆندۆ پرسیاری زۆر دژواری لێ کردبوون، ئەو شتانەی کە خەڵك فەرامۆشیان ئەکا، شتانێك کە ساڵەهایە بیریان لێ نەکردۆتەوە، بۆ وێنە: بوتڵەکان بۆ سەوزن یان ئەستێرەکان بۆچی بزۆکن؟

ئەتوت خەڵك ماوەیەکی زۆرە بە تەمای وتەیەکن، هەر تەنیا چەن وشە ئاوا لە کونجی شەقامەکەدا کە مۆندۆ ئەیزانی ئەو شتانە بڵێ. هەروەها پرسیارەکان، زۆربەی خەڵك نازانن پرسیاری باش بپرسن، مۆندۆ ئەیزانی پرسیار بکات. کاتێ پرسیاری ئەکرد، کەس بەتەمای ئەوە نەبوو، تاوێ ئەوەستان، ئیتر بیریان لە خۆیان و کارەکانیان ئەکردەوە، ڕائەمان، چاوەکانیان تۆزێ تێك ئەچوو، چونکە بیریان ئەهاتەوە کە زەمانێ خۆیان ئەو پرسیارانەیان کردووە.

پیاوێکی لاو هەبوو کە مۆندۆ زۆری حەز ئەکرد بیبینێ، پیاوێکی باڵابەرزی بەهێز بە ڕوخسارێکی سور و دوو چاوی شینەوە. ئونیفۆرمێکی شینی تۆخی لەبەردا بوو و هەمیشە هەگبەیەکی گەورەی چەرمینی پڕ لە نامەی پێ بوو. مۆندۆ زۆربەی کات، بەیانیان لەسەر ڕێگای پلیکانەکاندا کە بەرەو تەپۆلکەکە ئەڕۆیشت، ئەیبینی. جاری یەکەم مۆندۆ لێی پرسیبوو:

–بۆ من نامەت پێ نییە؟

پیاوە قەڵەوەکە پێکەنیبوو. بەڵام هەر ڕۆژ مۆندۆ پێی ئەگەیشت هەمان پرسیاری لێ ئەکرد.

–ئەی ئەمڕۆ؟ بۆ من نامەت پێیە؟

پیاوەکە هەگبەکەی ئەکردەوە وئەگەڕا:

–بابزانم.. ناوت چی بوو؟

–مۆندۆ.

–مۆندۆ.. مۆندۆ.. نە ئیمڕۆ نامەت نییە.

بڕێجار خێرا هەگبەکەی ئەکردەوەو ڕۆژنامەیەك یان ڕاگەیاندنێکی پڕوپاگەندەیی دەرئەهێناو ئەیدایە.

–بیگرە، ئەمڕۆ ئەمەت بۆ هاتووە.

چاوێکی لێ ئەقرتاند و ڕێگاکەی ئەگرتەوە بەر.

مۆندۆ زۆر حەزی لە خوێندنەوەی نامە ئەکرد، ڕۆژێ بڕیاری دا بە دوای کەسێکدا بگەڕێ کە خوێندن و نوسینی فێر بکات. لە شەقامەکانی شار، لە باخە گشتییەکاندا گەڕابوو،

بەڵام زۆر گەرم بوو و ماڵنشینەکان لەوێ نەبوون. تا دەریا رۆیشت. هەتاو بە هەموو هێزیەوە لەسەر لەمەکانی قەراخ ئەسوتا. خۆڵەخوێ لەسەر بەردە وردەی قەراخ بریقەیان ئەدات. مۆندۆ بۆ مندالەکانی ئەڕوانی کە لە قەراخ ئاوەکە گەمەیان ئەکرد. "مایۆ"ی رەنگ سەیریان لەبەردا بوو: سووری باینجانی و سەوزی سێوی. مۆندۆ خۆشی نە ئەهات زۆر لێیان نزیک بێتەوە، رەنگە لەبەرئەوە بوو بێ کە بە گەمەوە بە هەموو هێزیانەوە ئەیانقیراند.

لای کۆلیتێکی داریـن لە قەراخ، مۆندۆ پیاوێکی چاو کرد کە بە "مانگیر" قەراخی ساف ئەکرد. زۆر پیر بوو، شۆرتێکی کاڵەوەبووی لەکەداری لەپێ بوو، رەنگی جەستەی لە نانی سوتاو ئەچوو و پێستی وەك پێستی فیلێکی پیر پڕ لە چرچ و لۆچ بوو. پیاوەکە ماوەیەکی زۆر "مانگیر"ەکەی بەسەر ریخەکاندا ئەهێنا، بێئەوە کاری بەسەر مندالەکانەوە بێت. هەتاو لەسەر پشت و لاقەکانی ئەدرەوشایەوە. ئارەق لە روخسارییەوە دائەچۆڕا، جار جار ئەوەستاو دەسەسرێکی لە گیرفانی شۆرتەکەی دەرئەهێناو روخسار و دەستی ئەسڕی.

مۆندۆ لە رووبەڕووی پیاوەکەوە پاڵی دابوو بە دیوارەکەوەو ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بوو تا کارەکەی تەواو بکات. کاتێ پیاوەکە لای دیوارەکە دانیشت، بۆ مۆندۆی ڕوانی. چاوەکانی کەلێ گەش بوون، خۆڵەمێشییەکی کەم رەنگ کە لە ناو پێستە بۆرەکەی روخساریدا لە دوو خاڵ ئەچوون. تۆزێ لە سورپێستەکان ئەچوو. بۆ مۆندۆی ڕوانی، ئەتوت پرسیارەکەی تێنەگەیشتووە. هەر وتی:

–سەلام!

مۆندۆ وتی: ئەمەوێ ئێوە نوسین و خوێندنەوەم فێرکەن، تکاتان لێ ئەکەم.

پیاوە پیرەکە بێ جوڵە مابووەوە، بەڵام دیاربوو کە پێی سەیر ئەبوو.

–تۆ بۆ قوتابخانە ناچیت؟

–نە ئاغا.

پیاوە پیرەکە دانیشت، پاڵی دایەوە بە دیوارەکەوەو رووی کردە هەتاو، چاوی بڕیە بەردەمی. رواڵەتی زۆر ئارام و لەسەرخۆ بوو، بە پێچەوانەی لوتە کۆمەکەی و چرچەکانی گۆنای، گلێنەی چاوی ئێجگار گەش بوو، کاتێ بۆ مۆندۆی ڕوانی جۆرە پڕشنگێ لەسەر گەرمی لە نیگایدا بوو، وتی:

–ئەگەر هەر ئەوەت ئەوێ خوێندن و نوسین، من فێرت ئەکەم.

دەنگی لە چاوەکانی ئەچوو، زۆر ئارام و دوور، ئەتوت لەوە ئەترسێ کە لە کاتی قسەکردندا دەنگە دەنگ بکات.

–بە ڕاستی هیچ خوێندەوارییەکت نییە؟

–نەخێر ئاغا.

پیاوەکە چەقۆیەکی دەسك سوری لە ساکەکەی دەرهێناو دەستی کرد بە هەڵکەندنی پیتەکان لەسەر بەردە پانەکان و بەدەمیەوە باسی هەموو ئەو شتانەی ئەکرد کە لە پیتەکاندا بوو، هەموو ئەو شتانەی کە لە کاتی دیتن و بیستنی پیتەکاندا هەستی پێ ئەکرێ.

ئەیوت: "A" لە مێشێکی گەورە ئەچێ کە باڵەکانی بۆ دواوە چینیان خواردووە، "B" بە دوو سکەکەیەوە پێکەنیناوییە، "C" و "D" لە مانگ ئەچن، مانگی نیوە، مانگی تەواو، "O" مانگی چواردە لە ئاسمانی شەودا، "H" بەرزە، پلیکانەیەکە بۆ سەرکەوتن لە درەختەکان و سەربانی خانوەکان، "E" و "F" لە مانگیر و سەول ئەچن. "G" پیاوێکی قەڵەوە کە لە ناو موبلێکدا دانیشتووە، "I" لەسەر نوکی پێی سەما ئەکات و لە هەر هەڵخستنەوەیەکدا، سەری جیا ئەبێتەوە، لە کاتێکدا "J" دیلانێ ئەکات، بەڵام " K" وەك پیرێك کۆماوەتەوە. "R" وەك

سەرباز هەنگاوی بەرز ئەنێت، "Y" وەستاوە، دوباڵی لە هەوادایە و هاوار ئەکا: یارمەتی. "L" درەختی قەراخ روبارێکە، "M" کێوە، "N" بەدەست سڵاو ئەکات. "P" لەسەر پێیەك ئەنوێ، "Q" لەسەر کلکی دانیشتووە. "S" هەمیشە مارە، "Z" هەمیشە بروسکەیە، "T" جوانە، لە دوکەڵی کەشتی ئەچێ. "U" لە ئینجانەیەك ئەچێ، "V" و "W" باڵندەن، فرینی باڵندەکان. "X" خاچێکە بۆ بیرەوەری.

پیاوە پیرەکە بە نوکی چەقۆکەی نیشانەکانی لەسەر بەردەکان هەڵئەکەند و ئەینایە بەردەم مۆندۆ.

—ناوت چییە؟

—مۆندۆ.

پیاوە پیرەکە چەند بەردی هەڵچنی و لای یەکەوە ریزی کردن.

—بروانە ناوی تۆیە.

مۆندۆ وتی: جوانە. کێو، مانگ، کەسێ کە لە خەرمانەی مانگ سەلام ئەکات و دیسان مانگ، ئەو هەموو مانگەی بۆ تێدایە؟

پیاوە پیرەکە وتی: لە ناوەکەتدایە، هەر ئەوەیە، ناوەکەت وایە.

بەردەکانی هەڵگرت.

—ئەی ئێوە ئاغا، لە ناوەکەتاندا چی هەیە؟

پیاوە پیرەکە بەردەکانی نیشان ئەداو مۆندۆ یەك لە دوای یەك بەرزی ئەکردنەوەو ریزی ئەکردن.

—میوێکە.

—ئەرێ، شوێنی لەدایکبوونم.

—مێشێکە.

—رەنگە من مێش بوویم، ماوەیەکی زۆر بەرلەوەی ببم بە ئینسان.

—پیاوێ کە ئەڕوا بە رێگادا، سەربازێ.

— من سەرباز بووم.

— خەرمانەی مانگ.

—شتێك کە لە کاتی لەدایکبوونمدا بوو.

—مانگیر.

—ناوەکە. (پیاوە پیرەکە مانگیرەکەی لەسەر قەراخ پێ نیشان دا).

—درەختێ لەبەر روبارێکدا.

—ئەرێ، رەنگە وەك کاتێ بێ کە من ئەگەڕێمەوە، کاتێ من ئەمرم درەختێکی بێ جوڵە لەبەر روبارێکی جواندا.

—خوێندنەوە خۆشە، ئەمەوێ هەموو پیتەکان فێربم.

—تۆیش بنوسە.

چەقۆکەی پێ دا، مۆندۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر بەردەکانی ساحل پیتەکانی هەڵکەند ئەمجا ریزی ئەکردن. بۆ ئەوەی بزانێ چ ناوێکی دروست کردووە. "O" و "I"ی زۆر تیا بوو. چونکە حەزی لێ ئەکردن. هەروەها خۆشی لە "T" ئەهات، لە "Z" و لە باڵندەکان "V" "W".

پیاوە پیرەکە خوێندیەوە: *ovo owo otto izzi*. هەردوکیان پێکەنین. پیاوە پیرەکە شتی سەیری زۆرتری ئەزانی کە بە دەم سەیرکردنی دەریاوە بە دەنگە نەرمەکەیەوە ئەیگێڕایەوە. باسی وڵاتێکی بێگانەی ئەکرد، زۆر دوور، لەوبەر دەریاوە، وڵاتێکی زۆر گەورە کە خەڵکەکەی جوان و لەسەرخۆ بوون، شەڕی لێ نەبوو و کەس لە مەرگ نەئەترسا. ئەو وڵاتە روبارێکی تێدا بوو ئەوەندەی دەریا گەورە بوو. خەڵك لە دابچونی هەتاودا بۆ مەلەکردن ئەچوون. کاتێ قسەی ئەو وڵاتەی ئەکرد، دەنگی نەرمتر و هێمنتر ئەبوو. چاوە بێرەنگەکانی بۆ دورتریان ئەڕوانی، ئەتوت پێشتر لەوێ بووە، لە قەراخ رووبارەکە.

مۆندۆ پرسیاری کرد: منیش ئەتوانم لەگەڵتان بێم؟

پیاوە پیرەکە دەستی نایە سەر شانی مۆندۆ.

—ئەرێ، ئەتبەم.

—کەی ئەڕۆی؟

-نازانم، کاتێ پارەم هەبوو، ڕەنگە ساڵێکی تر، بەڵام تۆ لەگەڵ خۆم ئەبەم.

دوایی پیاوە پیرەکە مانگیرەکەی هەڵگرت و دورتر، لە قەراخ، دەستی کردەوە بە کارەکەی. مۆندۆ بەرەدکانی خستە گیرفانی، دەستی بۆ هاوڕێکەی ڕاوەشاند و ڕۆیشت.

ئێستا ئیتر هەموو شوێن پڕ ببوو لە نیشانە، بەسەر دیوارەکانەوە، دەرگاکان، لەسەر پلێتە ئاسنینەکان. مۆندۆ کاتێ لە شار تێئەپەڕی، چاوی ئەکردن و بڕێکیانی ئەناسیەوە.

لەسەر چیمەنتۆی شۆستەکە چەندین پیت هەڵکەندرابوون، بەڵام تێگەیشتنی ئاسان نەبوو.

کاتێ شەو دائەهات، مۆندۆ ئەگەڕایەوە بۆ خانوی "ڕووناکی زێڕین". لەگەڵ "تی شان"، لە ساڵۆنە گەورەکە برنج و سەوزەی ئەخوارد، ئەمجا ئەچوو بۆ ناو باخەکەو بە تەمای ژنە بچوکەکە ئەمایەوە کە پێکەوە لەسەر ڕێگا باریکە ڕیخیەکە بڕۆن تا کاتێ بە تەواوەتی درەخت و دەوەنەکان ئابلۆقەیان بدەن.

"تی شان" دەستی مۆندۆی ئەگرت و هێندە توند ئەیگوشی، ئیشی پێ ئەگەیاند، بەڵام بەهەرحاڵ پیاسەکردن لە شەوی تاریک و بە لەمسکردنی نوکی پێیان بۆ ئەوەی نەکەون، دڵڕفێن بوو. تەنیا چاوساغییان دەنگی خڕەی ڕیخەکە بوو لە ژێر پێیاندا.

مۆندۆ گوێی لە گۆرانی گوێ دڕی کوللە شاراوەکان ئەگرت، بۆنی دەوەنەکانی هەست پێئەکرد کە شەوانە گوڵەکانیان ئەکرایەوە، کەمێ توشی سەرگێژە ئەبوو، چونکە ژنە بچوکەکە دەستی توند ئەگوشی.

مۆندۆ وتی: شەوانە هەموو شت بۆنخۆشە.

"تی شان" وتی: چونکە نایبینین، کاتێ نایبینین باشتر بۆنەکان هەست پێ ئەکەین و باشتر ئەبیسین.

لەسەر ڕێگاکە وەستا.

-بڕوانە، ئێستا ئەستێرەکان ئەبینین.

قیژەی تیژی کوللە لە دەوروبەریاندا بڵاوبۆوە، ئەتوت تەنانەت لە ئاسمانیشەوە دەنگیان دێت. ئەستێرەکان یەك لە دوا یەك دەرئەکەوتن، لە نێو شەوانەدا بەکزی چاویان ئەتروکاند.

-جوانن، خەریکن شتێ ئەڵێن، "تی شان"؟

-ئەرێ، زۆر شت ئەڵێن، بەڵام ئێمە لێیان تێناگەین.

-تەنانەت ئەگەر خوێندنەوە بزانین هەر لێیان تێناگەین؟

-نە، ناتوانین مۆندۆ، مرۆڤەکان لە ئەستێرەکان تێناگەن.

-لەوانەیە بەسەرهاتە کۆنەکان بگێڕنەوە.

-ئەرێ، لەوانەیە چیرۆك بگێڕنەوە.

"تی شان" بێ جوڵە چاوی تێبڕین، دەستی مۆندۆی توند گوشی:

-ڕەنگە لەو جادەیە بڵێن کە ئەبێ بیپێوین، لە وڵاتگەلێ کە ئەبێ بۆی بڕۆین. مۆندۆ ڕاما.

-ئێستا توندتر ئەدرەوشێنەوە، لەوانەیە ڕۆحیان هەبێت.

"تی شان" ئەیویست ڕوخساری مۆندۆ ببینێ، بەڵام هەموو شت تاریك و ڕەش بوو. ئەمجا لە ناکاو، لەرز گرتی، ئەتوت ترساوە، دەستی مۆندۆی لەسەر سینگی گوشی. گۆنای خستە سەر شانی، دەنگی سەیر و خەمین بوو. ئەتوت شتێ ڕەنجاندویەتی:

-مۆندۆ!.. مۆندۆ.

بە دەنگە کپ و جەستە لەرزۆکەکەیەوە ناوی دوبارە ئەکردەوە.؟

مۆندۆ پرسیاری کرد: چیتە؟ هەوڵی ئەدا بە قسەکردنی ئارامی کاتەوە.

-من لێرەم، ناڕۆم، نامەوێ بڕۆم.

ڕوخساری "تی شان"ی نەئەدی، بەڵام پێی وابوو کە ئەگری؛ لەبەرئەوە بوو کە جەستەی

ئەلەرزی. "تی شان" کەمێ خۆی دوور خستەوە بۆ ئەوەی مۆندۆ خزینی فرمێسکەکانی نەبینێ.

-بمبورە، من گێلم.

بەڵام دەنگی دەرنەئەمات.

مۆندۆ وتی: "زویر مەبە" و تا ئەوپەری باخەکەی برد.

-وەرە روناکییەکانی شار لە ئاسماندا سەیر کەین.

تا شوێنێ کە ئەیانتوانی رۆیشتن، تیشکێکی گەورەی سور کە فۆرمی قارچکی بوو، لە ئاست سەر درەختەکانەوە دەرکەوت، هەروەها فرۆکەیەك کە بە چاوقرتاندن تێئەپەری و ئەوانی هێنابووە پێکەنین. ئەمجا بێئەوەی دەستی یەکتر بەربدەن لەسەر رێگا ریخیەکە دانیشتن. ژنە بچوکەکە خەمەکەی لەبیر چوبۆوەو دیسان دەستی کردەوە بە قسەکردن، بە دەنگێکی نزم، بێئەوەی بیر لە هیچی تر بکاتەوە، مۆندۆیش قسەی ئەکرد و هەروەها کوللەکە بە دەنگە گوێدرەکەیەوە لە ناو حەشارگەکەیدا لە ناو گوڵەکاندا، قسەی ئەکرد. مۆندۆ و "تی شان" ماوەیەکی زۆر هەروا مانەوە، تا کاتێ پێڵوەکانیان قورس بوو، ئەمجا لەسەر زەوی نوستن و باخەکەیش ئارام ئارام، وەك عەرشەی کەشتییەك ئەجولایەوە.

*****

دوایین جار، سەرەتای هاوین بوو. مۆندۆ لەگەڵ هەڵهاتنی هەتاودا، بێدەنگ رۆیشتە دەرەوە، لەسەر خۆ لە پلەکانی تەپۆلکەکە داگەڕا. سەر درەخت و گیاکان پڕ ببوو لە شەونم. هەڵم سەر دەریای گرتبوو، بە درێژایی دیوارە کۆنەکان، لە ناو گوڵە گەورەکانی لولوپەر، تنۆکی ئاو بەرۆ ببوو و کە وەك ئەڵماس ئەدرەوشایەوە. مۆندۆ دەمی نزیك خستەوەو گەڵاکەی هەڵگەڕاندەوە و تنۆکە ئاوە تازەکەی خواردەوە. تنۆکەکان گەلێ بچوك بوون بەڵام لە دەم و جەستەیدا بڵاوببۆوەو تینویەتییەکەی رەواندبۆوە. لەملاولای جادەکەوە، دیوارە بەردینەکان هێشتا فێنك بوون.

قورناویلکەکان بۆ سەیر کردنی روناکی لە درزەکانیان هاتبوونە دەر. مۆندۆ بەرەو دەریا داگەڕاو لە قەراخە چۆڵەکە دانیشت. لەو کاتەدا جگە لە گاکیەکان کەسی تری لێ نەبوو. یان لەسەر ئاوی درێژایی قەراخەکە ئاوێزان بوون، یان لەرە لەر بەسەر لەمەکاندا پێش ئەچوون، بە ئەستەم دەنوکیان ئەکردەوەو ئەیانناڵاند و ئەفڕین، لە جوغزێکدا ئەخولانەوەو دورتر، کەمێ ئەحەسانەوە. گاکیەکان، بەیانیان هەمیشە دەنگێکی سەیریان بوو، ئەتوت بەرلەوەی بڕۆن بانگ ئەکەن، کاتێ هەتاو لە ئاسمانی سوردا کەمێ بەرز ئەبۆوە، چرای داربریقەکان ئەکوژانەوەو دەنگی شاری ئەبیست کە دەستی ئەکرد بە بۆرە بۆر، دەنگێکی دوور دەست بوو کە لە شەقامەکانی نێوان خانوە بەرزەکانەوە دەرئەهات. دەنگێکی خنکاو کە لە لەمەکانی کەنار ئەلەرزی. دوچەرخەکان بە هۆڕن لێدان بە شەقامەکاندا لێئەخوڕان. ژن و پیاوەکان بالگیریان لەبەر بوو و کڵاوی خوری بە سەریانەوە بوو. مۆندۆ بێجوڵە لە ساحل مابۆوە و چاوەڕوان بوو دیسان هەتاو هەوا گەرم کاتەوە.

گوێی لە دەنگی شەپۆلەکانی سەر لەمەکان گرتبوو. ئەم کاتەی پێ خۆش بوو چونکە کەسی لێنەبوو جگە لەو و گاکیەکان، ئەو کاتە ئەیتوانی بیر لە هەموو خەڵکی شار بکاتەوە، هەموو ئەوانە کە ئەیبینن بەبێ سەیرکردنی دەریاو ئاسمانەوە بیری لێ ئەکردنەوە. ئەتوت خەڵکەکە هاوکات، هەم زۆر نزیك بوون و هەم زۆر دوور لە دەوروبەریدا دانیشتبوون، ئەتوت هەر بە روانینی ئەم ئەوان بوونیان بوو، کاتێ نیگای لێ

وەرنەگرتن، ئیتر ئەوان لەویا لەسەر قەراخە چۆڵەکە نەبوون.

مۆندۆ لەگەڵ خەڵکەکە قسەی ئەکرد. بە شێوەی خۆی قسەی بۆ ئەکردن، بێ وتە، بەتاریدنی شەپۆل، شەپۆلەکان، لەو جێگایەی کە بوون، بەرەو ئەوان ئەڕۆیشتن، لەگەڵ دەنگی شەپۆلەکان و رووناکی تێکەڵ ئەبوون و خەڵك بێئەوەی بزانن لە کوێوە هاتوون، وەریان ئەگرتن. مۆندۆ بیری لە "ژیتان" ئەکردەوە، لە "کۆساك"، کەسێ کە کورسییەکانی لە "کا" پڕ ئەکردەوە، بیری لە "رۆزا" ئەکردەوە، لە "ئیدا"ی نانەوا، قارەمانی کۆلارەکان و پیاوە پیرەکە کە خوێندنی فێرکردبوو. هەموو کوێیان لەم بوو. وەك ریژەیەك لە گوێیاندا ئایانبیست. تۆزێ سەریان ئەلەقاند، چونکە تێنەنەگەیشتن چی ڕوویداوە، بەڵام مۆندۆ ڕازی بوو کە ئاوا ئەتوانێ لەگەڵیاندا بدوێ و شەپۆلەکانی دەریا و هەتاو و ئاسمانی بۆ ئەناردن. ئەمجا مۆندۆ لە درێژایی ساحل تا کۆلیتە دارینەکە ملی نا.

لای دیوارەکان بەدوای بەردەکاندا ئەگەڕا کە پیاوە پیرەکە پیتەکانی بە سەریەوە هەڵکەندبوو. چەند رۆژ بوو نەچوبووە ئەوێ. خوێ و رووناکی نیوەی نوسراوەکانی سڕیبۆوە، مۆندۆ بەردێکی نوك تیژی ئەهێنایەوە بەسەر نیشانەکاندا و لای یەك ریزی کردنەوە، بۆ ئەوەی کاتێ پیاوە پیرەکە ئەگەڕێتەوە ناوەکەی ببینێ و بزانێ کە هاتووە. ئەو رۆژە وەك رۆژەکانی تر نەبوو، چونکە شار کەسی لێ نەبوو، مۆندۆ بە دوای سواڵکەرە پیرەکەو کۆترەکانیدا ئەگەڕا.

دڵی توند کەوتبووە ترپە ترپ، چونکە لە پێشەوە ئەیزانی کە نایدۆزێتەوە. هەموو شوێنێکی بە دوادا پشکنی. شەقامەکان و کۆڵانەکان، گۆڕەپانی بازاڕەکە و بەر کڵێساکە. مۆندۆ تامەزرۆی دیتنی بوو، بەڵام شەو، کامیۆنە بچوکە خۆڵەمێشییەکە تێپەڕیبوو و پیاوە یونیفۆرم لەبەرەکان "دادی" پیریان بردبوو. مۆندۆ بێوچان و بێحەسانەوە بەدوای "دادی"دا ئەگەڕا.

کاتێ لە حەشارگەیەك بۆ یەکێکی تر هەڵئەهات، دڵی توند و توندتر لێی ئەدا. هەموو ئەو شوێنانەی کە سواڵکەرە پیرەکە عادەتی بوو بۆی بڕوا، سەری پیا ئەکرد، کونجی دەرگای گەراجەکە، پلیکانەکان، نزیك کانییەکە، باخە گشتییەکان، بەر دەرگای خانووە کۆنەکان. بڕێجار لەسەر شۆستەکە لاپەڕە رۆژنامەیەکی چاو ئەکرد، ئەوەستاو بۆ دەورووبەری ئەڕوانی، ئەتوت ئێستا "دادی" دێتەوەو دائەنیشێ.

"کۆساك" دوایین هەوڵی بە مۆندۆ دابوو، مۆندۆ لە شەقامی نزیك بازاڕەکە چاوی پێکەوتبوو، بە دژواری ڕێی ئەبڕی، دەستی بە دیوارەکەوە گرتبوو، بە تەواوەتی مەست بوو، خەڵك ئەوەستان و بە پێکەنینەوە بۆیان ئەڕوانی.

"ئاکاردیئۆن"ەکەشی نەبوو، کاتێ خەریکە خواردنەوە ببوو، کەسێ لێی دزیبوو.

کاتێ مۆندۆ لێی پرسیبوو "دادی" پیر و کۆترەکانی لە کوێن؟ بۆ ئەوەی تێبگا، ساتێ بۆی ڕوانیبوو، چاوی ماق مابوو، ئەمجا نقاندبووی:

"نازانم.. بردیان، ئەمشەو"

–بۆ کوێیان برد؟

–نازانم. نەخۆشخانە.

"کۆساك" بە هەموو هێزییەوە هەوڵی ئەدا بڕوا.

–ڕاوەستە، ئەی کۆترەکان؟ ئەوانیشیان برد؟

–کۆترەکان؟

"کۆساك" تێنەئەگەیشت.

–باڵندە سپییەکان!

–ئا، ئەرێ، من نازانم.

"کۆساك" شانی هەڵتەکاند.

–نازانم چییان لێکردوون، رەنگە خواردبێتیان..

بە درێژایی دیوارەکە بە تلاوتل رێکەوتەوە.

لە پڕ مۆندۆ هەستی بە ماندوێتییەکی زۆر کرد. ئەیویست بگەڕێتەوە بۆ قەراخ دەریا، بۆ ئەوەی بخەوێ، بەڵام زۆر دوور بوو. ئیتر وزەی لا نەمابوو. وەك بڵێی ماوەیەکی زۆر هیچی نەخواردبێ یان ترسابێ. هەستی ئەکرد دەنگەکان هەموو لە مێشکیدا ئەزرنگێنەوەو زەوی لە ژێر پێیدا ئەبزوێ. لەسەر شۆستەکە پاڵی بە دیوارێکەوە داو چاوەڕوان بوو، لەولاتر، دوکانی فرۆشیارێکی شتومەکی ماڵ دیار بوو بە شوشەیەکی گەورەوە کە روناکی ئەدایەوە. مۆندۆ بێجوڵە دانیشتبوو، تەنانەت لاقی ئەو کەسانەی کە لەبەردەمیەوە تێلەپەڕین نەئەبینی. گوێی لە وتەکان نەئەگرت، هەستی بە جۆرە بێحاڵی و بێهێزییەك ئەکرد کە هەموو جەستەی داگرتبوو کە وەك سەرمایەك سەرئەکەوت و لێوەکانی بێهەست ئەکرد. نەیئەهێشت چاوەکانی ببزوێن، دڵی توند لێی ئەئەدا، ئیتر دوور و بێهێز بوو، بە ئارامی لە سنگیدا ئەبزوا، ئەتوت خەریکە بوەستێ. مۆندۆ بیری لە هەموو ئەو حەشارگانە ئەکردەوە کە شارەزایان بوو، لە قەراخ دەریا، لە ناو تاشەبەردە سپییەکان، لە نێوان شەپۆل شکێنەکاندا، یان لەناو باخی خانووی "رووناکی زێڕین"دا هەروەها بیری لە کەشتی "ئۆگزیتۆن" ئەکردەوە کە خۆی ئەجوڵاندەوە بۆ ئەوەی لە لەنگەرگەکە جیابێتەوە، چونکە ئەیویست تا دەریای سور بڕوات. بەڵام هەر لەو کاتەیشدا ئەتوت ئیتر ناتوانێ سەر شۆستەکە بەجێ بهێڵێ. پاڵی بە دیوارەکەوە دابوو، ئەتوت لاقەکانی ئیتر توانای رێڕینیان نییە.

کاتێ خەڵك قسەیان لەگەڵی کردبوو، مۆندۆ سەری بەرز ئەکردبۆوە، بێجوڵە، لەسەر شۆستەکە مابۆوە، تەوێڵی نابوە سەر باسکی. ئێستا لاقەکان لە بەردەمیا چەشنی دیوارێك، لە نێو بازنەیەکدا وەستابوون.

وەك کاتێ "ژێتان" نمایشی بەڕێوە ئەبرد، مۆندۆ بیری کردەوە کە باشتر وایە بڕۆن، رێگاکەیان بگرنە بەر. سەیری هەموو ئەو لاقە وەستاوانەی ئەکرد، پێڵاوگەلی گەورە و ڕەشی چەرمی پیاوانە، نەعلی پاژنە بەرزی ژنان. گوێی لە دەنگەکان بوو کە بە سەریەوە قسەیان ئەکرد، بەڵام نەیئەتوانی تێبگات کە چی ئەڵێن.

دەنگەکان ئەیانوت.. تەلەفون کردن..، تەلەفۆن بۆ کێ؟ مۆندۆ پێی وابوو بووە بە سەگێ، سەگێکی پیری موو خەنەیی کە خۆی گرمۆڵە کردووەو لە کونجی شۆستەکەدا نوستوە، کەس نەیئەتوانی بیبینێ، کەس نەیئەتوانی سەرنجی سەگێکی پیری زەرد بدات. سەرما بەردەوام لە جەستەیەوە سەرئەکەوت و بە ئارامی یەکبەیەکی ئەندامەکانی ئەگرت.

پاشان کامیۆنە بچوکە خۆڵمێشییەکەی "سیاپاکان" هاتبوو. مۆندۆ لە خەو و بێداریا گوێی [illegible] هاتنەکەی بوو. دەرگاکانی کرابوونەوە، بەڵام بۆی یەکسان بوو. لاقی خەڵکەکە کەمێ چوون بە دواوە، مۆندۆ چاوی لە پانتۆڵە شینە دەریاوانییەکان و پێڵاوە ڕەشە تەخت ئەستورەکان بوو کە لێی نزیك ئەبوونەوە.

-نەخۆشی؟

مۆندۆ دەنگی پیاوە ئۆنیفۆرم لەبەرەکانی ئەبیست کە دەنگیان ئەدایەوە، ئەتوت لە هەزاران کیلۆمەترەوە ئەهات.

-ناوت چییە؟ لە کوێ ئەژیت؟ ئەتەوێ لەگەڵمان بییت؟

مۆندۆ بیری لە تەپۆلکەکان ئەکردەوە کە لە هەموو شوێنێکدا، لە ئاقاری شار، ئەسوتان. ئەتوت لە قەراخ جادەکە دانیشتبوو کێڵگە سوتاوەکانی ئەدی، شۆڵە گەورە سورەکان، بۆنی "جەوی" دوکەڵە سپییەکەی هەست پێ ئەکرد کە لە ئاسماندا هەڵئەگەڕا. هەروەها چاوی لە

کامیۆنە سورەکانی ئاو پژێنەکان بوو کە لە ناو دڕکەکاندا وەستابوون و لولە درێژەکانیان ئەگەڕان.

—ئەتەوێ ڕێ بڕۆی؟

پیاوەکان ژێر باڵیان گرت و بەرزیان کردەوە و وەك کوڵێکی سوك بەرەو دەرگا کراوەکەی پشت کامیۆنەکە بردیان. هەستی ئەکرد لاقی لەبەر پلەی ماشێنەکەدا بەزەوییدا ڕۆئەچێ. ئەتوت پێی خۆی نییە، پێی بوکەڵەیەك بوو کە لە دارو پێچ دروست کرابوو. ئەوجا دەرگاکان تەقەتەق پێوەدران و کامیۆنە بچوکەکە لە شارەکەدا بەڕێ کەوت. ئەوە دوایین جار بوو.

دوو ڕۆژ دواتر، ژنە بچوکە ڤێتنامییەکە، ڕۆیشتە ناو هۆڵی کۆمیسەری پۆلیس، بێرەنگ بوو و چاوەکانی ماندو، نەخەوتبوو، دوو شەو بەتەمای مۆندۆ مابۆوە و ڕۆژی سێهەم هەموو شار بەدوایدا گەڕابوو.

کۆمیسەرەکە بێ فزوڵی بۆی ڕوانی:

—ئێوە دایکی ئەون؟

"تی شان" وتی: نە، نە، (بەدوای وشەدا ئەگەڕا)، من من دۆستێکی ئەوم.

سەرەڕای چرچ و لۆچەکانی ڕومەتی بچوکتر نیشانی ئەدا، هەروەك منداڵێ.

—ئێوە ئەزانن لە کوێیە؟

کۆمیسەر بێئەوەی بۆ وەڵامدانەوە پەلە بکات بۆی ڕوانی.

ژنە بچوکەکە دووبارەی کردەوە، ئەتوت تێنەئەگەیشت.

—لە "کانونی بارمێنان"ە.

پاشان ڤیژاندی.

—بەڵام وا نابێت.

کۆمیسەرەکە پرسیاری کرد: چی نابێت؟

—بەڵام بۆ؟ چی کردووە؟

—ئەو بە ئێمەی وت خێزانی نییە، ئێمەیش بردمانە ئەوێ.

"تی شان" دوپاتی کردەوە: نە، نابێت.. ئێوە نازانن.

کۆمیسەر بە توڕەییەوە بۆی ڕوانی:

ئێوە سەرنج نادەن، خانم. منداڵێکی بێ ماڵ، بێ کەسوکار، لەگەڵ وێڵکەردەکاندا لە شەقامدا وێڵە، لەگەڵ سواڵکەرەکاندا و ڕەنگە خراپتریش! کەسێکە وەك کێوییەکان ئەژی، کەس نەیئەزانی چی ئەخوا و لە کوێ ئەژی، لە مێژە نیشانەکانیان پێداوین، خەڵك شکایەتیان کردووە، ماوەیەکی زۆرە بە دوایدا ئەگەڕێن، بەڵام ئەو زۆر فێڵباز بوو، خۆی ئەشاردەوە، ناچار بووین ئیتر تەواوی کەین.

ژنە بچوکەکە ماتی بەردەم خۆی بیوو، جەستەی ئەلەرزی، کۆمیسەرەکە نەرمتر ببوو:

—ئێوە، ئێوە لەگەڵی خەریك بوون؟ گوێ بگرن، ئەگەر ئەتانەوێ وەئەستۆی خۆتانی بگرن، ئەگەر بتانەوێ بە ئێوەی بسپێرین، بێگومان ئەوە ئەگونجێ.

—ئەبێ لە "کانونی بارمێنان" دەربێت.

—بەڵام ئەبێ لەوێ بمێنێتەوە تا باشتر بیت، ئەگەر ئەتانەوێ وەئەستۆی بگرن، ئەبێ داخوازییەك بنوسن، پەروەرنەدە پێك بێنن، ئەوەیش خێرا بەڕێوە ناچێت.

"تی شان"، لە مێشکیدا بە دوای وشەدا ئەگەڕا، هێزی قسەکردنی نەبوو.

—ئەبێ کاری ئیداری بەڕێوە بچێت، ئەو منالە.. ناوی چییە؟

"تی شان" وتی: مۆندۆ، من..

—ئەم منداڵە لە ژێر چاودێردایە، ئەبێ ئاگایان لێ بێت. لە "کانونی بارمێنان" خەریکین، ئێوە ئەزانن کە لەم تەمەنەدا خوێندن و نوسین نازانێ، هەرگیز قوتابخانە نەچووە؟

"تی شان" هەوڵی ئەدا قسە بکات، بەڵام خنکا بوو، سەرئەنجام وتی:

—من ئەتوانم چاوم پێکەوێ؟

—ئەریٚ بێگومان، کۆمیسەر هەڵسایەوە:

—یەکیٚ لەم ڕۆژانە، کاتیٚ باشتر بوو، ئێوە بێن چاوتان پێکەویٚ، ئیجازەی ڕەئیس وەرگرن.

"تی شان" وتی: بەڵام ئەمڕۆ.. دیسان قیژاندنی، دەنگی گیرابوو.. ئەمڕۆ ئەبیٚ بیبینم.

—نە هەرگیز نابێت، ئێوە بەر لە چوار یان پێنج ڕۆژی تر ناتوانن بیبینن.

—تکاتان لیٚ ئەکەم، بۆ ئەو ئێستا زۆر گرنگە.

کۆمیسەر بەرەو دەرگاکە ڕێنوێنی کرد:

—نا، تا چوار یان پێنج ڕۆژی تر نابێت.

کاتیٚ دەرگاکەی ئەکردەوە، بۆچونی گۆڕیا:

—ناونیشانم بدەریٚ، بۆ ئەوەی بتوانین پێوەندیت لەگەڵ بگرین.

لەسەر دەفتەرێکی بچوك نوسی.

—باشە، لەم یەك دوو ڕۆژەدا تەلەفۆنم بۆ بکە بۆ ئەوەی پەروەردنەکەی دەست پێبکەین.

بەڵام بەیانی کۆمیسەر ڕۆیشتبوو بۆ ماڵی "تی شان". دەرگاکەی کردبۆوەو لە گۆزەرگا ڕیفییەکە بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتبوو. کاتیٚ "تی شان" دەرگاکەی کردبۆوە، هەر بە زۆر چووبووە ماڵەوە، بۆ ناو ساڵۆنەکەی ڕوانیبوو:

دەستی پێکرد: مۆندۆ کەوت.

"تی شان" پرسیاری کرد: چی بەسەر هاتووە؟ لەو ڕۆژە بێرەنگتر ببوو.

چاوەکانی بە ترسەوە بەرەو ڕوخساری پۆلیسەکە بەرز کردەوە.

—ڕۆیشتووە.

—ڕۆیشتووە؟

—ڕۆیشتووە، گوم بووە، بوە بە هەڵم!

لە ئاستی سەر "تی شان"ەوە، پۆلیسەکە ناو ماڵەکەی ئەپشکنی.

—ئێوە نەتاندیوە؟ بۆ ئێرە نەهاتووە؟

"تی شان" قیژاندی: نە!

—لە دەرمانگەکە دۆشەکەکەی ئاگر دابوو و لە هەڵێکدا هەڵهاتبوو، من پێموابوو کە لەوانەیە ئێوە دیبێتتان.

دیسان قیژاندی: نە! نە! چاوە تەنگەکانی لە توڕەییدا ئەدرەوشانەوە.

کۆمیسر خۆی کێشایە دواوە.

—گویٚ بگرن، من خێرا هاتم ئاگادارتان بکەم، ئەبیٚ ئەم کوڕە پەیدا بکریٚ بەرلەوەی کارێکی گێلانەتر بکات.

لە پلیکانە خڕەکانەوە ڕۆشتە خوارەوە.

—ئەگەر گەڕایەوە لاتان، ئاگادارم بکەن! بەرەو دەرگاکە ڕێکەوتبوو..

—من ئەو ڕۆژە پێم وتن، ئەو وەحشییە!

"تی شان" لە ناو دەرگاکەدا ئەئەمزوا، چاوەکانی پڕ ببون لە فرمێسك، گەروی هێندە گوشرابوو، نەیئەتوانی هەناسە بکێشیٚ.

—تۆ هیچ تێناگەی، هیچ!

بە دەنگێکی نزم، بۆ خۆی ئەدوا، لە کاتێکدا کۆمیسەری پۆلیس دەرگاکەی کردبۆوە و بە هەنگاوی بەرز ڕێگای پلیکانەکانی بەرەو ترۆمبیلە ڕەشەکە گرتبووە بەر.

"تی شان" لەسەر پلیکانە سپییەکان ماوەیەکی زۆر بێجوڵە دانیشتبوو، بێئەوەی بۆ ڕوناکییە زێڕینەکە بڕوانیٚ کە خەریك بوو ساڵۆنە گەورە چۆڵەکەی پڕ ئەکردەوە، بێئەوەی تەنانەت ئاگای لە خۆی بوبێت.

فرمێسکەکان تنۆك تنۆك ئەڕژانە سەر نوکی لوتی و ئەکەوتنە سەر بەرهەڵبێنە شینەکەی و ئەو ئەیزانی کە منداڵە قژ خۆڵەمێشییەکە ناگەڕێتەوە، نە بەیانی و نە ڕۆژەکانی تر.

*****

هاوین دەستی پێکردبوو، بەڵام ئەتوت هەروا ساردی کردووە، هەموو لێرە، لە شارەکەماندا، وامان هەست ئەکرد. خەڵك بەردەوام ئەهاتن و ئەچون، ئەیانفرۆشت و ئەیانگۆڕی، ترۆمبیلەکان

لەناو شەقامەکاندا بە هاڕە هار و هۆڕن لێدانەوە دەئاژوتن. جار جار لە ئاسمانی شیندا، فڕۆکەیەك تێئەپەڕی و هێڵێکی سپی درێژی لە دوای خۆی بەجێ ئەهێشت. سوالکەرەکان بێوچان، لە پاڵ دیوارەکاندا، لەبەر دەرگای شارەوانی کڵێساکاندا سواڵیان ئەکرد.

بەڵام ئیتر وەك جاران نەبوو، ئەتوت هەورێکی نادیار زەوی دائەپۆشێ، کە نەیئەهێشت ڕووناکی بە تەواویی بگاتە خوارەوە. شتەکان ئەوانەی جاران نەبوون. سەرەڕای ئەوە، دوای ئەوە پۆلیس "ژیتان"ی گرت، ڕۆژێ کە دیتبوویان لەناو گیرفانی ڕێبوارەکاندا دزی ئەکرد. "کۆساك" هەمیشە مەست بوو.

"ژیوردۆن"ی ماسیگر لەسەر شەپۆلشکێنەکە تەنافەکانی تێکشکاندبوو و هەرگیز بۆ "ئیریترە" نەڕۆیشتبوو و بۆ هیچ جێگایەکی تریش. "داد"ی پیر سەرەنجام لە نەخۆشخانە هاتبووە دەر، بەڵام کۆترەکانی نەدۆزیبۆوەو لە جێی ئەوان پشیلەیەکی سەندبوو. نیگارکێشەکەی یەکشەممان، نەیتوانیبوو وێنەی ئاسمان بکێشێ و دەستی کردبۆوە بە کێشانی وێنەی دەریاوانی و دیمەنە مردووەکان، کوڕە بچوکەکەی باخی گشتی، سێچەرخەکەیان لێ دزیبوو. پیاوە پیرەکەیش کە ڕوخساری لە سورپێستەکان ئەچوو، بەردەوام هەر لە قەراخەکەی ڕیخ کێش ئەکرد بێئەوەی بەرەو قەراخەکانی "کانژ" بڕوا. کەشتی "ئۆگزیتۆن" بە هەوسارەکەیەوە، بەستراوە بە ئەڵقەی ژەنگاوی لەنگەرگەکەوە، لەوەلەو لەسەر ئاوی بەندەر تەنیا مابۆوە، لە ناو سفرەیەك لە گازۆئیلدا، بێئەوەی کەس لە سەری دانیشێ و گۆرانی بۆ بڵێ.

سالان و مانگان و ڕۆژان، بێ مۆندۆ، تێپەڕی، چونکە زەمەنێکی هاوکات زۆر کورت و زۆر ماوەدار بوو. لێرە، لە شارەکەماندا، خەڵکێکی زۆر، بێئەوەی زات بکەن بیڵێن، بە تەمای کەسێ بوون، بێئەوەی خۆیشیان ئاگایان لێ بووبێت. ئێمە لەناو کۆمەڵدا بە دوایدا ئەگەڕاین. لە کونجی شەقامەکاندا، لەبەر دەرگاکاندا، بۆ ڕیخی کەنار دەریامان ئەڕوانی، دەریایەك کە لە دیوار ئەچوو، ئەمجا تۆزێ فەرامۆشمان کردبوو.

ڕۆژێ، ماوەیەکی زۆر دوای ئەوە، ژنە بچوکە ڤێتنامییەکە لە باخەکەیدا، لەسەر تەپۆلکەکە ئەگەڕا. لە ژێر کۆگای کەلاوەکاندا دانیشتبوو کە پڕ بوو لە مێشی پێست پڵەنگی کە لە هەوادا سەمایان ئەکرد. بەردە وردەکانی کۆئەکردەوە کە ئاوی دەریا ساف کردبوون. لەسەر ڕیخی قەراخ، نیشانەگەلی هەڵکەنراوی دیتبوو کە تەپ و تۆز نیوەی سڕیبۆوە. بە دڵەتەپێ، بە سەرنجەوە بە بەرهەڵبێنەکەی تەپ و تۆزەکەی سەری سڕیبۆوە. دوو وشە، بە پیتی گەورەی لار و گیر نوسرابوون، هەمیشە زۆر.

سەرچاوە:

لۆکلیزیۆ: مۆندۆ و چیرۆکەکانی تر، وەرگێڕانی: کافیە جەوانرودی – دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، ۲۰۰۳.

# دەربارەی (کریشنا مورتی)

سازدانی: ڕامین جەهانبەگلو

لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

ڕامین جەهانبەگلو: بەرنامەی ئەم هەفتەیەی "هزرەکان" تایبەتە بە عارفی گەورەی هیندیی ناسراو "جیدو کریشنا مورتی". جیدو کریشنا مورتی لە ١١ ی مایسی ١٨٩٥دا لە شارێکی بچووکدا هاتۆتە دونیاوە کە ١٥٠کم لە باکووری مەدراسەوە دوورە لە هیندستان. باوکی لە پێڕی براهماکان بوو و لە بەڕێوەبەرێتیی باج کاری دەکرد. کریشنا مورتی تەمەنی ١٠ ساڵان بوو کە دایکی کۆچی دوایی کرد و باوکی کە لە *Theosofical Society* و خانم *Helena Blavatsky* یەوە نزیك بوو، بۆ نزیك کردنەوەی خێزانەکەشی لەم گروپە، گواستنیەوە بۆ شاری *Adyar* لە *Cennai*. پاش ئەم گواستنەوەیە لە ١٩٠٩دا کریشنا مورتیی مێردمنداڵ لەڕێی *Besant Annie* و *Lidbite Cw*وە وەکو ڕزگارکەرێکی نوێ ناسرا. بەمجۆرە کریشنا جی و نیتتیناندای برای لە باوکیان جیابوونەوەو لەناو کۆمەڵەی تەسەووفی خانم *Besant* دا گەورە بوون و پاشان بۆ درێژەدان بە خوێندن هەردووکیان نێردران بۆ بەریتانیا؛ بەڵام بە مەرگی براکەی کریشنا مورتی بەهۆی نەخۆشیی سیلەوە لە ساڵی ١٩٢٥دا کریشناى لاو دوچاری وەهمێکی زۆر بوو سەبارەت بە چارەنووسی پەیامبەرانەی خۆی و دەستبەرداری کۆمەڵەی عیرفانیی ئەستێرەی خۆرهەڵات بوو کە خۆی ڕابەرایەتیی دەکرد. بەمجۆرە کریشنا مورتی تا کۆچی دوایی کرد، ژیانی خۆی بۆ وانەوتنەوەو وتارخوانی سەبارەت بە کۆمەڵێك مەسەلەی وەکو زانین و ئازادی و حەقیقەت و عیشق لە هیندستان و ئەوروپاو ئەمریکادا تەرخان کرد. کۆمەڵێك کتێبی بەچاپ گەیاند، لەوانە "ئامادەبوون لە بووندا"، "ڕاڤەی ژیان"، "نیگا لە بێدەنگیدا"، "بینینی ورد" و "ئایندە ئێستایە"، کە زۆربەیان بابەت و گفتوگۆی زیندوون لەگەڵ خەڵکانێکدا کە پرسیاری لێدەکەن.

کریشنا مورتی لە ساڵانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠ دا کاریگەریی لەسەر گەلێ کەسێتیی هونەری و

ئەدەبی و زانستی سەدەی بیستەم هەبوو، لەوانە بروس لی و دەیڤید هیوم و هەر لەبەر ئەمەش وەکو یەکێك لە گرنگترین گروپەکانی هیپییەکان لە شەستەکاندا ئاماژەیان پێدرا، بەڵام هەندێ بیروبۆچوونی هەڵە سەبارەت بە مزرو تێڕامانەکانی کریشنا مورتیش هەن کە هەروەکو خۆی پێشبینیی دەکرد مەودای فیکریی نێوان ئەوو قوتابییەکانی زیاتر دەکرد. هەر لەبەر ئەمەش بەڕاستی دەتوانین ئەوە بڵێین کە گوفتارو ڕێنماییەکانی کریشنا مورتی قابیلی گەیاندن نین و ئەو خۆشی بڕوای وابوو کە کەس جێگرەوەی نییەو کەسیش بۆی نییە گوتەکانی ئەو لێکبداتەوە.

کریشنا مورتی لە ١٧ی شوباتی ١٩٨٦دا لە ئۆهای لە کالیفۆرنیا دونیای جێهێشت.

جەهانبەگلو: بەڕێز عاقلی، ئایا دیاردەیەك هەیە بەناوی "سیستەم"ی کریشنا مورتییەوە یان ئەوەتا کریشنا مورتی مامۆستایەك و بیرمەندێکی پڕ نهێنییەو ئاشنابوون بەخۆی و ڕێنماییەکانی پێویستی بە ئامادەگیی ڕۆحی و دەروونیی زۆر تایبەتە؟

عاقلی: بەشێوەیەکی گشتی کریشنا مورتی لە سێ لایەنەوە قابیلی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەیە و ناسینیشی ئەفسوونێکی تایبەتیی خۆی هەیە. لایەنێکیان پەیوەندیی بە بەسەرهاتی ژیانیەوە هەیە، کە بەسەرهاتێکی زۆر سەرنجڕاکێشی هەیەو شایانی خوێندنەوەیە. لایەنێکی تریان پەیوەندیی بە دونیاو ئەزموونە ڕۆحییەکانی و کەسێتیی خۆیەوە هەیە کە مایەی لێکۆڵینەوەیە. لایەنی سێیەمیش پەیوەندی بەو ڕێنماییانەوە هەیە کە لە سەدەی بیستەمدا خستنیە ڕوو و دەکرێ لەم ڕووەشەوە بە یەکێك لە ڕوخسارە کاریگەرە گرنگەکانی سەدەی بیستەمی بژمێرین. بەڵام ئەگەر بمانەوێ کریشنا مورتی بخەینە خانەیەکەوە، ئەوا نە دەتوانین بە مانا تەقلیدیەکە بە عارفی لەقەڵەم بدەین، لەکاتێکدا ئەو عارفیش بووە، واتە خاوەنی ئەزموونی ڕوحی بووە، یان بە دەربڕینێکی نوێ خاوەنی ئەزموونی ئایینی بووە، و نە دەتوانین بە عارفی لەقەڵەم نەدەین. ئەوەی واش دەکات کە پۆلێنکردنی ئەو لە خانە جیاوازەکاندا گرفتئامێز بێت ئەوەیە کە عادەتەن کریشنا مورتی وەکو مامۆستایەکی جیهانی دەناسرێ و ئەم دەربڕینەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجوومەنی تیۆسۆفی کە بەڕێز جەهانبەگلو لەسەرەتادا ئاماژەی پێداو وردە وردە ئەم ناوەی بەسەردا دابڕا. کریشنا مورتی بە پێچەوانەی تەواوی عارفەکانی ترەوە کە خاوەنی پەیڕەوو پرۆگرامی سیستمی خۆیان بوون و زاراوەو ڕوانگەی فەلسەفی و ئایینیی تایبەت بەخۆیان هەبووە بۆ گوزارشت کردن لە ئەزموون و ڕێنماییەکانی خۆیان، دەکرێ بڵێین کە ئەو بۆ یەکەمین جار عیرفانی لە شێوە تەقلیدیەکەی دەرهێناو بە زمانی ئەقڵانیی سەدەی بیستەم خستیەڕوو. واتە کاتێك ئەو کەسە دەهێنینە بەرچاومان کە کریشنا مورتی پەیامی خۆی ئاراستە دەکات، دەبینین دەشێ هەموو کەسێك بێت، بە چاوپۆشین لەو بیروباوەڕەی کە هەیەتی. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ئەو لە ڕووی فیکری و بیروباوەڕەوە خۆی بە سیستم و قاڵبێکی دیاریکراوەوە نەبەستۆتەوە.

جەهانبەگلو: بەم بۆنەیەوەو لە درێژەی قسەکانی ئێوەدا، ئەو پرسیارەی من لە بەڕێز موسەففام هەبوو کە باسەکانی سەبارەت بە بنەما فیکرییەکانی کریشنا مورتییە، ئەوەیە کە یەکێك لە بنەما فیکرییەکانی مورتی ئەوەیە کە

زانین زۆر سنووردارو بچووکە، زانستیش واتە ئازار و خەم و ئەوەی لەودیو زانینەوە هەیە، لە زانین و زانیاریەکان گەلێ فراوانترە. ئەو خۆشی دەڵێت " ئەو کەسەی هەمیشە بیردەکاتەوە کەسێکە کە بیرناکاتەوە" ئەمە ڕستەیەکی بەناوبانگی کریشنا مورتییە. هەروەها دەڵێت "زانین لە بەلەمێك دەچێت لە ئۆقیانووسێك نەزانراودا".

موسەففا: شتێکی بەڵگەنەویستە کە مەبەستی لە زانین، زانینی فیزیاو زانستی نییە. ئەو لێکۆڵینەوە لە مەعریفە زانستییەکانی لەو زانینانە جیاکردۆتەوە کە تێکڕا دیاردەیەك بەناوی "خود"ەوە پێکدەهێنن. خود بەرەنجامی جۆرێکە لە زانین. من دەزانم بۆ نموونە کە ئادەمیزادێکی بچووکم، ئەم زانینەم لە دیاردەیەکی فراوانەوە دێت کە من بچووك دەکاتەوە بۆ کەسێکی بچووك، دیار، بێبایەخ و بایەخدار و هتد.. هەر بەم مانایەش ڕاست دەکات کە دەڵێت من لە ئۆقیانووسی ژیاندا والأم، واتە ئەگەر من هیچ جۆرە بیرکردنەوەیەکم سەبارەت بەخۆم نەبێت کە من وەهام یان وەها نیم، ئەوا والأم، واتە بە تەواوی دونیای بوونەوە پەیوەستم. بەڵام دوای ئەوەی گوتم من بچووکم، واتە موسەففا دابەزیوە بۆ ئاستی بچووك و بچووکی. بەم مانایەشە کە دەڵێت هزر سنووردارە، هزرە تەعبیریەکان یان هزرە پێکهێنەرەکانی خود "*self*".

جەهانبەگلو: هەر لە درێژەی ئەوەدا کە ئێوە فەرمووتان من وای بۆ دەچم کە پێویستە بایەخ بەم مەسەلەیەش بدەین و ئەم پرسیارەش ئاراستەی بەڕێز عاقلی دەکەم کە کریشنا مورتی لە ڕاستیدا دەڵێت ژیان لەو ساتەوەی لەدایك دەبین تا ئەو ساتەی دەمرین ڕەوتێکی فێرخوازییە. فێربوونیش مەرج نییە خوێندنەوەی کتێبێك یان تێپەڕاندنی تاقیکردنەوەیەك (ئیمتیحانێك) بێت، بەڵکو فێربوون ئەو شتەیە کە لەتەواوی ژیانماندا وەریدەگرین، هەروەها دەڵێت ژیان واتە ئەوەی کە ئێمە هەر ڕۆژەو بە جۆرێکی جیاواز وابەستەی دەبین و لەگەڵیدا هەڵسوکەوت دەکەین و ئازادبوون لە زانین خۆی جۆرە مردنێکە، بەڵام هەر خۆیشی ژیانێکی نوێشە.

عاقلی: ئەمەی تۆ باست کرد شیعرێکی بەناوبانگی مەولانای وەبیر هێنامەوە کە دەڵێت:

"رو بمیر ای خواجه قبل از مردنت
تا نباشد زحمت جان کندنت
آن چنان مرگی که در نوری روی
نی چنان مرگی که در گوری روی"

ئەمە ڕێك لەگەڵ ئەوەدا وێك دێتەوە کە ئێوە دەربارەی کریشنا مورتی فەمووتان. بەڵێ، کریشنا مورتی باس لە جۆرە زانینێك دەکات کە جیاوازە لەو زانینەی باوە. کریشنا مورتی لەڕاستیدا مەعریفە بەو شتانە دەزانێت کە لە یاد (زاکیرە)دا کەڵەکە دەبن و بە قەولی عارفانی لای خۆمان دەشێ ببێتە لەمپەرێك لەبەردەم عارف یان سالیکدا. ئامۆژگاریی ئەویش ئەوەیە کە پێویستە ئێمە سات بە سات خۆمان و دونیای خۆمان بخەینە ژێر چاودێرییەوە و لەڕێی پەیبردنێکی ڕاستەوخۆی مەزەنە ئاساوە، کە لە پەیبردن بە بینین دەچێت، لە جیهان خورد ببینەوە. پرسیار بکەین و تاوێك چییە لە نیگاکردنی جیهان نەوەستین.

ڕاستیەکەی کریشنا مورتی دەڵێت مرۆڤ لە خولگەی ڕاستەقینەی خۆی دەرچووەو دەیەوێ ڕێی ڕاستی چۆنێتی ژیانمان فێربکات. بۆئەوەی مرۆڤ بچێتەوە خولگە ئەسڵیەکەی خۆیشی، ڕادەسپێرێت کە پێویستە مرۆڤ سات

بە سات لە حاڵەتی بینیندا، و لە حاڵەتی سەرنجدان و بایەخداندا بێت. لە ڕاستیدا ئەمە کلیلی ڕێنماییەکانی کریشنا مورتییە کە تێگەیشتنی بۆ زۆر کەس ئاسان نییە. کریشنا مورتی باس لە ئەدگارەکانی ئەو مرۆڤە دەکات کە لە خولگەی دروستدایە. هەمان ئەو ئەدگارانەیە کە ئێمە لە ئەدەبیاتی کۆنی عیرفانی خۆماندا لای مرۆڤی کامڵ دەیبینینەوە. لە سەرێکی تریشەوە وەختێ سەبارەت بە ڕێوڕەسم پرسیاری لێدەکەن، لەبری ئەوەی پێشنیاری ڕێگاو میتۆدێك بکات، دەڵێت ئەوەی پێویستە ئەوەیە کە ئاگامان لە حاڵی خۆمان و جیهانی بوون بێت و سات بە سات لە بووندا ئامادەییمان هەبێت. مەبەستی لە فێربوونیش هەمان ئەم پەیوەندییە ڕاستەوخۆیەی سات بە سات و مەزنە ئامێزەیە بە جیهانی بوونەوە. ئەم پەیبردن و تێگەیشتنەش ناودەنێت زانین یان فێربوون، لەبەرئەوە دەبێ لە نێوان ئەو فێربوونەدا کە کریشنا مورتی مەبەستیەتی و ئەو فێربوونەدا کە بە شێوەیەکی باو لە زماندا هەیە، جیاوازی بکەین، لە ڕاستیشدا هەر ئەم مەسەلەی فێربوونە کلیلی ڕێنماییەکانی کریشنا مورتییە.

جەهانبەگلو: من وای بۆ دەچم ناکرێ باس لە مەسەلەی فێربوون و زانین بکرێ لای کریشنا مورتی، بەبێ ئەوەی ئاماژە بۆ مەسەلەی عیشق و ئازادی بکەین کە لە ڕوانگەی کریشنا مورتییەوە ئەمانە هەموویان بەیەکەوە بەستراونەتەوە. لە یەکێك لەو کتێبانەی کریشنا مورتیدا کە بە ناوی "ڕاڤەی ژیان"ەوە وەرتانگێڕاوە، مورتی باس لە مەسەلەی عیشق دەکات و لەو بڕوایەدایە کە ژیان بەبێ عیشق بێوەرەو لە خاکێکی بەیار دەچێت. بەڵام باسی شتێك دەکات زۆر سەرنجڕاکێشەو ئەویش ئەوەیە کە لە عیشقدا گوشارو ناچارکردن نییە. لەبەر ئەوەی گەر گوشارو ناچارکردن هەبوو، ئەوا عیشق نییە.

موسەففا: کریشنا مورتی بە شێوەیەکی فراوانتر دەربارەی عیشق دەدوێت و دەڵێت ئێمە ناتوانین بە شێوەی پۆزەتیڤ قسە لەسەر عیشق بکەین. باشترین شێواز بۆ مەڵسوکەوتکردن لەگەڵ عیشقدا شێوازی نەگەتیڤە. واتە ئێمە دەبێ بزانین ئەو شتانە چین کە عیشق نین. بۆ نموونە ئایا ئیرەیی عیشقە؟ ئایا وابەستە بوون (مەرجداربوون) عیشقە؟ ئایا غیرەکردن عیشقە؟ پاشان دەڵێت: نەخێر، ئەمانە عیشق نین. دەڵێت کاتێك بۆمان دەرکەوت کام شتانە عیشق نین، کاتێك تەواوی ئەم شتانە لەئارادا نەمان، دیاردەیەك بەرجەستە دەبێت کە ئەویش وزەی عیشقە. ئەوە هەستێکی ڕەسەنەو، ئەوە عیشقێکە کە مەرجدار نییەو پێویستی بە تەجەللا نییە، گەرچی تەجەللا دەکات، بەڵام مەرج نییە پێویستی بە تەجەللا و دەربڕین هەبێت. لە حاڵی حازردا من ئەگەر بە کەسێك نەڵێم "خۆشم دەوێیت" وا دەزانم عاشق نیم! واتە حەتمەن دەبێ دەربڕینێکی دەرەکیی هەبێت. بەڵام عیشق بە مانا ڕەسەنەکەی، یەکەم: جلیوەی دەرەکیی نییە و دووەم: سنووردار نییە. واتە حاڵەتێکی وجودیانەی مرۆڤە، وەکو هەناسەدان. من ناڵێم: "من بەتۆ هەناسە دەدەم"، ئەگەر بڵێم "من بەتۆ هەناسە دەدەم" هێندەی ئەوە هەڵەیە کە بڵێم " من تۆم خۆشدەوێت". عیشق ئاراستەی شتێك ناکرێ. حاڵەتێکی بوونی منە. جۆش و خرۆشی بوونە، جۆش و خرۆشی ژیانە. ئێمە لە ئێستادا غیرەکردن بە عیشق لەقەڵەم دەدەین، لە کاتێکدا غیرەکردن هۆکاری یەخسیرییە، واتە دژی ئازادییە، من لە عیشق و هاوڕێیەتییەکانی ئەم

پۆژگارەدا وابەستەم. ئەمەش واتە ئازاد نەبوون. لەبەرئەوەی عیشق بەمانا ڕاستەقینەکەی ئاراستەی بابەت *object*ێك ناکرێ. لە بنەڕەتدا ئازادی بەشێکە لە ماهیەتی عیشق. والایە. دۆخێکی والایە لە مرۆڤدا.

جەهانبەگلو: ئەم قسانەی کردتان گەلێ سەرنجڕاکێش بوون، چونکە من لە شوێنێکدا خوێندوومەتەوە کە کریشنا مورتی خۆی دەڵێت مەسەلەی خۆشەویستی یان عیشق نابێ شێوەیەکی بازرگانی بەخۆوە بگرێت. ئەمەش ئێمە دەبات بۆ شتێکی تر کە ئێوە باستان کردو دەمەوێ لەگەڵ بەڕێز عاقلیدا درێژەی پێ بدەین و ئەویش مەسەلەی تاککەرایی و تاکە کە لە گفتوگۆکانی خۆیدا لەگەڵ مامۆستایاندا ئاماژە بەم مەسەلەیە دەدات، بەڕێز عاقلی ئەگەر ئێمە بنەماو بناغە گەورەکان لەسەر بنچینەی "من" تاك دابمەزرێنین، گرفتار دەبین و ناچار دەبین هەمدیسان مامۆستایەکی تر بێت و ئێمە لەو پەرستگایە ڕزگار بکات کە بۆ خۆمان دروستمان کردووە. بەم پێیە ئەوەی کریشنا مورتی باسی دەکات ئەوەیە کە هەموو تاکێك دەیەوێ ئاسراو بێت و لەو ساتەشەوە کە ئاسراو دەبێت ئیدی ئازادیی خۆی بەتەواوەتی لەدەست دەدات. ئێمە دەتوانین لێرەدا ئاماژە بۆ ئەو مەسەلەیە بکەین کە هێزی کریشنا مورتی دژ بە هەموو جۆرە دۆگماتیزم و تێڕوانینێکی ئایدیۆلۆجیانەو هەموو جۆرە ڕابەرایەتییەکی ڕوحیشە.

عاقلی: بەڵێ، بەشێوەیەکی گشتی لەداب و نەریتە عیرفانیەکان و ڕێوڕەسمەکانیدا، هەمیشە ڕێپیشاندەرێك، قوتبێك، ڕابەرێك هەبووەو یەك ڕێو ڕەسم، بەڵام کریشنا مورتی لەو عارفە دەگمەنانەیە یان دەشێ تاقە عارفیش بێت کە زۆر دژ بە دەسەڵات و مامۆستایەتی یان قوتبایەتییە لە ڕێوڕەسمی ڕوحیدا و دەڵێت هەر کەسەو دەبێ خۆی ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بڕوای وابوو ڕابەر یان مامۆستا دەتوانێ یاریدەدەرێکی باش بێت لەو ڕووەوە، بەڵام دەیوت لە کۆتاییدا گەر تاکەکەس لەڕێی ڕابەرەوە و وەکو دەستی دووەم فێری کۆمەڵێك شت بێت، ئەم فێربوونە وەکو ئەو زانیارییانەی لێدێت کە لە یادیدا کەڵەکە دەبن و یارمەتییەکی ئەوتۆی ئەو تاکە کەسە نادەن لەوەدا کە کریشنا مورتی مەبەستی بووە. لەبەرئەوەی کریشنا مورتی، هەروەکو پێشتریش باسم کرد بڕوای وابووە کە مرۆڤ دەبێت بگاتە ئەو پلەیەی تیایدا ببێتە خاوەنی تێڕوانینێکی مەزەنە (حدس)یانەی سات بە سات. لەم سات بەسات بەسەربردنەدا، تاکە کەس ئەزموونی هەنووکەو ئەزموونی ئاوەز (ئەقڵ)ێك و هێزێك لە دانایی تاقی دەکاتەوە و سات بە سات ئامادەبوونی خۆی لەناو ئەم ساتانەی ژیاندا پیشاندەدات و ئەمەش زۆر لە هەندێ حاڵەتی سوکرات دەچێت، لەبەرئەوەی ئەویش هەمیشە بەدووی ئاگادارکردنەوەی مرۆڤدا بووە لە زانین و دەیوت مرۆڤ لەڕێی پەیبردن بە زانینەوە دەتوانێت فێری ڕێگای ڕاستی ژیان بێت. باشە سوکرات کە لەگەڵ ئەوەدا بووە مرۆڤ دان بە نەزانینی خۆیدا بنێت و بڕوای وابووە کە مرۆڤ دەتوانێت پەی بە نەزانینی خۆی بەرێت، ئەی هوشیاری و زانین چییان بەسەردێت؟ لەبەرئەوەی چیدی جێیەك بۆ زانین نامێنێتەوە. بەتەنها جێ بۆ پەیبردن بە نەزانین دەمێنێتەوە. لە بیروبۆچوونەکانی سوکراتیشدا دەبینین کە مرۆڤ کاتێك پەی بەو زانین و زانیارییانە دەبات کە لەلای کەڵەکە بوون،واتە پەی بە نەزانین و ناڕاستیی ئەوانە بردووە. لە مرۆڤدا جووڵەیەك ڕوودەدات کە تیایدا بەتەواوەتی

ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆی و لەگەڵ جیهانی بووندا دەگۆڕێت و چیدی لەڕێی هــزرو قاڵبــە مزرییــەکان و زانیارییــەکانی پێشووەوە پەیوەندی لەگەڵ دونیادا نابەستێت. بەڵکو پەیوەندییەکی ئامادەگیانە (حزووری)ی مەزەنەیی بێ ئێوەند دەدۆزێتەوە کە بەوپەڕی ئازادییەوە لە سای ئاوەزێکی ڕێنماییکەردا کـردەوەو ڕەفتـار دەکـات، لەڕاستیدا کریشنا مــورتی دەیویــست کەســەکان لــەوە ئاگــادار بکاتەوە کە ئادەمیزاد جگە لە زانین و زانیاری، دەتوانێت لەڕێی پەیبردنێکی مەزەنە ئاساشەوە فێربێت و پەی بە شتەکان بەرێت و تێبگات.

موسەففا: ئەو قسەیەی سوکرات کە ئاماژەت پێدا، سوکرات وتویەتی کە "ئێمە بە تەنها کارمان ئەوەیە پەی بە نەزانینی خۆمان بەرین، ئەی کەواتە کەی فێربیین؟" ئەم پرسیارە لەو قسەیەی مەولەوی دەچێت کە دەڵێت ئێمە پەنجەمان خستۆتە سەر چاومان، بۆیە دونیا نابینین. ئەوەندە بسە پەنجەمان لابەرین، کە پەنجەمان لابرد، ئەوکات دونیا دەبینین. ئەمەش واتە هوشیاری، واتە بینین. وەڵامی سوکرات ئەوەیە کە تۆ کاتێك نەزانینت لەناو برد، ئەوەی دەمێنێتــەوە ڕووناکییــە. نــەزانین هاووڵاتــای وەهمە.

عاقلی: ئەو ڕووناکییەی کە ئێوە ئاماژەی پێدەدەن، لە جۆری یان ڕەگەزی زانست و زانیــاری نییــە، بــەڵکو پــەیبردنێکی مەزەنــە ئاســایەو وەك ئــەوەی مــرۆڤ ببێتــە خــاوەنی چاوێکی ترو ئیدی بەو چاوە ببینێت. لەوانەیە بەلای خەڵکانێکی ئاساییەوە تێگەیشتن لەمە دژوار بێت، کە چۆن دەکرێ ببین بە خاوەنی چاوێکی ترو بەو چاوە ببینین. بەڵام کاتێك ســوکرات و کریــشنا مــورتی دەخوێنینــەوە، دەبیــنین وەختــێ دەســبەرداری زانیــاری و ڕێنماییە هەڵەکانمان بووین، واتە دەسبەرداری نــەزانین و وەهــم بــووین. کــەی دەســبەرداری دەبین؟ کاتێ کە پەیمان بە نەزانینی خۆمان برد. چونکە مــرۆڤ خــۆی بــۆ خــۆی شوێنپێهەڵگری حەقیقەتــەو کــە دەرکــی بــە نــەزانین کــرد بڕیــار دەدات یان ڕەفتار دەنوێنێت و بە شێوەیەکی خۆڕســکی دەســبەرداری نــەزانین دەبێــت. کــاتێکیش دەرکــی بــە نــەزانین کــرد چیتر هەوڵنادات لەڕێی ئەو زانیاریانەو ئەو شتانەوە لە جیهانی بوون تێبگات کە لەلای کەڵەکە بوون. بەڵکو لە ڕێی جۆرە پەیبردنێکی مەزەنە ئاساوە پەی بە جیهانی بوون دەبات و ئەم پەیبردنە مەزەنە ئاسایەش بڕیارەکان و بیرکردنەوەکان و هەستەکانیدا ڕێنمایی دەکات.

جەهانبەگلو: بەڕێز موسەففا، لە درێژەی قسەکانی بەڕێز عاقلیدا لایەنێك هەبوو کە بەلای منــەوە جێــی ســەرنج بــوو، لەوانەشــە بــەلای گوێگرانیــشمانەوە هــەر جێــی ســەرنج بێــت، ئەویش ئەوەیە کە کریشنا مورتی دەیەوێت هەموو جۆرە پەیوەندییەك لە نێوان "مورید" و "موراد"دا نــەمێڵێت. ئایا ئێوە هیچ جۆرە لێکچوونێك لە نێوان ڕێنماییەکانی کریشنا مورتی و ڕێنماییەکانی عارفانی ئێراندا دەبینن؟

موســەففا: بــەڵێ، بــۆ نموونــە ئەوەنــدەی پەیوەندیی بە مەسەلەی موریدو ڕێنماییکەرەوە هەبێت، مەولەوی زۆر بە ڕاشکاوی دەڵێت:

"چشم داری تو، به چشم خود نگر
منگر از چشم سفید خیرەسر
چشم چون نرگش فروبندی که چی؟
که عصایم کش که کورم ای اخی
آن عصاکش که گزیدی در سفر
خود بدان کاو هست از تو کورتر"

دەڵێت خۆت بە، خۆت ڕێگای خۆت هەڵبژێرە، ئەو چارەی کەسانی تر هەیانە تۆش هەتە، پشت بە خۆت ببەستە. ئەمە لایەنێکی مەسەلەکەیە. من کاتێك کتێبی "لەگەڵ پیرەکەی بەلْخ دا"م راڤە کرد گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە لێکچوونێکی سەیر لە ڕەگەکاندا، نەك تەنانەت لە لقەکاندا، لەنێوان کریشنا مورتی و مەولەویدا هەیە. بۆ نموونە یەکێك لە قسە بنەڕەتیەکانی کریشنا مورتی ئەوەیە کە دەڵێت مرۆڤ دەبێ خۆی لە دووفاقێتی ڕزگار بکات. دەڵێت کاتێك لە دووفاقێتی دەرچوویت، ئەو دیاردەیە بەردەوام نابێت کە پێی دەڵێن *self*. تەماشاکەن مەولەوی بۆ ئەم پەیوەندییە چی بە نموونە دەهێنێتەوە. دەڵێت خواجەیەك غولامێکی خێلی دەبێت کە شتەکان بە دوو شت دەبینێت. بە غولامەکەی وت بڕۆ لە ژووری گەنجینەکە شووشەیەك هەیە، بیهێنە. غولامەکە ڕۆیشت و گەڕایەوە وتی دوو شووشەی لێیە. خواجە وتی نا رۆڵە، تۆ چونکە خێلیت، یەك شت بە دوو شت دەبینیت. غولامەکە وتی: گەورەم، تانەو تەشەرم لێمەدە، دوو شووشەی لێیە. خواجە وتی: باشە، برۆ یەکێکیان بشکێنە. کاتێك چوو یەکێکیانی شکاند، سەیری کرد شووشەکەی تریش دیارنەما: ئەمە ڕێك قسەکەی کریشنا مورتییە کە دەڵێت ئەوە بزانە:

*The obvserver is the observed*

چاودێریکەر بریتییە لە چاودێریکراو. (یان بینەر بریتییە لە بینراو)

ئەمانە دوو دیاردە نین. وەختێ من دەڵێم "من بچووکم"، "من" دیاردەیەك نیەو "بچووکی" دیاردەیەکی تر. ئەمانە هەردووکیان یەك دیاردەن و ئەویش وەهمێکە.

یان دەربارەی "گەڕان"، مەولەوی دەڵێت:

"طالب هرچیز ای یار رشید
جز همان چیزی که می جوید ندید"

ئەمە وەرگێڕانێکی وردە بۆ ئەم دەستەواژەیەی کریشنا مورتی کە دەڵێت:

*You will find what you seek.*

تۆ ئەو شتە دەبینیتەوە کە بەدوویدا دەگەڕێیت.

یان سەبارەت بە تێفکرین، کریشنا مورتی لە بنەڕەتیترین بۆچوونەکانی ئەوەیە کە هەر ئازارێکی مرۆڤ بەستراوەتەوە بە جۆرێك تێفکرینەوە. مەولەویش دەڵێت:

"جمله خلقان سخره اندیشه‌اند
زین سبب خسته دل و غم پیشه‌اند
فکرتت از ماضی و مستقبل بود
چون از این دو رست، شکل حل شود"

تەماشاکە چەند بە ڕوونی ئەوە دەڵێت. کریشنا مورتیش دەڵێت هۆی ئازاری مرۆڤ ئەوەیە کە یان بە ڕابردووەوە وابەستەیە، یان بە ئایندەوە. ئەگەر لەم دووانە خۆی ڕزگار بکات، چیدی ئازار ناچێژێت.

یان یەکێك لە بنەما تیۆرییەکانی تری کریشنا مورتی بۆ ڕزگاربوون و قوتار بوون ئەوەیە کە دەڵێت هەمیشە لە ژیاندا ئامادەگی(حزوور)ت هەبێت. ئەمەش چ لە ئایینی ئیسلام و چ لە ئەدەبیاتی ئیسلامیدا، حزوور بێ ئەندازە جەختی لەسەر کراوەتەوە. مەولەوی دەڵێت:

"بشنو از اخبار آن صدر صدور
لا صلاه تم الا بالحضور"

دەڵێت تەنانەت نوێژەکەشت بێماناو ناکامڵە گەر حزووری لەگەڵدا نەبێت، زۆرترین بایەخی بە حزوور داوە.

جەهانبەگلو: دوا پرسیارم ئاراستەی بەڕێز عاقلی دەکەم و ئەو پرسیارەش پەیوەندیی بە کاریگەریی کریشنا مورتییەوە هەیە لە دونیای ئەمڕۆدا و ئەو شتەی بە بۆچوونی ئێوە لە

کریشنا مورتی دەمێنێتەوە بۆ سەدەی بیست و یەك و ئەو ڕێنماییانەی ئەو کە کاریگەرییان دەمێنێت.

عاقلی: سەرەتا دەمەوێ بڵێم کە گەلێ ڕۆشنبیری گەورە هەبوون کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی کریشنا مورتییەوە. بۆ نموونە ماتس لی مرۆڤێکی کەم نەبوو و لە هەواداران و پەیڕەوکارانی کریشنا مورتی بوو. یاخود هنری میللەر و کۆمەڵێك کەسێتیی دیاری تر، لەوانە دەیڤید بۆهم کە ئێوە لە کاتی ناساندنی کریشنا مورتیدا ئاماژەتان پێ دا و خاوەنی یەکێکە لە بەناوبانگترین تیۆرییەکان لە بواری فیزیای کوانتۆمدا. بەڵام سەبارەت بەوەی کە چی لە کریشنا مورتی دەمێنێتەوە، من وایدەبینم کە کریشنا مورتی لەو بیرمەندە بە ژمارە کەمانەی ئەم سەدەیە کە کاریگەریی بیروبۆچوونەکانی لەسەر نەوەکانی ئاییندە زۆر قووڵ دەبێت. ئەوەتانێ ئێستا شەپۆلێك لە جیهاندا بەڕێوەیە بەناوی "new at e"وە کە بە شەپۆلی سێیەمی ناودەبەن. ئەمانە پەیڕەوی لە ڕووحانیەت دەکەن و دەڵێن ئادەمیزاد گەیشتووە بە قۆناغێك کە ئێستا پێویستە بچێتە سەروو پێداویستیە مادییەکانیەوەو بایەخ بە ناخ و بە شتە ڕووحیەکان بدات. بۆ بایەخدان بە ڕووحانیەت و ئەوەی مرۆڤ لە خولگەی هاوسەنگیی ڕووحی و دەروونی و مەعنەویی خۆیدا لەنگەر بگرێت، دەکرێ قسەکانی کریشنا مورتی گەلێ فێرکەرو ڕێنماییکەر بن.

**سەرچاوە:**

سایتی <u>www.mossaffa.com</u>

ئەم گفتوگۆیە لە شابی ساڵی ٢٠٠٥دا لە لایەن ڕادیۆی bbcەوە ئەنجامدراوەو پەخش کراوە.

# گفتوگۆیەك لەگەڵ "ئەمین مەعلوف"دا

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

*با سەرەتای گفتوگۆکەمان بەوە دەست پێبکەین؛ "ئەمین مەعلوف" تۆ کێیت؟ لە کوێ لەدایك بویت و گەورەبویت و خوێندوتە؟

—لە بیست و پێنجی شوباتی ۱۹٤۹ لە نەخۆشخانەی (ڕزق) لە گەڕەکی (البسطة) لە بەیروت لەدایك بووم. دواتر بینای ئەو نەخۆشخانەیە خرایە سەر پەیمانگای ئاداب و بووە بەشێك لەو پەیمانگایە. ساڵی ۱۹٦٦ پەیوەندیم بەو پەیمانگایەوە کرد. لە منداڵیمدا کەسوکارم ناردمیانە باخچەی ساوایانی (بیزانسۆن) لە ناوچەی (جۆرج بیکۆ) و تەنیشت ئوتێل ڤینیسیا، پاشان لە ساڵی ۱۹٥٥ چومە قوتابخانەی یەسوعیە و لەوێدا مامەوە تا چووم بۆ خوێندنگای (الجمهور)، ساڵی ۱۹٦٦ ئەوێم تەواوم کرد و لەوێوە بۆ زانکۆی یەسوعیە و پەیمانگای ئاداب پێکەوە. لە زانکۆی یەسوعیە ئابووریم دەخوێند و لە پەیمانگای ئادابیش کۆمەڵناسی. یەکەم تاقیکردنەوەم لە زانکۆ ڕۆژی پێنجی حوزەیرانی ۱۹٦٧ بوو، کە هاتینە دەرەوە زانیمان شەڕ دەستی پێکردووە (مەبەستی شەڕی شەش ڕۆژەی عەرەب — ئیسرائیلە، وەرگێڕی کوردی).

ئەو ڕۆژەی نمرەی کۆتایی ساڵمان لە یەسوعیە وەرگرت، ئەو ڕۆژە بوو "عەبدولناسر" دەستی لە کار کێشایەوە. یەکەمجار کە سەیری نمرەکانی خۆم کرد لەسەر دیواری زانکۆ نەمزانی دەرچووم یان کەوتوم، پاشان جارێکی تر گەڕامەوە [redacted] دڵنیابم.

*مامۆستاکانی ئەوێت لەیادماوە؟

—بەڵێ، "عومەر عەزازە" وانەی گەشەی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵناسی پێ دەوتین، "سەلیم عەبۆ" فەلسەفە و مامۆستایەکی فەرەنسیشمان هەبوو ناوی "y etQL" بوو، ئەو ئەنسرۆپۆلۆگیای پێدەوتین و دەیزانی خەریکی کاری سیاسیم. جارێکیان بردمیە پەنایەکەوە و وتی: (ئەزانی تۆ دەوام ناکەیت و بەیانیش ئیمتیحانە، کەچی بە بای خەیاڵیشتا نایەت). دانیشت لەگەڵمدا و بە درێژایی دوو سەعات دەرسەکەی بۆ شەرح کردم. کاتێك ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی دایەوە، حەڤدە لە بیستم هێنابوو. لە سێیەم ساڵی خوێندنی زانکۆدا وازم هێنا. ئەو قۆناغە زۆر بێزاربووم. بۆ ماوەیەك دەستبەرداری خوێندن بووم. نەموێرا بە ماڵەوەمان بڵێم. دواتر دەستم بە

خوێندن کردەوە. ساڵی ١٩٧٢ پەیمانگای ئادابم تەواو کرد و کە شەڕی ناوخۆش دەستی پێکرد رومکردە پاریس. ساڵی ١٩٧٦ زانکۆی یەسوعیەم تەواوکرد.

***بۆچی بۆ ماوەیەك وازت لە خوێندن هێنا؟**

—ئەو کاتەی وازم لە خوێندن هێنا ون و سەرگەردان بووم. بێگومان هیچم لەو پیشەیە نەدەزانی کە خۆم حەزم پێدەکرد، بەڵام هەردەمویست ڕێگەیەك بدۆزمەوە. من هەر لە منداڵیەوە دەمزانی دەبمە ڕۆژنامەنوس. ئەو سەردەمە مرۆڤ نەیدەتوانی ڕۆژنامەنوسی بخوێنێ، یان لانی کەم فەزای ماڵی ئێمە ڕێی ئەوەی نەدەدا. "ڕوشدی مەعلوف"ی باوکم دەیوت: (ڕۆژنامەنوسی لە ماڵەوە فێردەبیت. فەزای ماڵەوە فەزایەکی ڕۆژنامەوانیە و پێویست ناکات لە خوێندنگا و پەیمانگادا فێری ببیت). ماڵەوەمان پێیان باش بوو فێری پیشەیەکی تر بم، تەنانەت ئەگەر کاری ڕۆژنامەنوسیش بکەم. بەڵام من لای خۆمەوە بڕیاری ئەوەم دابوو دەبێت ببمە ڕۆژنامەنووس. دوو ڕۆژ بەر لەوەی ژن بێنم و زەماوەند بکەم، مامۆستا "غەسان تویینی" پەیوەندی پێوەکردم و لێی پرسیم: (ئیش دەکەیت؟)، وەڵامم دایەوە وتم: (نەخێر). ئەو درێژەی پێداو وتی: (دوای گواستنەوەی ژنەکەشت هەرناتەوێت ئیش بکەیت؟)، وتم: (بەڵێ). وتی: (باشە کە مانگی هەنگوینیەکەت تەواو بوو، سەرێکم لێ بدە). وتم: (ناچم بۆ مانگی هەنگوینی و سبەینێ دێم بۆ لات). ڕۆژی شەممە ١٩٧١/٤/٢٤ ژنم گواستەوەو ڕۆژی دووشەممە ١٩٧١/٤/٢٦ لە ڕۆژنامەی (النهار) دەستم بە کار کرد. باوکم لە لاپەڕەیەکی ڕۆژنامەکەدا دەینوسی و منیش سەرەتا لە پاشکۆی ئابوریدا دەمنوسی کە پاشکۆیەکی تازە بوو. یەکەمجار لەو بوارەدا دەستم پێکرد، بەڵام زۆر حەزم پێنەدەکرد و بەلامەوە گرنگ نەبوو. ئەوە سەرەتایەك بوو بۆ من. ڕۆژنامەوانیم پێ گرنگ بوو.

***کە ژنت هێنا کێت هێنا؟ منداڵەکانت ناویان چیە؟**

—"ئەندریێ ئەبوشەدید"م هێنا. سێ کوڕم هەیە، "ڕوشدی" لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٢، "تارق" ١٩٧٥، "زیاد" ١٩٧٦.

***ئەم عەشقە بۆ کاری ڕۆژنامەنوسی چییە؟**

—ئەوەی گرنگی هەبوو لام بواری ڕۆژنامەنوسی بوو. ئەوەی لە بواری ئابوریدا نوسیم، شتێکی ئەوتۆ نەبوو. خەڵکم ئەبینی و لێدوانم لێوەردەگرتن. ڕۆژێکیان داوایان لێکردم بگوازمەوە لاپەڕەی دەرەوە، واتە ئەو لاپەڕەیە تەرخان بوو بۆ هەواڵ و بەدواداچوونی دنیای دەرەوە. ئەوە لە ساڵی ١٩٧٢ دا بوو. ئەو بەشە "عەبدولکەریم ئەبونەسر و سەمیر عەتاڵلا و فوئاد مەتەر"ی لێبوو. من لەسەر سیاسەتی نێو دەوڵەتان دەمنوسی. ئەو کاتە خولیای سەرەکیم سیاسەتی نێودەوڵەتی بوو.

***بۆچی سیاسەتی نێو دەوڵەتی؟**

—لە منداڵیەوە چاودێری ئەو ڕووداو و گۆڕانکاریانە دەکەم کە لە جیهاندا ڕوو دەدەن. لە بەیانیەوە گوێم لە ڕادیۆ دەگرت. یەکەمین شت کە گوێم لێ بوو، هەواڵێك بوو دەربارەی شەڕی سوێس ١٩٥٦. لەو کاتەوە تا ئێستا ڕۆژانە جارێك یان زیاد لە جارێك گوێ لە *BBC* دەگرم.

***ئایا ئەمە لە ژێر کاریگەری "ڕوشدی مەعلوف"ی باوکتاندا بوو؟**

—بە هۆی کاریگەری هەموو ماڵەوەمان بوو. ڕاستە مامە "حلمی"م ماوەیەك لە *BBC* کاری کرد، بەڵام فەزای گوێگرتن لە هەواڵ بەردەوام لە ماڵی ئێمەدا هەبووە. ڕەنگە لەم ڕووەوە من زیاتر لەوانی دی گوێم لە هەواڵەکان گرتبێت. تا ئێستاش گوێ لە هەواڵ دەگرم، هەرچەندە بۆچوون و بیرکردنەوەشم گۆڕاوە. پێشتر

پێموابوو من لە ناو سیاسەتدام و سیاسەت بۆتە بەشێك لە داهاتووم. بەڵام سەروەختێك دەستم بە نوسین کرد، ئەو بەشە لە داهاتووم ئاوا بوو. سەرەتا گرنگیدانم بەو شتانەی لە جیهاندا دەگوزەران، بەشێك بوو لە گرنگیدانی گشتی بە سیاسەت.

*ئەم بایەخدانە بە سیاسەت، تا چەندە دەگێڕێتەوە بۆ ئەو پەروەردەکردنە سیاسیەی "ڕوشدی مەعلوف"ی باوکت؟

—تێکەشتم مەبەستت چییە. نەخێر، هەرگیز لەو فەزایەدا نەژیاوم، فەزای من جیاواز بوو. ئەو قۆناغەی باسی دەکەیت، بەر لەوە بووە کە من لەدایك بم. کاتێك کە فامم کردەوە قۆناغی (حیزبی قەومی) لە فەزای ماڵەوەماندا نەمابوو. ناوبەناو باسمان دەکرد، بەڵام بەسەرچوو. "فەخری مەعلوف"ی مامم، بەر لەوەی من لەدایك بم، لوبنانی جێهێشتبوو، نەمبینی تا ساڵی ۱۹۷۸. باوکم ناسیۆنالست بوو، بەڵام لە براکانی چالاکی کەمتر بوو. لە کۆندا فەزای بنەماڵەی ئێمە لە فەزای (حیزبی قەومی)یەوە نزیك بوو. بێگومان پەیوەندی هاوڕێیەتی لە نێوان مامە "فەخری"م و "ئەنتوان سەعادە"دا هەبوو. لە ساڵانی سیەکانەوە "ئەنتوان سەعادە" ناوبەناو سەردانی گوندەکەمانی دەکرد، ئەمەش تا پەنجاکان بەردەوام بوو. هیچی ئەم قۆناغەم لەبیر نیە.

*بیرت لەوە نەکردۆتەوە ڕۆمانێك بنوسیت "ئەنتوان سەعادە"ی تێدا بێت؟

—ئەمە مەسەلەیەکە من لە ناوەوە ئاشنا نیم پێی و هیچی لێ نازانم. نەزانم شتێکە لە مێژووی بنەماڵەی "مەعلوف"دا هەبووە. شتێك لە فەزای خێزانەکەماندا هەبوو ئازاری دەداین، جۆرێك لە هێدمەی دەروونی. ئەوەت لە بیر نەچێت ئەو ساڵەی من لەدایك بووم، "ئەنتوان سەعادە" لە سێدارە درا. خەڵکانێك زیندانی کران و خەڵکانێك کران بە پەتا. شۆکێکی دەروونی لەسەر ئەم مەسەلەیە ڕوویدا. مەسەلەیەك کە کەس قسەی لە بارەوە نەدەکرد و باس نەدەکرا. بەڵێ هەستم بە هێدمەیەکی دەروونی کرد، بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەبوو لە ناو بنەماڵەکەماندا فەزایەك خوڵقا کە کەسمان کاری حیزبایەتی نەکەین و دوورکەوینەوە لەو شتانە.

*دایکت کێیە؟

—دایکم ناوی "ئۆدیت غەسین"ە و ساڵی ۱۹۲۱ لەدایك بووە و تا ئێستاش لە ژیاندا ماوە. بنەماڵەکەی خەڵکی (المشرع)ن. باوکیشم هەر لەوێ لەدایك بووە، بەڵام من لەدایکبووی بەیروتم، کەچی لە ناسنامەکەمدا (المشرع) نوسراوە. باوکم ساڵی ۱۹۱٤ لەدایك بووە و ساڵی ۱۹۸۰ مردووە.

*واتە دایکت خەڵکی (المشرع)ە؟

—نەخێر، وەکو بڵێی خەڵکی (عین القبو)ە. ئەو لە میسر لەدایك بووە، لە شاری (طنطا).

*بۆچی (طنطا)؟

—بنەماڵەی دایکم هەموویان لە (طنطا)ن. باپیرم واتە باوکی دایکم و برایەکی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا لە (زەبوغە)وە چونەتە میسر. کەس و کار و خزمانی دایکم بە هاویندا هاتونەتە ئێرە. دایکم بۆی دەگێڕامەوە کە (فەخری مەعلوف"ی مامم، لە کۆڵی کردووە کە ئەو تەمەنی چوار پێنج ساڵان بووە. باوکی دایکم هەموو تەمەنی لە میسر ژیاوە و داپیرەشمی لەوێ بینیوە. داپیرەم لە ئەستەنبولەوە هاتبووە میسر. باپیرەم و داپیرەم لە میسردا ژیاون و هەر لەوێشدا مردن.

*مەسەلەیەکی ئاڵۆزە؟

—بەڵێ، باوکی داپیرەم لە ئەستەنبول قازی بووە. ساڵی ۱۹۰۹ ئەستەنبولی جێهێشتووە و ڕویکردۆتە میسر. لەوێدا باپیرەم دەبینێت و دایکیشم هەر لەوێ لەدایك دەبێت. وا دیارە ئەم

گفتوگۆیەمان تەواو نابێت، ئەوە تا ئێستاش ئێمە هەر لە میسرداین.

*دایك و باوكت چ ساڵێك زەماوەندیان كردووە؟

-١٩٤٥.

*خوشك و براكانت؟

-سێ خوشكم هەیە: "هند" لەدایكبوی ساڵی ١٩٤٧، "لەمیلا" ساڵی ١٩٥٣، "نەدا" ساڵی ١٩٥٧. هەرسێكیان لە فەرەنسان.

*ئەی كوڕەكانت؟

-"ڕوشدی" یاسای لە باریس و لەندەن خوێندووە. "تاریق" حەزی بە *Video special* و هەر ئەوەشی كردۆتە پیشە، "زیاد"یش لە ڕادیۆی پاریس *RFI* ئیش دەكات.

*لە فەرەنسا نیشتەجێیت؟

-بەڵێ، بەڵام بە دایمی لە پاریس نامێنمەوە، شەش مانگ لە پاریسم و شەش مانگەكەی تر لە دوورگەیەكم لە زەریای ئەتڵەسی. ئەڵبەت لەگەڵ هاوسەرەكەمدا، ئاوبەئاویش كوڕەكان سەردانمان دەكەن.

*ئەگەر لە بەیروت بمایتایەتەوە، بەو شێوەیەی ئێستا دەتنوسی؟

-ئەوەی ڕاستی بێت تاقیم نەكردۆتەوە خۆم بۆ ماوەیەكی درێژ گۆشەگیركەم بە مەبەستی نوسین. من ئێستا وا خۆم ڕاهێناوە كە لە شوێنی زۆر تەریك و چەپەكدا بنوسم. ئەستەمە ئێستا خوی خۆم بگۆڕم. كتێب و ڕەفتار و هەروەها لاپەڕەكانم بە خۆمەو لەگەڵ خۆمدایە.

*بە دەست ئەنوسیت یان بە كۆمپیوتەر؟

-هەر لە یەكەمین ڕۆمانمەوە بە كۆمپیوتەر دەنوسم، ئەگەرچی هەندێ جار بەشێك لە ڕۆمانەكانم بەدەست دەنوسمەوە، پاشان پەتادەبەمەوە بەر كۆمپیوتەر.

*كاتێك دەست بە نوسینی ڕۆمانێك دەكەیت، ئایا دەخوێنیتەوە و دەكەویتە سۆراخ و پشكنین؟

-هەر ڕۆمانەو فۆرمی خۆی هەیە. دوو كتێب نیە وەك یەك بن و لەیەك بچن. بۆ نمونە بەر لەوەی (لیۆنی ئەفریقی) بنوسم، "ئیبن بەتوتەم" دەخوێندەوە.

*بە عەرەبی دەتخوێندەوە؟

-بەڵێ، لەماڵەوە ژمارەیەك كتێبی عەرەبیم هەبوو. "ئیبن بەتوتەم"لەبەر شتێك دەخوێندەوە. لەو نوسینەدا پەراوێزێك هەبوو دەڵێت "لیۆنی ئەفریقی" بەدوورو درێژی باسی لەو شتە كردووە. من هەر كاتێك وشەیەكی نامۆ بێتە بەرچاوم دەگەڕێمەوە بۆ فەرهەنگ و لەوێدا بۆی دەگەڕێم. ناتوانم بەسەر وشەیەكدا تێپەڕم، بەبێ ئەوەی لێی بكۆڵمەوە. هەندێ جار لە كاتی نانخواردندا هەڵدەستم بۆ ئەوەی لە فەرهەنگدا بۆ مانای وشەیەك یان مێژووی ڕووداوێك بگەڕێم. سەرەوەختێك ناوی "لیۆنی ئەفریقی"م بیست، كەوتمە گەڕان ▫ زیاتری لەبارەوە بزانم و زۆرتری لەبارەوە بخوێنمەوە. هەر لەیەكەم وشەوە دەربارەی "لیۆنی ئەفریقی" هەستم كرد ئەو بابەتە دڵخوازی منە. شتێك لە بەسەرهاتی ئەودا هەیە كە پەیوەندی بە منەوە هەیەو بۆ من گرنگە. بەمجۆرە ئەم ڕۆمانە لای من دەستی پێكرد.

*یانی بەرێكەوت؟

-بە ڕێكەوت، بێگومان بە ڕێكەوت. بەڵام وەكی ڕێكەوتیش بوو من خۆم بایەخ و گرنگیم پێدا. من بە ڕێكەوت ئەم ناوەم بەرچاو كەوت. ڕۆژانە دووسەد ناو دەبینم، بەڵام تەنها لە ئاست ئەم كارەكتەرەدا هەڵوێستەم كرد.

*كەواتە پەرەت بەم ڕێكەوتە داو كردت بە ڕۆمان. مەبەستێك لەمەدا هەبوو كە پەرە بەو ڕێكەوتە بدەیت و بیكەیتە ڕۆمانێك؟

-ئەڵبەتە مەبەستێك هەبوو، بەڵام مەبەستێكی دیاریكراو نەبوو. دەكرێت بە كورتی بۆتی باس بكەم. من تازە لە لوبنان و لە

فەزای شەڕی ناوخۆی ئەوێ هاتبوومە دەر، بەجۆرێ لە جۆرەکانیش "لیۆنی ئەفریقی" باسی لەو بابەتە دەکرد. لە پاش ڕوخانی غەرناتە، سەد کەسێك بە ناچاری ئەوێ بەجێ دێڵن و ڕوو لە شوێنانی تر دەکەن، "لیۆنی ئەفریقی" لە ئیتاڵیا دەگیرسێتەوەو بە زمانی ئەوێ دەنوسێت. کەواتە، ڕەنگە جۆرە پەیوەندیەك هەبێت.

*یانی لە ڕووی لەیەکچونەوە؟

*کەم تا کورتێك، کاتێك ویستم باس لە ڕوخانی غەرناتەو کۆچ بکەم، خواستم نەبوو ئەو شتانە تۆمار بکەم کە هەستم پێدەکرد، بەلاَم بێگومان ئەم مەبەستە لە پشت نوسینی تەواوی ڕۆمانەکەوە بوو.

*تۆ پەنا بۆ کەلەپوور دەبەیت، ئایا کەلەپوور هەلگەیەنێتە جێگایەك؟

—ئەو پرسیارە لە خۆم ناکەم کە: (دەگەم بە کوێ؟)، مەسەلەگەلێکی دیاریکراو هەیە کە کارم تێدا کردووە، بەلاَم نامەوێت دیاری بکەم کە ئەوانە چییە. لە چوارچێوەی هەست و خواستێکی دیاریکراودا جێی دێڵم و پێموایە ئەوەیە کە ڕێنمایم دەکات و ئاڕاستەم بۆ دیاری دەکات.

*من پرسیارەکانم تەواو بوون، ئەوەی ویستم لە "ئەمین مەعلوف" دەستم کەوت. بەلاَم ڕەنگە چەند پرسیارێکی دیکەش هەبن؟

*(قەیسەر عەفیف: ئەگەر بە کورتی باسی پرۆسەی داهێنانی نوسینمان بۆ بکەیت لای خۆت؟)

—ئەلبەتە من لە ئێستادا ڕۆژانە دەنوسم. پێشتر بەشەودا دەمنوسی. بەلاَم لەو کاتەوەی خۆم بۆ نووسین تەرخانکردووو لە دوورگەیەکی هێمندا بە تەنها پەنامگرت، هەستمکرد ناچار نیم  هەر بەشەودا بنوسم، چونکە لەو شوێنەی لێیدەژیام هەر لە سپێدەوە ئارامی و هێمنی دەستی پێدەکرد. ڕۆژانە سەر لە بەیانی دەچوومە ژوورەکەی خۆم و دەرگام دادەخست. ئەزانم من هەموو ڕۆژێك دەنوسم، گەر بۆ ماوەیەکی کەمیش واز لە نوسین بهێنم، ئەوا دوچاری دڵتەنگی دەبم. ئەگەر لە مانگی حوزەیراندا پەیوەندیەکم بۆ دروست بێت کە ئێمە ئێستا لە شوباتداین، ئەوا واز لە نوسین دێنم. ئەگەر مێشکم بە مەسەلەیەکەوە مژوڵ بێت، ئەوا هەرگیز ناتوانم بنوسم. بۆیە پێویستە هەست بکەم کە هیچ شتێك نامبەستێتەوەو ڕێگیری کارەکانم لێ ناکات.

*یانی حەز بە پەیوەندی ناکەیت و خۆتی لێدەدزیتەوە؟

—زۆر ڕاستە. سەختگیرانە مامەڵە لەگەڵ خۆمدا دەکەم و بە بەرنامە کار دەکەم. یەك شەممان پشوو دەدەم. کە ئەوە تەواو بوو دەچمەوە ژوورەکەم و دەست بە نوسین دەکەمەوە.

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی (النهار)، بەرواری ٣/٧/٢٠٠٣.

# سپینۆزای شەقامی ناو بازاڕ

ئایزاك باشیڤز سینگەر

لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف

دکتۆر (ناحووم فیشلسن) لە ژوورەکەیدا کە لە بەشی سەرەوەی ماڵەکەبوو؛ پیاسەی دەکرد. پیاوێکی کورتە باڵای پشت کۆمی ریش سپی بوو، سەریشی بە تەواوی رووتا بووەوە، بێجگە لە چەپکێك قژ کە بە پشتی ملییەوە مابوو. لووتی هێندەی دەنووکی باڵندەیەك گێڕ بوو، چاوە زلە ڕەشەکانی وەکو چاوی باڵندەیەکی زل هەمیشە لە سووڕانەوەدا بوون، ئێوارەیەکی گەرمی هاوین بوو، بەلام دکتۆر پاڵتۆیەکی رەشی لەبەردا بوو کە دەگەیشتە ئەژنۆی، هەروەها کراسێکی یەخە رەق و بۆینباخێکی لەسەر بەستبوو. بەهێواشی لە دەرگاکەوە بەرەو پەنجەرە بەرزەکەی دیوارە لارەکە دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە. ئەگەر یەکێك بیویستایە لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە بکات، دەبوایە دوو سێ پایە سەر بکەوێت. مۆمێك لە مۆمدانێکی مسدا لەسەر مێزەکە دەسووتا و جۆرەها مێش و مەگەز بە دەوری گڕەکەیدا دەخولانەوە. هەندێکیان زۆر لێی نزیك دەبوونەوەو گڕەکە باڵەکانیان یان خۆیانی دەسوتاند. کە ئەمە روویدەدا، دەموچاوی گرژ دەکرد. روخسارە چرچەکەی گرژ دەبوو، دەکەوتە گەستنی لێوی لە ژێر سمێڵە بژەکەیەوە. پاشان لە گیرفانییەوە دەستەسرێکی دەرکرد و کەوتە راوەشاندنی بۆ مێرووەکان. بە سەرزەنشتکردنەوە هاواری لێدەکردن: "لاچن لێرە گەمژەی نەفامینە، بەمە گەرم نابنەوە، تەنها خۆتان دەسووتێنن."

مێش و مەگەزەکە بلاوەیان لێدەکرد، بەلام دوای چرکەیەك دووبارە لە دەوری گڕە کزەکە کۆدەبوونەوە. دکتۆر (فیشلسن) ئارەقی ناوچەوانە لۆچاوییەکەی دەسڕییەوەو هەناسەیەکی هەڵدەکێشا. (وەکو مرۆڤ وان، تەنها خۆشیی ئەو چرکە ساتەیان دەوێت). لەسەر مێزەکە کتێبێکی کراوەی لێبوو بەلاتینی نووسرابوو، کە لە پەراوێزیدا دکتۆر (فیشلسن) بە خەتێکی ورد، تێبینی و بۆچوونی خۆی لەسەر نووسیبوو. ئەم کتێبە، کتێبی (ئاکار)ی (سپینۆزا) بوو، دکتۆر (فیشلسن) سی ساڵ بوو لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرد. هەموو گریمانەکان،

هەموو سەلماندنەکان، هەموو بەڵگەنەویست و سەلمێنراوەکان، هەموو تێبینییەکانی لەبەر بوو. ئەگەر بیویستایە سەیری بڕگەیەك بکات یەکسەر دەیدۆزییەوە، بێئەوەی بۆی بگەڕێت. لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو ڕۆژێك، زەڕەبینەکەی بەدەستە چرچ و ڕەقەکەی دەگرت و ڕۆژانە بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەر خوێندنەوەی کتێبی ئاکار بەردەوام دەبوو، دەیبۆڵاند و لەگەڵ هەندێك بڕگەدا سەری قایلبوونی ئەلەقاند. ڕاستییەکەی ئەوە بوو لەگەڵ خوێندنەوەی زیاتردا ڕستەی سەرسووڕهێنەری زیاتر و بڕگەی ناڕوون و تێبینی پەنهانی زیاتری دەدۆزییەوە. هەموو ڕستەیەك ئاماژەی ئەرتۆی تێدابوو، کە هیچ کەس لە قوتابیانی (سپینۆزا) نەگەیشتبوونە قووڵاییەکەی. لە ڕاستیدا (سپینۆزا) پێشبینی هەموو ئەو ڕەخنانەی کردبوو کە (کانت) و لایەنگرانی لەبارەی ئەقڵی پەتییەوە باسیان دەکرد.

دکتۆر (فیشلسن) تێبینی لەسەر کتێبی ئاکار دەنووسی. چەکمەجەکانی پڕ بوون لە ڕەشنووس و تێبینی، بەڵام لەوە نەدەچوو بتوانێت هەرگیز ئەم کارەی تەواو بکات. ئەو نەخۆشییەی گەدەی کە زۆر بێزاری کردبوو، ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو خراپتر دەچوو. وای لێهاتبوو پاش چەند پارووییەك یەکسەر گەدەی تێکدەچوو. "ئای خوایە گیان، ئەمە ستەمە، زۆر ستەمە" ئەم ڕستەیەی بە هەمان تۆنی دەنگی خوالێخۆشبووی باوکی، (رابیی تیشیڤتز)، لەو کاتانەدا بەخۆی دەووت.

دکتۆر (فیشلسن) لە مردن نەدەترسا. بەر لە هەموو شتێك، لاوێتیی بەسەرچوو بوو. دووەم، لەبەشی چوارەمی کتێبی ئاکاردا هاتووە "پیاوی ئازاد لە مردن کەمتر بیرناکاتەوە، ئەم داناییەشی رامان نییە لە مردن، بەڵکو ڕامانە لە ژیان"، سێیەم، هەروەها لە کتێبەکەدا هاتووە "مێشکی مرۆڤ لەگەڵ مردنی جەستەدا نافەوتێت بەڵکو بەشێکی بە نەمری دەمێنێتەوە". لەگەڵ ئەوەشدا، نەخۆشییە خۆرەکەی گەدەی (لەوانەشە شێرپەنجە بێت) بەردەوام هەراسانی دەکرد. هەمیشە زمانی توێخێکی بەسەرەوە بوو. بەردەوام قرقێنەی دەدا و لەگەڵیدا گازێکی بۆن ناخۆشی بەردەدا. ژانە سك و دڵە کزێیشی هەبوو. هەندێجار هەستی بە ڕشانەوە دەکرد، جاری واش هەبوو ئارەزووی خواردنی سیر و پیاز و خواردنی باشی دەکرد. دەمێك بوو وازی لەو دەرمانانە هێنابوو کە پزیشکەکان بۆیان نووسیبوو و خۆی چارەسەری خۆی دەکرد. بۆی دەرکەوت کە خواردنی تووری هاڕراو پاش ژەمەکان و ڕاکشان لەسەر گەدە و بەرزکردنەوەی سەر بەلایەکدا سوودی هەیە، بەڵام ئەم کارە تەنها چارەسەرێکی کاتیی پێدەبەخشی. هەندێك لەو پزیشکانەی کە سەردانی کردبوون، دەیانووت هیچی نییە و "هەتا سەدساڵی دەژێت". بەڵام لەم ئێوارە گەرمەدا، دکتۆر (فیشلسن) هەستیدەکرد کە هێزی جەستەی لە کزبووندایە. ئێسقانەکانی دەلەرزین و لێدانی دڵی سست بوو. دانیشت بۆئەوەی بخوێنێتەوە، بەڵام بەرچاوی لێڵ بوو. ڕەنگی پیتەکان لە شینەوە، گۆڕان بۆ ئاڵتوونی. دێڕەکان تێکەڵی یەکتر بوون و بەسەریەکدا بازیان دەدا و پاشان بۆشاییەکی سپییان بەجێدەهێشت و بەشێوەیەکی ئاشیار ونەبوون.

گەرماکسە لە ووزە بەدەربوو و دەتووت ڕاستەوخۆ لە بنمیچە تەنەکەکەوە دەڕژێت. دوکتۆر (فیشلسن) هەستیدەکرد کە لەناو تەنوورێکدایە، چەند جارێك بەسەر پێپەکانی بەردەم پەنجەرەکە سەرکەوت و سەری خستە بەر شەماڵی فێنکی ئەو ئێوارەیە. ئەوەندە لەوێ دەوەستا هەتا ئەژنۆکانی دەکەوتنە لەرزین.

"ئای کە شەماڵێکی فێنکە" لەبەرخۆیەوە دەیوت، "بەڕاستی خۆشە". ئینجا ئەوەی بیردەهاتەوە کە بە پێی (سپینۆزا) ئاکار و خۆشی هاوتای یەکترین و باشترین کردەوەی ئاکاری ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی شل بکات بۆ ئەو خۆشییانەی پێچەوانەی ئاکار نین.

-٢-

کاتێك دوکتۆر (فیشلسن) لەسەر پایەی سەرەوەی بەر پەنجەرەکە ڕاوەستابوو سەیری دەرەوەی دەکرد، دەیتوانی دوو جیهان ببینێت. لەسەرەوە ئاسمان بە چڕی بە ئەستێرە داپۆشرابوو. هەرچەند دوکتۆر (فیشلسن) ئەستێرە ناسیی نەخوێندبوو، جیاوازی نێوان هەسارەکان، کە وەکو زەوی بە دەوری هەتاودا دەسووڕێنەوەو ئەستێرە چەسپاوەکانی دەزانی، کە خۆی لە خۆیاندا کۆمەڵە هەتاوێکی زۆر دوورن و تیشکەکانیان پاش سەد ساڵ یان تەنانەت هەزار ساڵ پێمان دەگات. هەروەها هەوتەوانەی دەناسییەوە کە دەستنیشانی ڕێگەی زەوی دەکات، لەو پشتێنە ناڕوونەی کە پێی دەوترێت ڕێگەی کاکێشان. دوکتۆر (فیشلسن) تەلیسکۆپێکی بچووکی هەبوو کە لە کاتی خوێندنی لەسویسرا کڕیبووی، زۆر حەزی دەکرد بەو تەلسکۆپە سەیری مانگ بکات، بە باشی لەسەر ڕووی مانگ گڕکانەکانی بەرهەتاو چاڵە تاریکەکانی مانگی دەناسییەوە. هەرگیزماندوو نەدەبوو لە سەیرکردنی ئەو چاڵ و چۆڵانەی لەسەر مانگ هەبوون. لای ئەو هەم لە نزیك و هەم لە دوور، هەم لە قەبارە دار و هەم بێ قەوارە دەچوون. ناو بەناو ئەستێرەیەکی بەدی دەکرد کە دادەچۆڕاو نیشانەیەکی گڕداری بەدوای خۆیدا بەجێدەهێشت و ونده‌بوو. ئەوسا دوکتۆر (فیشلسن) دەیزانی کە ئەستێرەیەك کشاوەو گەیشتۆتە بەرگە هەوای دەوری، لەوانەشە بەشە نەسووتاوەکەی کەوتبێتە ناو زەریاوە، یان بیابانێك یان تەنانەت ناوچەیەك کە دانیشتوانی تێدا بێت. ئەستێرەکان کە لە بەشی پشتەوەی سەربانەکەی دوکتۆر (فیشلسن)ەوە دەرکەوتبوون، بەرەبەرە بەرزبوونەوە هەتا گەیشتنە سەر ماڵەکانی سەر شەقامەکە. دوکتۆر (فیشلسن) سەیرێکی ئاسمانی کرد و ئاگاداری مەودای بێکۆتایی بوو کە بەپێی (سپینۆزا)، یەکێکە لە دامێنانەکانی خوا. دوکتۆر (فیشلسن) دڵی بەوە خۆش بوو کە دەیزانی هەرچەندە مرۆڤێکی بچووك و بێهێز بوو، بەڵام بەشێك بوو لە مادەیەکی تەواو بێسنوور، کە بەشێکە لە گەردوون، لە هەمان مادەی تەنە ئاسمانییەکان، لەوانەیە بەشێك بێت لە سەری خوا. دەیزانی کە لەناو ناچێت. دوکتۆر لەم حاڵەتانەدا ئەزموونی (خۆشەویستی ڕۆشنبیرانەی خوا *Amor Die IBteellectualis*) دەکرد، کە بەپێی فەیلەسووفێکی ئەمستردام، نموونەی بێگەردی و کامڵی مێشکە. هەناسەیەکی قووڵی کێشاو ئەوەندەی یەخە ڕەقەکەی بواری بدات، سەری بەرزکردەوە، هەستیکرد لەگەڵ زەوی و هەتاو و ئەستێرەکانی ڕێی کاکێشاندا دەخولێتەوە، کە میوانی ئەستێرەکانە. ئەمەش تەنها مێشکێکی ڕەها پێیدەزانێت. قاچەکانی سووك و بێ کێش بوون و لە ترسا بە هەردوو دەست چوارچێوەی پەنجەرەکەی گرت وەکو ئەوەی بترسێت نەوەکو بفڕێتە ناو ئەبەدیەت.

پاش ئەوەی دوکتۆر (فیشلسن) ماندوو بوو لە چاودێریکردنی ئاسمان، سەرنجی شەقامی خوارەوەی دا. دەیتوانی ریزێك ببینێت کە لە بازاڕی یانۆشەو بەرەو شەقامی ئاسنگەران کە تیایدا چرا گازییەکان وەکو ریزە خاڵێکی ئاگرین دەردەکەوتن. دووکەڵ لە

دوکەڵکێشەکانەوە بەرز دەبووەو بەسەر سەریانە تەنەکە ڕەشەکاندا بڵاودەبووەوە: نانەواکان تەنوورەکانیان گەرم دەکرد و پریشکی ئاگر تێکەڵاوی دووکەڵی ڕەش دەبوو. وەکو هەموو ئێوارەیەکی هاوین، شەقامەکە قەرەباڵغ و پڕ لە دەنگە دەنگ بوو. دز و سۆزانی و فرۆشیاری شتی دزراو کە لە گۆڕەپانەکەدا دەسووڕانەوە کاتێک کە لە سەرەوە سەیرت دەکردن دەتوت تۆوی خەشخاشن لەسەر مەزەی پریتزل بڵاوکراونەتەوە. کوڕە گەنجەکان بە دەنگێکی گڕ پێدەکەنین و کچەکان دەیانقیژاند، دەستگێڕێک کە بەرمیلێکی بچووکی شەربەتی لیمۆی پێبوو قیژەکەی تێکەڵی دەنگە دەنگەکە کرد.

شوتی فرۆشێک بە دەنگێکی ناخۆش دەیقیژاند و چەقۆیەکی زلی بەدەستەوە بوو کە شیلەیەکی سووری خوێن ئاسای لێ دەتکا. ناو بە ناو شەقامەکە زیاتر دەخرۆشا. ئامێرێکی ئاگرکوژێنەوەی، کە چەرخە قورسەکانی تەقەتەقی دەهات، تێدەپەڕی و دوو ئەسپی ڕەشی بەهێز ڕایان دەکێشا و ئەسپەکان زۆر بە توندی لغاوکرابوون، بۆ ئەوەی بەلەسە نەبن. دوای ئەوە ئەمبولانسێک دێت و دەنگی فیکەکەی دێت. دوای ئەوە چەند شەقاوەیەک شەڕ دەکەوێتە بەینیان و دەبێت پۆلیسیان بۆ بانگ بکرێت. ڕێبوارێک دزرابوو و هاواری یارمەتیی دەکرد، گالیسکەیەک پڕ لە داری سووتاندن دەیەویست بچێتە گۆڕەپانەکە بۆ لای نانەواخانەکان، بەڵام ئەسپەکان نەیاندەتوانی بە هەورازەکەدا سەرکەون و لێخوڕەکانیان ڕەشمەکانیانی ڕادەکێشا و بەتوندی بەقامچی لێیان دەدان. پریشک لە سمی ئەسپەکانەوە هەڵدەسا. ئێستا زۆر لە دوای سەعات حەوتی ئێوارە بوو کە میری دایابوو بۆ داخستنی دووکانەکان، بەڵام کار تازە دەستی پێکردبوو. کڕیارەکان بە دزییەوە، لە دەرگای پشتەوە، دەبرانە ژوورێ. پۆلیسە رووسەکەی سەر شەقامەکە، کە پارەیەکی باشی پێدرابوو، چاوپۆشینی لەمە دەکرد. بازرگانەکان خەریکی ساغکردنەوەی کاڵاکانیان بوون و دەیانویست هات و هاوارەکانیان بەسەر یەکتردا زاڵ بێت.

"زێڕ، زێڕ، زێڕ" ژنێک کە پرتەقاڵی بۆگەنی دەفرۆشت دەیقیژاند: "شەکرە، شەکرە، شەکرە" فرۆشیارێکی هەڵووژەی زۆر گەیوو هاواری دەکرد. منداڵێکی فرۆشیاری سەری ماسی هاواری دەکرد: "سەر، سەر، سەر."

لە پەنجەرەی خوێندنەوەی قوتابخانەیەکی ئایینیدا، دوکتۆر (فیشلسن) هەندێک گەنجی زوڵف درێژی بینی کە سەریان بادەداو بە دەنگێکی بەرز و بە ئاوازەوە سەرقاڵی خوێندنەوە بوون. لە مەیخانەکەی خوارەوە، قەساب و حەماڵ و میوەفرۆش، خەریکی خواردنەوەی بیرەبوون. لە دەرگا کراوەی مەیخانەکەوە هەڵم، وەکو گەرماو، دەهاتە دەر. لە دەرەوەی مەیخانەکە، هەندێک ڕێبواری سەر شەقامەکە پەلاماری سەربازە سەرخۆشەکان و ئەو کرێکارانەیان دەدا، کە بەرەو ماڵەوە دەگەڕانەوە. هەندێ کەس گوریزە داریان لەسەر شانیان هەڵگرتبوو، ئەمەش ئەوەی بە بیر دوکتۆر (فیشلسن) هێنایەوە کە لە دۆزەخدا کەسانی بەدکار دەبێت خۆیان سووتەمەنی ئاگرەکانیان دابین بکەن. ڕێکۆردەکان دەنگە ناسازەکانیان دەڕشتە ناو شەقامەکە. گۆرانیی هێمنی کەنیسەیی، تێکەڵ بە هەراو بەزمی گۆرانی میللی دەبوو.

دوکتۆر (فیشلسن) سەرنجێکی ئەم شێتخانە نیمچە ڕووناکەی داو هەردوو گوێی داپۆشی. دەیزانی ڕەفتاری ئەم قەرەباڵغییە دژی ئەقڵە. ئەم خەڵکە نوقمی سۆزێکی بێهوودە بوون، هەستیان سەرخۆشی کردبوون. بەپێی (سپینۆزا)ش هەست و سۆز هەرگیز باش

نەبووە. لەبری ئەو خۆشییەی کە بۆی دەگەڕان، تەنها نەخۆشی و بەندیخانە و ئازار و ئابڕوو چوونیان چنگ دەکەوت، ئەمەش بەهۆی نەفامییان بوو. تەنانەت پشیلەکانی ئەم ناوە، کە بە سەربانەکاندا دەگەڕان، لە پشیلەکانی بەشەکانی تری شار درتر و هەستیارتر بوون. دەنگیان لە دەنگی ژنێک دەچوو کە لە منداڵبووندا بێت، وەکو جنۆکە بەدیوارەکاندا هەڵدەگەڕان و خۆیان دەهاویشتە بالکۆن و گۆسەبانەکان، یەکێک لە پشیلەکان خۆی هەڵدایە پەنجەرەکەی دوکتۆر (فیشلسن) و قیژەیەکی کرد کە لەرزی لە دوکتۆر (فیشلسن) هێنا. دوکتۆر (فیشلسن) لە پەنجەرەکە دابەزی و دەستی دایە گەسکێک، لەبەردەم پشیلە چاو بریسکەدارەکە ڕایوەشاند.

"بڕۆ، دوور بکەوە، هەی وەحشی نەزان!" — ئەوەندەی بە پەنجەرەکەدا ماڵی هەتا پشیلەکە دوورکەوتەوە.

کاتێک دوکتۆر (فیشلسن) خوێندنی فەلسەفەی لە زیوریخ تەواو کرد و گەڕایەوە بۆ وارشۆ، پێشبینی پاشەڕۆژێکی مەزنی بۆ دەکرا. هاوڕێکانی دەیانزانی کە خەریکی نووسینی کتێبێکی گرنگە لەسەر (سپینۆزا). گۆڤارێکی جوولەکەی پۆڵەندی داوای لێکرد کە بەشداری تێدا بکات. میوانداریی زۆر خێزانی دەوڵەمەندی دەکرد. کەنیشتی جوولەکەکان کردیانە بەپرسی کتێبخانەکەی. هەرچەند تەنانەت ئەوساش بەرەبەنێکی تەمەن گەورە دادەنرا، ئەوانەی ژن دەدۆزنەوە پێشنیازی ژمارەیەک کچی دەوڵەمەندیان بۆ کرد. بەڵام دوکتۆر (فیشلسن) سوودی لەم پێشنیازانە وەرنەگرت. دەیویست ئەویش وەکو (سپینۆزا) سەربەخۆ بێت، هەر واشی لێهات. بەڵام بەهۆی کافرییەوە لەگەڵ (رابی)دا تووشی کێشە بوو و ناچاریان کرد کە واز لە پۆستی بەڕێوەبەری کتێبخانە بهێنێت.ساڵەها دوای ئەوە، ناچار بوو بژێوی خۆی لە ڕێگەی وتنەوەی وانەی تایبەت بە زمانی ئەڵمانی و عیبری پەیدا بکات.

پاشان کە نەخۆش کەوت جڤاتی جوولەکەکانی بەرلین، ساڵانە پێنجسەد مارکیان بۆ بڕیەوە، ئەمەش بەهۆی ڕوو لێنانی دوکتۆر (هێلدە شەیمن)ەوە کە لەگەڵیدا ئاڵوگۆڕی نامەی هەبوو دەربارەی فەلسەفە. بۆئەوەی بتوانێت بە مووچە کەمەکەی بژی، دوکتۆر (فیشلسن) ژوورێکی لە بەشی سەرەوەی ماڵێک بەکرێ گرت و لەسەر تەباخێکی نەوت ژەمەکانی خواردنی بۆ خۆی لێدەنا. دۆڵابێکی هەبوو ژمارەیەکی زۆری چەکمەجەی تێدا بوو کە ئاخنرابوون بە جۆرەها خۆراک، وەکو برنج و جۆ و گەنمی ڕەش و پیاز و پەتاتەو گوێزەر و قارچک. هەفتەی جارێک، دوکتۆر (فیشلسن) شەپقە ڕەشە لێوار پانەکەی لەسەر دەکرد و بە دەستێک سەبەتەیەک و بە دەستەکەی دیکەی کتێبی ئاکاری (سپینۆزا)ی دەگرت و دەچووە بازاڕ بۆ کڕینی پێویستییەکانی. کاتێک چاوەڕوانی نۆرەکەشی دەکرد، کتێبەکەی دەکردەوە. بازرگانەکان دەیانناسی و فەرموویان لێدەکرد بێتە پێشەوە.

"پەنیرێکی زۆر باشە، دوکتۆر، لە دەمتدا دەتوێتەوە".

"قارچکێکی تازەیە، دوکتۆر، ڕاستەوخۆ لە دارستانەکانەوە هاتووە".

"ڕێگە بکەنەوە، بۆ دوکتۆر، خانمان،" قەسابەکە دەیقیژاند "تکایە ڕێگاکە مەگرن".

لە سەرەتای نەخۆشییەکەیدا، دوکتۆر (فیشلسن) هێشتا ئێواران دەچوو بۆ قاوەخانەیەک و لەوێ زۆر جار چاوی بە هەندێک مامۆستای زمانی عیبری و ڕۆشنبیری تر دەکەوت. گرنبوویە خوو لەوێ دابنیشێت و نیو کووپ قاوەی ڕەش بخواتەوەو یاری شەترەنج

بکات. هەندێجاریش سەری لە کتێبفرۆشەکانی شەقامی خاچی پیرۆز دەدا و لەوێ کتێب و گۆڤاری هەرزانی بەدەستدەکەوت. جارێکیان قوتابییەکی کۆن لە چێشتخانەیەکدا کۆبوونەوەیەکی لەگەڵدا ڕێکخست. کاتێک دوکتۆر (فیشلسن) گەیشت تووشی سەرسوڕمان بوو کە بینی کۆمەڵێک هاوڕێ و ڕێزلێگرەکانی لەوێن و ناچاریانکرد لە سەرڕووی مێزەکە دابنیشێت و گوێ لەو وتار و پێداهەڵدانانە بگرێت کە لەبارەیەوە دەوتران. بەڵام، ئەم شتانە زۆر دەمێکە ڕوویانداوە. ئێستا ئیتر کەس بایەخی پێ نادات. ئێستا بە تەواوی لە خەڵک دابڕاوەو بووەتە پیاوێکی لەبیر کراو. ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٠٥، کاتێک گەنجانی شەقامی ناو بازاڕ خۆپیشاندانێکیان ڕێکخست و بۆمبایان گرتە پۆلیس و پیاوانی ئاسایش و دووکانەکان داخران، دابڕانەکەی زۆر زیاتر کرد. وای لێهاتبوو ڕقی لە هەموو شتێک بێت کە پەیوەندیی بە جوولەکەی مۆدێرنەوە هەبێت — وەکو زایۆنیزم و سۆشیالیزم و ئانارشیزم. ئەو گەنجانەی پەیوەندییان بەم بۆچوونانەوە هەبوو، بە کۆمەڵێک ئاژاوەچی دادەنان کە دەیانویست کۆمەڵگا تێکبدەن — کۆمەڵگایەک کە بەبێ ئەو بوونێکی ئەقڵانی نەشیاو بوو. هێشتا ناو بەناو گۆڤارێکی بە زمانی عیبری دەخوێندەوە، بەڵام ڕقی لە عیبریی مۆدێرن بوو کە هیچ ڕەگ و ڕیشەیەکی لە ئنجیل یان مشنا نەبوو. هەروەها ڕێنووسی وشە پۆلەندییەکانیش زۆر گۆڕابوو. دوکتۆر (فیشلسن) گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی ئەوانەی ناوی خۆیان ناوە کەسانی ئایینی، وازیان لە ئەقڵ هێناوەو بە هەموو توانایانەوە هەوڵدەدەن دەلاڵی بۆ خەڵکە ناشووبگێڕەکە بکەن. هێشتا ناو بەناو سەری لە کتێبخانەکان دەدا و لاپەڕەکانی مێژووی مۆدێرنی فەلسەفەی هەڵدەداوە، بەڵام بۆی دەرکەوت کە پرۆفیسۆرەکان هیچ لە سپینۆزا تێنەگەیشتوون و بەهەڵە قسەکانی دەگێڕنەوەو بۆچوونە تێکەڵ و پێکەڵەکەی خۆیان تێکەڵاوی بۆچوونەکانی ئەو فەیلەسووفە دەکەن. هەرچەند دوکتۆر (فیشلسن)دەیزانی، تووڕە بوون هەست و سۆزێکە شایانی ئەو کەسانە نییە کە لەسەر ڕێگەی ئەقڵ ئەڕۆن، بەڵام خۆی زۆر تووڕە دەبوو و کتێبەکەی دادەخست و تووڕی هەڵدەدا. "گەمژە" لەبەرخۆیەوە دەیگوت، "کەر، نەدی و بەدی" ئینجا سوێندی دەخوارد ئیتر سەیری فەلسەفەی مۆدێرن نەکات.

هەموو سێ مانگێک، پۆستەچییەک، کە ئیشی دابەشکردنی پارەی نێردراو بوو، هەشتا ڕۆبڵی بۆ دوکتۆر (فیشلسن)دەهێنا. لە سەرەتای مانگی تەمووزدا چاوەڕوانی ئەو پارەیە بوو. بەڵام کاتێک ڕۆژ دوای ڕۆژ تێدەپەڕی و پیاوە درێژە سمێڵ زەردەکە، خاوەن قۆپچە بریسکەدارەکان دیار نەکەوت، دوکتۆر (فیشلسن) تووشی نیگەرانی بوو. تەنها چەند گرۆشێکی پێ مابوو. کێ ئەزانێ — ئەشێ جڵاتەکەی بەرلین یارمەتییەکەیانی بڕیبێت، یان لەوانەیە دوکتۆر (هیلدەشایمەر) خوانەخواستە، مردبێت. لەوانەیە بەڕێوەبەرایەتی پۆستە هەڵەی کردبێت. هەموو ڕووداوێک هۆکاری خۆی هەیە، دوکتۆر (فیشلسن) ئەمەی دەزانی. هەموو شتێک بڕیاری لەسەر دراوە، هەموو شتێک پێویستە، پیاوی ئاقڵ پێویست بەوە ناکات تووشی مەراق بێت. لەگەڵ ئەوەشدا، مەراق هێرشی کردە سەر مێشکی و وەکو مێش بە دەوریدا گێژەیان دەکرد. ئەگەر تووشی ناخۆشترین شت بوو، ئەوسا خۆی دەکوژێت. بەڵام بیری کەوتەوە کە (سپینۆزا) خۆکوشتنی پەسەند نەکرد و ئەو کەسانەی کە خۆیان دەکوشت بەشێتی دادەنان.

ڕۆژێک،کاتێک دوکتۆر (فیشلسن) چوو بۆ فرۆشگایەک بۆ کڕینی دەفتەرێکی داڕشتن،

گوێی لێبوو کە خەڵك باسی جەنگ دەکەن، لە شوێنێکی سیربیا زەلامێك شازادەی نەمسای کوشتبوو، نەمساش هەڕەشەی لە سیربیا کردبوو. خاوەنی فرۆشگاکە، کە گەنجێکی ریش زەردی بێیار بوو، وتی: "لەوانەیە جەنگێکی بچووکمان هەبێت." ئامۆژگاری دوکتۆر (فیشلسن)ی کرد کە زەخیرە بخات، چونکە لەوانەیە بەمزووانە تووشی کەمی خۆراك بن.

شتەکان زۆر بەخێرایی روویاندا، تەنانەت هێشتا بڕیاری ئەوەی نەدابوو کە ئایا ئەمێنێت چوار گرۆش بدات بە رۆژنامەیەك، جۆرەها پۆستەر هەڵواسرابوون بۆ جاڕدانی رەشبگیری، پیاوان لە شەقامەکانیدا دەبینران نیشانەیەکی کانزاییان بە بەرۆکەوە بوو وەکو ئاماژەیەك کە بە سەربازی گیراون، ژنەکانیان بەگریانەوە کەوتبوونە دوایان. رۆژێکی دووشەمە، کاتێك دوکتۆر (فیشلسن) دابەزییە شەقامەکە بۆ کڕینی خۆراك بەو چەند کوپیکەی کە پێی مابوو، فرۆشگاکانی بە داخراوی بینی. خاوەنی دوکانەکان و ژنەکانیان لە دەرەوە وەستابوون باسی ئەوەیان دەکرد کە شتومەکی بازرگانی بە دەست ناکەوێت. بەڵام هەندێك کڕیاری تایبەت دەبرانە لاوەو لە دەرگای پشتەوە دەخرانە ژوورەوە. شەقامەکە پڕ بوو لە پاشاگەردانی. پیاوانی پۆلیس بە شیری رووتەوە بە ئەسپ دەگەڕان. خەڵکانێکی زۆر لەبەردەم مەیخانەکاندا کۆببوونەوە، چونکە قەیسەر فەرمانی دابوو هەرچی ویسکی مەیخانەکانە دەبێت برژێتە ئاوەڕۆکانەوە.

دوکتۆر (فیشلسن) چووە قاوەخانە کۆنەکەی. لەوانەیە لەوێ ئاشنایەکی بەرچاو بکەوێت کە بتوانێت ئامۆژگاریی بکات. بەڵام کەسی بەرچاو نەکەوت. بڕیاری دا بچێتە لای (ڕابی) ئەو کەنیشتەی کە سەردەمێك بەڕێوەبەری کتێبخانەکەی بوو، بەڵام مجەوەرە کلاو شەش لاکە پێی ڕاگەیاند کە (رابی) و خێزانەکەی دەرچوون بۆ گەڕاوێك. دوکتۆر (فیشلسن) هاوڕێی دیکەی لە شارەکەدا هەبوو، بەڵام کەسیان لە ماڵەوە نەبوون. ئەوەندە گەڕابوو قاچی دەیەشاو پەڵەی سەوز و رەش دەهاتنە بەرچاوی و خەریکبوو بیووڕێتەوە. تۆزێك وەستا بۆ ئەوەی گێژییەکەی لاچێت. خەڵکەکە خۆیان لێدەدا. قوتابییەکی کچی چاوڕەش هەوڵیدا پارەی بداتێ.

هەرچەند شەڕ تازە دەستپێکردبوو، بەڵام سەرباز دەبینران بە جلی تەواوی جەنگەوە — هەندێکیان خۆڵاوی و هەتاو بردبوونیەوە، مەتارەیان کردبوو بەلاداو ریزێك فیشەکیان بەستبوو بە سنگەوە، قەمەی سەر تفەنگەکانیان بریسکەیەکی ساردی سەوزی لێدەهات. لەگەڵ پیاوەکاندا تۆپەکان هاتن کە هەریەکەیان هەشت ئەسپ رایدەکێشان، لوولە ڕەشەکانیان ترسێکی غەمناکی لێ هەڵدەستا. دوکتۆر (فیشلسن) هێڵنجی هات. گەدەی دەیەشاو پیخۆڵەکانی خەریکبوو بتەقن، ئارەقی سارد بە رووخساریدا هاتە خوار.

"من دەمرم" بیری کردەوە، "ئەمە کۆتاییمە". لەگەڵ ئەوەشدا، بەزەحمەتێکەوە خۆی بگەیێنێتە ماڵەوەو لەسەر چەرپایە ئاسنەکەی رابکشێت.

بۆ ماوەیەك هەناسەبڕکێی بوو. دەبێ خەوی لێکەوتبێت، چونکە خەونی بەوەوە دی کە گەڕاوەتەوە بۆ شارەکەی خۆی، شاری تیشفتز. قورگی دەیەشاو دایکی گۆرویەکی پڕکراو لە خوێ لە دەوری ملی دەماڵی. گوێی لە قسەکردنێك بوو لە ماڵەکەدا، شتێك دەربارەی مۆمێك و لە بارەی ئەو بۆقەی کە گازی لێگرتبوو دەوترا. دەیەویست بچێتە دەرەوە بەڵام نەیاندەهێشت چونکە رێپێوانێکی کاسۆلیکەکان بەو ناوەدا تێدەپەڕی. پیاوانی

جبە درێژ تەوری دوودەمیان بە دەستەوە گرتبوو، ئاوی پیرۆزیان دەپرژاند بە خەڵکاو بەلاتینی سروودیان دەوت. خاچەکان دەبریسکانەوە، وێنەی کەسایەتییە پیرۆزەکان بەرزکرابوونە ئاسمان. بۆنی بخورد و مردوو دەهات. لە پڕێکدا رەنگی ئاسمان سوور هەڵگەڕاو هەموو دونیا دەستیکرد بە سووتان. زەنگەکان کەوتنە لێدان و خەڵکەکە شێتانە بەو ناوەدا ڕایاندەکرد. پۆلێک باڵندە بە نزمی دەفڕین و دەیانزیقاند. دوکتۆر (فیشلسن) داچڵەکی و لە خەو هەستا. لەشی لە ئارەقە نیشتبوو و قوڕگی ئێستا بەڕاستی دەیەشا. ویستی لەم خەوە نائاساییە رابمێنێت بۆ ئەوەی پەیوەندییەکی ئەقڵانی بدۆزێتەوە لەگەڵ ئەو بارەی کە تێیدایە و بۆ تێگەیشتنی لەگەڵ باری هەمیشەییدا (*Sub Specie eternitatis*)، بەڵام هیچ مانایەکی نەدۆزییەوە. "بەداخەوە، مێشکم دەفەری شتی بێمانایە" دوکتۆر (فیشلسن) بیری کردەوە، "ئەم سەر زەمینە هی پیاوی شێتە."

جارێکی تر چاوی نوقاندەوە، جارێکی تر خەوی لێکەوتەوە، جارێکی تر خەونی بینی.

—٥—

دیار بوو یاسا هەمیشەییەکان، هێشتا بڕیاری کۆتایی دوکتۆر (فیشلسنیان) نەدابوو. لەلای چەپی ژوورەکەی کە بەسەر داڵانێکی تاریکدا دەیڕوانی، پڕ بوو لە سندوق و سەبەتە و هەمیشە بۆنی سابوونی جلشۆری و ڕۆن و پیازی لێدەهات. لەولای ئەمانەوە قەیرە کچێك دەژیا کە دراوسێکانی پێیاندەوت (دۆب)ە رەش. (دۆب) درێژێکی لاوازبوو، ڕەش وەکو خاکەنازی نانەواکان، لووتێکی شکاوەی هەبوو و لێوی سەرەوەی سمێڵی لێ ڕووابوو. بە دەنگێکی زبری پیاوانە قسەی دەکرد و پێڵاوی پیاوانەی لەپێدەکرد. ساڵانێك بوو نان و مارە مارەو خەپلەی لە نانەواخانەکەی بەر دەرگا دەکڕی و دەیفرۆشتەوە.

ڕۆژێکیان لەگەڵ خاوەنی نانەواخانەکە بوو بە شەڕی و پیشەکەی گواستەوە بۆ ناو بازاڕ. ئێستا شتێك دەفرۆشێت کە پێی دەڵێن "ژاکارەکان" — کە هاوواتایە لەگەڵ هێلکەی درزبردوودا. (دۆب)ە ڕەش بەختی لەگەڵ پیاواندا نەبوو. دوو کەڕەت مارەکرا لەگەڵ شاکردی نانەواخانەکاندا، بەڵام هەردووجار پەشیمان بوونەوە. دوای ئەوە پەیوەندیەکی هاوسەرگیری لە پیاوێکی پیری شووشەچییەوە بۆ هات کە دەیگوت ژنەکەی تەڵاقداوە، بەڵام دوایی دەرکەوت ژنەکەی هەر لامارە. (دۆب)ە ڕەش ئامۆزایەکی پێڵاودرووی لە ئەمریکا هەبوو و بەردەوام شانازی بەوەوە دەکرد کە نامەی بۆ دەنێرێت، بەڵام هەر لە وارشۆ مایەوە. ژنان گاڵتەیان پێدەکرد و دەیانگوت: (دۆب، هیچ هیوایەکت نییە. چارەنووس وایدانەوە کە بە قەیرەکچی بمریت). "دۆب"یش هەمیشە وەڵامی دەدانەوە: (من ئامەوێت ببمە کۆیلەی هیچ پیاوێك. با هەموویان بۆگەن بکەن).

ئەو ئێوارەیە (دۆب) نامەیەکی لە ئەمریکاوە بۆ هاتبوو. زۆربەی کات، دەچووە لای (لەیزەری) بەرگدروو بۆئەوەی نامەکەی بۆ بخوێنێتەوە. بە هەرحاڵ ئەو ڕۆژە (لەیزەر) لەوێ نەبوو، لەبەرئەوە (دۆب) بیری لە دکتۆر (فیشلسن) کردەوە کە کرێچییەکانی تر بە هەڵگەڕاوە لە دینیان دادەنا، چونکە هەرگیز نەدەچوو بۆ نوێژکردن. لە دەرگای ژوورەکەی دوکتۆری دا، بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە. "کافرەکە لەوانەیە ▪ دەرەوە بێت" (دۆب) بیری کردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا جارێکی تر لە دەرگاکەی دایەوە. ئەمجارەیان دەرگاکە تۆزێك کرایەوە. پاڵێکی بە دەرگاکەوە نا و چووە

ژوورەوە. ترساو ڕاوەستا. دوکتۆر (فیشلسن) ڕاکشابوو و هەموو جلەکانی لە بەر بوو، ڕەنگی وەکو مۆم زەرد هەڵگەڕابوو و قورتمی دەرپەڕی بوو، ڕیشی بەرەو سەرەوە بەرز بیوەوە. (دۆب) قیژاندی. دڵنیابوو لەوەی کە مردووە.

بەڵام -ئا- لەشی تۆزێك جووڵا. (دۆب) پەرداخی سەر مێزەکەی هەڵگرت و ڕایکرد بۆ داڵانەکەو، لە بەلووعەکە پڕیکرد لە ئاو و بە پەلە گەڕایەوە. ئاوەکەی کرد بە دەموچاوی پیاوە بووراوەکەدا. دوکتۆر (فیشلسن) سەری لەقاند و چاوەکانی کردەوە.

"ئەوە چیتە؟" دۆب پرسی "نەخۆشی؟"

"زۆر سوپاست دەکەم. نەخێر"

"خێزانت هەیە؟ بانگیان ئەکەم"

"کەسم نییە"

(دۆب) ویستی سەرتاشەکەی ئەوبەر شەقامەکە بهێنێت، بەڵام دوکتۆر (فیشلسن) وتی پێویستی بە یارمەتی سەرتاشەکە نییە. لەبەرئەوەی (دۆب) ئیشی بازاڕی نەبوو، چونکە مێلکە بە دەست نەدەکەوت، بڕیاریدا کارێکی چاکە بکات، یارمەتی پیاوە نەخۆشەکەی دا بۆئەوەی لە جێگاکەی هەستێت و پەتووی سەر جێگەکەی ڕێك کردەوە. پاشان جلەکەی داکەند و شۆربایەکی لەسەر تەباخە نەوتەکە بۆ لێنا. ژوورەکەی (دۆب) هەرگیز هەتاوی تێدا نەدەکەوت، بەڵام لێرە چوارگۆشەکانی تیشکی ڕۆژ لەسەر دیوارەکە دەدرەوشانەوە.

زەمینەی ژوورەکە بەسوور ڕەنگ کرابوو. لەسەرووی جێگاکەوە وێنەی زەلامێك هەڵواسرابوو، کە قژێکی درێژی هەبوو و ملپێچێکی پانی لە ملی پێچابوو. (پیاوێکی پیرە، بەڵام بڕوانە ژوورەکەی چەند جوان و پاکە)، (دۆب) بە پەسەندکردنەوە بیری کردەوە. دوکتۆر (فیشلسن) داوای کتێبی ئاکارەکەی کرد، ئەویش بەناڕەحەتییەوە دایە دەستی. دڵنیا بوو کە کتێبێکی تۆزکردنی خەڵکی ناجوولەکەیە. پاشان بە شپرزەییەوە کەوتە جوڕنە بەو ئاوەدا، سەرەتا سەتڵێك ئاوی هێناو زەوییەکەی سڕییەوە. دوکتۆر (فیشلسن) نانی خوارد، پاش ئەوەی لێبووەوە هەستیکرد کە بەهێزترە. (دۆب) داوای لێکرد کە نامەکەی بۆ بخوێنێتەوە.

نامەکەی بە هێواشی دەخوێندەوە و کاغەزەکە لە دەستیدا دەلەرزی. لە نیویۆرکەوە هاتبوو، لە ئامۆزاکەی (دۆب)ەوە. جارێکی تر نووسیبووی کە خەریکە بەمزوانە نامەیەکی (بەڕاستی گرنگ) و بلیتێکی بۆ بنێرێت بۆ ئەمریکا. (دۆب) ئەم قسانەی هەموو لەبەر بوو و یارمەتی پیاوە پیرەکەی دا لە هەڵهێنانی دەستخەتە ناڕێکەکەی. (درۆ ئەکا) "دۆب" وتی:

(دەمێکە منی لەبیر چۆتەوە). بۆ ئێوارە (دۆب) جارێکی تر هاتەوە. مۆمێك لە مۆمدانێکی سەر کورسی تەنیشت جێگاکە دەسووتا. سێبەری ئاگری سورباو لەسەر دیوار و بنمیچەکەدا لەرزلەری بوو. دوکتۆر (فیشلسن) لە جێگەکەیدا پاڵیدابووەوەو کتێبێکی دەخوێندەوە. تیشکی مۆمەکە ڕەنگێکی زێڕینی دەدا لە ناوچەوانی کە بەهۆی لۆچێکەوە دەتوورت بۆتە دوو بەش، چۆلەکەیەك لە پەنجەرەکەوە هاتە ژوورەوەو لەسەر مێزەکە نیشتەوە. بۆ چرکەیەك (دۆب) ترسا. ئەم زەلامە وایلێدەکرد بیر لە ژنە جادووبازەکان و، ئاوێنە ڕەشەکان و تەرمەکان بکاتەوە، کە بە شەو لەو ناوەدا دەسووڕانەوەو ژنانیان دەترساند. لەگەڵ ئەوەشدا، چەند هەنگاوێك لێی نزیك بووەوەو لێی پرسی. (چۆنی؟ باشتری؟).

(تۆزێك باشترم، سوپاس).

(ئایا بەڕاستی لە ئایین هەڵگەڕاویتەوە؟). پرسی، هەرچەند بە تەواوی لە واتای وشەکە دڵنیانەبوو.

(من؟ هەڵگەڕابمەوە؟ نەخێر، من جوولەکەم وەکو هەر جوولەکەیەکی تر)، دوکتۆر (فیشلسن) وەڵامیدایەوە.

وەڵامەکەی دوکتۆر دڵنیاییەکی باشی بە (دۆب) بەخشی. شووشەی نەوتەکەی دۆزییەوە و تەباخەکەی داگیرساند، پاشان لە ژوورەکەی خۆیەوە شووشەیەك شیری هێنار دەستیکرد بە لێنانی خواردن. دوکتۆر (فیشلسن) بەردەوامبوو لە خوێندنەوەی کتێبی ئاکار، بەڵام ئەو ئێوارەیە هیچ لەو بیردۆزە و سەلماندنانەی کە دەیخوێندنەوە تێنەدەگەیشت، بە تایبەتی کە پێناسە و دەستور و بیردۆزەی تریشیان باس دەکرد، بە دەستێکی لەرزۆکەوە کتێبەکەی لە چاوی نزیك کردەوە، (بیرۆکەی ئەوەی کە هەر گۆڕینێکی لەشی مرۆڤ مەرج نییە زانینی خودی لەشی مرۆڤی تێدابێت.. بیرۆکەی ئەو بیرۆکەیەی کە هەر گۆڕینێکی مێشکی مرۆڤ، مەرج نییە زانیارییەکی تەواوی مێشکی مرۆڤ..).

-٦-

دوکتۆر (فیشلسن) دڵنیا بوو لەوەی کە بەمزوانە دەمرێت. وەسیەتنامەکەی نووسی و هەموو کتێب و دەستنووسەکانی بەخشی بە کتێبخانەی کەنیشتەکە. جل و کەلوپەلەکانیشی بەخشی بە (دۆب)، چونکە ئاگاداریی کردبوو. بەڵام مردن نەهات، بە پێچەوانەوە تەندروستی بەرەو باشتر دەچوو. (دۆب) گەڕابووەوە بۆ کارەکەی ناو بازاڕی، بەڵام ڕۆژانە چەند جارێك سەری لێدەدا و، شۆربای بۆ لێدەنا، پەرداخی چای بۆ بەجێدەهێشت و، دەنگوباسی جەنگی پێ ڕادەگەیاند. ئەڵمانەکان شاری کالش و بێندن و سێستەچۆیان داگیر کردبوو، ئێستا بەرەو وارشۆ پێشڕەوییان دەکرد. خەڵك دەیانگوت هەر بەمزوانە بەیانییەکی ئارام گوێیان لە گرمەی تۆپ دەبێت. (دۆب) پێی ڕاگەیاند کە کوژراوەکان زۆرن، وتی: (وەکو مێش لێیان دەکوژرێت. چ بەدبەختییەکە بۆ ژنان).

نەیدەزانی بۆ، بەڵام ژووری پیاوە پیرەکە سەرنجی ڕادەکێشا. حەزیدەکرد کتێبە پەراوێز زێڕینەکان لە ڕەفەکان دەربهێنێت و خۆڵەکانیان بسڕێت و لەناو پەنجەرەکە دایانبنێت بۆ هەوا وەرگرتن. لە پایەکانی پەنجەرەکە سەردەکەوت و لە تەلیسکۆپەکەوە سەیری دەکرد. هەروەها حەزی لە قسەکردن بوو لەگەڵ دوکتۆر (فیشلسن) دا. دوکتۆر (فیشلسن) باسی سویسرای بۆ دەکرد کە تیایدا خوێندبووی، باسی ئەو شارە گەورانەی بۆ دەکرد کە پیایاندا تێپەڕیبوو. باسی ئەو شاخە بەرزانەی بۆ کرد کە بە هاوینیش بەفر دایپۆشیبوون. باوکی ڕابی بوو لەبەرئەوە ئەویش (یەشیڤا)ی خوێندووە. (دۆب) لێی پرسی چەند زمان دەزانێت. دەرکەوت کە زمانی عیبری و ڕووسی و ئەڵمانی و فەرەنسی بە قسە و نووسین دەزانێت، بێجگە لە زمانی (ییدیش). هەروەها زمانی لاتینیشی دەزانی. دۆب سەرسامبوو لەوەی چۆن پیاوێکی ڕۆشنبیری لەمجۆرە، دەتوانێت لە ژوورێکی سەرەوە ■ شەقامی ناو بازاڕ بژێت. بەڵام ئەوەی زیاتر سەرسامی دەکرد، ئەوە بوو کە هەرچەند نازناوی (دوکتۆر)ی هەڵگرتبوو کەچی ڕەچەتەی بۆ خەڵك نەدەنووسی. دەیپرسی: (بۆچی نابیتە دوکتۆرێکی ڕاستەقینە؟)، ئەویش لە وەڵامدا دەیگوت: (من پزیشك نیم). (ئەی چ جۆرە دوکتۆرێکی؟). (من دکتۆری فەلسەفەم). هەرچەند هیچی دەربارەی واتەکەی نەدەزانی، بەڵام هەستیکرد کە دەبێت شتێکی زۆر گرنگ بێت. ئینجا دەیووت "ئای خوایە گیان، ئەم مێشکەت لە کوێوە هێناوە؟"

ئێوارەیەکیان، پاش ئەوەی (دۆب) بسکویتو

چایی و شیری بۆ هێنا، دوکتۆر (فیشلسن) بە پرسیار کردن لەبارەی ئەوەی خەڵکی کوێیە و دایك و باوکی چی بوون و بۆچی هەتا ئێستا شووی نەکردووە، (دۆب) سەرسامبوو. هەتا ئێستا کەس پرسیاری وەهای لێ نەکردبوو. بە دەنگێکی هێمن چیرۆکی خۆی بۆ گێڕایەوەو هەتا سەعات یانزە لەوێ مایەوە. باوکی حەماڵ بوو و لای قەسابێك کاری دەکرد، کە ئاژەڵی بەگوێرەی ئایینی جولەکە سەردەبڕی و دایکیشی مریشکی پاکدەکرد. خێزانەکەی لە ژێرزەمینێك لە ژمارە ١٩ شەقامی ناو بازاڕ بوون کە تەمەنی گەیشتە دە ساڵ، بوو بووە کارەکەر. ئەو پیاوەی کاری بۆ دەکرد شتی دزراوی لە دزەکانی مەیانەکە دەکڕییەوە. (دۆب) برایەکیشی هەبوو کە پەیوەندیی بە لەشکری رووس کرد و هەرگیز نەگەڕایەوە. خوشکێکی شووی بە کابرایەکی عارەبانەچی کردبوو لە پراگ و بەسەر منداڵەوە مردبوو. (دۆب) باسی شەڕی نێوان دزەکان و شەڕی نێوان شۆڕشگێڕەکانی بۆ کرد لە ساڵی ١٩٠٥. باسی (ئنچە) کوێر و دەستە دزەکەی بۆ دەکرد کە چۆن پارەیان لە کۆگاکان دەسەند. باسی ئەو شەقاوانەی دەکرد کە چۆن پەلاماری کچ و کوڕە گەنجەکانیان دەدا، لە کاتی پیاسەی رۆژانی شەممەدا، ئەگەر باجی پاراستنیان نەدایە. هەروەها باسی ئەو گەوادانەی بۆ کرد کە بە عەرەبانە دەگەڕان و ژنانیان دەفڕاند و لە بۆینس ئایرس دەیانفرۆشتن. (دۆب) سوێندی بۆ خوارد کە تەنانەت هەندێك پیاو خەریکبووە فریوی بدەن و لە قەحبەخانەیەك ئیشی پێبکەن. هەموو خەریکی دزینی بوون، دەزگیرانەکەیان دزی. رۆژێکیان نەیارێکی شووشەیەك ئەوتی ڕژاندە سەر تەختەی خەپلەکانی، ئامۆزا پێڵاودرووەکەی سەت روبڵی لێدزی پێش ئەوەی بچێت بۆ ئەمریکا.

دوکتۆر (فیشلسن) بە وریاییەوە گوێی بۆ گرتبوو. هەندێك پرسیاری لێکرد و سەری یادا و مرقەیەکی کرد. پاشان لێی پرسی: (باشە، باوەڕت بەخوا هەیە؟).

(نازانم)، وەڵامیدایەوە: (ئەی تۆ؟).

(بەڵێ، من باوەڕم پێی هەیە).

(ئەی کەواتە بۆ ناچیت بۆ کەنیشت؟)

(خوا لە هەموو شوێنێکە)، وەڵامیدایەوە. (لە کەنیشت، لە بازاڕ، لەم ژوورە. ئێمە خۆمان بەشێکین لە خوا).

(ئەم جۆرە شتانە مەڵێ)، (دۆب) وتی: (ئەمترسێنن).

(دۆب) ژوورەکەی بەجێهێشت. دوکتۆر (فیشلسن) دڵنیابوو کە بۆ نووستن دەچێت، بەڵام پێی سەیر بوو بۆچی نەیگوت (شەو باش). بیری کردەوە: (لەوانەیە بەهۆی فەلسەفەکەمەوە تەرەمکردبێت). بەیانی رۆژی دوایی گوێی لە دەنگی پێی بوو. هاتە ژوورەوەو وەکو دەستگێڕێك تۆپەڵێك جلی بەدەستەوە بوو.

وتی: (ویستم ئەمانەت پیشانبدەم، ئەمانە جیازییەکەی منە). دەستیکرد بە بڵاوکردنەوەیان لەسەر کورسییەك، کراسەکان — خوری، ئاوریشم، قەیفە بوون. یەك یەك هەڵیدەگرتن و بە بەری خۆی دەگرتن. روونکردنەوەیەکی لەبارەی هەموو دانەیەکی جیازییەکەی دەدا — ژێرکراس، پێڵاو، گۆرەوی. وتی: (من دەستبڵاونیم. من پاشەکەوتکەرم. ئەوەندە پارەم هەیە پێی بچم بۆ ئەمریکا). ئینجا بێدەنگ بوو رەنگی وەکو خشتی سوور سوور هەڵگەڕا. بە تیلەی چاوی بە شەرم و پرسیارەوە، سەیری دوکتۆر (فیشلسن)ی دەکرد. لەشی دوکتۆر (فیشلسن) لە پڕ کەوتە لەرزین، وەکو ئەوەی سەرما لێیدابێت. (جوانن، شتگەلێکی جوانن)، نێوچەوانی گرژبوو و

دەستی بە ڕیشیدا هێنا. بزەیەکی خەمناك کەوتە سەر دەمە بێ ددانەکەی و چاوە گەورەکانیشی لە پەنجەرەکەوە سەیری دووریان دەکرد، بزەی خەمناکیان تێکەوت.

-٧-

ئەو ڕۆژەی (دۆب)ە ڕەش هات بۆ لای (ڕاب)ی و ڕایگەیاند کە دەیەوێت شوو بە دوکتۆر (فیشلسن) بکات، ژنەکەی (ڕاب)ی لێوابوو شێت بووە، بەڵام دەنگوباسەکە گەیشتبووە (لەمیزەری) بەرگدروو و ئاوەڵاخانەکە و دووکانەکانی دیکەش. خەڵکانێك هەبوون دەیانگوت (کچە پیرەکە) بەختی هەیە، چونکە دوکتۆر پارەیەکی زۆری پاشەکەوت کردووە.

بەڵام خەڵکی تر هەبوون لایان وابوو کە ئەو بێپارە نەفس نزمە، مەگەر هەر نەخۆشیی سفلسی بێ ببەخشێت. هەرچەند دوکتۆر (فیشلسن) سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئاهەنگی مارە بڕینەکە دەبێت بچووك و هێمن بێت، بەڵام میوانێکی زۆر لە ژوورەکەی (ڕاب)ی کۆبوونەوە. شاگردەکانی ئانەواکە کە بە گشتی بە دەرپێ و پێ خاوسی و کیسەیەکی کاغەزیان دەنایە سەریان و دەگەڕان، ئەمڕۆ قاتی ڕەنگ کاڵ و پێڵاوی زەرد و ملپێچی بریقەداریان لەبەرکردبوو، شەپقەی پووشیان لەسەر کردبوو، لەگەڵ خۆیان کێکی زلیان هێنابوو، لەگەڵ تاوەی پڕ لە جۆرەها پسکیت. تەنانەت شووشەیەکی ڤۆدکاشیان پەیداکردبوو، هەرچەند خواردنەوە لە کاتی جەنگدا قەدەغەکرابوو. کاتێك بووك و زاوا هاتنە ناو ژووری (ڕاب)ی دەنگە دەنگێك لە خەڵکەکەوە بەرز بووەوە. ژنان باوەڕیان بە چاوی خۆیان نەدەکرد، ئەو ژنەی کە بینیان ئەو ژنە نەبوو کە دەیانناسی. (دۆب) شەپقەیەکی لێوار پانی لەسەر کردبوو کە بە گێلاس و تریێ و پەڕی زل ڕازابووەوە، کراسێکی ئاوریشمی سپی لەبەردابوو کە دامێنەکەی لە زەوی دەخشا، پێڵاوێکی ڕەنگ زێڕینی پاژنە بەرزی لەپێ کردبوو، ملوانکەیەکی مرواریی ساختەی لە مل کردبوو، پەنجەکانی بە ئاموستیلەی نقێم بریسکەدار ڕازاندبووەوە. دەموچاوی پۆشیبوو، هەر لەو کچە دەوڵەمەندانە دەچوو کە لە هۆڵی ڤیینا زەماوەند دەگێڕن – شاگردەکانی ئانەواکە، بە گاڵتە پێکردنێکەوە دەستیان کرد بە فیکە لێدان. دوکتۆر (فیشلسن)یش پاڵتۆ ڕەشەکەی و جووتێك پێڵاوی نووك پانی لەپێدابوو. زۆر بە زەحمەت دەیتوانی ڕێ بکات، لەبەرئەوە پاڵی بە (دۆب)ەوە نابوو. کاتێك قەرەباڵغییەکەی لە دەرگاکەوە بینی، ترسا و ویستی بگەڕێتە دواوە، خاوەن کارەکەی پێشووی (دۆب)، بەرەو ڕووی ڕۆیشت و وتی: (وەرە ژوورەوە، وەرە ژوورەوە، زاوا – شەرمن مەبە. ئێستا هەموومان براتین)- ڕێ و ڕەسمەکە بەپێی یاسا بەڕێوە دەچوو. (ڕاب)ی کە جلێکی کۆنی گەبەردینی لەبەردا بوو، مارە بڕینەکەی نووسی و داوای لە بووك و زاوا کرد، دەست لە دەستەسڕەکەی بدەن، وەکو نیشانەی ڕازیبوون. پاشان نووکی قەڵەمەکەی بە تەپڵی سەری سڕییەوە. کۆمەڵێك حەماڵ لە شەقامەوە بانگ کرابوون، وەکو دەستەیەکی هەڵبژاردە بۆ ڕاگرتنی پەردە کوللەکە. دوکتۆر (فیشلسن) ڕۆبێکی سپی لەبەرکرد، وەکو وەبیرهێنانەوەیەك بۆ ڕۆژی مردن. (دۆب)یش بەپێی تەریت چەند جارێك بەدەوریدا سووڕایەوە. تیشکی مۆمەکانی شاییەکە، لەسەر دیوارەکان دەترووسکانەوە و سێبەرەکان لەرەلەریان بوو. پاش ئەوەی شەرابیان کردە ناو پەرداخێکەوە، (ڕاب)ی دوعاکانی پیرۆزکردنی بە ئاوازێکی غەمناك خوێند. ژنەکانی تریش

دەستەسەرەکانیان دەرهێنا و، بە کاڵتەپێکردنێکەوە ڕاوەستان. کاتێک شاگردەکانی نانەواکە دەستیانکرد بە چرپاندنی قسەی بەتوێکڵ بە گوێی یەکتردا، (راب)ی پەنجەی نایە سەر لێوەکانی و لەژێر لێوەوە بۆڵاندی: (*Eh Bu oh*). وەکو ئاماژەیەك کە قسەکردن قەدەغەیە. کاتی پەنچەکردنی ئەڵقەی بوکێ هات، بەڵام زاوا دەستی کەوتە لەرزین و نەیدەتوانی، پەنجەی دۆشاو مژەی (دۆب) بدۆزێتەوە.

دوای ئەوە بەپێی نەریت، نۆرەی شکاندنی پەرداخی شەرابەکە بوو. دکتۆر (فیشلسن) چەند جارێك لەقەی لە پەرداخەکە دا، بەڵام نەشکا. کچان سەریان داخست و توقورچیان لە یەکتری گرت و تریقانەوە. پاشان یەکێك لە شاگردەکان بەپاژنەی پێی لە پەرداخەکەی داو ورد و خاشی کرد. تەنانەت (راب)یش نەیتوانی بزەکەی بشارێتەوە. پاشان تەواوکردنی رێ و رەسمی مارە برینەکە، قۆدکایان خواردەوە و بسکویتیان خوارد. خاوەندکاری پێشووی (دۆب) بەرەو رووی دوکتۆر (فیشلسن) هات و وتی: (*Mazel tov* بەختێکی باش، زاوا، بەختت ئەبێ وەکو بەختی ژنەکەت باش بێت). (سوپاس، سوپاس) دوکتۆر (فیشلسن) لە ژێر لێوەوە وتی: (بەڵام چاوەڕوانیی بەخت ناکەم). بە پەرۆشەوە دەیویست بەزووترین کات بگەڕێتەوە بۆ ژوورەکەی. هەستی بە فشارێك لەسەر گەدەی دەکرد و بە ئازارێك لەسەر سینەی، رەنگی سەوز هەڵگەڕابوو.

(دۆب) لە پڕ تووڕە بوو و سەرپۆشەکەی لاداو قیژاندی بەسەر خەڵکەکەدا: (بەچی پێدەکەنن؟ ئەمە شانۆگەری نییە). بەبێ ئەوەی ئەو پەرکە سەرینەی کە دیارییەکانی لێپێچرابوو هەڵبگرێت، لەگەڵ مێردەکەیدا رۆیشتن بۆ ژوورەکەیان لە نهۆمی پێنجەم.

دوکتۆر (فیشلسن)، لەسەر جێگە تازەکەی راکشاو دەستیکرد بە خوێندنەوەی کتێبی ئاکار. دوکتۆر بە ژنەکەی وتبوو کە پیرو نەخۆشە و هیچ هێزێکی نییە. بەڵێنی هیچی پێنەدابوو، لەگەڵ ئەوەشدا (دۆب) گەڕایەوەو کراسێکی نوستنی ئاوریشمی لەبەرکردبوو، لەگەڵ نەعلی گوڵینگدار و قژیشی بەسەر ملیدا بەرابووەوە.

شەرمن و دوودڵ دیاربوو، بەڵام بزەیەك بەسەر لێویەوە بوو. دوکتۆر (فیشلسن) لەرزی و کتێبەکەی ئاکار لە دەستی کەوتە خوارەوە، مۆمەکە کوژایەوە. (دۆب) بە تاریکی دەستی بۆ دوکتۆر (فیشلسن) گێڕاو دۆزییەوەو دەمی ماچکرد. (مێردە ئازیزەکەم) چرپاندی بە گوێیدا: (*Mazel tov*).

ئەوەی ئەو شەوە ڕوویدا، دەتوانین ناوی بنێین موعجیزە. ئەگەر دوکتۆر (فیشلسن) لەو باوەڕەدا نەبوایە کە هەموو ڕووداوێك بەپێی یاساکانی سروشت ڕوودەدەن، دەیگوت کە (دۆب)ە ڕەش جادووی لێکردووە. هەموو توانا کپکراوەکانی زیندووبوونەوە. هەرچەند تەنها قومێکی شەرابی پیرۆزکردنەکەی خواردبووەوە، دەتوت بە تەواوی سەرخۆشە، ماچی (دۆب)ی دەکرد و باسی خۆشەویستی بۆ دەکرد. شیعرە لەبیرکراوەکانی (کلۆپستۆك و لیسنگ و گۆتە)، دەهاتنە سەر زمانی. ئازارەکانی گەدە و سنگی نەمان. باوەشی بە (دۆب)دا دەکرد و دەیگوشی بەخۆیەوە، وەکو ئەوەی گەنج بووبێتەوە. (دۆب) خەریکبوو لە خۆشیدا ببوورێتەوە و شتی بە شێوە زاری وارشۆیی دەچرپاند بە گوێدا کە ئەم لێی نەدەگەیشت. پاشان دوکتۆر (فیشلسن) خەوێکی گەنجانەی لێکەوت و خەونی بە سویسراوە بینی، لە خەونەکەیدا خۆی ئەبینی بە شاخدا هەڵئەگەڕێت، ئەکەوێت، ڕائەکات و ئەفڕێت.

لەبەرەبەیاندا بە ئاگا هاتەوە، دەتوت یەکێك بە مشتەکۆڵە بە گوێچکەیدا مالیوە. (دۆب) لەولاوە دەیپرخاند. دوکتۆر (فیشلسن) بە ئەسپایی لە جێگەکەی هەستا. بە جلی نوستنەوە بەرەو پەنجەرەکە رۆیشت و بە پلیکانەکەدا سەرکەوت، بەسەرسوڕمانەوە سەیرێکی دەرەوەی کرد. شەقامی ناو بازاڕ نوستبوو، هەناسەی قووڵی بێ جووڵەیی دەدا. چرا گازییەکان تروسکەیان دەهات. دەروازەی دوکانەکان بە شیشی ئاسن قایم کرابوون. شەماڵێکی سارد هەڵیکردبوو. دوکتۆر (فیشلسن) سەیرێکی ئاسمانی کرد. ئاسمانی رەش پڕ بوو لە جۆرەها ئەستێرە، ئەستێرەی سەوز و سوور و زەرد و شین، ئەستێرەی بچووك و ئەستێرەی گەورە، ئەوانەی بە کۆ وەستابوون و ئەوانەی بە تەنیا بوون. لەسەری سەرەوەدا، کەم کەس تێبینی ئەوەی کردبوو کە دوکتۆر (فیشلسن) ئاوێك، لە رۆژانی داچوونیدا ژنێکی هێنابوو بەناوی (دۆب)ە رەش. لەبەرچاوی سەرەوەدا، تەنانەت جەنگی جیهانیش گۆڕینێکی کاتیی میزاجە. کۆمەڵە ئەستێرەکان لە رەوتی دیاریکراوی خۆیاندا، لە ئاسمانی بێسنووردا دەخولانەوە. هەسارەکان، ئەستێرە کلکدارەکان، بە دەوری چەقی خۆیاندا دەخولانەوە. لە ئاشووبی گەردوونیدا دونیای نوێ لەدایکدەبوون و هی تر دەمردن. ئاویەناو ئەستێرەیەك دەکشا و کلکێکی ئاگرینی بە دوای خۆیدا جێدەهێشت، مانگی ئاب بوو، لێزمەیەك ئەستێرەی کلکدار دەبیتران. بەڵێ، ماددەی ئاسمانی بێ کۆتاییە و نە سەرەتای هەیە نە کۆتایی. شەپۆلەکانی لە مەنجەڵی گەردووندا سەمایان دەکرد و بەپێی یاسای هۆ و ئەنجام، بەرگی گۆڕانی تێدەکرا. دوکتۆر (فیشلسن)یش، بە چارەنووسە بێ دەربازبوونەکەیەوە بەشێك بوو لەمە. دوکتۆر چاوی نوقاند و هێشتی شەماڵەکە ئارەقی نێو چەوانی وشك بکاتەوە و مووی ریشی بجووڵێنێت. هەناسەیەکی قووڵی هەوای نیوەشەوی هەڵمژی و بە دەستە لەرزۆکەکەی خۆی پەنجەرەکەی گرت. لەبەر خۆیەوە وتی: (سپینۆزای پەرۆز، لێم ببوورە، من خۆم گەر کردووە).

سەرچاوە:

*Spiw. za . f a arket street*
*mo: Isaal mushevis siwger,*
*miterature (s. mh a eth. dist Uwiversito),*
*New Y. rk 1975*

# منداڵی خەڵکی

جەلالی ئال ئەحمەد

لە فارسییەوە: حەمە ڕەسووڵ حەسەنپوور

باشە، من دەمتوانی چیبکەم؟ شووەکەم ئامادە نەبوو بە منداڵەوە رامبگرێ. منداڵەکە هی خۆی نەبوو، هی مێردی پێشووم بوو کە تەڵاقیدابووم و ئامادەش نەبوو منداڵەکە ڕابگرێت. ئەگەر یەکێکی تر لە جێگەی مندا بوایە، چی دەکرد؟ باشە، منیش دەبوو ژیان بکەم، ئەو مێردەشم تەڵاقیدابام چیم کردبا؟ ناچار بووم بە شێوەیەك منالەکە سەرنگوم بکەم. ئافرەتێکی چاووگوێ بەستراوی وەك من، جگە لەمە شتێکی دیکەی بە بیردا نەدەهات. نە جێگەیەکم پێدەزانی، نە ڕێگەچارەیەکم دەزانی. نەك ئەوەی جێیەکم پێنەدەزانی، دەنا دەکرا منالەکە لە دایەنگا دابنێم یان بە وێرانەیەکی دیکەی بسپێرم، بەڵام لە کوێ دیار بوو منالەکەم لێوەردەگرن؟ لە کوێوە دەمزانی و دڵنیابووم ماتڵم ناکەن و ئابڕووم نابەن و هەزار ناو لەسەر خۆم و منالەکەم دانانێن؟ لە کوێوە؟ گەرەکم نەبوو بەم شێوانە تەواو بێت.

ئەو ڕۆژە بۆ ئێوارەکە ئیشەکەم تەواو کرد و بۆ ماڵ گەڕامەوە، ئەوەی کردبووم بۆ دایکم و هاوسێکانم گێڕایەوە.

نازانم کامەیان وتی: "باشە، ژنەکە دەبوو منداڵەکە بە دایەنگا بسپێری، یان بیبەیە هەتیوخانە..." نازانم ئیتر کوێی تری گوت. بەڵام هەر ئەو کات دایکم پێی وت کە "وا دەزانی ڕێگەیاندەدا؟ پەح!"

من لەگەڵ ئەوەیدا خۆیشم بیری ئەمکارەم کردبوو، بەڵام ئەو ژنە هاوسێیەمان کاتێ ئەمەی وت، دیسان دڵم داتەپی و بەخۆم وت:" باشە ژنەکە تۆ هیچ چووی و ڕێگەیان پێنەدای؟" و پاشان بە دایکم وت: "شەڵڵا ئەم کارەم کردبا". بەڵام من شارەزاییم نەبوو. من دڵنیا نەبووم ڕێگەم بدەن. ئەو کاتیش ئیتر درەنگ ببوو. لە قسەی ئەو ژنە دەتوت دونیایەك خەم و خەفەت بەسەر دڵمدا باریوە. قسە خۆشەکانی منالەکەم گشتی بیرکەوتەوە. ئیتر نەمتوانی خۆم رابگرم و بەلای گشت دەروهاوسێکانەوە دەوڕە نووی

گریام، بەڵام چەندە خەراپ بوو. خۆم بیستم یەکیان وتی:

"دەشگری! تەریق نابێتەوە!..."

دیسانەوە دایکم بەفریام کەوت. زۆر دڵیدامەوە، باشە راستیشی دەکرد. من کە سەرەتای گەنجیمە بۆ ؟ بۆ منداڵێك هێندە خەم بخۆم؟

ئەویش کاتێ مێردەکەم بە منداڵەوە رامناگرێ. ئێستا زۆرم کات بە دەستەوە کە هەر دابنیشم سێ چوارێکم ببێت. راستە منداڵییەکەمم بوو و نەدەبوو ئەمکارە بکەم، بەڵام باشە، خۆ ئێستا کار لە کار ترازاوە. ئێستا ئیتر بیرکردنەوەی پێناوێ. خۆنەخۆش نەبووم هەستم و بچم ئەم کارە بکەم.

شووەکەم بوو کە پێیدادەگرت، راستیشی دەکرد، نەیدەویست پاشماوەی نێرەکەرێکی تر لەسەر سفرەکەی ببینێ.

بۆ خۆشم کاتێك کلاوەکەم دەکردە قازی مافم پێدەدا. بۆ خۆم گەلۆ ئامادەبووم منداڵی مێردەکەم وەك منداڵی خۆم خۆشبوێ؟ و بە سەرباری خۆمیان ئەزانم؟ ئەوان لەسەر سفرەی مێردەکەم بە زیادی ئەزانم؟ باشە ئەویش هەروا، ئەویش ماف خۆی بوو منداڵی من نا، منداڵی نێرەکەرێکی تر (بە وتەی خۆی) لەسەر سفرەکەی ببینێ.

لەم دوو ڕۆژە چووبوومە ماڵەکەی، هەمووی هەر باسی منالەکە بوو. دوایین شەو زۆرمان قسە کرد. واتە نەك ئەوەی زۆرمان وتبێت، ئەو دیسانەوە سەبارەت بە منالەکە وتی و من گوێم راگرت. دواجار "وتم باشە دەڵێی چیبکەم؟"

مێردەکەم هیچی نەوت، هەندێ بیری کردەوەو پاشان وتی: "نازانم چیبکەی، هەر چۆنێکی خۆت دەتەوێ وا بکە. من نامەوێ پاشماوەی نێرەکەرێکی تر لەسەر سفرەی خۆم ببینم."

رێگە چارەیەکیش لەبەرپێدانەنام، ئەو شەوە نەهاتە لام. لێم تۆرابوو. شەوی سێیەمی ژیانمان بوو. بەڵام لێم تۆرابوو. خۆم دەمزانی دەیەوێت رقم لێدابگرێ بۆ ئەوە کاری منالەکە زوتر یەکسەرە بکەم، بەیانیش کە لە دەرگای ماڵەوە بۆ دەرەوە دەچوو وتی: "نیوەرۆکە دێمەوە ئیتر نابێ منداڵەکە ببینم، باشە." و من لەو کاتەوە تەکلیفی خۆم دەزانی. ئێستا هەرچی بیری لێدەکەمەوە ناتوانم تێبگەم چۆن دڵم هات، بەڵام ئیتر بە دەست خۆم نەبوو.

چارشێوەکەم بەسەر خۆمدا دا، دەستی منداڵەکەم گرت و بەشوێن مێردەکەمدا لە ماڵ دەرکەوتم. منداڵەکە تەمەنی نزیکەی سێ ساڵ بوو. بۆ خۆی جوان دەرۆیشت. خەراپییەکەی ئەوە بوو سێ ساڵ تەمەنم بۆی سەرف کردبوو. ئەمەیان زۆر خەراپ بوو.

لەخەم رەخسیبوو. شەونخوونییەکانی تێپەڕاندبوو و تازە سەرەتای ئاسوودەبوونی بوو. بەڵام من ناچار بووم ئیشەکەم بکەم. تا نزیکەی وێستگەی ماشێن لەگەڵیدا بە پێ رۆیشتم. پێلاوەکانیشم لە پێی کردبوو. بەرگە باشەکانیشم کردبۆ بەری. چاکەت و پانتۆڵێکی بچووکی شین کە بەم دواییانە مێردەکەی پێشووم بۆی کڕیبوو. کاتێك جلەکانم دەکردە بەری ئەم بیرەشم بە بیردا هات کە: "ژنەکە ئیتر بۆ چ جلە نوێیەکانی لەبەر دەکەی؟ بەڵام دڵم نەهات. چیان لێبکەم؟ چاوی مێردەکەم کوێر بێ ئەگەر دیسانیش منداڵم بوو با بچێ و جلی بۆ بکڕێ.

جلەکانم کردەبەری، سەرم بۆ شانە کرد: زۆر جوانببوو. دەستم گرت و بە دەستەکەی دیکەم چارشێوەکەم گرت و بە ئەسپایی هەنگاوم دەنا. ئیتر، پێویست نەبوو هەر جوێنیی پێ بدەم بۆ ئەوەی بە پەلە بڕوات. دواجار بوو کە دەستم گرتبوو لەگەڵ خۆمدا دەمبردە کۆڵانێ. لە دوو

سێ جێگە ویستی قژەی بۆ بکڕم. وتم: "لە پێشدا سواری ماشێن بین پاشان بۆت دەکڕم."

بیرمە ئەو ڕۆژەش وەك ڕۆژانی تر هەر پرسیاری دەکرد. ئەسپێك سمی دەجۆگا کەوتبوو و خەڵکی بە دەوریدا کۆببوونەوە. زۆری پێداگرت بەرزی کەمەوە بۆ ئەوەی بزانێ چیاسە. بەرزم کردەوە و ئەسپەکە دەستی رووشابوو و خوێنی لێدەهات، دی. کاتێ دامنایەوە وتی: "دایتە، چەچەکەی بڤە بووە؟" وتم: "بەڵێ گیانەکەم بە قسەی دایکی نەکردووە، بڤە بووە" تا وێستگەی ماشێن لەسەرخۆ دەرۆیشتین. ئێستا سەرەتای کات بوو. ماشێنەکان پڕ بوون و من نیو کاتژمێر لە وێستگە مامەوە تاکوو ماشێن هات. منداڵەکەم هەر ناڕەحەت بوو و من خەریکبوو ماندووبم. لەبەرئەوەی هێندە پرسیاری دەکرد تاقەتی بڕدبووم. دوو سێ جار وتی: "کەواتە دایتە، سبووە، ماسێن نەهاتووە. کەوایە بسین قژەی بکڕین." و من پێم وت: ئێستا دێت. وتم کاتێك سواری ماشێن بووین قژەشی بۆ دەکڕم. ئاخرەکەی هێڵی حەوتم گرت و تا مەیدانی شاکە دابەزین، منداڵەکەم هەر قسەی دەکرد و هەر پرسیاری دەکرد. بیرمە جارێکیان پرسی: "دایتە بۆ توێ دەسین؟"

من نازانم بۆ چ لەپڕ وتم بێنەوەی بەخۆم بزانم وتم: "دەچین بۆ لای باوکە؟". منداڵەکەم هێندەی سەیری دەمووچاوی کردم، پاشان پرسی: "دایتە، ئامە، باوکە؟".

من ئیتر تاقەتم نەبوو، وتم: "گیانەکەم چەندە دەڵێی، ئەگەر قسە بکەی قژەت بۆ ناکڕم." ئێستا چەندەم زگ پێ دەسوتێت! ئەمجۆرە شتانە زۆرتر دڵی بنیادەم دەسوتێنێ. بۆ چ دڵی منداڵەکەم لەم ساتەوەختانەی دوایدا شکاند؟.

کە لە ماڵ دەرکەوتبووین لەگەڵ خۆم پەیمانم بەستبوو کە تا کۆتایی ئیشەکە تووڕە نەبم، لە منداڵەکەم نەدەم، جوێنی پێنەدەم، لەگەڵیدا باش بم. بەڵام ئێستا چەندە دڵم پێی دەسووتێ! بۆ چ وا بێدەنگم کرد؟ ڕۆڵەکەم ئیتر بێدەنگبوو و لەگەڵ شاگرد و شۆفێرەکەدا کە خۆی لێ خێچ و خوار دەکردەوە، قسەی دەکرد. بەڵام من نە ڕوومدا بەو نە بە منداڵەکەم کە هەر رووی تێدەکردم و سەرقاڵی پێکەنین و تێکەڵاوی بوو. لە مەیدانیشا وتم دابەزین هەیە و کاتێك دابەزیم منداڵەکەم پێدەکەنی.

مەیدانەکە قەرەباڵغبوو و پاسی زۆری لێبوون. من تا ئێستاش دەترسام کارەکەم بکەم. ماوەیەك پیاسەم کرد، لەوانەیە نیو سەعاتێك بێ پاسەکان کەمتر بوونەوە. هاتمە کەنار مەیدانەکە: "دە شایی"م لە گیرفانم دەرهێناو بە منداڵەکەمم دا. سەری لێشێوابوو سەیری دەکردم، تا ئێستا پارە وەرگرتن فێرنەببوو. نەمدەزانی چۆنی تێبکەیەنم. لەوبەر مەیدانەکە گوڵەبەڕۆژە فرۆشێك هاواری دەکرد. بە پەنجەم نیشانمدا ووتم: "ها، بکرە بچۆ قژەی بکڕە، بزانم دەزانی خۆت بچی بکڕی؟"

منداڵەکەم سەیرێکی پارەکەی کرد و پاشان پێی وتم: "دایتە، تۆس وەلە با بلۆین." من وتم: "نا، من لێرەوە رادەوەستم و ئاگام لێت دەبێت بچۆ بزانم بۆ خۆت دەتوانی بکڕی؟"

منالەکەم دیسانیش چاوی لە پارەکە کرد، واوێدەچوو دوودڵ بێت و نەیدەزانی چۆن شت بکڕێ. تا ئێستا کارێکی ئەوتۆم فێر نەکردبوو، زل، زل سەیری دەکردم. عەجیب چاولێکردنێك بووا. وەك ئەوە وابوو هەر ئەو چرکەیە دڵم گیراو تێکچووم. حاڵم زۆر خەراپبوو. خەریکبوو پاشگەزبمەوە و پاشان کە منداڵەکەم ڕۆیشت و من هەڵاتم و تا ئێستاش، تەنانەت ئێوارەی ئەو ڕۆژەش کە لەبەرچاوی دەروجیرانمان لەبەر ناڕەحەتیان گریام. هیچ بەم چەشنە دڵم نەگیراو تێکنەچووم.

خەریکبوو بێتاقەت دەبووم. چاولێکردنێکی سەیر بوو، منداڵەکەم سەرگەردان بوو و وادیار بوو ئێستاش دەیەویست پرسیارێکم لێبکات. نازانم چۆن خۆمڕاگرت. جارێکی تریش گوڵە بەڕۆژە فرۆشەکەم نیشاندا و وتم: "بڕۆ گیانەکەم ئەم پارەیەی بدەیە، بڵێ گوڵە بەڕۆژەم بدەیە، هەر ئەمە. بچۆ بارە قەڵاّ." منداڵەکەم چاوی لە گوڵە بەڕۆژە فرۆشەکە دەکرد و پاشان وەک ئەو کاتانەی دەیەویست بیانوو بگرێ و بگری، وتی: "دایتە، گوڵە بەڕۆژەم ناوێت. مێوژم دەوێ." من خەریکبوو بێچارە دەبووم، ئەگەر منداڵەکەم هێندێکی تر راوەستابا، حەتمی پاشگەز ببومەوە. بەڵام منداڵەکەم نەگریا، تووڕە و، وەڕس ببوو، بەسەرمدا نەڕاند: "مێوژیشی هەیە بچۆ هەرچی دەتهەوێ بکڕە. بڕۆ ئیدی." و لەسەر جۆگەی کەناری پیادە ڕۆیەکە بەرزم کردەوە و لەسەر قیرتاوی ناوەڕاستی جادەکەم دانا دەستم بە پشتەوەیەوە ناو لەسەرخۆ پاڵم پێوە وتم:

"دەبچۆ ئیدی درەنگبووە".

جادەکە چۆڵبوو، لە ناوەڕاستی جادەوە کۆتاییەکەی. ئەمانە و گالێسکە دیارنەبوون بۆئەوەی منداڵەکەم بە ژێرەوە بکەن. منداڵەکەم کە دوو سێ هەنگاو ڕۆیشت، گەڕایەوەو وتی: "دایتە، مێوژیشی هەیە؟." وتم: "ئەری، گیانەکەم، بڵێ بایی دە شاهیم بدەرێ و ئەو ڕۆیشت. منداڵەکەم کەیبۆ ناوەڕاستی جادەکە کە لە پڕ ماشێنێك هۆڕنی لێداو من لە ترسان لەرزیم و بێئەوەی بزانم چدەکەم، خۆم هاویشتە نێوڕاستی جادەکەو منداڵەکەم لە ئامێز گرت و بۆ پیادەڕۆ هەڵاتمەوە و لە نێو خەڵکیدا خۆم شاردەوە. ئارەقەم بە سەروو چاواندا دەهاتە خوار و هانکە هانکم لێدەهات. منداڵەکەم وتی: "دایتە سبووە؟". وتم هیچ گیانەکەم لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا خێرا دەڕۆن، تۆ لەسەرخۆ دەڕۆیشتی، خەریکبوو بکەویتە ژێر ماشێن. کە ئەمەم دەوت خەریکبوو بگریەم. منداڵەکەم لە کاتێکا لە ئامێزدا بوو وتی: "باسە دایتە، دامەنێ، ئەمجالەیان تون دەچم."

لەوانەیە ئەگەر منالەکەم ئەم قسەیەی نەکردبا، بیمە چوو بوو بۆ چ ئیشێك هاتووم، بەلاّم ئەم قسەیەی سەر لە نوێ خستمیەوە دڵە خورپەوە، ئێستا ئەسرینەکانم وشك نەکردبۆوە کە سەرلەنوێ کەوتمەوە بیری ئەم کارەی کە پێویست بوو بیکەم. کەوتمەوە بیری مێردەکەم کە لێم دەتۆرێت. منداڵەکەم ماچ کرد، دوا ماچ بوو کە لە گۆنام دەکرد. ماچم کرد و سەر لەنوێ لە زەویم دانایەوە و دیسان بە گوێمدا چرپاند: "خێرا بڕۆ گیانەکەم، ماشێن دێ." دیسانەوە جادەکە چۆڵ بوو و ئەمجارەیان منالەکەم خێراتر چوو. هەنگاوە بچووکەکانی بە پەلە داویشت و من دوو سێجار ترسام کە نەکا قاچی تێکهاڵێ و بکەوێ. کە گەیشتە ئەوبەری جادەکە، ئاوڕی دایەوەو چاوێکی لێکردم. من داوێنی چارشێوەکەمم لەبن هەنگڵمدا کۆکردبۆوە و خەریکبوو ڕێدەکەوتم، هەر کە منداڵەکەم سووڕاو چاوی لێکردم، لەسەر جێگەکەم وشکبووم. راستە کە نەمدەویست بزانێ من خەریکم دەرباز دەبم، بەلاّم بۆ ئەوە نەبوو لە جێگەی خۆم وشك بم. وەك دزێکی لە کاتی دزیکردندا جومگەی دەستیان گرتبێ، وا بووم. وشك بیووم و دەستم هەروا لەبن هەنگڵمدا بوون. رێك وەك ئەو جارەی لە زگ گیرفانی مێردەکەم بووم، هەر ئەو مێردەی پێشوویەم و دەمپشکنی و مێردەکەم بەسەردا هات، رێك وەك ئەو کاتی وشك ببووم. دیسانەوە شەلاّلی ئارەقە بووم، سەرم داخست و کاتێك بە هەزار زەحمەت سەرم بەرزکردەوە، منداڵەکەم دووبارە وەرێکەوتبوو بۆئەوەی بگاتە گوڵەبەڕۆژە فرۆشەکە، ئیشی من کۆتایی

پێهاتبوو، منداڵەکەم بە ساقی گەیبۆ ئەوبەری جادەکە، لەو کاتەوە بوو دەتگوت هەر منداڵم نییە. دوا جار کە چاوم لە منداڵەکەم کرد رێك وەك ئەوە وابوو کە چاو لە منداڵی خەڵکی کەم. رێك وەك منداڵێکی تازە پێرۆچکە و شیرنی خەڵکی چاوم لێدەکرد. رێك وەك ئەو کاتە حەز لە سەیرکردنی منداڵی خەڵکی دەکەی، حەزم بە بینینی کرد و بە پەلە بۆ لای ئاپۆرەی خەڵکی پیادەڕۆکە چووم. بەڵام لەپڕ کەوتمە ترسەوە. خەریکبوو هەنگاوم وشك بن و لەسەر جێگەکەم بزمار کوت بم. لەوەی دەترسام نە کایەکێك قەلەڕەشەکەی دارکاری کردبێت.

لەم بیر کردنەوەیە مووەکانم گرژبووبوون و من خێراترم کرد، دوو کۆڵان لەولاترەوە، بەنیاز بووم لە نێو لا کۆڵانەکاندا دەست بە هەڵاتن بکەم. بە زەحمەت خۆم گەیاندە سەر کۆڵانەکە کە لە پڕ تەکسییەك لە پشت سەرم لە جادەکەدا ئیستۆپێکی کرد. هەروەك ئەمە وابوو ئێستا جومگەی دەستم دەگرن، تا سەر ئێسقانەکانم لەرزی. وامدەزانی پۆلیسی سەر چوار ڕێیانەکە کە چاوی لێکردبووم، خۆی هاویشتۆتە ناو تەکسییەوەو ئێستا لە پشتە سەرم دابەزیوەو خەریکە پەنجەم بگرێ.

نازانم چۆن ئاوڕم دایەوە و پشت سەری خۆم چاولێکرد و داچڵەکیم. موسافیرەکانی تەکسییەکە پارەکانیان دابوو و خەریکی رۆیشتن بوون. من هەناسەیەکی بە ئاسوودەییم داو بیرێکی ترم بە مێشکدا هات بێ ئەوەی بزانم یان چاوم جێیەکی دی ببینێ خۆم هاویشتە نێو تەکسییەکە و دەرگاکەم بە دەنگە دەنگەوە داخست. شۆفێرەکە بۆڵەی کرد و رێکەوت. چارشێوەکەم لە ژێر دەرگای تەکسییەوە مابۆوە.

کاتێ تەکسییەکە دوورکەوتەوە و من دڵنیابووم، سووکێ دەرگاکەم کردەوەو چارشێوەکەم لە کەلێنی دەرگاکە دەرهێناو دەرگام پێوەدا. پاڵم وە کوشنی تەکسییەکە داو هەناسەیەکی ئاسوودەم کێشا. ئاخرەکەی ئەو نەمتوانی پارەی تەکسییەکە لە مێردەکەم دەربێنمەوە.

**سەرچاوە:**

(بهترین داستانهای کوتاه دنیا، جلد ۱ – چاپ اول– بهار سال ١٣٦٧ – چاپ شفق ص ١٥١-١٦٥).

# ئەو پیاوە داسی پێیە

مستەفا مەستور

لەفارسییەوە: جەبار سابیر

کاتژمێر ١٠ی بەیانییە، لەزانکۆوە دەگەڕێمەوە ماڵەوە. نامەیەکی مەهتاب لەتەنیشت تەلیفۆنی سەرمێزە رەنگ مەنگوینییەکەی گۆشەی هۆڵەکە دەبینم. چەند جارێك نامەکە دەخوێنمەوە، بەڵام باوەڕناکەم. وازی لێهێناوم. لەسەر کاغەزێکی بچووك نووسیویێتی:

لەژیان لەگەڵ تۆدا ماندووم. هاوسەرگیری ئێمە هەر لەسەرەتاوە هەڵەبوو. سەرباری ئەوەی خۆشت ئەویێم و خۆشم ئەوێی، بەڵام ژیان لەگەڵ تۆدا ئیتر بۆمن قابیلی تەحەمول کردن نییە. من لە تۆ تێناگەم تۆیش لەمن هەروا. بەتی بچکۆلەشم نەبرد تا واتێنەگەی لەئێستاوە ئەمەوێ شەڕ هەڵگیرسێنم. ئەگەرچی بۆمن دژوارە، بەڵام تا دادگا یەکلایی ئەکاتەوە منداڵەکە لای تۆ جێدەهێڵم. هەوڵدە راستییەکەی بۆ روونکەیتەوە. راستە لەپۆلی یەکە، بەڵام ئەم شتانە باش تێدەگات.

هاوسەری پێشووت: مەهتاب

نیوەڕۆ ئەچم بەشوێن بنیامیندا تا لەخوێندنگاوە بیهێنمەوە ماڵێ. لەسەر رێگە دوو ساندویچ بۆ نیوەڕۆ دەکڕم. نازانم چۆن بابەتەکەی تێگەیەنم. لە ئۆتۆمبێلەکەدا یاداشتی مامۆستاکەیم پیشان دەدات. نووسراوە لەبەرئەوەی هەفتەیەکی ماوە بۆ تاقیکردنەوەی سێیەم پێویستە لەماڵێ هەموو وانەکانی پێ دەورکەمەوە. کە دەگەینەوە ماڵێ هەواڵی دایکی ئەپرسێت و ژوورەکان دەگەڕێ. پێی ئەڵێم چووە بۆ ماڵی دایەگەورە. هەردووکمان لەدەوری مێزی نانخواردنەکە دائەنیشین و ساندویچەکە دەخەینە سەر بەرقاپێك، کە نانەکەمان تەواوکرد پێی ئەڵێم: کە من و دایکی شەڕمان کردووە. پێی ئەڵێم: ئەشێ هیچ کاتێ یەکتر نەبینین. چەند چرکەیەك لەچاوی وردئەبمەوە تا پەرچەکردارێك ببینم. شتێکم دەستگیرنابێت. پێی ئەڵێم: هەر کاتێ بیەوێ ئەتوانێ دایکی ببینێت. کاتێك قسە ئەکەم بێدەنگەو تەنیا قاشە تەماتەکان کە حەزی لێی نییە لە ساندویچەکە دەرئەهێنێ و لەلایەکی بەرقاپەکەوە دایئەنێت.

عەسر، بەرلەوەی بۆ زانکۆ بچم، بنیامین دەبەمە لای دایکم و مەسەلەکەی مەهتابی پێ ئەڵێم. دایکم ئەڵێ: مەهتاب کچێکی باشە. ئەهلی ژیانەو من سەرێکم هەیەو هەزار سەودا. ئەڵێ: لەسەرەتاوە دەبوو لەگەڵ ئەو ژیانت پێک نەهێنایە، ئێستا کە منداڵێکم لەو هەیە دەبێ کۆتایی بەو شەڕمێنێم و بچم بەشوێنیداو بیهێنمەوە ماڵێ. ئەڵێ: ژن و مێرد بۆیەکتر وەك درەخت وان کە ڕەنگە میوەیان تاڵ بێت، بەڵام هەمیشە سێبەریان فێنکە. تاڕادەیەك دڵنیام کە ئیتر مەهتاب ناگەڕێتەوە.

پاشنیوەڕۆ زووتر لەهەموو کاتێك وانەکە تەواو ئەکەم. حەوسەڵەی وەڵامدانەوەی پرسیاری خوێندکارەکانم نییە. لە زانکۆوە یەکسەر بەرەو نووسینگەی گۆڤارەکە دەڕۆم. تازە بوومەتە بەرپرسی بەشی فەلسەفەی مانگنامەی(بیری نوێ). چەند وتارێك گەیشتوونەتە نووسینگەی گۆڤارو خەریکی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانم و ناتوانم بیانخوێنمەوە. یەکێك لە وتارەکان لەوانی تر سەرنج ڕاکێشترە: (بیری فەلسەفەی ڕۆژاواو خەیاڵی تەنیای لەناو زۆرینەدا). لەپشت مێزەکەوە هەڵدەستم و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە ئەکەم: بەختەوەری بەسواری پاسکیلێکەوەیەو لەبەردەم پەنجەرەی نووسینگەکەمەوە تێئەپەڕێ. پیاوێك منداڵێکی بچووکی لەپێشەوەی پاسکیلەکە داناوەو کچەکەیشی لەدواوە. کچە گرێی لەچکە سوورەکەی توند دەکاتەوە. بەژن و باڵای کوڕەکە هەمان بەژن و باڵای بنیامینە. بیری دوانیوەڕۆیەکی چەند ڕۆژ پێشترم دەکەوێتەوە کە کتێبی (دەردی نەمری) (ئۆنامۆ)م دەخوێندەوەو مەهتاب وەك جاران سینییە چاکەی لەسەر مێزەکەی بەردەمم دائەنا بێ پێشەکی و بەپێکەنینەوە وتی: خۆزگە هەموو نەخوێندەوار دەبوون. کاشکێ کەس دەرسی نەخوێندایە. کاتێك لەپشت مێزەکەوە بەرامبەرم دانیشت پێکەنین بەسیمایەوە نەما، زۆر بەجدی وتی: (بەبۆچوونی من ئەوانەی کە هیچ شتێك نازانن بەختەوەرترن.) پاشان دەستی خستە سەر مێزەکەو کوپێك چای بەرەو رووی من هەڵداو چەند قسەیەکی تری کرد کەمن گوێم لێنەبوو. من لەو پەڵانەم ئەڕوانی کە لەسەر پشتی دەستی دروست ببوون. گومانم لەقاپ شۆرینی زۆربوو. پارەنگە بەهۆی وایتسکییەوە بووبێت کە بە چەرچەفە سپییەکانیەوە دەکرد.

لێی پرسیم: (تۆ چی ئەڵێی؟)

من کە لە پرسیارەکەی تێنەگەیشتم قامکم خستە سەر یەکێك لەپەڵەکان و پێم وت: (تۆ خودی خۆشبەختیت.)

چەند ڕۆژێك تێپەڕیوەو شەو درەنگێك بۆ ماڵ ئەگەڕێمەوە. دایکم بنی لەباوەشکردووەو هەردووکیان لەسەر قەنەفەیەکی کۆنی تەختەی گۆشەی حەوشەکە خەوتوون. دایکم ئەڵێ: دایکی مەهتاب پاشنیوەڕۆ تەلەفۆنی کردبووەو وتوێتی کچەکەی وەك کەسێك لەبەرزییەکەوە بەربووبێتەوە خواری گێژو وێژ بووە. دوای نانی ئێوارە دایکم ئەڵێ: ناتەوێ بچیت بەشوێنیدا؟ ئەڵێم: ئیتر مەهتاب ناگەڕێتەوە، چونکە لەناخی ئەودا زیری نەبوو ئێستا کە زیری نیشانداوە کەواتە ناگەڕێتەوە. ئەڵێم: گەر پێشتر قسەمان لەو بارەیەوە بکردایە ڕەنگە بگەڕایاتەوە، بەڵام کاتێك هەموو شتێك کتوپڕ ڕوویدا مانای ئەوەیە کە شتێك تەقیوەتەوە. دواتر لە چرچولۆچی گۆشەی چاوەکانی دایکم وردەبمەوە پێم سەیرە پێشتر ئەو چرچولۆچانەم نەبینیوە. ئەڵێم ڕۆحی ئەو وەك مینڵدان تەقیوەو ئێستا پارچە پارچەبووە. وەك ئەوەی دڵی بۆم بسووتێ ئەڵێ: (ئەتەوێ بڕۆم

بەشوێنیدا؟) لەژێر لێوەوە بەخۆم ئەڵێم: (هەموو خەتای من بوو) من بەداس مەهتابم دروەکرد. دایکم ئەپرسێت: چی ئەڵێی؟ ئەڵێم: (هەر کارێك پێت خۆشە بیکە.)

شەو بەر لەنووستن، بۆ ئەوەی بیری مەهتاب نەکەم دەفتەری ئیملاکەی بنیامین لە جانتاکەی دەرئەهێنم و دەکەومە هەڵدانەوەی پەڕەکانی. دوا ئیملای کە ئەمڕۆ کردویێتی، نۆزدەو نیوی هێناوە. بۆ یەکەم جارە کە نمرەی لەبیست کەمتر ئەهێنێ. مامۆستاکەی لەژێر وشەی (دۆست) یەکی بچووکی خستۆتە سەر بەمانای نیو هەڵە.(س)ی (دۆست) کە بنیامین نووسیویێتی دوو چوکڵەی هەیەو مامۆستاکە سزای داوە تا دەجار وشەی (دۆست) لەژێر ئیملاکەیدا بنووسێت. سەیری سزاکە ئەکەمو سەراسیمەییم زیاتر دەبێت: (دۆست)ەکان سێ چوکڵەیان هەیەو هەندێکیان چوار چوکڵەیش.

نیوەڕۆ بەنی لە خوێندنگاوە بەرەو ماڵی خۆمان ئەهێنمەوە. لەبەر ئەو مەعکەرۆنی دروست ئەکەم. زۆری حەز لە مەعکەرۆنیە. تۆزێ بێ خوێیە، بەڵام ئەوەندەنا کە بنیامین هەستی پێبکات. تامن خواردنەکە لەسەر مێزەکە دائەنێم بنیامین ئینجانەی ناو باخەکە ئاو ئەدات. پارییە هەمیشەییەکەمان دەست پێئەکەین: چەند تاڵە مەعکەرۆنییەك جیائەکەمەوەو سەرێکی ئەخەمە دەمی بنیامینەوەو سەرەکەی تریشی بۆ دەمی خۆم. بەئاماژەیەکی من دەکەوینە خواردنی و لەیەکتر نزیك دەبینەوە تالوتمان بەر لوتی یەکتر دەکەوێت و هەردووکمان پێدەکەنین. پاشان بەپشتی کەوچکەکە ماکارۆنییەکە لەبەرقاپەکەدا ساف ئەکەمو ساسی تەماتە کە لە ورچێکی پلاستیکیدایە بەدەستەوە ئەگرم و وەك هەمیشە ئەپرسم: (باشە، چی بنووسم؟) تۆزێ بیردەکاتەوەو دواتر وشەیەك دەڵێ کە من دڵم دادەخورپێ و بەسەر خۆمی ناهێنم.

ئەڵێ: (مەهتاب!)

گوشار دەخەمە سەر ورچە بوکەڵەکە تا ساسی سوور بە باریکی لەسەری بوکەڵەکەوە بێتە دەرو لەسەر ماکارۆنییە زەردەکە ئەنووسم: (مەهتاب). بنیامین لەژێر لێوەوە ناوی دایکی دووبارە ئەکاتەوەو منیش بە بیانووی سەیرکردنی دواوە ناوڕ بۆ گوڵەکان ئەدەمەوەو چەند چرکەیەك ناوا ئەمێنمەوە تا چاوەکانم ئەسووتێنەوەو تەڕ ئەبن. کاتێکیش بەپشتی دەستم چاوەکانم پاك ئەکەمەوەو ناوڕ ئەدەمەوە ئەبینم تەنیا(ب)ی مەهتابەکە لەناو بەرقاپەکەدا ماوە. باقییەکەی تری بنی خواردویێتی.

ئەپرسم: (ئەگەر بڵێی "ب" وەکو چی؟)

بنیامین هەرچەند بیرئەکاتەوە شتێکی بەخەیاڵدا نایات. بەدوو پەنجەم سەری لوتی ئەگرم و ئەڵێم: (وەکو بنیامین.)

بەیانییەکەی دایکم دەبەم بۆ سێ شەممە بازاڕو لەوێوە ئەڕۆم بەرەو زانکۆ. ئەبێ وانەی(مبانی فەلسەفەی عیلم) بڵێمەوە. لە ئۆتومبیلەکەدا بەدەست خۆم نییە دەکەومە بیری قسەکانی مەهتابەوە کە ڕۆژێکیان پێی وتم: (بەزەییم بە فەیلەسوفەکاندا دێتەوە.) پرسیم: (بۆچی؟) وتی: (لەبەر ئەوەی تەمەنێك خۆیان ماندوو ئەکەن تا تێبگەن چی بەچییەو لەکۆتاییشدا وابیردەکەنەوە کە تێگەیشتوون، بەڵام تێنەگەیشتوون و هەمان شێوە ئەمێننەوە تا ئەمرن.) لێم پرسی(چوزانی کە تێنەگەیشتوون چی بەچییە؟) دواتر پێکەنی و وتی: (لەبەر ئەوەی گەر تێبگەن چی بەچییە ئیتر بە فەیلەسوف نامێننەوە.)

دوای زانکۆ ئەڕۆمە نووسینگەی گۆڤارو ئەو وتارەی کە چەند ڕۆژێك پێشتر نەمتوانیبوو بیخوێنمەوە، ئەیخوێنمەوە. لە گۆشەیەکی

وتاری (بیری فەلسەفەی ڕۆژاواو خەیاڵی تەنیای لەناو ڕۆریڤەدا) ئەنووسم: (بۆ بڵاوکردنەوە باشە.)

پێش نیوەڕۆ دەگەمەوە ماڵێ. بنیامین لە قوتابخانەیەو بەتەنیا لەماڵەوە پیاسە ئەکەم. هەموو کونجێکی ماڵەکە بۆنی مەمتابی لێدێت. وەک بڵێی هەموو شتێکی ماڵەکە پارچەیەکی مەمتابی قوتداوەو وەک مەمتابی لێهاتووە. دارو دیواری ماڵەکە یادەوەرەیی مەمتابیان لێ ئەبارێت. سەیری هەرچییەک ئەکەم یادەوەریی مەمتابی تێدا دێتە دەرێ. کاتژمێری دیوارەکە، رادیۆ، بەرقاپ، مەکینەی دروومان، چەقۆی چێشتخانەکە، مێزو کورسی، چوارچێوەی وێنەکان، ڕۆژژمێری سەرمێزو تەنانەت کەوچک و چەتاڵەکانیش پڕن لە مەمتاب. وەک بڵێی مەمتاب ئەمانەی ڕیزکردبێت. ئەچمە ژوورەکەی خۆم. لای کتێبەکان شوێنەواری مەمتاب نییە. چونکە هیچ یەکێک لە کتێبەکانی نەخوێندۆتەوە، تەنانەت دەستیشی لێ نەداون. لەپشت مێزی خوێندنەوەکەوە دائەنیشم و چوارچێوەی وێنەکەی سەرمێزەکە هەڵدەگرم کە لە وێنەکەدا بنیامین و مەمتاب پێئەکەنن. دەستم ئەکەمە پایە بۆ سەرم. لوول ئەبم. چاوم بە کووپی گۆشەی مێزەکە ئەکەوێت. کووپەکە بێ مەمتابی پێوە دیارە.

چەند ڕۆژێکە هاتوومەتە لای دایکم، رەنگە بەم جۆرە زووتر مەمتابم بیرچێتەوە. دایکم دوێنێ بنیامینی بردبووە لای مەمتاب. ئەڵێ: مەمتاب لەدادگا داوای جیابوونەوەی کردووە. ئەڵێ: مەمتاب بە دادوەرەکەی وتووە کە مێردەکەم بە لاستیکی خەت کوژێنەوە منی لە ژیانی خۆیدا سڕیوەتەوە.

ئێوارەی یەک شەممەیە. دوو ڕۆژی تر تاقیکردنەوەکانی بنیامین دەست پێئەکەن. پێی ئەڵێم: دەفتەرو کتێبەکانت بێنە تا ئیملات پێبکەم. دایکم لە چێشتخانەکەدا نانی ئێوارە ئامادە ئەکات. باوکیشم لە هۆڵەکە سەیری تەلەفزیۆن ئەکات. بنیامین بەسەر دەفتەرەکەیدا درێژ دەبێت و چاوەڕوانی منە تا ئیملاکە دەست پێبکەم. ئەڵێم: سارا سەبەتەیەکی بەدەستەوەیە. بنی دەست ئەکات بەنووسین. ئەمە یەکەم جارە لە خێزانی ئێمەدا جیابوونەوە ڕووئەدات. لەو ژنە دەرزیی پێیە. دەفتەر رەسمەکەی بنی لە جانتاکەی دەرئەهێنم تا سەیری وێنەکانی بکەم. ئەو پەدەرزی دامێن ئەدروێ. هەفتەیەک ئەبێت مەمتابم نەبینیوە. وائەزانم هەزار ساڵە. بەڵام ئەبێ فەرامۆشی کەم. ئەو ئەسپە خێرا غار ئەدات. بنیامین چاوەکانی بە کاغەزەکەوە نووساندووەو چوکڵەکانی(س)ی ئەسپەکە ئەژمێرێت. لاپەڕەی دەفتەر رەسمەکەی بنی هەڵئەدەمەوە: میزڵدانێک لە ئاسمانە. بنیامین سەیرم ئەکات و منیش وەڵامی ئەدەمەوە: ئەکرەم سێ ڕۆژ نەخۆش بوو. چاوم بەیەکێک لە پەڕەکانی دەفتەرەکە ئەکەوێت و وشکم ئەکات: هەزار نوقتەی رەشی بەقەڵەمەکەی دروستکردووە. مریەم قەڵەمەکەی ونکردبوو. کەوتمە بیری چەند هەفتەیەک پێشتر کە مەمتاب ئەو گۆی زەوییەی لە کتێبخانەکە بوو هێنای و لێی پرسیم: (ئێمە لەکوێی زەویداین؟)

منیش بەنووکی قەڵەمەکەی بنیامین یەک نوقتەم پیشانداو وتم: (لێرە!)

مەمتاب وتی: (وای! زەوی چەند گەورەیە!)

دواتر دەفتەرەکەی بنیامین کە لە تەنیشتمەوە بوو هەڵمگرت و لەسەر لاپەڕەیەکی سپی یەک نوقتەم کردو وتم: (وای دابنێ ئەمە خۆرە) و پاشان بەنووکی قەڵەمەکە نۆ جار بەدەوری ئەودا سووڕاندم و وتم ئەم زەوی و ئەستێرانە بەدەوری خۆردا ئەسووڕێنەوە.

مەهتاب پێکەنی و وتی: (ئەو نوقتە بچووکە زەویی ئێمەیە؟)

لە خوارەوەی پەڕەکە توند توند بەنووکی قەڵەمەکە نوقتەم کێشا تا گۆشەی پەڕەکە ڕەشبوو. وتم: (هەر یەکێك لەم نوقتانە ئەستێرەیەکە وەك خۆری ئێمە. کاکێشانەکەی ئێمە دووسەد هەزار ملیۆن ئەستێرەی هەیە.)

مەهتاب وتی: (چەندە زۆرە!)

پاشان لە گۆشەیەکی تری کاغەزەکەوە دووبارە بە قەڵەمەکە نوقتەی زۆرتر ئەکەم و ئەڵێم: هەر یەکێك لەم نوقتانە کاکێشانێکە. دنیای ئێمە سەد هەزار ملیۆن کاکێشانی هەیە. لەهەر کاکێشانێکیشدا بەملیۆنان ئەستێرە هەیە. ئەستێرەگەلێك کە وەك دۆزەخ گەرمن.

مەهتاب ئەپرسێت: (ئەی بەهەشت لەکوێیە؟)

من دەستیم ئەگرت و لە هێڵەکانی دەستی وردئەبوومەوەو بەقامکم ئاماژەم بۆ ئەکردو ئەموت: (ئەشێ لێرە بێت.)

مەهتاب وتی: (گاڵتە مەکە.)

ئەڵێم: ئەو پیاوە داسی پێیە. بنیامین خەوی لێکەوتووە.

دایکم لە چێشتخانەکەوە بانگ دەکات: (تا چەند چرکەیەکی تر خواردنەکە ئامادەیە.)

ڕائەکشێم و ئەخوێنمەوە: شەو بوو. مانگ لەپشت هەورەکانەوە بوو. ئامین و ئەکرەم سەیری ئاسمانیان ئەکرد. ئەوان مانگ و ئەستێرەکانیان نەئەبینی. هەموو جێیەك تاریك بوو. مانگ لەپشت هەورەکانەوە هاتەدەرێ. مەهتاب زەوی ڕووناك کردەوە. ئەکرەم وتی: بەه بەه! مەهتاب هەموو جێیەکی ڕووناك کردۆتەوە.

بنیامین خەوتووە. لەسەرخۆ، دەفتەری ئیملاکە لەژێر چەنەی دەرئەهێنم. تا(ئەو پیاوە داسی پێیە) بەخەبەر بوو. باقی ئیملاکەی تری نەنووسیوە. سەیری دوا ڕستە ئەکەم. ئەو(داس)ەی نووسیویێتی چوکڵەیەکی زیادەی هەیە.

**سەرچاوە:**

عشق روی پیاده رو، مجموعه داستان کوتاه، مستەفا مەستور – نشر رسش، اهواز.

# فایلی ژماره..




## ناسیۆنالیزم

# زانستە سیاسیەکان و ناسیۆنالیزم

دەیڤد د.لیتین

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

ناسیۆنالیزم لە زانستە سیاسیەکاندا لەژێرناونیشانی جیاواز و لەچەند بەشێکی فەرعیدا خراوەتە ژێر باس و توێژینەوە. لەم وتارەدا هەموو بانگەشەیەکی خۆبەڕێوەبردنی سیاسی لەسەر بناغەی کلتوری هاوبەش (وەك زمان و مەزهەب یان دابونەریت) لەلایەن کۆمەڵێکەوە، بە بانگەشەیەکی ناسیۆنالیستی بەمانای فراوانی وشە دانراوە. ئەو بزووتنەوە سیاسیانەی کە بەگشتی وەك بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی، خوار ناسیۆنالیستی یان بان ناسیۆنالیستی ئاماژەیان بۆ دەکرێت، لێرەدا وەك بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی دەخرێنە ژێر باسەوە. لەگەڵ دەرککردنی ئەم پێشەکیەدا دەبێ بگوترێت کە زانستە سیاسیەکان لەسێ لقی لاوەکی خۆیدا، بەشداریەکی سودمەندی لە ناسینی ئێمە بۆ ناسیۆنالیزم کردووە. لەتیورەی سیاسیدا – ئەگەرچی بەرێژە درەنگ پێی خستۆتە ئەم مەیدانەوە – بیرکردنەوە لەبارەی ناسیۆنالیزمەوە لەدوو ئاراستەدا پەرەیسەندووە. لە فەلسەفەی سیاسی ئازادیخوازانەدا، بیرکردنەوەیەکی زۆر لەبارەی پەیوەندی ناسیۆنالیزم و ئازادیخوازی کراوەتەوە و ئەم پرسیارە هێنراوەتە ئاراوە ئایا ئەم دوانە بەیەکەوە دەگونجێن، و ئەگەر دەشگونجێن چ سنوردارێتییەك هەیە. لە نەریتی تیورەی سیاسی گشتیدا لە هیگڵ و مارکسەوە بیگرە تا لایەنگرانی گونجاندنی ئامانجە جیاوازەکان لەناو یەك ئامانجدا، وتوێژی ڕۆشنگەرانە سەبارەت بە واقعیەتی کۆمەڵایەتی نەتەوە هەروا بەحەماسەتەوە بەردەوامە. لە سیاسەتی تەتبیقیدا نەریتێکی درێژخایەن لەبارەی دروستکردنی نەتەوە لەناو سنورەکانە وڵات و پرۆسەکانی ڕودانی ئەمکارە، بوونی هەبووە. لە پەیوەندیە نێونەتەوەییەکاندا لێکۆڵینەوە لەبارەی پەیوەندی ناسیۆنالیزمە بە جەنگی نێوان وڵاتەکانەوە (بەم دواییانە جەنگ لەناو خودی وڵاتەکانیشدا)، یارمەتیەکی گرنگی تێگەیشتنی ئێمە بۆ ناسیۆنالیزم کردووە. لە هەریەك لەم بەشە لاوەکیانەدا زانایانی زانستە سیاسیەکان بەشێوەیەکی بەربڵاو قەرزیان لە بوارەکانی تری وەك مێژوو، کۆمەڵناسی، ئابوری

و خەڵکناسی کردووە. زانایانی زانستە سیاسییەکان تا ئەندازەییەک _و لە ئەنجامی تێبینی کردنی بوارەکانی تردا بۆ ناسیۆنالیزم_ ئەو مەسەلانەی کە دەتوانن بەهۆی پێگەی تایبەتی خۆیانەوە، رۆڵێکی تایبەتیان تیایدا هەبێت، نادیدە گرتووە. مەسەلەکانی ناسیۆنالیزم وەك رێبازێکی سیاسی بۆ دەسەڵاتی وڵات و ئەو ئەگەرەی کە شوناسی نەتەوەیی لەبەرامبەر شوناسەکانی تری گروپدا، ببێتە بناغەی رێکخستنی سیاسی، و هەروەها هاوسەنگی سەرلەنوێی وڵاتەکان لەم جیهانە پەشۆکاوەدا، هەموو ئەمانە لەپەراوێزی بەشی زانستە سیاسییەکاندان، بەڵام ئامادەی شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی سیاسی ئامانجدارن.

**دوهەم: تیۆرەی سیاسی**

تیورەسازی لەبارەی نەتەوەوە زۆر درەنگ هاتە ناو نەریتی تیورەی سیاسییەوە. بە سەرنجدان لەو دیدە بێوێنانە لە سیاسەتدا کە لە یۆنانی دێرین وەبەردەهێنرێت، ئەو خاڵە جێگەی سەرنجە کە ئەمڕۆ تیۆرە سازانی نەتەوە و ناسیۆنالیزم، زۆر بەدەگمەن پشت بەو نوسراوانە دەبەستن کە بەر لە مۆنتیسیکۆ و رۆسۆ لەبواری تیورەی سیاسیدا نوسراوە. مۆنتیسیکۆ لە سەدەی هەژدەدا لە "رۆحی یاساکان"دا دەستی بە رونکردنەوە و شیکردنەوەی کۆمەڵێك مەسەلەی هەڵنەسەنگێنراو کردووە و پێشنیاری ئەوەی کرد کە دەبێت دەستور لەگەڵ ئەو شتەدا کە ئەمڕۆ دەتوانین ناوی بنێین "کلتوری سیاسی کۆمەڵ" هاوئاهەنگ بێت. مۆنتیسیکۆ لە "نامە ئێرانییەکان"دا ئەم جیاوازیانەی لەشێوەی رەخنەیەکی سیاسیی گاڵتەئامێزدا لە فەرەنسا– وەك لە ئاوێنەی شەوستانی ئێرانیدا دەبینرێت– گەورە کردووە و نمایشی دەکات. رۆسۆ لە ئاوتوێکردنی جیاوازییە نەتەوەییەکاندا کەمێك ئەکادیمی تر بوو. رۆسۆ لە وتارێکی خۆیدا لەبارەی دەستوری پۆڵەنداوە بەڵگەی هێنایەوە خەڵکی نابێت هاوڵاتی وڵاتێك بن، مەگەر دابونەریتی ئەو وڵاتەیان هەبێت و لێرەوە پێشنیار بۆ پۆڵەندییەکان دەکات کە پانتایی وڵاتەکەیان کەمبکەنەوە، تا ئەو سنورەی کۆی ئەندامانی کۆمەڵگای سیاسی، پۆڵەندی بن. رۆسۆ لە پەیمانی کۆمەڵایەتیدا بیرۆکەی دینی مەدەنی پەرەپێدا و لە یەکەم لاپەڕەکانی ئەمیلدا بیرۆکەی هاوڵاتی نیشتیمان پەروەری هێنایە ئاراوە. رۆسۆ لەم بەرهەمانەدا تیورەییەك پێشکەش دەکات لەبارەی ئەوەی چۆن هاوڵاتیبوون دەکرێت بەدەست بێت. هەرچەندە لەبارەی ئەو دەورەوە کە بیری ئەندامێتی نەتەوە دەتوانێت لە پرۆسەی بەدەستهێنانی هاوڵاتیبوندا هەیبێت، رونکردنەوەییەکی روون نادات بەدەستەوە. ئەم بیریارە مەزنانە نەك لەبەر تێڕامانیان لەبارەی ناسیۆنالیزمەوە، بەڵکو لەراستیدا سەرەڕای ئەم تێڕامانانە، لەبواری تیورەی سیاسیدا هەروا لەئارادان و لەجێی خۆیاندا مابن.

تیورەسازانی ناسیۆنالیزم کە لە سەدەی نۆزدەدا دەیاننوسی_ فیختە (کە بڕوای بەوە بوو کە نەتەوە وەك "کۆمەڵگایەکی خاوەن ئیرادە هێزێکی بەزەبری هەیە کە دەتوانێت وڵات و ئابورییەکی بەهێز دروستبکات)، هیردەر (کە بناغەی نەتەوەیی کۆمەڵگای سیاسی لە گوتارە جەماوەرییەکاندا دەبینی) و رینان (کە دروستکردنی شوناسە نەتەوەییەکانی بۆ مەبەستی سیاسی–هەم بەهۆی رابەران و هەم بە هۆی پەیڕەوانەوە– بە شتێکی بەدیهی دەزانی)– ئەمڕۆ بەکردەوە لە پانتایی تیورەی سیاسیدا فەرامۆشکراون. بەرنامەی کار و فۆرمەلەکانی ئەم بیریارانە (جگە لە هەندێك پەراگرافی

سەرســـوڕهێنەری ڕینـــان) لـــە دەرەوەی ئـــەم پانتاییەدان.

**ئەلف: تیۆرەی لیبرالی**

ئەزموون و شیکردنەوەی نەتەوە نەك هەر تەنها درەنگ هاتە ناو تیۆرەی سیاسیەوە، بەڵکو لقە لیبراڵیەکەی بە سەرسەختیەوە ناسیۆنالیزمی فەرامۆشکرد. ئەم خاڵەش خۆی پێویستی بە ڕونکردنـــەوە هەیـــە. پـــەیمانخوازانی (*contractualists*) سەرەتا ئەو شتەیان وەسف دەکرد کە میهتا ناوی نابوو دۆخی سروشتی (خاڵی لە خەڵکناسی) و دەکرێ بگوترێت کە نەریتی ئازادیخوازانەی سەدەی نۆزدە سروشتی بە یەکە نەتەوەییەکان پڕنەکردەوە. جگە لەهەندێك دروشمی توندڕەوانەی جیمز میل-کە لە دەرەوەی ئەم حاڵەتانەدا، ئەو خۆی ئازادیخوازە- (لەکتێبی مێژووی هیند دا کە لەچەند بەرگێك پێکهاتووە)، هەڵسەنگاندنە ناسەقامگیرەکانی جۆن ستیوارت میل (کە تیایدا گوتوێتی ئەو دەوڵەتانەی لەسەر بناغەی نوێنەرایەتی دروستبوون، لەحاڵەتی بوونی کلتووری جیاوازدا، کارایییان نیە)، یان ئەو پەرەگرافە وەسوەسەئامێزانەی ماکس فیبەر (لەوانە لەبارەی پەیوەندی نەتەوە و وەفاداری بۆ نیشتیمان)، (جگە لەمانە) تیۆرەسازانی ئازادیخواز کە تێڕوانینێکی پەیمانخوازانە، سودخوازانە و سۆسیۆلۆجیانەیان هەبوو، بەشێوەیەکی سەیر لەبەرامبەر ئەو ناوەڕۆکانەی پەیوەندی بە نەتەوە و مافی دروستکردنی دەوڵەتەوە هەبوو، بێدەنگ بوون. یەکێك لەبەهانە باوەکان ئەوەیە کە-وەك ستیڤان هۆمز دەڵێت- لیبڕالیزم هەر لە سەرەتاوە بەرلەوەی ڕۆحی سەردەم بێت، تێزێك بوو کە بۆ چارەسەرکردنی کێشە پراکتیکیەکان هاتبوە ئارا. کێشەی مەزهەبی لە قۆناغی لوتکەی تیۆرسازی لیبڕالیدا، کۆمەڵگای پارچە پارچە دەکرد. وەڵامی لیبرالیزم کە لەسەر بناغەی لێکبوردن و ئاسانگیری بوو، پێویستی دەکرد کە ئازادی بیروڕا بەهەر تاکەکەسێك بدرێت. لەم ناوەدا ئەو کێشانەی ڕوبەڕوی گروپە نەتەوەییەکان دەبوەوە-واتە پێویستی بوونی دەوڵەتێك بۆ درێژەدان بە مانەوە- تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە لە بەرنامەی کاری سیاسیدا نەبوو، تەنهاش بە ڕوخانی ئیمپراتۆری نەمسا-مەجەرستان بەرجەستەبوو. لەم سەردەمەدا تیۆرەی لیبرالیزم ئیدی هەندێك لەو گەرموگوڕی و هەژانەی لەبەرامبەر کێشە تازە سەرهەڵدراوەکاندا لەدەستدابوو.

بەدرێژای جەنگی جیهانی یەکەم ودرۆ ولسۆن (یەکێك لە سەرۆکە پێشوەکانی "ئەنجومەنە زانستە سیاسیەکانی ئەمەریکا") لیبرالیزم و ناسیۆنالیزمیان بەشێوەیەکی نوێ بەیەکەوە گرێدا. ئەویش لەژێر کاریگەری ئەو بەڵگاندنانەی کە پێشتر بەهۆی ئیمانۆیل کانتەوە هێنرابووە ئاراوە و هەم ڕەنگە زۆرتر لەژێر کاریگەری واقعی عەمەلی ئەو شتەدا کە بەبڕوای ویلسۆن بە کەموکوڕی ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانیدا دەژمێررا، بڕوای وابوو دیموکراسیەکان کەمتر لە وڵاتە دیکتاتۆریەکان دەستدرێژیکەرن، و بەڵگەی دەهێنایەوە ئەگەر هەموو خەڵکی سەر بەیەك نەتەوە بن، ئەگەری بەرپابوونی دیموکراسی لیبرالیانە لە وڵاتدا زیاتر دەبێت. لێرەوە سووربوو لەسەر ئەوەی وەك بەشێك لە ڕێکەوتنەکانی پەیوەندیدار بە جەنگی جیهانیەوە، مافی خودموختاری لەڕێگەی گەڕانەوە بۆ ڕای گشتی، بەهەموو نەتەوەکان بدرێت.

ئەو کێشە مەزنە پراکتیکیانەی بۆ بەدیهاتنی ئەم بنەمایە لە چوارچێوەی بنەماکەی ڕەمزی ویلسۆن هاتە پێشێ، بەتایبەتی بە سەرنجدان لەو کۆمەڵگایانەی کە لە سەرتاسەری ئەورووپای

خۆرهەڵاتدا لەرووی زمویەوه تێکەڵبوون، خودموختاری وەك بنەمایەکی سەرەکی لیبرالی بێبایەخ کرد، و پێشوازیکردنی نازیەکانی ئەڵمانیا لە وێنەی خەیاڵیی دیموکراسی، هەموو جۆره پەیوەندیەکی نێوان دروشمە نەتەوەیی و بنەما لیبراڵیەکانی بێبایەختر کرد. تەنها لە چوارچێوەی بزوتنەوەی دژ بەکۆلۆنیالیزمی دەیەکانی ١٩٤٠دا بەرابەرایەتی خوێندەوارە ئەفەریقی و ئاسیاییەکان بوو، کە جارێکی دی زانایانی لیبراڵی زانستە سیاسیەکان (بەگشتی لەدەیەی ١٩٥٠دا) مەسەلەی پشتگیری لیبرالیزم لە ناسیۆنالیزمیان هێنایە ئاراوە. بەرهەمەکانی رۆبرت ئیمرسۆن کە سەرەڕای ئەوەی هوشیارە بەو کێشە پراکتیکیانەی روبەروی بەدیهاتنی دروشمە نەتەوەییەکان دەبێتەوە، بەسووربونی لەسەر ئەوەی کە لیبراڵەکان ناتوانن نکوڵی لە دروشمە نەتەوەییەکانی نەتەوەکان بکەن، یارمەتی گۆڕینی مەلومەرجەکانی دا بەئاراستەی بەدەستهێنانی بەرگریکردنی لیبراڵەکان لە بزوتنەوە سەربەخۆیخوازەکانی جیهانی سێیەم لەژێر ئاڵای ناسیۆنالیزمدا. لە دەیەکانی ١٩٧٠دا فۆرنون وین دایك لەچوارچێوەی ولاتە فرە نەتەوەییەکانی پاش کۆلۆنیالزمدا، کۆمەڵێك پێوەری لیبرالیانەی بۆ سەرکەوتن بەسەر پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤی کەمایەتیە نەتەوەییەکان پێشکەش کرد، پێدەچوو لیبرالیزم بتوانێت یارمەتی رێکخستن و تەنسیقی بانگەشە ناسیۆنالیستیەکان بدات.

لە زانستە سیاسیەکاندا پەیوەندی ناسیۆنالیزم و نازیزم بەشێوەی وێنایەکی بەهێز مایەوە. زانایانی پارێزکاری وەك جیمز گرگۆر بەمنیازبوون ئایدۆلۆژیا ناسیۆنالیزمیەکانی جیهانی سێیەم، لەرێگەی پەیوەندی دروستکردنی عەقڵانی ئەم ئایدۆلۆژیانەوە بە تێزەکانی ناسیۆنال سۆسیالیزمەوە بێبایەخ بکەن، و زانایانی لیبراڵ وەك چاندرلن کۆکاتاس هەروا جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکەن کە لیبرالیزم پارێزگاری لە هەموو هاوڵاتیان بەدەر لە کلتوری نەتەوەییان دەکات. لێرەوە نەتەوەکان وەك نەتەوە، پێویستیان بە ناسینەوە نیە.

بەمشێوەیە جوڵەی باو لە ئەریتی لیبرالی سەدەی بیستدا وەك یەك پیشانیەدا، دابەشکردنی جیهان بوو بۆ دوو گروپی لیبراڵ و ناسیۆنالیستەکان کە ناونانەوەی جیاوازیان لێناوە. لەروانگەی "کارلتۆن هیز"ەوە ناسیۆنالیزمی (لیبراڵی) لە بەرامبەر بە ناسیۆنالیزمی "تەواو"دا رادەوەستێت (لەگەڵ پۆلێنکردنێکی سێهەمیشدا -ناسیۆنالیزمی کلاسیکی- کە تاڕادەیەك لە ناسیۆنالیزمی تەواو نەرمترە). لە دیدی "جان پلامیناتز"ەوە ناسیۆنالیزمی خۆرهەڵاتی (وەك جۆری دەمارگیرانە) لە بەرامبەر ناسیۆنالیزمی رۆژئاوایی (وەك جۆری لیبرالیانە)دا بوو. لە روانگەی "ماینك"ەوە ولاتە "کلتوریەکان" لە بەرامبەر ولاتە "سیاسیەکاندا" بوون. وەك میخائیل ئیگناتۆف پیشانیەدات، هەر ئەم دوو پارچەبوونە لەقۆناغی روخانی فدراسیۆنەکانی یوگوسلاف و سوڤیەتیشدا، دوبارە بە ناوەڕۆکێکی ناسیۆنالیستانە و وەك دوالیزمی تێڕوانینە نەتەوەییەکان بۆ نەتەوە، لەبەرامبەر تێڕوانینە "مەدەنیە"کاندا دەردەکەوێتەوە.

ئەم دوالیزمانە سەرسوڕهێنەرن. بۆ نمونە پۆلینکردنی "نەتەوەی مەدەنی" خەسڵەتێکی ناکۆك و دژبەیەکی هەیە، و وشەی "نەتەوە" ئاماژە بۆ کۆمەڵگایەك دەکات کە مرۆڤ تیایدا لەدایکبووە، لەکاتێکدا وشەی "مەدەنی" ئاماژە بۆ کۆمەڵگایەك دەکات کە مرۆڤ لەڕووی هەڵبژاردنەوە یان لەرووی باوەڕی هاوبەشەوە، سەر بەوە. لەحاڵەتێکدا گەر باوەڕی هاوبەش پەیوەندی بە باوانی هاوبەشەوە هەبێت، یان

ئەگەر هەڵبژاردنی خەڵك لەسەر بناغەی بڕوابوون بە لاوانی هاوبەش بێت، ئایا ئایدیای نەتەوەیی مەدەنیە؟ خاڵی خراپتر ئەوەیە لەم دوالیزمانە تیورەیەکی بەنرخ لە ناسیۆنالیزم بەدەستەوە نادەن. بۆ نمونە ئرنست هاس بەشێوەیەکی مەنهەجی هەوڵیدا تا ئایدۆلۆژیە ناسیۆنالیستیەکان پۆلێنبکات و بیانبەستێتەوە بەپلەی جیاوازی سەرکەوتن لەچاکسازی وڵات و دیموکراسی و پێشکەوتنی مرۆڤەوە. ئەگەرچی پۆلێنکردنەکانی ئرنست هاس بۆ لێکۆڵینەوەکانی دوایی نرخی خۆی دەبێت، بەڵام هیچ پەیوەندیەکی سەقامگیر و بەردەوام لەنێوان جۆری ئایدۆلۆژیای ناسیۆنالیزم و دەرئەنجامە سیاسیەکان پیشاننەدراوە. کارەکەی ئرنست هاس (و هەروەها کارەکەی برووبیکەر) ئەو باشیەی هەیە کە بناغەی وێنا نادروست بەڵام باوەکان، بۆ دەرئەنجامە سیاسیەکانی تێزە جیاوازەکانی ناسیۆنالیستیەکان سست و لاواز دەکات.

ئەوەی لەو دوالیزمە باوانەدا ئادیارە کەلەلایەن بیریارانی لیبرالیەوە پێشکەشکراوە، وەڵامدانەوەی دوو پرسیاری ناچاریە لەبارەی ناسیۆنالیزمەوە کە بۆتە هۆی دەردەسەری بۆ هەموو لیبرالیەك: ١-تیورەیەك کە تەنها پلەی ئەخلاقی بەتاکەکان دەدات، چۆن ئەو بانگەشانەی پەیوەندی بە ماف و ئیمتیازاتی ئەو قسەکەرانەوە هەیە کەخۆیان بە نوێنەری "نەتەوەکان دەزانن هەڵدەسەنگێنێت؟. ٢-تیورەیەك کە هیچ سەرنجێك لە کلتور یان میرات نادات، سنورە سیاسیەکان چۆن ئاراستە دەکات؟.

ئەم پرسیارە ئازاردەرانە دواجار بوونە جێی سەرنجی تیورەسازانی لیبرالیزمی وەك بیل تەمبر، راسل هاردین و ویل کیمیلکا کە هەر هەمویان پشتیان کردۆتە دوالیزمە سادەکانی پێشینانی خۆیان. هاردین سورە لەسەر ئەو بڕوایەی کە هەموو بانگەشە ناسیۆنالیزمەکان بۆ وڵاتە لیبرالیەکان وەك ژەهر وان و مایەی لەناوبردنین. لیبرالەکان دەبێت هەوڵبدەن بناغەی ئەو پەیوەستبونانەی لەسەر بناغەی بانگەشەی نەتەوەی هاوبەشە، لاواز بکەن. کیمیلکا و تەمیر بەدوای ئەوەوەن بانگەشە نەتەوەییەکان لەبارەی دەوڵەتی لیبرالیەوە بەیەکەوە گرێبدەن (و بەمشێوەیە شێوازەکانی لەیەك جیابکەنەوە). بەرهەمەکانی ئەم سێ نوسەرە تێگەیشتنی ئێمە بۆ ئەو شێوازانە دەوڵەمەند دەکات کە تیاییدا نەریتە نەتەوەیی و لیبرالیەکان بەریەك دەکەون، و لێرەوە یارمەتی تێگەیشتنی باشتری ناسیۆنالیزم دەدەن.

"یەکێك بۆ هەموان" بەرهەمی هاردین باسی ئارەزوە دەمارگیریە ناسیۆنالیزمیەکان دەکات و ئەمکارەش لەرێگەی دروستکردنی پەیوەندی لەنێوان دوو واقعی کۆمەڵایەتیدا ئەنجامدەدات. گریمانەی یەکەم لەسەر ئەوە دادەمەزرێنێت کە گروپە نەتەوەییەکان بۆ هەنگاونانی کۆیی، خاوەن توانایەکی نائاسایین. دیدی سەرەکی لەم گریمانەیەدا ئەوەیە دەکرێت لەگەڵ ئەو گروپانەی لەسەر بناغەی کۆمەڵگا کە لەرێگەی چارەسەری کێشە سەرەتاییەکانی هاوئاهەنگیەوە دەسەڵات پەیدا دەکەن، بەئاسانی بەسەر ئەنجامگیری بەروکەش ئەسەفباری بەرهەمی کلاسیکی منکور ئۆلسن "لۆژیکی هەنگاوناني کۆیی" -واتە ئەوەی کە وروژاندنی هەنگاوناني کۆیی بەهۆی پاڵنەرە فەردیەکانەوە بۆ ئاسایش کارێکی ئەستەمە- زاڵ بین. لەو حاڵەتانەدا کە گروپ ئارەزوی هاوکاری دەکات، دەسەڵاتی هاوئاهەنگی یارمەتی چارەسەرکردنی کێشەکان دەدات. گروپە نەتەوەییەکان بەهۆی ئەزمونی کلتوری هاوبەشەوە، دەسەڵاتێکی هاوئاهەنگی بەرچاویان هەیە.

دووەم ئەوەی کە هاردین بەڵگەدێنێتەوە کە گروپە نەتەوەییەکان لەبەر هۆی جیاواز، کۆمەڵێک خەسڵەتی تایبەتی پەروەردە دەکەن کە ڕێزگرتن لە دیدی سیاسی بێگانەکان کەمدەکاتەوە. ئەم خەسڵەتانە خۆبەخۆ دەمارگیرانەن و ئارەزووکردنی بۆ یەکسان نەبوون لەگەڵ ئەوانی دیدا، مەترسیەکی بنەڕەتی بۆ کۆمەڵگایەکی لیبرالی فراوانتر دروستدەکات. بەمشێوەیە هاردین بڕوای وایە کە سەرنجدان لە قسەکەرانی گروپە نەتەوەییەکان و لێرەشەوە هێنانە ناوەوەی ئەم گروپانە بۆ ناو ژیانی سیاسی، بەردەوام مەترسیەکە بۆ بنەماکانی لیبرالیزم.

دەکرێ ئەو ئەنجامگیریە لە بیروڕاکانی هاردین بکرێت کە هیچ ڕێگەیەکی لۆژیکی نیە بتوانێت بنەماکانی لیبرالیزم لەگەڵ ناسیۆنالیزمی نەتەوە وەک نەتەوەدا بگونجێنێت. لەگەڵ ئەمەشدا دوو تیورەسازی لیبرال لە گونجاندنی ناسیۆنالیزم لەچوارچێوەی لیبرالزمدا، پێشکەوتنێکی گرنگیان بەدەستهێنا و ئەم نوسینانەش نەک هەر یارمەتی تیورەی لیبرالیزم، بەڵکو یارمەتی تێکەیشتنی ئێمەی بۆ توانا بەزەبرەکانی ناسیۆنالیزمیش پەرەپێداوە.

تەمیر لە ناسیۆنالیزمی لیبرالیدا شوناسی نەتەوەیی لە چوارچێوەی لیبرالیزمدا دادەنێت. بەوشێوەیە کە بانگەشەی ئەوە دەکات کە شوناسی نەتەوەیی، دەرئەنجامی هەڵبژاردنی فەردیە. ئەم شوناسە دەستنیشانکەری هەڵبژاردن (ولێرەوە سنوردارێتیەک لەسەر سەربەخۆی فەردی)نیە، بەڵکو شتێکی مەسرەفیە کە تاکەکان بەدەستی دێنن و لێرەوە دەستمایەیەکە کە وڵاتێکی لیبرال دەبێت پارێزگاری لێبکات. لەورووەوە کە تاکەکان خاوەن مافی کلتوریین، پێویست ناکات وڵاتی لیبراڵی پلەوپایە بە گروپە کلتوریەکان ببەخشێت. بەتایبەتی کاتێک ئەو گروپانە دوچاری کاری دەمارگیرانە بن. بەڵام وڵات دەبێت وەڵامی سەرجەم یەک بەیەکی هاوڵاتیانی بداتەوە کە دەیانەوێت متاڵەکانی خۆیان پەروەردەبکەن، تاوتوێی مەسەلە ئەخلاقیەکان بکەن و بەشداری لە وتوێژی سیاسی نێوان هاوڵاتیاندا بکەن. بۆ ئەم مەبەستە هاوڵاتیان داوای مافی نەتەوە – نەک سەربەخۆی– لانیکەم بۆ فەزای گشتی دەکەن، و وڵاتیش دەبێت لە ڕێگەی بنەماکانی لیبرالیزمەوە ئەم داوایە قبوڵبکات. تەمیر پێ لەسەر ئەو خاڵە دادەگرێت کە "دەبێ بۆ پاراستنی شوناسی نەتەوەیی، هەل دەرخستنی شوناس بە تاکەکان بدرێت، هەم بەشێوەیەکی تایبەتی و هەم بەشێوەیەکی ئاشکرا...بوونی فەزایەکی گشتی هاوبەش، مەرجی پێویستە بۆ زامنکردنی هێشتنەوەی نەتەوەیەک وەک کۆمەڵگایەکی چالاک و زیندوو"(١٩٩٣–ص٧٣).

یەکێک لەو پرسیارانەی تەمیر دەیهێنێتە پێشێ ئەوەیە ئایا پۆلێنکردنی گروپە نەتەوەییەکان وەک کۆکردنەوەی هەڵبژاردنە فەردیەکان مومکینە، لەکاتێکدا قسەکەرانی ئەم گروپانە (ئەگەر نەمانەوێت باسی دەزگا و هێزە نیمچە سەربازیەکان بکەین) ئیدیعایان بەسەر وڵاتی لیبرالدا هەیە. ئەم حاڵە کاتێک کێشە دروستدەکات کە ئەم قسەکەرانە پێداگری لەسەر کارە دەمارگیریەکان (وەک خەتەنەکردنی ژنان)لەناو کۆمەڵگای نەتەوەییدا بکەن. دەبێ وڵاتی لیبرال چ جۆرە پلەیەک بەمجۆرە بانگەشە یا کردارانە بدات؟ ئایا کەمایەتیە نەتەوەییەکان کە لەناو وڵاتێکی لیبرالدا دەژین، "کەسانی گریمانەیی" وەک کارخانەکانن و پەیڕەوی یاسا گشتکیەکانی ئەو وڵاتەن؟ تەمیر دەڵێت بەڵێ وایە و لێرەوە دەڵێت کە "بێگانەبوونی" کەمە نەتەوایەتیەکان (بەڵام نەک مەحرومیەتی ئابوریان) کە بەختی ئەوەیان نیە وڵاتێکی تایبەت بەخۆیان هەبێت، کێشەیەکی چارەسەرنەکراوی

هەمیشەییە. لەگەڵ ئەوەشدا تەمیر سوورە لەسەر ئەوەی ئەم رەهەندە نیگەتیڤەی ناسیۆنالیزمی لیبرالی، زۆر لە دنیای ناسیۆنالیزمی سەنتەریزمی نەتەوەیی باشترە (بەراوردکردنی تەمیر لەگەڵ ناسیۆنالیزمی مەدەنیدا کە قورسایەکی چەمکی زیاتر هەیە) کە تیاییدا کەمە نەتەوایەتیەکان سەرکوت دەکرێن و هیچ دەرفەتێکی گشتی بە راگەیاندنی ئاشکرای تێروانینەکانیان نادرێت. تەمیر بەمشێوە بەراوردکردنەی ناسیۆنالیزمی لیبرالی لەگەڵ ناسیۆنالیزمی سەنتەریزمی نەتەوەییدا (واتە ئەگۆڕانی ناسیۆنالیزمی لیبرالی بۆ مەرامێکی نانەتەوەیی) نەتەوەکان و دروشمە ناسیۆنالیستیەکانی ئەندامەکانی، دەخاتە ناو تیورەی لیبرالیەوە لەبارەی وڵاتەوە.

"هاوڵاتی فرە کلتوری" بەرهەمی کیملیکا وەك بەرهەمەکەی تەمیر هەوڵێکە بۆ ئاشتکردنەوەی ناسیۆنالیزم (بەمانا فراوانەکەی، واتە هەرجۆرە بانگەشەیەکی کلتوری بۆ ماف یان ئیمتیازەکان) و کیملیکا دڵنیا دەکاتەوە کە لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستدا گروپە خاوەن بەرژەوەندییە نەتەوەییە رێکخراوەکان، بەکردەوە لەهەموو وڵاتە لیبرالەکاندا، بانگەشەی پلە و دەسەڵاتدارێتی دەوڵەتی دەکەن. کیملکا دەپرسێت ئایا پێوەری لیبرالانە هەیە کە لەرێگەیانەوە بکرێت، باسی ئەم بانگەشانە بکرێت؟ کیملیکا رەخنە لە تیورەی لیبرالی دەگرێت، چونکە لە چوارچێوەیەکی لیبرالیدا بایەخی ئەمجۆرە بانگەشانە هەڵناسەنگێنێت. بۆ نمونە ناکرێت خواستی رابەرانی گروپێکی نەتەوەیی بۆ خۆبەڕێوەبردنی ناوچەیی لەسەر بناغەی کلتوری هاوبەشی زۆرینەی ئەو خەڵکانەی لەناو سنوری ناوچەیەکی دیاریکراودا دەژین، بە دەمارگیرانە بزانرێت، چونکە بەکردەوە هەموو وڵاتە هەبوەکان (چ لیبرالیەکان و چ ئەوانی دی) هەمان بانگەشەیان بۆ رەوایەتی سنورەکانی خۆیان هەیە. یان هەروەها ناکرێت داواکاری رابەرانی گروپێکی نەتەوەیی کۆچکردوو کە دەیانەوێت لەو یاسایانە ببورێن کە پەیوەندی بە پێویستی پۆشینی کڵاوی ئاسایشەوە هەیە لەکاتی لێخوڕینی ماتۆردا (لەبەر ئەو تایبەتمەندییە کلتوریانەی پەیوەندی بە سەرپۆشەوە هەیە)، بەکارێکی دەمارگیرانە ناوببرێن.

بەڵام هەموو ئەو خواستانەی گروپە نەتەوەییەکان بۆ وڵاتەکان هەیانە، لەدەمارگیری خاڵی نین. ئەو کردارانەی لەژێر ئاڵای "کلتور"دا پاساویان بۆ دەهێنرێتەوە –وەك خەتەنەکردنی ژنان، مەحرومکردنی خوێندن لەکچانی سەرو ١٢ ساڵ یان زیندانیکردنی ئەو کەسانەی دەیانەوێت گروپ بەجێبهێڵن– بەئاشکرا دەمارگیرانەیە، چونکە بەبێ رەزامەندی هوشیارانەی تاکەکان، هاورەنگی کلتوریان بەسەردا دەسەپێنێت. لەبەرامبەر ئەمەدا هەندێك حاڵەتی دژواریش هەیە، بۆ نمونە کاتێك بەرێوەبرایەتیە ناوچەییەکان ئەرکی سەرجەم هاوڵاتیان بەوە دەستنیشان دەکەن کەدەبێت خوێندنیان بە زمانی فەرمی ناوچەکە بێت، تەنانەت گەر خواستی دایك و باوکیان شتێکی تر بێت. رابەران وا بەڵگە دێننەوە کە گەر ئەم یاسایانە نەبێت، کلتور لەناودەچێت. وەڵامی لیبرالێك ئەوەیە کە بەم یاسایانە، هەڵبژاردنی فەردی بەتوندی دەکەوێتە بەر هەڕەشە. دەستکەوتەکانی شیکردنەوەکانی کیملیکا وەڵامێکی بڕاوە و بەهێزی لیبرالیانە نیە بۆ هەموو داواکانی گروپە نەتەوەییەکانی وڵات، بەڵکو پێشکەشکردنی چەند رێبازێکە –بە هوشیاربوون لەتیورەی ناسیۆنالیزم– لەبارەی چۆنێتی سنوردانان بۆ ئەمجۆرە داوایانە.

بەمشێوەیە تیورەی سیاسی لیبرالی (ئەگەرچی درەنگ)، رێگەی بۆ باسکردنی مەتهەجیانەی هەندێك پرسیاری گرفتئامێز کردەوە سەبارەت بە

ڕەوایەتی بانگەشە نەتەوەییەکان بۆ وڵاتێك کە بەشێوەیەکی لیبرالیانە دروستبووە. هاردین گەرچی لە سەرتاسەری نوسینەکانی خۆیدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە دنیای واقعیدا گروپە نەتەوەییەکان مەیلیان بۆ پاوانکردن و دەمارگیری هەیە، بەڵام بەڵگە یان هۆیەك بۆ سەلماندنی ئەم تێڕوانینە پێشکەش ناکات. هەروەها تمیر و کیملیکاش-بێ هیچ هۆ و بەڵگەیەك- زیاد لەسنور بڕوایان بەوە هەیە کە ئەو وڵاتە لیبرالیانەی گروپە کلتورییەکان بەفەرمی دەناسن، ڕێگری لە کردارە دەمارگیرییەکانی ئەو گروپانە دەکەن. ئەم بڕیارانە ئەگەری ئەو هەلومەرجە هەڵناسەنگێنن کە ئەکتیڤیستەکانی گروپە نەتەوەییە بەفەرمی ناسراوەکان، ئەگەر حکومەتە ناوچەییەکەیان هەڕەشەیان لێبکرێت، خودی دەسەڵاتی وڵات لەڕێگەی توندوتیژییەوە دەخەنە ژێر هەڕەشەوە. دواجار ئەم بڕیارانە ئەو کێشانەی توشی کاری وڵاتە لیبرالیەکان دەبێت لەڕێگەی کەمکردنەوەی ئەو سنوردارێتیانەی بەسەر ئەو کەسانەدا دەسەپێنرێت کە دەیانەوێت شوناسکەلێکی تازە تاقیبکەنەوە (یان وازهێنانی تەواو لە گروپ و توانەوە لە کلتوری ئەو وڵاتەدا کە لێی نیشتەجێن) بەکەم دەگرن. تاقیکردنەوەیەك کە دەشێت پاوانکردنی نوێنەرایەتی سیاسی لەلایەن ڕابەری گروپی نەتەوەییەوە، لاوازبکات. ئەم نیگەرانیانە دەچنە سەرو سنوردارێتیەکانی تیورەی سیاسییەوە، بەڵام باسکردنی ئەم نیگەرانیانە بۆ باسەکانی ئایندەی لیبرالیزم لەبارەی ناسیۆنالیزمەوە، گرنگیەکی زیندوی هەیە.

ب- نەریتی کۆنی

نەریتە دژبە لیبرالیەکانی چەپ و ڕاست هەردوکیان نەتەوەکانیان بەجدیتر وەرگرت لە نەریتە لیبرالیەکان و زۆر زوتر یارمەتی خوێندنەوەی ناسیۆنالیزمیان دا. گەورەترین یارمەتی ئەم نەریتانە ناونوسی نەتەوەکان و ناسیۆنالیزم بووە لەمێژوودا. لایەنگرانی حکومەتی ناوچەیی بەناونوسکردنی نەتەوەکان وەك واقعی کۆمەڵایەتی و ناسیۆنالیزم وەك تێزێکی سیاسی لەمێژوودا، کۆمەڵێك تێڕوانینیان لەبارەی هەلومەرجی ئەنتۆلۆجی نەتەوەکانەوە بەدەستەوەدا. لایەنگرانی هاوچەرخی پێکەوە گونجاندنی ئامانجە جیاوازەکان (کە لەچەند بوارێکدا پەرشوبڵاون) باسی شێوە تازەکان و ئەو پرسیارانەیان کردووە کە لەم نەریتەدا هاتۆتە ئاراوە.

ئاراستەی دژە لیبرالی بۆ نەتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ "بیرك" کە لە نوسینە جێی سەرنجەکانی خۆیدا (ڕێك دژبە جیمز میل) باسی مەسەلەی حوکمڕانی هندی کردووە. بیرك ئەگەرچی کارەکەی خۆی بەشێوەی شیکردنەوەیەکی مەنهەجی پێشکەش ناکات (دیارە بەرهەمەکانی ئەو لە نوسینەکانی میهتادا بەشێوەیەکی قەناعەت پێکەر، کورتکراوەتەوە)، بەڵام بەردەوام و بەسوربونەوە بەڵگە دێنێتەوە کە ئینگلتەرا مافی ئەوەی نیە، حوکومڕانی بەسەر هندستاندا بکات، چونکە مومکین نیە زنجیرە یاسایەك کە بۆ نەتەوەیەك داڕێژراوە، بۆ نەتەوەیەکی دی گونجاو بێت یان مانای هەبێت. نەتەوەکان دەبێت لەژێر حوکمڕانی نەوەکانی خۆیاندا بن، نەك لەژێر حوکمڕانی بیگانەکان. ئەگەرچی بیرك ئەندامی حیزبی پارێزگارانی ئینگلتەرا بوو، بەڵام ڕای توندڕەوانەی هەبوو. ئەم سەرنجانە دژبە لیبرالیەتیش بوون، چونکە لە دیدی بیرکەوە نەتەوە، نەك تاکەکەس مافی هەبوو، هەروەها لەبەرئەوەش بیرك هەستی دەکرد بنەماگەلێکی یان نەتەوەیی دادپەروەری نیە کە بکرێت (بە بەکارهێنانی خوازمیەکی ئەمڕۆیی) لەپشت پەردەی غەفلەتەوە، پاك بکرێتەوە.

فەلسەفەی مێژووی هیگڵ لە گێڕانەوەی ئامانج، پەیام و مەبەستەکان بۆ نەتەوە، زۆر زیاتر لە بیرك دەڕوات. هیگڵ ناسیۆنالیزم بە قۆناغێکی کلیلی لە سوڕانی ژیانی نەتەوەکاندا دادەنێت. هیگڵ بڕوای وابوو "نەتەوەکان پێش گەیشتن بە ئامانجی خۆیان واتە دروستکردنی دەوڵەت، ژیانێکی دوور درێژیان بردۆتە سەر"(١٩٥٦،ص ١٨٣١-١٨٣٠). بیرك و هیگڵ هەردوکیان نەتەوەکانیان لەڕووی مێژووییەوە بە نوێ، بەڵام واقعی دادەنا.

مارکسیەکان دیدی کۆییان بۆ نەتەوە بەزیندوی هێشتەوە، بەڵام -وەك مارکس هەمیشە ئومێدەوار بوو- ئەمکارەیان بە ئاوەژووکردنەوەی (تێزەکانی) هیگڵ ئەنجامدا. لە تیۆری مارکسیەکاندا نەتەوەکان پێکهاتەی کۆمەڵایەتین کە لەسەر بناغەی مێژوو دروستبوون کە لەقۆناغێکی دیاریکراوی سەرمایەداریدا سەریان دەرهێناوە، و پاشتریش لەناو دەچن. دەبوو جێگەیەك بە ناسیۆنالیزم بدرێت، و ئەگەر ئەمکارەش بەشێوەیەکی دادپەروەرانە ئەنجامبدرێت، ئەوا ناسیۆنالیزم وەك هۆکارێکی کۆمەڵایەتی لەناو دەچوو. ئۆتۆ باثر و کارل رینەر ومارکسیە نەمساییەکان هەوڵیاندا بە گونجانی تێزە سۆسیالیستیەکان لەگەڵ بنەمای شەخسیدا، جۆش و خرۆشی نەتەوەیی بخەنە ناو ئیمپراتۆری روو لە ڕوخانی هابسبۆرگەوە، و بەهەر یەك لە هاوڵاتیان مافی دەنگدان بە نوێنەرانیان لەسەر بناغەی نەتەوەی هاوبەش بدەن.

لینین ئەگەرچی بەپێی تیۆری مارکسی دەینوسی، بەڵام تێزی سەربەخۆ لەو تیۆرییەی بۆ هەستی نەتەوایەتی هەبوو. باوکی سەردەمێك یەکێك لەهاوکارانی ئیلمنیسکی بود- میسیو نەری کە هەوڵیدەدا بە وتنەوەی وانەی بنەماکانی ئەرسۆزکس بۆ تورکەکانی روسیا بە زمانی خۆیان، تێکەڵ بەدنیای روسیە ئەرسۆزکسیەکانیان بکات. تێبینیەکانی لینین سەبارەت بەکاردانەوەی کرێکارانی "هەڵخەڵەتێنراوی بۆرژوازی" سەبارەت بەسەرەتای جەنگی گەورە (کە لەوتارەکەی خۆیدا لەبارەی "ئیمپریالیزمەوە" کە رێك پاش جەنگ نوسراوە، ئاماژەی بۆ کردووە)، بۆ لینین سەرسوڕهێنەرتر بوو. ئەم تێزانە هاوکات لەگەڵ نەیارێتی ناسیۆنالیستی لەگەڵ حکومەتی بەلشەفی لە١٩١٧-١٩٢١دا، لە سیاسەتەکانیدا کە مافی کۆمار دروستکردنی بەزۆرێك لە نەتەوەکان دەدا کە تیایدا مژدەی دەسەڵاتدارێتی کلتوری (نەك سیاسی)درابوو (و رێنماییەکانی بۆ ستالین کە "مارکسیزم و مەسەلەی نەتەوەیی" لەژێر تێزەکانی لینیندا نوسیبوو) بەرچاو بوو.

لە کۆتاییەکانی ١٩٢٠دا بەپێی سیاسەتەکانی "شارنشینی" گەلێك مافی کلتوری بە ئەندامانی نەتەوەکان درا، تەنانەت ئەو خەڵکەش کە بە لەزگەیەکی دیارکراوی نەتەوەیەکەوە دەناسرانەوە، و خوازیاری ئەم مافانە نەبوون. ئەم سیاسەتانە خاڵی بەرامبەر ئەو شتە بوو کە دەکرێت ناوی بنێین لیبرالیانە. هەندێك لە نەتەوەکان ناچار بەجێگیربوون لەیەك شوێندا کران، ئەو رابەرە نەتەوەییانەش کە بەرنامەی سیاسی جیاواز لە حکومەتی کۆمنیستیان هەبوو، لەلایەن رابەرایەتیەوە پاکتاوکران و زیندانی کران، و لەبری ئەوان ئەو کادرە نەتەوەییانەی لایەنگری حکومەتی کۆمنیستی بوون، و بەدەر لەوەی رای خەڵکی بەرامبەر بەم رابەرانە چی بوو، وەك رابەرانی سروشتی نەتەوەکان بەسەر خەڵکیدا سەپێنران. بەمشێوەیە هاوکات سیاسەتێکی پاراستنی نەتەوە و لەناوبردنی نەتەوە، لە حکومەتی سۆڤیەتدا هەبوو. لە سەرتاسەری سەردەمی سۆڤیەتدا، حکومەتی کۆمنیستی هەم دەستیکرد بە ناسینی

فەرمی نەتەوەکان و هەم بەدوای دروستکردنی هەلومەرجێکەوە بوو کە تیایدا پەیوەندییە نەتەوەییەکان، جێگەی خۆی بە هەستی ئەنترناسیۆنالیستی بدات. بەمشێوەیە ئایدۆلۆژیای سۆڤیەتی لەجیهانی تیوریدا، نەتەوەیان لە مێژوودا تۆمارکرد. لە ساڵی ١٩١٧دا نەتەوەکان (ی سۆڤیەت) واقعی بوون و نەبوو حسابیان بۆ بکرێت. بەڵام بە روودانی کۆمنیزم بەهەمانشێوە کە بیریارە وردبینەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی سۆڤیەت وەك یۆبرۆ میلیی گوتویانە، هەستی نەتەوایەتی لاواز بوو، و چیدی چوارچێوەیەکی ئاوەندی بۆ ئەندامێتی سیاسی بوونی نەبوو.

مارکسیە هاوچەرخەکان کە رابەرەکەیان هۆبسبامە، بەڕاشکاوییەکی زیاترەوە بڕوایان بە مێژوو هەیە. هۆبسبام لە "نەتەوە و ناسیۆنالیزمدا" بابەت بە بابەت دەریدەخات کە چۆن نەریتە نەتەوەییەکان بناغەیەکی مێژوویان نیە و لە راستیدا لە سەردەمە تازەکاندا بەهۆی ئەو رابەرە سیاسیانەوە دروستکراوە، کە بەدوای بەرپاکردنی دەسەڵاتدارێتی سیاسیەوە بەسەر ئەو وڵاتانەدا بوون کە سنووری ئاشکرایان هەیە. هۆبسبام پێ لەسەر ئەو خاڵە دادەگرێت کە سەردەمی ناسیۆنالیزم، لەسەر بناغەی سەرمایەداری نوێ دروستبووە، بەڵام لەژێر هەلومەرجی سەرمایەداری دواییدا، رووی لە کارکەوتن کردووە (هۆبسبام ئەم کتێبەی پێش تۆفانی ١٩٨٩ لەشێوەی زنجیرەیەك وتاربێژیدا پێشکەشکردووە). ئەگەرچی هۆبسبام مێژوونوسە، بەڵام نوسینەکانی کاریگەرییەکی گەورەیان کردە سەر زانستە سیاسیەکان.

لایەنگرانی ئەمڕۆی "دروستکراوی کۆمەڵایەتی" (*constructivists*) ـلەسەرو هەموویانەوە بندیکت ئەندرسۆن- پشتیان بە نەریتێکی مێژووگەری، زۆر زیاتر لە نەریتی لیبراڵی بەستووە. ئەندرسۆن نەتەوە بە بەرهەمی سەرمایەداری (پیشەسازی) چاپ دەزانێت کە ئەو حەزەی لە پەخشکەراندا دروستکرد، دیالکتیکە جیاوازەکان لە زمانێکی نوسراوی یەکگرتوودا یەکبخات. ئەم دۆخە ئەو دەرفەتەی بەخەڵکی ئاسایی دەدا کە پەیوەندی لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایانەدا بکات کە لە کۆمەڵگا ناوچەییەکان گەورەتر، بەڵام لە"رەگەزی مرۆڤ" بچوکترن. سەرەڕای ئەمە زمانە نوسراوەکان جۆرێك وابەستەیی هەڵبژێراویان بەچەمۆك و حیکایەتی نەتەوەوە هەبوو. زمانە نوسراوەکان (وەك رۆمان) ئەگەری روودانی هاوکاتی پێشهاتەکانیان مومکین کرد، کە لە"کاتی زەمەنی خاڵی و چونیەکدا" هاوتای وردی چەمکی نەتەوەیە کە ئەویش وەك کۆمەڵگایەکی هاوڕەنگ وێنادەکرێت کە بەشێوەیەکی سەقامگیر لەرەوتی مێژوودا دەچێتەوە سەرەوە یان خوارەوە"(١٩٨٣، ٣١٧).
ژمارەیەکی زۆر لە بیریاران پەیڕەوی ئەندرسۆنیان کردووە، و ئەزموونە نەتەوەییەکانیان بە شتێکی بنەڕەتی دانەناوە، لە بەرامبەردا وەك شتێکی مێژوویی تەماشایان کردووە. یەکێك لە نموونەکانی مێژوویی نەتەوەیی کە زیاتر لە دیدێکی ئەندرسۆنیانەوە گوتراوە، کتێبی "دروستکردنی نەتەوەی گورجی" نوسینی "رۆناڵد سانی"ە. لەم بەرهەمەدا سانی دەیەوێت پیشانیبدات کە هەستی روونی نەتەوە بوونی هەمیشەیی کە ئەمڕۆ لەناو خەڵکی گورجستاندا هەیە، بونیادێکی نوێیە – بونیادێك کە رەنگە نەخشەی تەواو جیاوزی لەیەك هەبوبێت.

مێژوونوسانی وەك ئەدریان هێستینگز بەڕاستی بیرکردنەوەی مێژووخوازی زانایانی کۆمەڵایەتیان، خستۆتە ژێر پرسیارەوە، زۆرتر لەسەر ئەو بڕوایەن کە پەیدابوونی نەتەوە زۆر پێشتر لەوەبووە کە هۆبسبام و ئەندرسۆن وێنایان کردووە. لەڕاستیدا جۆن ئەرمستڕانگ –

کە یەکێکە لە زانا بەرجەستەکانی زانستە سیاسییەکان- وتارێکی گرنگی نوسی و دەریخست کە نەتەوەکان بەئاشکرا بەر لە ناسیۆنالیزم بوونیان هەبووە. بەڵام هیچ زانایەك دژی ئەو تێڕوانینە بنەڕەتییە نییە کە پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەنێوان نەتەوە و ئەو بەرنامە سیاسیانەی پەیوەندی بە وڵاتەوە هەیە، تەنها لە سەردەمی مۆدێرندا دروستبوون، و بەرهەمی هەلومەرج و بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی، سیاسی، کلتوری یان ئابوری ئەو سەردەمەیە. لێرەوە قبوڵکردنی ئەو تیورانەی لەبارەی ناسیۆنالیزمەوە کە تێبینی قۆناغی مێژووی و ئەو هەلە سیاسیانە ناکەن کە ئەو سەردەمە لەبەردەست سیاسەتمەداراندا بووە، نامومکینە. ئەریتی تیورەی سیاسی کۆیی، لە دۆزینەوەی دابەشبونی مێژووی نەتەوەکانـدا-وەك گەمەکەرانی مێژووی جیهان-دەورێکی زۆر گرنگیان بۆ قۆناغە جیاوازەکان داناوە.

## سێهەم، سیاسەتی پراکتیکی

گەلێك بەرهەمی بەرجەستە لە بواری کۆمەڵناسی سیاسیی گەورەدا- کە تیایدا نوسینەکانی ستاین رۆکان و چارلز تیلی گرنگییەکی زۆریان هەیە- دەستیان کردووە بە تاوتوێکردنی سەرچاوە مێژووییەکانی وڵاتی نەتەوەیی مۆدێرن. لە دیدی تیلییەوە بەتایبەتی لە بەرهەمە سەرەتاییەکانیدا، سیفەتی وەسفکردنی "نەتەوەیی" پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە بونیادی کلتوری نەتەوەکانەوە نییە. خاڵی سەرەکی تێڕوانینەکانی تیلی بریتی بوو لە ڕێکخستن و پەرەسەندنی وڵاتی مۆدێرن. بەڵام بەرهەمەکانی رۆکان (کە بەپیاچونەوەی پیتر فلۆرا، جارێکی دی چاپ کرایەوە) بەتایبەتی باسی سنورداریێتی جیاوازیە مەزهەبی و زمانییەکانی لە دروستبوونی نەتەوە ئەوروپییەکانـدا دەکات، کە چەمکی دروستکردنی سنورەکانی نەتەوە، گونجاو بوو لەگەڵ سنورەکانی وڵاتدا.

لەکاتێکدا رۆکان چوارچێوەی کۆمەڵناسی گەورەی بۆ بیرکردنەوە لەبارەی پەیوەندی نەتەوە، ئابوری و وڵاتدا بینا دەکرد، دریژ بۆ هەڵسەنگاندنی پرۆسەی عەمەلی دروستکردنی نەتەوە، بەرنامەیەکی لێکۆڵینەوەی دەست پێکرد کە زۆرتر ورد-بونیاد بوو. بەشداری تایبەتی دریژ بریتی بوو لە گەشەپێدان و دروستکردنی نمونەیەك لەسەر بناغەی گۆڕاوە شێمانەیی(ئیحتیمالی) و ڕێکەوتەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی، کە لە ئاستێکی باڵای کار و کاردانەوە (ئابوری، مەزهەبی، کۆمەڵایەتییەکان)ی نێوان گروپەکانی خەڵك، زۆرتر توانای دروستکردنی پەیوەندیان لەگەڵ یەکدا بۆ دەخوڵقێنێت، و ئاستە باڵاکانی پەیوەندسازی(کۆمینیکەیشن) بە سەرچاوەی کۆمەڵگا سیاسیە تازەکان دەژمێرێت. نەتەوەکان بەدرێژای چەندین ئەوە و لە ئەنجامی بەردەوامی ڕەوتەکانی ئەم کارو کاردانەوانەیە، شکڵیان بە بونیادی وڵاتە تازەکان داوە و دروستیان کردوون. بەڵام ئەگەر بەرلەوەی ئەندامانی کۆمەڵگا پەراوێزیەکانی ناو وڵاتێك (لەرێگەی ئاستی باڵاکانی پەیوەندسازیەوە) لەناو نەتەوەی سەرەکیدا بتوێنەوە، لەرێگەی کۆچکردن و دەستکەیشتن بە دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە بەتوندی سازو ئامادەبکرێن، ئەوکاتە کۆمەڵێك پاڵنەریان دەبێت بۆئەوەی بەناوی نەتەوەوە لە وڵاتەکەیان جیاببنەوە. دریژ زۆر زوو واتە لە ساڵی ١٩٤٢دا میتۆدەکەی خۆی بۆ تاوتوێکردنی دەرکەوتنی وڵاتە ئەوروپییەکان وەك نەتەوە بەکارهێنا، و پاشان سودی لەم میتۆدە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەگەری (کە زۆر کەم پێشبینی دەکرد) یەکگرتنی وڵاتە ئەوروپییەکان لەناو دەوڵەتی نەتەوەیی ئەوروپادا وەرگرت.

پەیرەوانی دویچ دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لەبارەی زۆرێك لە نەتەوە سەرەتاییەکانی وەك نەتەوەی ئەمەریکا (بەهۆی ریچارد مریت)، نەتەوەی ئەڵمانی (بەهۆی پیتر کاتزنستاین)، نەتەوەی بۆرما (بەهۆی لوسین پای) نەتەوەی نیجیریا (بەهۆی جیمز کۆڵمن) و نەتەوەی مالی بەهۆی ویلیام فۆڵتەرەوە.

لەدەیەی ١٩٦٠دا بیریارانی سیاسەتی پراکتیکی -کە لە دەرئەنجامی خۆشبینی سەربەخۆی وڵاتە تازە سەربەخۆکانی ئەفەریقا و ئاسیا، ئەو بودجەیەی بەهۆی نیگەرانیەکانی جەنگی ساردەوە بۆ لێکۆڵینەوەی مەیدانی لە جیهانی سێدا دیاری کرابوون، و هەل بینینی دروستکردنی نەتەوەیان لە دیدێکی بەڕاستی پراکتیکیەوە کە بەهۆی ژمارەیەکی زۆری بابەتی لێکچووەوە هاتبووە پێشێ، ورووژابوون- پۆل پۆل بۆ ئەم وڵاتانە چوون، تا لە نزیکەوە شایەتی بینینی دروستبونی نەتەوە بن. لەکاتێکدا بەشێکی ئەم لێکۆڵینەوانە -لەوانە لێکۆڵینەوەکانی فرد هیوارد لەبارەی غاناوە- سەرکەوتنێکی سەرەتاییان لە دامەزراندنی بیری نەتەوەیی تازەدا، لەنێوان ئەو کۆمەڵانەدا بەدەستهێنا کە لەرووی کلتوریەوە جیاواز بوون، بەڵام زوربەی لێکۆڵەرەوە مەیدانیەکان شایەتی بابەتێکی پێچەوانە بوون، بەو مانایەی کە وەفاداریە نەتەوەییەکان یا "سەرو نەتەوەییەکان"، لەژێر هەلومەرجی پاش کۆلۆنیالیدا بەهێزتر بوو. کتێبەکەی یۆنگ لەبارەی کۆنگۆوە (کینشاسا) لێکۆڵینەوەی کلاسیکی براس لەبارەی بزوتنەوە مەزهەبی و زمانیەکان لە هندستانی سەربەخۆدا، شیکردنەوەکانی ئلسۆن کسیفر بۆ "نەتەوایەتی بونیادنراو لەسەر پێکە" لە ئۆگانددا، هەموو ئەمانە پیشاندەری دەسەڵاتی شوناسی نەتەوەیی لەناو وڵاتەکاندا بوون بۆ لاوازکردنی ئەو هەوڵانەی کە لەئاستی وڵاتدا دەدران، بۆئەوەی نەتەوەی گونجاو لەگەڵ سنوری وڵاتە کۆلۆنیالکراوەکاندا دروستبکەن.

زۆرێك لە لێکۆڵیارە پراکتیکیەکان لە دژایەتی دیدی دویچدا لەبارەی دروستکراوی نەتەوەکانەوە و بە بیرکردنەوە لە دۆزینەوەکانی لێکۆڵیارانی مەیدانی کە ئەم چەمکانەیان لە مەحەکی تاقیکردنەوەدا، بەتوندی کاردانەوەیان پیشاندا، و بەنیازبوون ئەو سنوردارێتیانە پیشانبدەن کە سەبارەت بە دروستکردنی نەتەوەوە هەن. ئەگەر ئەم لێکۆڵیارە پراکتیکیانە کە هەندێکجار بە "ئەزەلیگەر"-پەیوەندیدار بە چەمکەکانی گواستنەوەی نیمچە ژنتیکی یەکێتی نەتەوەیی- ناودەبرێن، بە "ئەمرگەرانە" ناوبنێین، تێگەیشتن لە تێڕوانینەکانیان ئاسانتر دەبێت. ئەمانە بڕوایان وایە نەتەوەکان کۆمەڵێك گروپی شوناسیی دێرینن کە توانیویانە لە بەرامبەر فشاری سەدەکاندا-کەمتازۆر بەهەمان مانا و سنورەکان- رابوەستن و بەئاسانی گۆڕانیان بەهۆی هەلومەرجی ئابوری یا زۆربونەوە بەسەردا نایەت. بەرهەمەکەی ئانتۆنی سمیس دەریدەخات کە چۆن گروپە خوار نەتەوەییە تازەکان دەتوانن بەمەبەستی دروستکردنی بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی، بگەڕێنەوە بۆ نەتەوە دێرینەکان. نوسینەکانی واکرکاتر پێ لەسەر ئەو خاڵە دادەگرێت کە پەیوەستبونە نەتەوەییەکان ئەوەندە پتەون کە لەبەرامبەر پرۆسەکانی نەتەوە دروستکردندا بەرگری دەکەن، پێشبینی ئەوە دەکات کە ئەو نەتەوانەی لەبەردەم هەڕەشەی تواندنەوەن لەناو پرۆژەی نەتەوەیی گەورەتردا، کاردانەوەی بەرگری لەخۆیان پیشاندەدەن و ژیانی پیاوانی لاوانی خۆیان لەپێناوی پاراستنی نەتەوەکانی خۆیاندا دەخەنە مەترسیەوە. سمیس بڕوای وایە نەتەوە دروستکردن، لەخەیاڵپلاوی زیاتر هیچی دی نیە. لەڕاستیدا

"نەتەوە دروستکەرانی" جیهانی سێیەم، "لەناوبەرانی نەتەوە" بوون، و باجێکی زۆر بۆ هەوڵەکانیان دەدەن. جۆن ئەرمستراتگیش پێداگری جێی سەرنجی هەندێك لە سنورە نەتەوەییەکانی (بۆنمونە سنوری ئەوروپای ژەرمەنی زمان لە سنوری ئەوروپای لاتینی زمان) بەدرێژای دوو هەزار ساڵ بگرە و بێنە و کار و کاردانەوە کە لە ئاستی باڵادا ئەنجامدراوە پیشاندەدا. لەسینگ بڕوای بە دروستکردنی نەتەوەکان هەیە، بەڵام لە هەمانکاتدا قایل بەبوونی سنورێکە بۆ دروستنەبوون – هەرئەوەندەی پرۆژەیەکی نەتەوەیی "سەرکەوت" (واتە ئەو بڕوایانەی هەموو بەشەکانی خەڵکی سەبارەت بەواقعی سنورە بێ چەندوچونەکان هەیانە)– و بەمشێوەیە ڕێگە بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی شێوەی دروستکردنی نەتەوە دەکاتەوە، کە هەم ناسەقامگیری سنورەکان لە هەندێك قۆناغەکاندا پیشاندەدات، و هەم سروشتیبونیان لە قۆناغێکی دیدا.

ئەڵتەرناتیڤێکی دی بۆ ڕەخنەکردنی دویچ لەسەر بناغەی دەسەڵاتی پەیوەستبونە نەتەوەییەکان، میتۆدی ئابوری سیاسیە بۆ خوار ناسیۆنالیزم. ئابوریزانانی سیاسی بە پێچەوانەی نەمرخوازانەوە، لەو ڕووەوە ڕەخنە لە نمونەی گۆڕاوە شیمانەی و ڕێکەوتەکانی دویچ دەگرن، کە ئەم نمونەیە بونیادە کۆمەڵایەتیەکان، دەزگاو هەنگاوە سیاسیەکانی دروستکەرانی ناسیۆنالیست کە دەشێت ئارەزوی ئەوە بکەن هەنگاو بۆ گۆڕانی ڕەوتەکانی کار و کاردانەوە بنێن فەرامۆش دەکات. "هچتەر" پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە ناکرێت پەیوەستبوونە بەزەبر نەتەوەییەکان لەو بونیادە کۆمەڵایەتیانەدا کە دابەشبوونی کاری کلتوری نەگۆڕی تێدایە، بۆ مەبەستی سیاسی بەکاربهێنرێن. بیتس جەخت لە نایەکسانی ئەو بەرژەوەندیانە دەکات کە لە پرۆسەی مۆدێرنبوندا بەرەو روی گروپە نەتەوەییە جیاوازەکان دەبێتەوە و ئەو پاڵنەرانەی ئەم جیاوازیانە بۆ فەرمانڕەوایانی ناوچەیی (واتە نەتەوەیی) کە دەتوانن بەناوی چەوساندنەوەی نەتەوەیی (یان خوار نەتەوەییەوە) بۆ بوارە ناوچەییەکان ئامادەی بکەن. بەمشێوەیە بزوتنەوە خوار نەتەوەییەکان کە پرۆژەکانی دروستکردنی نەتەوە دەڕۆخێنن، لەناو پێکهاتەی هەڵبژاردنە نەتەوەییەکاندا سەر دەردەهێننەوە. لە بەرهەمەکانی رابوشکا و شپسیل و هەروەها هارووێتزدا تاوتوێی پاڵنەرەکانی هەڵبژاردنەکان بۆ فەرمانڕەوایانی سیاسی خوارنەتەوەیی کراوە.

کتێبە کاریگەرەکەی گلنەریش لەبارەی ناسیۆنالیزمەوە کە لە ساڵی ١٩٨٣دا بڵاوکراوەیە، بەپێی شێوازی ئابوری سیاسی نوسراوە. گلنەر بەڵگە دێنێتەوە کە لە سەردەمی پیشەسازیدا، خوێندەواری بە کلیلی دەسەڵاتی بزوتنەوە کۆمەڵایەتیەکان دەژمێرێت. ئەو دەستەیە لە گروپە زمانیەکان کەلەناو دڵی ئەو وڵاتانەدا دەژیان کە بەرەو پیشەسازیبوون دەڕۆیشتن، کۆمەڵێك ئیمتیازاتی نائاساییان بۆ وەرگرتنی پۆستەکان بەدەستهێنا. کۆمەڵە کۆچکردوەکان لەناو ئەم وڵاتانەدا بەهۆی چەوساندنەوەی زمانیەوە، بەرەو ڕووی ئاسۆی جوڵەیەکی داخراو بونەوە. بەهاتنە پێشەوەی ئەم بارودۆخە، هەندێك لە کۆچکردووەکان گەڕانەوە بۆ ناوچە سەرەکیەکانی خۆیان، بۆ ئەوەی رابەرایەتی ئەو بزوتنەوە نەتەوەییە بکەن، کە خوازیاری وڵاتێك بۆ نەتەوەکەی خۆی بوو. بەمشێوەیە پیشەسازیبوونی نایەکسان، کلیلی پەیدابوونی ناسیۆنالیزمە.

ئەو نوسینانەی ڕەخنەیان لە تیۆرەکەی گلنەر گرتووە، گەلێك زۆرن.

لیتین لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا لەبارەی روسی زمانەکانەوە کە لە وڵاتە تازە

سەربەخۆکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشودا دەژین، بە سەرنجدان لە شکڵبەندیەکانی گلنەر (بەڵام بە دورکەوتنەوە لە بەشێك لە بەکارهێنانی ئاشکرای رونکردنەوەی وەزیفیانەی گلنەر)، پەرەی بە میتۆدی ئابوری سیاسی بۆ هوشیاری نەتەوەیی دا. لیتین بە پشبەستن بە تیورەی گەمە و لەسەر بناغەی لۆژیکی ئابوری نەتەوە کە دیڤید فریدمان بە گریمانەیەکی بەڵگەنەویستی دادەنێت، دەریدەخات کە چۆن حسابکردنی بەرهەمی ئابوری چاوەڕوانکراو و باروودۆخی شیمانەیی داهاتوو-بەمەرجی چاوەڕوانیەکانی هەڵبژاردنەکانی هاوڵاتیان- دەتوانێت ببێتە هۆی گۆڕانکاری شوناسی نەتەوەیی لەناو نەوەیەکدا. لە نەریتی گلنەردا بەرژەوەندیەکانی کۆچکردوەکان -و نەك رەوتی کار و کاردانەوە رێکەوتەکانیان- رادەی وروژانی سۆزە نەتەوەییەکان و ئەگەری ئەوەی ئەم سۆزانە بناغەی بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی پێکبهێنن، روونەدەکاتەوە و ئاراستە دەکات.

لە وەڵامدانەوەی میتۆدی کارو کاردانەوەدا بۆ ناسیۆنالیزم، بزوتنەوەیەکی دیش هەیە کە لەسەر تەوەرەی گوتار دەسوڕێتەوە و لێرەشدا بنیدیکت ئەندرسۆن سیمایەکی بەرجەستەیە. دیارە ئەندرسۆن بناغەی ئابوری سیاسی ئاخاتە لاوە و سەرچاوەی ناسیۆنالیزم دەگەڕێنێتەوە بۆ سەرمایەداری پیشەسازی چاپ و ئەو پاڵنەرانەی پەخشکەران بۆ دۆزینەوەی زۆرترین خوێنەر لەرێگەی یەکگرتنی دیالەکتیکی نەتەوە جیاوازەکانەوە هەیانبوو. هەروەها لەگەڵ گلنەر هاوڕایە و سەرنەکەوتنی کۆچکردوەکان لەبەدەستهێنانی کار لە ناوەندە پیشەسازیەکاندا، بەشێوەی کێشەی "سەردانی تەنگ و تیکەڵ و پێکەڵ" وێنادەکات. بەڵام ئەندرسۆن هەنگاوێك زیاتر چوبوە پێشەوەو دەڵێت "کۆمەڵگای خەیاڵی" نەتەوە وەك لۆژیکی وێنایی بەتەواوی قابیلی هەڵگرتنە. لەبەرئەوە کاتێك گوتاری نەتەوە لە شوێنێکدا سەربکەوێت، بۆ ئەو میوانانەی کە کێشەی تەنگی جێگەیان هەیە، و پەیژەی جوڵەی خۆیان بۆ سەرکەوتن دەوێت، دەگۆڕێت بۆ جوڵەیەکی زۆر بەهێز.

پێشکەوتنێکی سەرەکی لە میتۆدی ئەندرسۆندا-تاڕادەیەکی زۆر لەبەرئەوەی ئەم میتۆدە بەناچار نەتەوەکانی بەسنوردار دەبینی (هیچ کەس پانتایی نەتەوەکەی خۆی وەك "دراوسێی دیوار بەدیواری رەگەزی مرۆڤ" نەدەبینی، وەك چۆن هەندێك پانتایی دینی خۆیان دەبینن)- بەمشێوەیە ئەندرسۆن بەئاسانی دەیتوانی باسی ئەو ناسیۆنالیزمانە بکات کە تەنها لەسەر بناغەی فەزای هاوبەش دروستبوون، بێئەوەی پەیوەندیان بەو نەتەوە دێرین یان خاکەوە هەبێت کە تیایدا دەژین. ئەمرخوازان دەیانتوانی تەفسیری هەندێك لە ناسیۆنالیزمەکان بکەن، بەڵام نەك ئەو ناسیۆنالیزمانەی پەیوەندی بە ئەفەریقا و بەشی زۆری باشوری ئاسیاوە هەیە، و نە ئەو ناسیۆنالیزمە جیاوازانەی وڵاتە عەرەبیەکان و ئەمەریکای لاتین. بەرهەمەکەی ئەندرسۆن تۆوی کۆمەڵێك نوسینی (زیاتر لەبواری ئەنسرۆپۆلۆجیادا) چاند کە پەیوەندی نێوان خەیاڵ و دروستکردنی کۆمەڵگای نەتەوەیی پیشاندەدات. هەروەها پریشکێك بوو بۆ وروژاندنی چەندان وتوێژی زیندوو و سەرنجراکێش لەبارەی جیاوازی نێوان گوتارەکانی ناسیۆنالیزم لەئەوروپا و جیهانی سێهەم، کە پەیوەندیەکی زۆری بە نوسینەکانی "چاتر جی"وە هەبوو.

هەنوکە بەرهەمەکەی ئەندرسۆن لە قوتابخانەی لایەنگرانی دروستبوونی نەتەوەدا، بۆتە سەرچاوەی چەندان نوسینی

پۆستمۆدێرنانە. لەم نەریتەدا گوتاری ئەوانەی لەسەر کورسی دەسەڵات دانیشتون، دەتوانێت نەتەوەکان دروستبکات یان لەناو ببات. ئەمڕۆ "لایەنگرانی تیورەی دروستکراوی نەتەوە" (بۆ نمونە ئەرنستۆ لاکلۆ) ئەو راستیە لەبەرچاو ناگرن کە بەکردەوە هەموو تیورەسازانی مۆدێرنەکردنی نەریتی دویچ، خۆیان لایەنگری دروستکراوی بوون، کە هەوڵیاندەدا بەشێوەیەکی هەستپێکراوتر لە رەخنەگرانی پۆستمۆدێرنی خۆیان، چۆنێتی دروستبوونی نەتەوەکان تاوتوێ و شیبکەنەوە. رەنگە یەکێك لەو هۆیانەی کە وادەکات پۆستمۆدێرنیستەکان تیورەسازانی مۆدێرنەبوون لەبەرچاو نەگرن، ئەوە بێت کە پۆستمۆدێرنەکان لەکرداری دروستکردنی نەتەوەدا شتێکی دزێویان دەبینی، لەکاتێکدا تیورەسازانی مۆدێرنە بوون کاری دروستکردنی نەتەوەیان بەکارێکی پێشڕەوانە و پێشکەتوخوازنە دەبینی.

لەکاتێکدا تیورەسازانی گۆڕاوە شیمانەیی و رێکەوتەکان، ئەمرخوازان، ئابوریزانانی سیاسی و شیکەرەوانی گوتار بەدوای ئەوەوە بوون لە ئاستێکی ئەبستراکتدا پەیوەندیە گۆڕاوەکانی نەتەوە بە وڵاتەوە دیاری بکەن و رونبکەنەوە، ژمارەیەکی جێی سەرنجی مێژوونوسان و بیریارانی زانستە سیاسیەکان سەرقاڵی نوسینی مێژووی نەتەوەکان بوون. نوسینەکانی تیوو رون (لەبارەی ئیستۆنیاوە) و ئۆیست سالتنی (لەبارەی ئۆکرانیاوە)چەند نمونەیەکی ئەم شێوازەن. ئەم شێوازە گەرچی لەرووی تیورەسازیەوە سادەیە (بۆ نمونە لەبەر گێڕانەوەی هەندێك هۆکار بۆ ووژاندنی نەتەوەیی کە لەهەندێك حاڵەتی دیشدا بوونی هەبووە، بێ ئەوەی ببێتە هۆی ووژاندنی نەتەوەیی)، بەڵام سەرنجدان لەو بابەتانەی لە ئەرشیفدا هەن، کۆمەڵە تایبەتیەکان و بەرهەمی کلتووری بەنرخ بوون. کارێکی زۆر لەبارەی ناسیۆنالیزمەوە بە پشتبەستن بە کتێبگەلێکی زۆر ئەنجامدراوە، کە بەپێی ئەم نەریتە نوسراوەو پەیڕەوکردن لەم نەریتەش تائێستا بەردەوامە (زۆرتر لەلایەن ئەو لێکۆڵیارانەوە کە کۆچیان لەو سەرزەمینە نەتەوەییە کردووە کە لەبارەیەوە دەنوسن).

نەتەوە دروستکردن -وەك بزوتنەوەیەکی سیاسی بەمەبەستی گونجاندنی سنورەکانی نەتەوە لەگەڵ سنورەکانی وڵاتدا- لەناوجەرگەی ئەو نوسینە پراکتیکیانەدا بووە کە لەبارەی ناسیۆنالیزمەوە بوون. بەدرێژایی نیو سەدەی رابردوو دەستەیەك روانگە و نمونە- وەك خەسڵەتخوازی، رەفتارخوازی، بونیادگەری وەزیفی، مۆدێرنخوازی، خوێندنەوەی لۆکالی، تیورەی وابەستەبوون، هەڵبژاردنی عەقلانی و لەهەنوکەشدا دەزگاخوازی- دژی لقی سیاسەتی پراکتیکی لە زانستە سیاسیەکاندا راوەستاوون. ئەگەرچی ئەم شۆڕشە میتۆدیە کاری لە تەفسیری تایبەتی نەتەوە دروستکردن کردووە، بەڵام ئەو کارنامە سەرەکیەی رۆکان و دویچ دایانڕشتووە، هەروا بە بەهێزی خۆیەوە ماوەتەوە. زانایانی سیاسی پراکتیکی بەردەوام درێژە بە رێگەی خۆیان دەدەن، تاکو لە لۆژیکی دروستبونی نەتەوەکان لەناو کەڵەکەبوونی فرەیی نەتەوەکاندا تێبگەن، و هۆکاری ئەو حاڵە بزانن کە بۆچی لەمجۆرە نەخشانە دەتوانن دروستکەری بزوتنەوەگەلێکی خوار نەتەوەیی بن، کە هەڕەشە لە هەوڵەکانی دروستکردنی نەتەوە لە وڵاتدا دەکات، و (وەك لە بەشەکانی دوایدا دەیبینین) بیر لەو کاروکردەوە بنەڕەتیانە بکەنەوە کە دەتوانێت توندوتیژی-ئەوکاتەی پرۆژە خوار نەتەوەییەکان دەبن بە بزوتنەوەگەلێك کە هەڕەشە لەیەکپارچەیی خاکی وڵات دەکەن- دابمرکێنەوە.

## چوارەم: پەیوەندیە نێو نەتەوەییەکان

زۆر دەمێکە لە پەیوەندیە نێونەتەوەییەکاندا وشەکانی نەتەوەو وڵات تێکەڵ بەیەك بوون. لەکاتێکدا ئەو پەیوەندیانەی لەم بوارە لاوەکیەدا بەشێوەیەکی بەرجەستە لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکرێت، پەیوەندیە نێونەتەوەییەکان نەبووە، بەڵکو پەیوەندی نێوان وڵاتەکان بووە. ئەم گریمانە سودمەندە سەرەتاییە (بەڵام لەرووی ئەزمونیەوە نادروست) کە هەموو گەمەکەران لە سیستەمی جیهانیدا وڵاتی نەتەوەیین"، ئەو توانایەی بە لێکۆڵیارانی پەیوەندییە نێو نەتەوەییەکان بەخشی، خۆیان لەو کێشانە لابدەن کە بەرهەمی بوونی ئەو وڵاتانەیە کە چەند نەتەوەیەکیان تێدایە، هەروەها خۆیان لە کێشەی ئەو نەتەوانە لابدەن کە وڵاتیان نیە. هەر ئەم لێکۆڵیارانە ئاماژە بۆ ڕێکخراوی نەتەوە یەککرتوەکان وەك ڕێکخراوێك دەکەن، کە لە وڵاتەکان پێکهاتووە نەك نەتەوەکان. ژمارەیەکی کەم سەرنجی ئەو ئاڵۆزیە زمانیانەیان داوە.

دیارە هەندێك لە لێکۆڵیارە بەرجەستەکانی لقی پەیوەندیە نێونەتەوەییەکان-بەڕابەرایەتی ئەرنست هاس- لێکۆڵینەوەیان لەبارەی ئەو مەسەلانەوە کردووە کە پەیوەندی بەپەیدابوونی کۆمەڵگا سیاسی یان نەتەوەییەکانەوە هەیە، کە دەشێت سەروتر لە دەوڵەتی نەتەوەیی بن. لە دەیەی ۱۹۵۰دا هاس بەرنامەیەکی لێکۆڵینەوەی لە پەیوەندیە نێونەتەوەییەکاندا بونیاد نا، کە تەواوکەری لێکۆڵینەوەکەی دویچ بوو لە سیاسەتی پراکتیکیدا. هاس و پەیرەوانی لەبری لێکۆڵینەوەی رەوتەکانی کارو کاردانەوەی گۆڕاوە شیمانەیی و ڕێکەوتەکان لەئاستی جەماوەردا، لێکۆڵینەوەیان لەبارەی ئەو گروپە خاوەن بەرژەوەندی و ڕێکخراوە یان نەتەوەیی و تواناکانیان بۆ لاوازکردنی وەفادارییە

نەتەوەییەکان و ڕەنگە تەنانەت دروستکردنی وەفاداری نیمچە نەتەوەیی تازە لەئاستی ناوچەیدا دەکرد. دیدی بنەڕەتی هاس کە بەدیدی وەزیفیخوازی نوێ ناوی دەبرد، ئەوەیە کە ...... جیاوازی گروپە خاوەن بەرژەوەندیەکان لەسەر سەرچاوە و مافەکان لە ناوەندە سیاسیە تازەکاندا، دەبێتە هۆی ئەوەی دەسەڵاتێکی دەزگایی زۆرتر لەو ئاستەدا داوابکرێت. هاس بەڵگەی دەهێنایەوە کە جیاوازی و پەرەسەندنی دەزگایی، دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە، هوشیاریەکی ئەورووپی تازە پێکبهێنن. پەیرەوانی هاس تاوتوێی دروستکردنی وفاداری سیاسی یان نەتەوەییان لەرێگەی ڕێکخراوە ناوچەییەکانەوە کردووە: لە ئەمەریکای لاتین (بەهۆی هاس و فیلیپ شمیتەر)، ئافریقای باشور(بەهۆی جۆزیف نای) و ئەفەریقای باکور (بەهۆی عەبدولجلوح)و هەندێك شوێنی دیەوە.

هەڵوێستی "دروستکراوی" نەتەوە چەندان نەیاری لەئاستی پەیوەندیە نێونەتەوەیەکاندا هەبوو، کە نەمرخواز بوون. بۆ نمونە ستانلی هافمەن گاڵتە بە شوبهاندنی نمایشی نەتەوە بە پیاز دەکات -کە بەهۆی وەزیفەخوازانی نوێوە پێشکەشکراوە و دەڵێت دەکرێ ئەوەندە توێکڵی لێبکرێتەوە، کە هیچی لێنەمێنێتەوە-. ستانلی هافمان لەبەرامبەر ئەمەدا دەیگوت نەتەوە زۆرتر لە کنگر دەچێت، دەکرێت بەرگەکانی لێبکرێتەوە، بەڵام دڵی هەروا دەمێنێتەوە. ئەو مەسەلەیەی کە ئایا "کۆمەڵگای ئەورووپا" یارمەتی بەهێزبوونی شوناسە یان نەتەوەییەکان دەدات یان نا، هێشتا لەم لقەدا جێگەی لێکۆڵینەوەیە. بەڵام لەقۆناغی جەنگی ساردا ئەو بابەتانەی بونە پاڵنەری هاس و هاوکاران و رەخنەگرانی، لەرووی گاڵتەجاڕییەوە بە "سیاسەت زانی" ناودەبرا. لەکاتێکدا ئەو بابەتانەی پەیوندیان بە پاراستن و ئاسایشەوە

هەبوو، بە "سیاسەتی بالاّ" ناودەهێنرا. لەبەر ئەم جۆرە جیاوازیانە بوو کە ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە ناسیۆنالیزمەوە هەیە، لە تیورەسازی نێونەتەوەییدا کەوتنە پەراوێزەوە.

بەلاّم روخانی سیستەمی کۆمۆنیستی زنجیرەی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانی گۆڕی. یەکەم ئەوەی کە ویلایەتە یەکگرتوەکان بێ ئەوەی هیچ زلهێزێك ململانێی لەگەڵدا بکات، بووە بە سەرکردەیەکی کرداری جیهان و دنیای بە هاوپەیمانی کۆمەڵێك هاوپەیمان و رێکخراوی نێونەتەوەیی، خستۆتە ژێر دەسەلاّتی خۆیەوە. گریمانەی پەیوەندی نێونەتەوەیی لەبارەی ئاژاوەوە، تاڕادەیەکی زۆر لاواز بووە و لێکۆڵینەوەی میتۆدیانەی ئەو پەیوەندیانەی ئاوێتەی ئاژاوەن لەنێوان دەسەلاّتە گەورەکاندا، رەونەقی خۆی لەدەستداوە.

دوەەم ئەوەی کە پاش روخانی سوڤیەت و یوگوسلاڤیا چەندین جەنگی شوم هەڵگیرسان، کە نەتەوەیان لەبەرامبەر دەوڵەتدا دادەنا(وەك ئۆسێتیەکان لەبەرامبەر گرجستاندا و سربیەکان لەبەرامبەر کرواتیەدا). لێکۆڵیارانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان سەرنجی خۆیان ئاراستەی هێزە بزوێنەرەکانی ئەم پێکدادانانە کرد. زۆرێك لەم لێکۆڵیارانە بڕوایان وابوو ئەم جیاوازیانە دەرئەنجامی ناچاریانەی (قەیرانی ئاسایشە) (کە دەکرێت باشترین رونکردنەوەی لە کتێبێکدا بدۆزینەوە کە ستایدەر و ڤالتەر پیاییدا چونەتەوە)، کە بەشێوەیەکی گشتی وەك لۆژیکێك لەپشت پێشبڕکێی خۆچەکدارکردنەوە دروستدەبێت، و بەشێوەی بڕیارێکی ئەستەم کە رویەروی رابەران دەبێتەوە، دیاری دەکرێت. بەو مانایەی ئایا (بەمەبەستی بەرگری چەکدار)دەبن یان (بۆ پیشاندانی نیەتی ئاشتیخوازانەی خۆیان، بەلاّم بەنرخی مەترسی خۆ خستنە بەر هێرش) دەستیان بەچەك داماڵین کردووە. لەحاڵەتی خۆ چەکدارکردندا تەنانەت بەنیەتی ئاشتیخوازانەش، ئەیارەکانیان دەست بەهەمان کار دەکەن، و دەرئەنجامی ئەم باروردۆخەش ئەوەیە کە لەراستیدا ئەو رابەرانەی بەمەبەستی بەهێزکردنی ئاسایشی خۆیان دەست بەخۆ چەکدارکردن دەکەن، دەیخەنە مەترسیەوە. بەم روانگەیە بۆ دیمەنی بەرکەوتنی ولاّتەکان، لێکۆڵیارانی پەیوەندییە نێو نەتەوەییەکان پیشانیانداوە کە بۆ رونکردنەوەی ئەوەی بۆچی ولاّتەکان دژی یەکدی دەست بۆ چەك دەبەن، پێویست ناکات گریمانەکە لەسەر دوژمنایەتی دێرینە دابنێین. لێکۆڵیارانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان بەکارهێنانی چەمك و هونەرەکانی خۆیان لەبارەی ئەو جەنگانەی لەنێوان ئەو نەتەوانەی (بێ ولاّتن) دژی ئەو ولاّتانەی (کە دەیانویست دەسەلاّت بەسەر ئەو نەتەوانەدا بکەن) بەرپابووە، بە سودمەند زانیووە.

سێیەم ئەوەی لەگەڵ کۆتاییهاتنی شەڕی ساردا زۆرێك لە لێکۆڵیارانی پەیوەندیە نێو نەتەوەییەکان وەك جیم کالمەن، پێیانوابوو چیدی بونیادی ئایدۆلۆژیای سەرەکی بۆ پەیوەستبونە گروپییەکان لەکاتی شەڕە ناوخۆییەکاندا، کە سەردەمێك لەژێر سێبەری راست- چەپدا بوو، گرنگیەکی ئەوتۆی نیە. بڕوا لەسەر ئەوەبوو کە بناغە تازەکان بۆ هەنگارنانی لەمەچەشنە- وەك سامۆئل هانتینگتۆن بەگریمانە وەریدەگرت- شوناسە نەتەوەییەکانە. لەسەر بناغەی تێڕوانینی ودرۆ ویلسۆن کە دەیگوت رێژەی بالاّی ناسیۆنالیزم بۆ ولاّت، بۆ ئاشتی جیهانی ترسناکە، بەڵگاندنێکی پەیوەندیدار بونیادنرا. ستیڤان وان ئورا بڕوای وابوو کە پێدەچێت ئەم رژێمە، لەدنیای دوای جەنگی ساردا روو لە زیادبون بێت. لەبەر ئەم هۆیانە لێکۆڵیارانی پەیوەندیە نێو نەتەوەییەکان

ڕویانکردۆتە پانتایی ناسیۆنالیزم و دیدگەلێکی تازەیان لە پەیوەندی ناسیۆنالیزم بە توندوتیژییەوە، پێشکەشکردووە.

ماوەیەکی زۆر مەسەلەی پرۆژەکانی دروستکردنی نەتەوە بە ناکۆک لەگەڵ پرۆژە "خوار نەتەوەیی"کان و ئاراستەی ئەمجۆرە پرۆژە ناکۆکانە بۆ توندوتیژی، بەمەسەلەیەکی نیگەرانکەر لە سیاسەتی پراکتیکیدا دەژمێررا و زۆرێک لە نوسینەکانی زانایانی سیاسەتی پراکتیکی لەم ڕووەوە بەشێوەیەکی سروشتی لە زەمینەی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکاندا دەگونجێن. لێکۆڵینەوەی بابەتی لەمچەشنە لە سوداندا (بەهۆی فرانسیس دنگەوە)، یوگۆسلافیا (بەهۆی سوزان ودواردەوە) سریلانکا (بەهۆی ستانلی تامبیاوە) و ئیرلەندا (بەهۆی مەك گری و ئالیریەوە) بەرچاوە. لیتین لێکۆڵینەوەی لەو مەرجە ستراتیژیە هەمەکیانە کردووە کە دەبنە هۆی ئەوەی بزوتنەوەی زیندوبونەوەی نەتەوەیی هاوڕێی توندوتیژی بێت. ئەگەرچی هاوڕاییەك لەنێوان زانایاندا نیە لەبارەی هۆکانی توندوتیژی لەنێوان وڵات و ئەو نەتەوانەی لەو وڵاتەدا دەژین، بەڵام زوربەی نوسەران ئەو ئاراستانەی کە لە مەسەلە ستراتیژیەکان وردەبنەوە (بۆ نمونە ئەو رابەرانەی کە سود لە مەسەلەی خەونە نەتەوەییەکان وەك ڕێگەیەك بۆ گرتنە دەسەڵات وەردەگرن، یان ئەو گروپانەی ترسی ئەوەیان هەیە کە ئەگەر ئەنوکە پشت بەجەنگ نەبەستن، باردۆخیان لەدوایدا خراپتر دەبێت) و هەروەها ئاراستەی گوتاری (بۆ نمونە نادادپەروەریەکانی رابردوو کە لە زیهنی گشتیدا ماوەتەوە، یان ئەو وێنا قاڵبیانەی کە ئەندامانی گروپەکانی دی- لەحاڵەتی لاوازی و بێهێزی گروپەکانی خۆیاندا- هەیانە) بەیەکەوە گرێبدەن. زوربەی نوسەران میتۆدە گەورەکان بۆ ئەم کێشەیە-ئەگەر وردبونەوەیان لەسەر هۆکارەکانی وەك سەرمایەداری یا کۆلۆنیالیزم بێت- لەبەرچاو ناگرن، یان ڕەدی دەکەنەوە. چونکە زۆرێك لە وڵاتەکان لەبەردەم ئەم هۆکارانەدان، بەڵام تەنها لەژمارەیەکی کەمیاندا جەنگە ناسیۆنالیستیەکان لەئاستی بەربڵاودا ڕوودەدەن.

چەندان کەس لە لێکۆڵیارانی لێکۆڵینەوە پراکتیکیەکان لە زانستە سیاسیەکاندا بۆ تاوتوێکردنی هێزە بزوێنەرەکانی توندوتیژی کە بەرهەمی ناسیۆنالیزمە، پشتیان بەکۆمەڵناسی ڕوداوە باس ووروژێنەرەکان بەست. مەسەلەی سەرەکی لەم نوسینانەدا -وەك لە نوسینەکانی سیدنی ترودا بەباشی کورتکراوەتەوە- بریتیە لە بونیادەکانی پێگە کە گروپە ناڕازیەکان دەستیان بەسەریدا ناشکێت. دەورەکانیان لە ناڕازیبوون کە لەسەردەمی مێژوویی رابردوەوە فێری بوون، ....مارك بیسینجەر بە پشتبەستن بەم چوارچێوە چەمکیە بۆ لێکۆڵینەوەکانی خۆیان لەبارەی وروژانی نەتەوەیی سۆڤیەتی جارانەوە، بەو دەرئەنجامە گەیشت کە ئەو تێڕوانینەی پێیوایە توندوتیژی لە قۆناغێکی تایبەتی ساز و ئامادەکردنی ناڕازیبونە نەتەوەییەکاندا دەردەکەوێت، قابیلی پشتگیری لێکردنە.

بواری لاوەکی سیاسەتی پراکتیکی لێکۆڵینەوەی لەبارەی ئەگەری کۆنترۆڵکردنی دیاردەی نەیارانەتری هەستە ناسیۆنالیستەکان لەناو وڵاتە دیموکراتیەکانیشدا کردووە. ئارنێد لیپهارت لە هوڵەندار لە لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکانی خۆیدا ، بیرۆکەی "پەیوەندی نزیك"ی پەرەپێدا و پێشکەشکرد، بۆئەوەی پیشانی دا چۆن ئەو وڵاتانەی بەقوڵی توشی ناکۆکی و پارچە پارچەبوون بوون (کە نمونەکەی بوونی فرە کلتوریە لە وڵاتێکدا)، دەتوانن پڕوپاگەندە بۆ خۆبەڕێوەبردن بۆ گروپە نەتەوەیەکان بکەن و بیبەنە پێشێ. لە حاڵەتی سەرکەوتندا زۆرینەی نەتەوە توانای ئەوەیان

نابێت ستەم لە کەمایەتیە نەتەوەییەکان بکەن و کەمایەتیە نەتەوەییەکانیش پاڵنەرێکیان بۆ خەبات لەپێناو بەدەستهێنانی دەسەڵاتداریێتی تەواودا نابێت. دۆناڵد هارویتز لە بەرهەمە کلاسیکیەکەی خۆیدا "گروپە نەتەوەییە ناکۆکەکان" هەمان کێشەی لیبهارت تاوتوێدەکات، بەڵام ڕێگەی جیاواز بۆ چارەسەرکردنی جیاوازیە توندوتیژئامێزەکان پێشکەش دەکات. هارویتز لەو ڕووەوە بەتایبەتی گرنگە کە جیاکاری کرد لەنێوان جیاوازی نەتەوەیی لەناو هەلومەرجێکدا جیاوازی پلەی کۆمەڵایەتی هەیە (و لێرەوە حاڵەتێکی تەواو تەقینەوە وەردەگرێت)، و هەلومەرجی جیاوازی نەتەوەیی کە تیایدا جیاوازی کلتوری هەیە، بەڵام ئەم جیاوازیانە لەسەر بناغەی زنجیرە پلەی پایەکان رانەوەستاوە. بابەتگەلێکی زۆر لەبارەی ئەو بابەتەوە نوسراوە کە چۆن دەکرێت دروشمە ناسیۆنالیستیەکان لەناو وڵاتە فرە نەتەوەکاندا کۆنترۆڵبکرێت. نوسینەکانی مەک گری و ئالیری کە پێشکەشکەری چەند شێوزایکی پەیمانبەستنە هەم بۆ زۆرینە (بەوەی کە کاتێك کەمایەتی چەکی خۆی دادەنێت، ستەمی لێنەکەن) و هەم بۆ کەمایەتی (بۆ ئەوەی ئەو جەنگاوەرانەی بۆ ڕزگاری نەتەوەیی کەمینە دەجەنگن، کۆنترۆڵ و چاودێری بکات)، و هەروەها نوسینەکانی لیتز و ستیان کە پێشنیاری جۆرێك سیستەمی پەرلەمانی دەکەن کە توانای ئەوەیان هەیە شوناسی نەتەوە جیاوازەکان لەناوخۆیدا جێبکاتەوە، هەموو ئەمانە کاریگەریەکی ئاشکرایان لەسەر بواری لاوەکی سیاسەتی پراکتیکی هەبووە. فیرۆن و لیتین لەبارەی توندوتیژیە ڕۆژانەییەکانی ناو شەقامەکانەوە لەژێر هەلومەرجی جیاوازی نەتەوەییشدا، بەفەرمی چوارچێوەیەك کاری چاودێری ناوخۆی گروپی، وەك ڕێگەیەك بۆ دامرکاندنەوەی توندوتیژیە نەتەوەییە ڕوو لەزیادەکان، بەدەستەوە دەدەن.

لەکاتێکدا لێکۆڵیارانی سیاسەتی پراکتیکی لە بواری ڕونکردنەوەی گشتی لەبارەی توندوتیژیەکانی دەرئەنجامی نەتەوایەتی چالاك بوون، نوسینە پسپۆڕیەکانی تر لەبواری پەیوەندیە نێونەتەوەیەکانیشدا تێشکیان خستۆتە سەر جیاوازی نێوان نەتەوەکان. هەندێك لە لێکۆڵیارانی پەیوەندییە نێو نەتەوەییەکان وەك پوسن لەگەڵ ئەو وێنەیەدا کە ساز و ئامادەکردنی گروپە نەتەوەییەکان، مەسەلەیەکی بەدیهی و بڕاوەیە، سەرنجی خۆیان ئاراستەی "مەتەرێزی هەل" دەکەن، لەوکاتەدا کە وڵات توشی لاوازی و پارچە پارچەبوون دەبێت، بۆ گروپە نەتەوەییەکان دێتە پێش. گروپە نەتەوەییەکان دەشێت لە حاڵەتی لێکترازانی وڵاتدا بەدیهاتنی ئامانجە مێژوویەکانی خۆیان بۆ بوونی نیشتیمانێك زۆرتر ببینن تا لەحاڵەتی بەهێزبوونی وڵاتدا. ڕابەرە نەتەوەییەکان -بەهۆی حاڵەتی ئاڵۆزەی دەرئەنجامی لێکترازانی وڵات و نەستەمی حسابکردنە ڕاستەکان- زۆر دەشێت تواناکانی خۆیان بۆ سەرکەوتن لە جیاخوازیدا بەبەهایەکی لەرادەبەدەر کەم، توانای کارکردەوەی وڵات بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هەڕەشەی جیابونەوەی نەتەوەیی، کەمتر لە ڕاستی دەهێننە دی. ئەم دۆخە ئەو هەستە بە ڕابەرانی نەتەوە دەدات کە لێکترازانی نەتەوە، مەتەرێزی هەلێکە بۆ ئەو کەسانەی بۆ بەدیهاتنی خەونە دێرینەکانی خۆیان، بەخێرای فشار بهێنن.

لێکۆڵیارەکانی دی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان وەك فیرۆن و ڤاڵتەر دەریدەخەن کە تەنانەت بێ وێنای هەبوونی دروشمی نیشتیمانی نەتەوەیی و کورسی لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا بۆ بکەرە نەتەوەییەکان، دەکرێت جەنگی نەتەوەیی یان نێوان -نەتەوەیی

دەست پێبکات و باڵابگرێت. ئەم لێکۆڵیارانە سەرنجی خۆیان ئاراستەی ئەتوانینی رابەرایەتیکردنی وڵاتێکی بە نەتەوە بوو دەکەن لە جێبەجێکردنی "بەرپرسیارێتیەکی جێی متمانە" سەبارەت بە پارێزگاریکردن لە گیان و سامانی ئەو گروپە نەتەوەییانەی کە لە دەرەوەی بازنەی گروپی رابەرایەتین. ئەو مەرجە سەرەتاییەی کە سەرنجی لێدەدەن، پەیوەندی بە لێکترازانی وڵاتەوە هەیە کە ستایندەر بەمەرجی پێوستی دەزانێت بۆ وروژانی ناسیۆنالیزمی تازە دامەزراو لەسەر بناغەی نەتەوایەتی. پاش هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت، پارچە پارچەبوونی وڵاتەکان لەجیهانی کۆمنیستی پێشوو و ئەفەریقادا سەرتاپاگیر بووە. ئەگەر گروپێکی نەتەوەیی لەکاتی هەڵوەشاندنەوەی وڵاتدا (بۆ نمونە کرواتیەکان لە کۆماری کرواتیاو یۆگسلافیادا) بە سەرکەوتویی سەربەخۆیی خۆی رابگەیەنێت، کەمایەتیەکان (سربیەکان) کە لەناو ئەو کۆمارە تازەیەدا دەژین، ناتوانن دڵنیا بن لەوەی ئاسایشی گیان و سامانیان پارێزراو دەبێت. هەرجۆرە دڵنیاییەك کە کرواتیەکان پێیان دەبەخشن (تەنانەت گەر راستگۆیانە و راستەقینە بێت)، رەنگە لەلایەن سربیەکانەوە وا وەرگیرێت کە تاکتیکێکە بۆ بردنەوەی کات، بەمەبەستی دروستکردنی سوپایەکی نەتەوەیی کە دەتوانێت باشتر هەموو کەمایەتیەکان سەرکوت بکات. کەوابوو باشتر وایە کە لەکاتی لێکترازانی وڵاتدا بەناوی گروپی نەتەوەیی خۆیەوە، دەست بەجەنگ بکات تا ئەوەی چاوەڕوان بێت و ببینێت ئایا ئەو کەسانەی دەزگاکانی وڵاتیان بەدەستەوەیە، بەڕاستی راستگۆ بوون یان نا. کاتێك جەنگ دەستی پێکرد، رێکەوتن و راوەستانی شەڕ بەڕاستی ئەستەم دەبێت، چونکە هیچ یەك لە لایەنەکان نایانەوێت چەك دابنێن، مەگەر ئەوکاتە نەبێت کە دڵنیا بن رێکەوتنەکە جێبەجێ دەکرێت. بەڵام هیچکەس بڕوا بە جێبەجێ بوونی رێکەوتن ناکات، مەگەر لایەنەکەی دی چەك دابنێت. ڤاڵتەر دەڵێت تەنها ناوبژیوانی لایەنی سێهەم دەتوانێت یارمەتی گروپە نەتەوەییە شەڕکەرەکان بدات، لەم گۆڵمەزە رزگاریان بێت. بەڵام دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کە دەشێت دەسەڵاتە دەرەکیەکان بەرژەوەندیان لەگەڵ یەکێك لەلایەنەکانی شەڕی نەتەوەییدا هەبێت. شێوازەکانی دەسەڵاتە دەرەکیەکان کە "نیشتیمانی نەتەوەیی" یەکێك لەلایەنەکانی شەڕی نەتەوەیی لە وڵاتێکی دراوسێدان، بەم تازەیانە کەم بۆتە جێگەی سەرنجی میتۆدیانە، بەتایبەت لەلایەن بروبیکەر و پیتر ڤان هوتنەوە. وەك زانیاریەکانی ڤاڵتەر پیشانی دەدات، تەنانەت لەو حاڵەتانەدا کە دەسەڵاتە دەرەکیەکان تەنها ئارەزووی ناوبژیکەریان هەیە، ئەگەری زاڵبوون بەسەر کێشەی رێکەوتندا بەتەواوی سنورداره.

دیارە وەك لیتین ئاماژەی بۆ دەکات جیاوازی نێوان نەتەوەیی، جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ جیاوازی نێو وڵاتاندا هەیە. گرنگتر لەمە زەمینەی پەیوەندیە نێونەتەوەییەکان، واقع بینانەیە گەر گریمانەکە لەسەر ئەوە دابنێین کە ئەو سنورانەی وڵاتەکان لەیەك جیادەکاتەوە، بەتەواوی ناسراون و یەکە جیاوازەکان لێکجیا دەبن. بەم گریمانەیە لێکۆڵیارانی پەیوەندیە نێو نەتەوەییەکان دەتوانن وڵاتەکان لەپەیوەندیاندا بە وڵاتەکانی دیەوە "بە کەمەکەرانی یەکتا" دابنێن. وەك لە ئەوەیەك لێکۆڵیار بەهۆی بارت کە لێکۆڵیارێکی ئەنسرۆپۆلۆجیە و یۆنگ کە زانایەکی زانستە سیاسیەکانە بەباشی دەردەکەوێت، گروپە نەتەوەییەکان بونەوەرانێکی "دیاریکراو" بە کۆمەڵێك رێسای تایبەتیەوە نین. بەدەگمەن "رابەرێکی" یەکتا هەیە کە هەموان وەك کەسێك کە بەڕاستی وتوێژەکان بەناوی گروپەوە

ئەنجامــدەدات، بەفــەرمی بناســن. گروپــەکانیش لــەرووی ئەنــدام و ژمــارەوە گــۆڕاوون. لەراســتیدا گروپــەکان لــەرووی ژمــارە و پانتــایی گونجــاوە لەگەڵ پێکهاتــە و رادەی ئەو مەترسیەی روبەروی ئەندامــەکانیان دەبێتــەوە، دەگــۆڕێن. لەراســتیدا هاوســەرگیری لەنێوان ئەندامانی گروپەکانــدا بــەو مانایەیە کە لەکاتی پێکدادانی نەتەوەییدا، زۆرێك لــە خــەڵکی (لایەنیکــەم لەســەرەتادا) نــازانن بەشــێوەیەکی بــڕاوە ســەر بــەکام لایــەنن. نەخشەکانی دروستکردنی سنور لەناو دەروونــی گروپــە نەتەوەییەکانــدا، بــەردەوام بەشــێك لــەو جیاوازیانــە بــووە کــە نێــوان–نەتــەوەیی دەردەکــەوێت. ئــەم خاڵــەش لــە ڕوانگــەی ئــەو کەســانەوە کــە تــەنها لەدیــدی پەیوەندیــە نێــو نەتەوەییەکانــــەوە تەماشــــای جیاوازیــــە نەتەوەییــەکان دەکــەن، وون دەبێــت. کێــشەیەکی دی کە پەیوەندی بە چونیەککردنی نەتــەوەکان و وڵاتەکانــەوە هەیە ئەوەیە کە نەتــەوەکان هەمیــشە ئەو رابەرانەیان نیە کە تەنانەت توانای گفتوگۆی بــۆ چارەســەری جیاوازیــەکان هــەبێت، و ئەمــەش وەك بەرهەمــــەکانی پیــــدن و پۆدۆلفــــسکی پیــشانیدەدەن، کێــشەیەکە کــە دەرئــەنجامی چەندانجار گــەورەترە لــەوەی کــە نوێنــەرانی وڵاتــە فەرمانڕەواکان روبەروی دەبنەوە.

دیــــارە لێکۆڵیــــارانی پەیوەندیــــە نێونەتەوەییــەکان رەهەنــدێکی تــەواو تازەیــان بــە لێکۆڵینــەوەی ناسیۆنالیزم و دەوری ناسیۆنالیزم لــە توندوتیژیــە ناوخۆیــەکانی وڵاتــدا بەخشی. لاتیکــەم دودڵــی لێکۆڵیــارانی پەیوەندییــە نێونەتەوەییــەکان (کــە سەرچــاوەی لــە کتێبــی "سیاســەت لــەناو نەتەوەکانــدا وەرگرتبــوو کــە نوســینی هــانز مۆرگنتــۆ بــوو) ســەبارەت بــەو رێگەچــارانەی بــۆ توندوتیــژی نێــوان وڵاتــەکان پێــشنیار دەکرێــت و پــشت بــە نیــەت باشــی بەشداریکەران دەبەستێت، سودبەخشە. بۆ نمونە جــەك ســتایندەر و کــارن بلنتــاین روبــەروی ئــەو پێــشنیارە هەنــدێکجار ساویلکانە و لەهەمانکاتــدا نیــەت باشــەی رێکخــراوی "چــاودێریکردنی مافــەکانی مــرۆڤ" بونــەوە، کــە راگەیانــدنی ئــازاد و کــــراوە مەرجــمێکــــە بــــۆ بەنەتــــەویکردنی توندوتیــژئامێزی جیاوازیــە ناوخۆیــەکانی وڵات. لەبەرامبــــەر ئەمــــەدا بلنتیــــان و ســــتایندەر پیــــشانیدەدەن کــــە خــــراپترین رودلوەکــــانی ئــەوەکوژی، دوابــەدوای قۆناغێــك بــووە کــە تیایــدا ســــنوردارێتیەکانی راگەیانــــدن کەمکراوەتــــەوە. دیــدی پەیوەندیــە نێونەتەوەیــەکان بەتایبــەتی لــە تێگەیــشتنی ئــەو خاڵــەدا کــە بۆچــی توندوتیــژی دەتوانێــت بــەناوی ئاسایــشی نەتــەوەوە دەســت پێبکــات، سودبەخش بــووە– بــێ ئــەوەی پێویــست بێــت دوژمنایەتیــە کۆنــە ناواقعیینــەکان یــان تەنانــەت هەڕەشــە واقعیــەکان بــۆ ئاسـایش، بـە شتێکی بەڵگەنەویست بژمێرێت.

## پێنجەم: لە پەراوێزی ئەم بوارەدا

زانــــستە سیاســــیەکان وەك لقێــــك تــــەنها ســەرنجێکی ســەرپێیانەی راگــوزەری بــۆ چــەندان مەســــەلەی پەیوەندیــــدار بــــە ناســــیۆنالیزمەوە هــەبووە، کــە بەڕاســتی دەبێــت بەشــێوەیەکی شایــستە جێگــەی لــە بوارەکەیــدا بێتــەوە. مێــژووی سیاســـی و ڕێنـــایی ناســـیۆنالیزم لـــە زانـــستە سیاسیەکاندا لە پەیوەندیدا بە بەرهەمەکانی هانز کــۆهن وکارلتۆن هیــزەوە، بەشــێوەیەکی ســەرەکی بە بێدەنگی ئەنجامدراوە. هەرچەندە ئەم نەریتــە وەك راپــۆرت نوســی، کاریگــەری لەســەر زانــستە سیاســـیەکان بـــووە، بـــەڵام بەرهـــەمی زانـــستە سیاسیەکان نــەبووە. بەهــەمان ئاراســتە زانایــانی زانــــستە سیاســــیەکان لــــەبارەی "وتوێــــژەکانی زانکــۆی ئــابوری لەندەنــەوە" ســەبارەت بــە خــاڵی دەرچونەکانی ناسیۆنالیزم کە تیایدا پێی گلنەر

و سەمیس و كەدروی لەئاراداییە، بێدەنگیان هەڵبژاردووە. هێزی بزوێنەری ناسیۆنالیزمی تازە چییە؟: "چەمكەكان یان ئایدیاكان" (وەك كەدروی بروایوایە)، "نەتەوەكان" كەپێشتر هەبوون (هەڵوێستی سمیس)، سەرەتای مۆدێرنسازی و پیشەسازی بوون (گلنەر)، هەستی دەروتی كینەئامێزی (گرینفلد)، یان هەستی توڕەیی لادێییەكان و جوتیاران، سەبارەت بەوەی ئارمندە جیهانیەكانیان لەژێر حوكمڕانی بێگانەكاندایە (هراچ)؟ ئەم وتوێژە كە گرینفلد و میرۆسلاڤ و هراچ سەرقاڵین، زۆر زیاتر لە سنورەكانی لەندەن دەڕوات، بەڵام گروپە باڵادەستەكان تیایدا كۆمەڵناسان و خەڵكناسانن و بەدەگمەن زانایانی زانستی سیاسی پێیان تێخستووە. پڕ ماناتر لە نەبوونی تێڕوانینی سیاسیەكان بۆ رەهەندە گرنگەكانی ناسیۆنالیزم، ئەو راستییە كە جگە لەدوێچ زانایانی بەرجەستەی زانستە سیاسییەكان كە بابەتگەلێكیان لەبارەی ناسیۆنالیزمەوە نوسیووە-جۆن ئەمسترانگ، بندیكت ئەندرسۆن، پارتا چاترجی- بەشی زۆری نوسینەكانی خۆیان لە بڵاوكراوە پسپۆڕیەكانی ئەم لقەدا بڵاونەكردۆتەوە. بە سەرنجدان لەم جیاكاریە - لەنێوان ئەوەی دەبێت تەوەرەی سەرەكی سەرقاڵی زانستە سیاسیەكان بێت و نەبوونی ئەمجۆرە نوسینانە لە بڵاوكراوە پسپۆڕیە بەرجەستەكانی ئەم لقەدا- بەشی كۆتایی ئەم نوسینە تەرخان دەكەین بۆ هەندێك لەو ئاسۆیانەی دەتوانێت و دەبێت بەشێوەیەكی بەرهەمهێن لەكارە داهاتوییەكانی زانستە سیاسیەكاندا گەشەبكات.

**ئەلف: ناسیۆنالیزم وەك ڕێسازێكی سیاسی بۆ دەسەڵاتی وڵات**

جۆزێف راتچلید لەساڵی ١٩٨١دا -كە نوسینەكەی پێشوی، تاوتوێی ئاكۆكیە نەتەوەییەكانی شیكردبۆوە، لە باشوری ئەورووپای ئاوەندیدا- چوارچێوەیەكی بۆ لێكۆڵینەوەی سیاسەتی نەتەوەیی بڵاوكردەوە. یەكێك لە هاوكاریە گرنگەكانی ئەم چوارچێوەیە ئەوەبوو لەسەر بناغەی ئەو وێنایە دامەزرا كە سیاسیكردنی نەتەوەیی "دەتوانێت لەململانێ و هەوڵداندا بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات، لەرووی ئامێریەوە بەكەڵك بێت"(١٩٨١،ص٢٤٨). راتچلید بۆ گەشەپێدان و دروستكردنی ئەم چەمكە، تاوتوێی ئەو هێزە بزوێنەرە سیاسیانە دەكات كە دەشێت دوابەدوای رەوتە جیاوازەكانی پۆلبەندی نەتەوەیی دروستبن. برویلی كە وتارەكەی خۆی لەبارەی ناسیۆنالیزمەوە ساڵی دوایی بڵاوكردەوە، رەهەمان ئەو بەڵگاندنانەی رایچی پێشكەشكرد، دەڵێت زوربەی ئەو لێكۆڵینەوانەی لەبارەی ناسیۆنالیزمەوەن، پرسیارێكی سیاسی بنەڕەتیان فەرامۆشكردووە" گروپە ناسیۆنالیزمەكان بەدوای چییەوەن و لەچ هەلومەرجێكدا سەركەوتن بەدەست دێنن؟ برۆیلی هەروەها دەڵێت بەشێكی زۆر لەو نوسینانەی لەسەر ناسیۆنالیزمن، سەرنجیان لە هەست و تێزە نەتەوەییەكان داوە. هەروەها درێژەی پێدەدات كە بەشێكی یەكجار كەمی ئەو كارانەی باسی سیاسەتیان كردووە، ئەو مەرجانەی كە ناسیۆنالیزم تیایدا سەرهەڵدەدات و رادەی بەدیهاتنی ئامانجە ناسیۆنالیزمیەكانیان بەشێوەیەكی تایبەت لەبەرچاو نەگرتووە. برۆیلی بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، جۆرەكانی ناسیۆنالیزمی پۆلێن كردووە، بۆ ئەوەی لە ئایندەدا لەبارەیانەوە تیورەسازی بكەین. برۆیلی لەسەر بناغەی دوو رەهەند بزوتنەوە نەتەوەییەكانی لێكجیا كردۆتەوە. سەرەتا ئەوەی كە ئامانجی بزوتنەوەكان وەك جیاخوازی، ریفۆرمخوازی یان یەكێتی خوازی

هەڵدەسەنگێنێت. دوهەم ئەوەی کە دیاریدەکات ئایا وڵاتی نەیاری بزوتنەوەی نەتەوەیی، وڵاتێکی نەتەوەییە یان وڵاتێکی نانەتەوەیی. ئامانجی بروێلی پێشبینی رادەی ئەگەری سەرکەوتنی پرۆژە ناسیۆنالیستیەکانە بەپێی جۆرەکانیان، قۆناغێکی مێژوویی کە تیایدا بەسەردەبەن، ئەوەی کە ئایا لە جیهانی گەشەکردووە هەڵساون یان لە جیهانی گەشەنەکردووەوە، قبوڵکردنی ئەمجۆرە بزوتنەوانە لەلایەن هێزە گەورەکانەوە، و-رەنگە داهێنانەتر لەهەموویان- دەسەڵاتی پێداویستیەکانی وڵات بۆ ئەرمکردنی خواستە ناسیۆنالیستیەکان. بروێلی بۆ هەڵسەنگاندنی خۆی لە سەرکەوتنی بەرنامە ناسیۆنالیستیەکان، پشتی بە بەراوردکاری و شتگەلێکی بەوردی هەڵبژێرراو بەستووە، دەبێت لێکۆڵینەوەکانی دوایی لەرێگەی بەکارهێنانی شیکردنەوەی ئاماری و لێکۆڵینەوەی وردی بابەتە پێشهاتووەکان، بەمەبەستی پەیبردن بە پێداویستیەکانی سەرکەوتن یان شکست، بیروڕاکانی بروێلی کامڵ بکەن. زانایانی زانستە سیاسیەکان هەروەها دەبێت بەرهەمەکانی سەرکەوتنی سیاسی بەسەر رێکخستنی تازەی ئامانجە سیاسیەکانی رابەرانی ناسیۆنالیستدا بخەنە ژێر لێکۆڵینەوەوە. ئەوە شتێکی مومکینە کە سەرکەوتنی سیاسی، رابەران بەرەو خواستگەلێکی زیاتر پاڵ پێوە بنێت کە حەز بە بەدیهاتنی ناکەن، و لەحاڵەتی بەدیهاتنیشدا یارمەتی دروستکردنی لێکترازانی تازە لەناو خودی بزوتنەوەی ناسیۆنالستیدا دەدەن.

**ب: ناسیۆنالیزم وەك شێوەیەك گروپی شوناسی بەسیاسیکراو**

ئەگەر بگەرێینەوە بۆ شکڵبەندیە کاریگەرەکانی لیپست و رۆکان لەدەیەی ١٩٦٠دا، دەبینین دێر زەمانێکە زانستە سیاسیەکان سەرنجی لە سەقامگیرکردنی گروپە شوناسدارەکان وەك گروپە خاوەن بەرژەوەندیە رێکخراوەکان لە کۆمەڵگا دیموکراتیەکاندا داوە. لیپست و رۆکان بەتایبەتی ئارەزوومەندی بەسیاسیکردنی شوناسە "کاسۆلیکی" یان "کرێکاریەکان" بوون، و هەروەها چۆن ئەم شوناسانە وەفاداری دەنگدەران رادەکێشێت. ئەوان ئەوەیان بە گریمانە وەردەگرت کە کاتێك چوارچێوەی شوناسە سیاسیەکان جێگیر دەبێت (بۆ نمونە کاسۆلیك لەبەرامبەر ئادینی لەچوارچێوەی کۆماری سێهەمی فەرەنسادا)، ئەم چوارچێوەیە تەنانەت ماوەیەکی درێژ پاش داڕمانی ئەو بناغە کۆمەڵایەتیەی کە دروستکەری ئەم جیاکاریە بووە، هەروا وەك هۆکارێکی گرنگی جیاکاری سیاسی دەمێنێتەوە.

لەدنیای هەنوکەی ئێمەدا سیاسیکردنی پۆلێنکردنەکانی شوناس جا چ لەسەر بناغەی مەزهەب، رەگەز، ئارەزووە جنسیەکان، نەتەوایەتی یان رەگەز بن، هەم لەرووی راکێشانی وەفاداریە پەیڕەوەکانیەوە بەهێزترن، هەم لەهەمانکاتدا لەرووی هەستی نزیکی توندی تاکەکان بۆ پۆلینکردنەکانی شوناسە رۆژانەییەکان ناجێگیرترە. وادێتە پێشچاو کە لێکۆڵیارانی ناسیۆنالیزم دەبێت کەم کەم تەرکیز لەسەر پانتایی شوناسە کۆمەڵایەتی-کلتوریە شیمانەییەکان بکەن و ئەو هەلومەرجانە دیاریبکەن کە تیایدا شوناسە نەتەوەییەکان خاوەن ئارەزووی سیاسی بەهێزن. یەکێك لە تەماشاکردنەکان بۆ ئەم کێشەیە دەتوانێت ئەوە بێت کە سیاسەتی شوناس وەك یاریەکی هارئاهەنگ دابنێین (کە تیایدا تاکەکان دەیانەوێت گروپە شوناسیەکان بدۆزنەوە کە نەك هەر تەنها بۆ خۆیان، بەڵکو بۆ ژمارەیەکی دی خەڵکیش وروژێنەر بێت، بەشێوەیەك بکرێت لەم رێگەیەوە کۆمەڵگایەکی هاودڵ و هاوشوناس

دروستبکرێت)، و هەوڵبدەین ئەو بارودۆخانەی کە تاکەکان لەژێر ئاڵای یەك شوناسی نەتەوەییدا هاوئاهەنگ دەبن، دیاریبکەین. لە لێکۆڵینەوەکانی لیتیندا لەبارەی نەتەوە زمان روسییەکانی ئەو کۆمارانەی کە تازە سەربەخۆییان لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران بەدەستهێناوە، قاڵبێکی فکری بەهەمان بیرەوە پێشکەش کراوە، کە هەنگری وردەکاری جێی سەرنجە لەبارەی نەتەوەگەریەکەوە کە کرداره دەرونییەکانی گەمەی هاوئاهەنگی شوناس پیشاندەدات. پەرەپێدان و دروستبونی قاڵبی تر لەسەر بناغەی ئەو گریمانەیە کە شوناسە نەتەوەییەکان لە چوارچێوەی ئەو شوناسانەیە کە مۆری سیاسەتیان لێدراوە، و دەتوانێت ببێت بە بناغەی هەنگاونانی سیاسی کۆیی، دەبێ ببێتە بەشێکی بەرجەستەی دەستوری کاری زانستە سیاسییەکان.

**ج: سنوربەندی سەرلەنوێی نەتەوەکان و وڵاتەکان لە دنیای ئاشوباویدا**

سەرەڕای رادەی ئەو هەوڵە ئایدۆلۆژی و ئەو ناچاریانەی کە بەدرێژای چەندان سەدە بۆ دروستکردنی گونجان لەنێوان سنورەکانی وڵاتی نوێ و سنورەکانی نەتەوەدا دراوە، کۆتاییهاتنی جەنگی سارد بەشێوەیەکی بێوێنە ساختەیی بوونی دەوڵەتە نەتەوەییەکانی ئاشکراکرد. لە دیدی لوستیک و گروپێك هاوکارانەوە کە لەناوەڕاستی دەیەی ١٩٩٠دا چەند کۆبونەوەیەکیان هەبوو، ئەم خاڵە بەمانای باسی نەگونجان و هاوتانەبوونی نێوان شوناسی کۆیی و دەزگا سیاسییەکانی دەکرد. ئەو گرفتەی دروستدەبێت - و دەبێت جێی سەرنجی زانستە سیاسییەکان بێت- ئەوەیە چۆن دەکرێت سنورە سروشتییەکان بەسەرنجدان لە واقعە کۆمەڵایەتییەکان کە لەناویاندایە چاکبرێت. وەك پێشتر گوتمان سروشتەکان بەشێوەیەکی گشتی و وڵاتەکان بەشێوەیەکی تایبەتی سەرمایەیەکی مەزن بۆ دروستکردنی باڵادەستی سنورەکان دادەنێن. هەر هەوڵێك بۆ دیاریکردنی سنوری وڵاتەکان یان "جێگیرکردنی ئەندازەی راست"یان، لەسەر بناغەی ئەو کۆمەڵانەی لەناویدا دەژین، بەشێوەیەکی ناچارانە (دیاری نەك لەحاڵەتی جیابونەوەی ئارام و ئاشتیانەی کۆمارەکانی چیك و سلۆڤاك) ئاژاوەی سیاسی بەدواوەیە. رابەرانی ئیسپانیا پێش سەدەیەك لە بەرامبەر ئەو تێڕوانینەدا کە دەشێت سنورەکانی وڵاتی ئیسپانیا، گەورەتر لە نەتەوەی ئیسپانیا بێت، بەرگریان کرد و ئەو ئاڵۆزیانەی کە بونە هۆی شەڕی ناوخۆ ١٩٣٦-١٩٣٩، بەهۆی ئەم بانگەشانەوە توند بوو. بەرپرسیارانی کینیا هەمان هەستیان بەرامبەر بە پارێزگای باکوری خۆرهەڵاتی خۆیان هەبوو، بەرپرسیارانی حەبەشە هەمان هەستیان بەرامبەر بە بیابانی ئۆگادن هەبوو، فەرمانڕەوایانی سودان هەر ئەم هەستەیان سەبارەت بە پارێزگاکانی باشوری خۆیان هەبووە، بەرپرسیارانی روسیاش هەمان هەستیان بەرامبەر بەو کۆمارە مۆسڵمانانە هەیە کە دەکەرنە دامێنی ئۆڕاڵەوە. رەنگە نوسینە ناسیۆنالیستەکان زیاد لەسنور سەرنجیان لەسەر ئەو خواستە ناسیۆنالیستیانەی لەسەر بناغەی خۆ بەڕێوەبردن یان فەرمانڕەوایەتی دامەزرابوون دابێت، و رەنگە تێبینی ئەو پێشەکی و ئامادەکارییەیان نەکردبێت کە پەیوەندی بە جێگیرکردنی سنورەکان لەلایەن ئەو وڵاتانەوە هەیە، کە نەتەوەکان لەناویدا دەژین. زانایانی زانستە سیاسییەکان دەبێت لەو بارودۆخانە وردببنەوە کە دەکرێت لەناویاندا سنوری وڵات و نەتەوەکان سەرلەنوێ هەڵسەنگێنرێت. مەسەلەکانی ئاسایش کامانەن. مەسەلەکانی خۆشگوزەرانی کامانەن؟ مەسەلەکانی پەیوەندیان

بە گەشەکردنی ئابوریەوە هەیە کامانەن؟ ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە کەمایەتیەکانەوە هەیە کە ئایندەیان بەهۆی بەرنامەکانی جێگیرکردنی سنورە راستەکان دەکەوێتە مەترسیەوە، کامانەن؟ هەموو زانایانی زانستە کۆمەلایەتیەکان حەزیان لە لێکۆلینەوە لەبارەی داراکردنی مافە نەتەوەییەکان هەیە، زانایانی زانستە سیاسیەکان ئارەزوویەکی تایبەتیان -کە تا هەنوکەش نەهاتۆتە دی- بۆ تیورەسازی لەبارەی پرۆسەکانی گۆڕانکاری سنورەکانی ولات لەبەرامبەر خواستە ناسیۆنالیستەکاندا هەیە.

لە ناوەڕۆکی ناوەندی زانستە سیاسیەکاندا کارێکی زۆر سنوردار لەسەر نەتەوە و ناسیۆنالیزم کراوە. ناوەڕۆکە تازەکان: یەکەم: هەلسەنگاندنی ئامانجە سیاسیەکانی ناسیۆنالیستەکان، دوەم: تاوتوێکردن و شیکردنەوەی شوناسی نەتەوەیی وەك یەکێك لە بابەتە شیمانەییەکانی هاوئاهەنگی لە سیاسەتی شوناسدا، سێهەم: بیرکردنەوە لە گۆڕانکاری سروشتی بەمەبەستی هەلسەنگاندنی سەر لەنوێی ولات و نەتەوە- لە پەراوێزی زانستە سیاسیەکاندا ماونەتەوە. ئەم ناوەڕۆکانە شایستەی ئەوەن لە ناوەڕۆکی ناوەندی زانستە سیاسیەکاندا، سەرنجیان لێبدرێت.

## شەشەم: ئەنجام

زانستە سیاسیەکان ئاراستەیەکی یەکتای بۆ لێکۆلینەوەی نەتەوەکان و ناسیۆنالیزم نیە، بەلام لقە لاوەکیەکانی مەسەلەگەلێکی گرنگیان لەبارەی ناسیۆنالیزمەوە هێناوەتە ئاراوە و تاوتوێیان کردووە. تیورەی سیاسی بەشێوەیەکی جدی (هەرچەندە کەمێك درەنگ) بیریان لە پەیوەندیە سیاسییە لیبرالییەکان لەگەل ئامانجە ناسیۆنالیستیەکاندا کردۆتەوە. هەروەها (بەپێی نەریتی لایەنگرانی حکومەتی ئارچەیی) دەورێکی گرنگی لە سەرنجدان لە رەهەندی مێژوویی نەتەوەدا بینیووە، و ئێمەی فێرکردووە کە ناکرێت ناسیۆنالیزم ئەمر یان کۆتایی مێژوو بێت. تیورەی پەیوەندیە نێو نەتەوەییەکان (هەروەها زۆر درەنگ)دەستی بە لێکۆلینەوەی سەرچاوەکانی جیاوازی توندوتیژانەی نێوان نەتەوە و ولاتەکان بەدیدێکی تازەوە کردووە، کە رێگەمان دەدات تێڕوانینمان سەروتر لەو شکلبەندیانە بڕوات کە پشت بە کینە کۆتایی نەهاتورەکان دەبەستێت. سیاسەتی پراکتیکی ماوەیەکی زۆرە تیورەکانی نەتەوەسازی -واتە چۆنێتی جێبەجێکردنی گونجاندنی سنورەکانی نەتەوە و ولات- ی خستۆتە بەرنامەی کاری خۆیەوە. لەکاتێکدا زۆرێك لە ناوە مەزنەکان لەبواری ناسیۆنالیزمدا سەر بە زانستە سیاسیەکان نەبوون(هانز کۆهن، کارلتون هیز، ئانتۆنی سمیس، ئەریك هۆبسبام، ئەرنست گلنەر) بەلام زانستە سیاسیەکان میدانی سەرەکی لێکۆلینەوە لەبارەی چەندان مەسەلەی بنەڕەتی ناسیۆنالیزمەوە بوون. ئەگەرچی زانا سەرەکیەکانیان هێشتا سنوری کارەکانیان ئەوەندە پەرە پێنەداوە کە تاوتوێی هەندێك مەسەلەی یەکجار گرنگی ئەمڕۆ بکەن کە لێرەدا هێنراوەتە ئاراوە.

## سەرچاوە:

دیڤید د.لیتین: علوم سیاسی. ترجمه پری ئازرم وند. دایره المعارف ناسیونالیزم. جلد دوم - تهران ١٣٨٢- ص٦٦١.

# ناسیۆنالیزم لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا

فرید هالیدای

لەعەرەبییەوە: د. ئەنوەر محەمەد فەرەج

**پێشەکی:**

ناسیۆنالیزم، چ وەك سیستمێکی بیروباوەڕ یان وەك بزاڤێکی سیاسی، بە یەکێك لەو پرۆسانە دادەنرێت کە پێکەوە دونیای هاوچەرخیان خوڵقاند. ئەگەر وەك سیستمێکی بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژیایەك تەماشای بکەین دەبینین لەلایەك ژمارەیەك چەمکمان پێشکەش دەکات لەبارەی دابەشبوون و پۆلێنکردنی مرۆڤایەتی بۆ چەندین گروپ و دەستەی جیاواز، لەلایەکی تریشەوە تێگەیشتنێکمان پێدەبەخشێت سەبارەت بەو شێوازە سیاسییەی کە گونجاوە لەگەڵ چۆنیەتی ڕێکخستن و چۆنیەتی ڕەفتارو پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتان کە هەریەکەیان نوێنەرایەتی دەوڵەتێك دەکەن.

ناسیۆنالیزم کۆمەڵێك ئاکۆکی وروژاندوە لە ئاستی زانستە سیاسییەکاندا بەگشتی و لە ئاستی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیشدا بە تایبەتی، هەندێك لەو ئاکۆکیانە پەیوەندیدارن بە لێکدانەوەی هۆکارەکانی گۆڕانی ناسیۆنالیزم بۆ دیاردەیەك کە تەواوی جیهانی گرتۆتەوە، هەندێکی تریشیان پەیوەستن بە دژواری گونجاندن لە نێوان پێداویستییەکانی ناسیۆنالیزم لەلایەك و پێداویستییەکانی سیستمی نێودەوڵەتی لە لایەکی ترەوە، چونکە زۆرجار ناسیۆنالیزم وەك پاشماوەی سەردەمە ڕابردووەکان تەماشا دەکرێت کە دژایەتی پرۆسەی بەجیهانیبوون دەکات و هەندێجاری تریش وا تەماشا دەکرێت کە بەهۆی ئەو پرۆسەیەوە پێگەکانی خۆی بەهێزتر دەکات.

## ناسیۆنالیزم و بەجیهانیبوون *Nationalism and Globalization*

ناسیۆنالیزم وەك ئایدیۆلۆژیایەك و بزاڤێکی کۆمەڵایەتی، یەکێکە لەو فاکتەرانەی کە بەشدارە لە فۆرمەلەبوونی جیهانی نوێدا. بەڵام تا سەردەمانێکی نزیکیش ئەم هەستە نەتەوایەتییە گرنگییەکی ئەوتۆو شیاوی پێنەدرابوو لەلایەن زۆریەی دەروازەکانی

لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە. چونکە ئەو دیدوبۆچوونە باڵادەست بوو بەسەر بوارەکەدا کە ناسیۆنالیزمی وەك پاشماوەیەکی ڕابردوو تەماشا دەکردو بە هۆکاری پشت هەڵگیرساندنی جەنگەکانی ئەورووپای دادەناو لە جیهانی سێهەمیشدا وەك دەرئەنجامێکی سەردەمی کۆلۆنیالیزم سەیردەکرا. لەبەرئەوە لەگەڵ دانپێدانانی گرنگییەکەشیدا هێشتا بە دیاردەیەك دەژمێردرا کە خاڵیە لە ئەقڵانیەت لە ئاستی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، بۆیە سەرەنجام ناسیۆنالیزم پشتگوێخرا لەلایەك بەهۆی بەرپابوونی ئاشتی لە نێوان زلهێزە جیهانییەکانداو لەلایەکی تریش بەهۆی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی ئەو دەوڵەتانەی کە پێشتر لە ژێر چەپۆکی کۆلۆنیالیزمدا بوون.

ئەم دۆخە نوێیە دەرئەنجامێکی بەڵگەنەویستی لێوە دروست بوو کە دەوڵەتان بەشێوەیەکی پلەبەندو لەسەرخۆ پشت هەڵدەکەن لە بیری ناسیۆنالیستی لە پەیوەندیو مامەڵەکردنیان پێکەوەو لەبری ئەوەش پەنادەبەن بۆ ئەو دامودەزگا نوێیانەی کە سیستمی جیهانی ئەپارێزن، لە نموونەی نەتەوە یەکگرتووەکانو یەکێتی ئەورووپا، بە مەبەستی بەدیهێنانی هاریکاریی زیاتر. لەو سۆنگەیەشەوە ئەوەی چاوەڕوان دەکرا لە بەجیهانیبوون، وەك شێوازێکی تەواوکاریی فراوان لە نێوان دەوڵەتانو کۆمەڵگاکانیاندا، ئەوەبوو کە بواری زیاتر برەخسێنێتو ئەم هاریکارییە بەهێزتر بکات: چونکە لەلایەك جیاوازییەکانی نێوان دەوڵەتان نەسرێتەوەو، گەلانیش کراوەتر دەبن لەسەر هاریکاریو ئاڵوگۆڕی بازرگانی پێکەوەو، بەشێوەیەك کە کاریگەریی ئەم دۆخە دەکاتە ئینتیماو وابەستەیی نەتەوەییش کە لەسەر بنەمای دەوڵەتی نەتەوەیی هاتونەتەکایەوە.

لە ڕاستیدا هیچ شتێك وەك ناسیونالیزم دژ بە کرۆكو ڕۆحی بە جیهانیبوون نەبوو. هەرچەندە ئەم دیدە بۆ مەسەلەکە لە ئێستادا مایەی قبوڵکردن نییەو زۆرکەس دژایەتی دەکەن. چونکە هەستی نەتەوایەتی لە وڵاتانی پێشکەوتوو هاوشانی وڵاتانی تازە گەشەکردوودا بەردەوام لە دەرکەوتندایە، بەتایبەت لە کاتی داواکاریی گەلان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی یان خودموختاریی زیاترو فراوانتر لە چوارچێوەی هەمان دەوڵەتدا، یان لە کاتی ناڕەزایی دەربڕین لەسەر پرۆسەی کۆچکردنی پەنابەرانو پرۆسەی بازرگانی ئازاد. لە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانیشدا بەرزبوونەوەی هەستی نەتەوایەتی بە هۆکاری هەڵگیرسانی بەشێك لە ململانێ هەرێمییەکانو جەنگەکان دادەنرێتو بە بنەمایەکیش دادەنرێت بۆ دیاریکردنی بەرژەوەندییە ئابوورییەکان. واتە بە پێچەوانەی ئەو ڕایانەی کە لە ڕابردوودا برەویان هەبوو سەبارەت بە لێکتر نزیکبوونەوەی سیاسەتە ناوخۆیی و دەرەکییەکان یاخود هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی کۆمەڵگەیەکی نێودەوڵەتی یەکگرتوو، ئەبینین لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا جەختکردنەوەیەکی بەردەوام هەیە لەسەر گرنگی ئەو فاکتەرانەی کە گەلانو نەتەوەکان لێکتر جیادەکەنەوە وەك ترادیسیۆنەکانو ناسنامەی نەتەوەیی و بنەڕەتخوازیی و دابونەریتی لۆکاڵیو سیاسەتی جوداخوازی.

ئاماژەکانی ئەو فاکتەرانەش بۆ بەجیهانیبوون زۆرن، چونکە بەجیهانیبوون لە یەکەم دەرکەوتەکانیدا، زنجیرەیەك پرۆسیسی جیاوازو بگرە دژبەیەکیشی هێناوەتەکایەوە. بۆ نموونە لەلایەك ژمارەیەك بازاڕی نوێ دروست دەکاتو پشتیوانی ئاڵوگۆڕی شمەكو تەکنیکی

جیاوازیەکات لە نێوان وڵاتانداو بوار دەڕەخسێنێت بۆ گواستنەوەی هاووڵاتیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، ئەمەش لەلایەکی ترەوەو خۆی لە خۆیدا کاردانەوەو بەرگری لێدەکەوێتەوە لەلایەن ئەو کەسانەی کە هەست بە مەترسی دەکەن لەسەر بەرژەوەندییەکانیان. ئەم حاڵەتی بەرگریکردنە هەندێك لە وڵاتە پێشکەوتووەکان دەکرێتەوە کە دژایەتی کۆچکردن و بازرگانی ئازاد دەکەن، هەر وەك چۆن ئەو وڵاتانەی جیهانی سێیەمیش دەگرێتەوە کە هەست بە ستەم و خۆسەپاندنی وڵاتە پێشکەوتووەکان دەکەن. لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین ناسیۆنالیزم وەك کاردەنەوەیەکی دژ بە بەجیهانیبوون ئەژمار بکەین و لە هەمان کاتیشدا وەك دەرئەنجامێکی بەجیهانیبوون لێی بڕوانین، ئەمەش حاڵەتی جیاوازیی و دژیەکبوونەکە قووڵتر دەکاتەوە.

لەلایەکی ترەوە گەشەکردنی هەستی نەتەوایەتی بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لە هەشتاکان و نەوەدەکانی سەدەی بیستدا بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر شکستی هەوڵەکانی بنیادنانی دەوڵەت بە پێی ئەو شێوازانەی کە لە جیهانی کۆمۆنیزمیدا پەیڕەو دەکران لە ئەزموونی دەوڵەتی خاوەن کەمینە جیاوازەکاندا. چونکە لە پاش لەبەریەك هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی (١٩٩١)دا چوار لەو دەوڵەتانە سەربەخۆیی خۆیانیان ڕاگەیاند و ئاڕاستەیەکی ناسیۆنالیستیان هەڵبژارد، کە بریتیبوون لە ڕوسیای فیدراڵ و چیکۆسلۆڤاکیا و یۆگسلاڤیا و ئەسیوپیا و لە ئەنجامدا بیست و دوو دەوڵەتی سەربەخۆیان لێوە دروست بوو. هەرچەندە لێرەدا نابێت ڕۆڵی ئەو فشارە کۆمەڵایەتی و ئابوریانە لە یاد بکەین کە وڵاتانی خۆرئاوا دژ بە جیهانی کۆمۆنیستی پیادەیان دەکرد.

لە سەردەمی بەجیهانیبووندا هەندێك لە نەتەوەکان ئاڕاستەی جیابوونەوە هەڵدەبژێرن نەك یەکگرتن و توانەوە کە دەوڵەتە گەورەکاندا، لە هەمانکاتدا داوای ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی خۆیان دەکەن و ئەیانەوێت بە مەرجی تایبەتی خۆیانەوە بێنە نێو بازاڕە جیهانیەکانەوە. بەڵام لە لایەکی ترەوە دارمانی ئەزموونی کۆمۆنیستی لە هەندێك لە وڵاتانی جیهاندا جۆرێکی نوێی لە ناسیۆنالیزم بەرهەمهێناوە کە بەشێك لە ئەدگارەکانی لە ئەزموونی یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا و یەمەن و هەوڵەکانی چین و کۆریادا دەردەکەوێت. بە دەربڕینێکی تر پەیوەندی نێوان ناسیۆنالیزم و بەجیهانیبوون لە جۆری یەکەمدا ئاڕاستەی دابەشبوون و لێکتر جیابوونەوە دەگرێتەبەر و لە جۆری دووەمدا ئاڕاستەی لێکتر نزیکبوونەوە و یەکگرتنەوە دەگرێتەبەر.

بۆ دیاریکردنی پەیوەندی نێوان ناسیۆنالیزم و بەجیهانیبوون ئەتوانین بگەڕێینەوە بۆ سەرەتەمە مێژووییەکان و سەرەتاکانی دەرکەوتنی سیستمی جیهانی نوێ. فەلسەفەی ناسیۆنالیزم وەك سیستمێکی بیروباوەڕ، لەسەر دامەزراندنی چەندین دەوڵەتی سەربەخۆ بنیادنراوە کە پشت بە کەلتوور و مێژووی نەتەوەکان دەبەستێت و کار لەسەر ڕایەڵەکانی جیاوازی و تایبەتمەندی کەلتووری و مێژوویی گەلان دەکات. هەربۆیە هەمیشە باس لە ڕادەی سەربەخۆیی و ئارەزایی نەتەوەکان دەکات بەڵام لە ڕاستیدا ئەم فەلسەفەیە لە بۆشاییدا دروست نەبوو، بەڵکو بەشێك بوو لەو گۆڕانکارییانەی کە لە جیهانی دوو سەدەی ڕابردوودا هاتەکایەوە و ژینگەیەکی جیهانیان بۆ بڵاوبوونەوەی ئەم بیرە نوێیە خوڵقاند. لە گرنگترین ئەو گۆڕانکاریانەش ئەتوانین ئاماژە بکەین بۆ هەوڵەکانی تەواوکاریی لە نێوان بازاڕە

جیهانیەکانـــدا، هاتنەکایـــەی ئیمپراتۆریەتـــە کۆلۆنیالیستە ئەورووپییەکان و دەرکەوتنی بزاڤی بەرگریکاری لە دژیان، هەروەها هەڵگیرسانی جەنگـە جیهانییـەکان و بڵاوبوونـەوەی بیـرو سیـستمی دیمـوکراتی لــە جیهانـدا. خـاڵی سەرسـوڕهێنەر لێـرەدا ئەوەیــە کــە ئــەو ناســیۆنالیزمەی کـــە لەســـەر بنــەمای جیاکردنـەوەی گـەلان لـە یـەکتری دروسـتبوو بەهۆی ئاراستەی فراوانخوازی و نێودەوڵـەتی و بەجیهانیکردنەکانـەوە بڵاوبوویـەوەو تەشـەنەی کــرد لـــە دوو ســـەدەی ڕابـــردوودا وەك کاردانەوەیەك بۆ ئەو ئاڕاستانە.

## بـەجیهانیبوون و ناسـیۆنالیزم: پرۆسـە دژ بەیەکەکان

**١. ئـەو فاکتەرانـەی کـە دژ بـە (ناسـیۆنالیزم) دەوەستنەوە:**

- خۆشگوزەرانی هاوبەش.
- تەواوکاریی ئابوری نێودەوڵەتی.
- کۆچکردن.
- سەفەرو گەشتوگوزار.
- کارکردن لە دەرەوەی سنوور.
- مەترسییە جیهانییەکان.
- فراوانبـوونی کۆمۆنیکەیـشن لـە ئاسـتی جیهانیدا.
- کۆتـایی هـاتن بـە بیرۆکـەی سـەروەریی ئابوری.

**٢–ئەو فاکتەرانەی کە پشتگیری لە (ناسـیۆنالیزم) دەکەن:**

- لـە دەسـتدانی کـۆنترۆڵ لـە بەرامبـەر وەبەرهێنەرە بیانییەکاندا.
- دژایەتیکردنی دیاردەی کۆچ.
- مەترسی لە تەشەنەکردنی بێکاریی.
- ناڕەزامەنـدی لـە دامودەزگـا سـەروو نەتەوەییەکاندا.
- ڕقو ڕەدکردنەوەی کەلتوورە بیانییەکان.
- مەترسی تیرۆرو کاری تێکدەرانە.
- دژایـەتیکردن هۆکارەکـانی میـدیای جیهانی.
- سوودو قازانجەکانی سەربەخۆبوون.

به هـەرحاڵ، پەیوەندی نێوان ناسیۆنالیزم و سیـستمی جیهـانی ڕەهەنـدی مێـژووی تێپەڕانـدووە. چـونکە لەلایـەکی تـرەوە ئـەم پەیوەندییە شێوازێکی (نۆرماتیڤ)ی لە خۆی دەگرێت و پەیوەستە بەو بەهاو بیروڕایانەوە کە چۆنیەتی ژیانی گەلان و پێوەرەکانی دەسەڵات و گوێڕایەڵی بۆ دیاریدەکەن. هەر بۆیە ئەو هەستە نەتوایەتیـەی کە لـە تـواوی جیهانـدا تەشـەنەی کردوە ڕۆڵی ئەو فەلسەفە بنەڕەتیە ئەبینێت کە بنـەمای دروسـتبوونی سیـستمی جیهـانی پێکـدەهێنێت و سەرچـاوەی ڕەوایـەتیبوونی پێدەبەخـشێت. چـونکە ئەگـەر حکومەتـەکانی پـێش سـەردەمی نـوێ سەرچاوەی دەسەڵات و ڕەوایـەتی خۆیـان بـە پاشـا و بنەماڵـە فەرمانڕەواکانـەوە گرێـدەدا، ئـەوا سـەردەمی نـوێ و پـاش تەشـەنەکردنی بـیرو هەسـتی نەتەوایەتی سیستمێکی نوێ هاتە کایەوە کە حکومەتـەکان بنـەمای بـوون و دەسـەڵاتەکانیان ئەبەسـتنەوە بـە بیرۆکـەی سـەروەری گـەلان و نوێنەرایـەتی کردنـی گەلانـەوە. ئـەم دۆخـە نوێیـەش زاراوەی (دەوڵـەتی– نەتـەوە *Nation-State*)ی هێنایـە بـوون. واتـە هـەر حکومـەتێك نوێنەرایـەتی نەتەوەیـەك دەکـات. هـەر ئـەم دۆخـەش بوو بواری ڕەخساند بۆ هاتنەکایـەی پرانـسیپی مـافی دیـاریکردنی چـارەنووس لەلایەن نەتەوەکانەوە، کە ماق تەواو ئەبەخشێت بـە هـەر نەتەوەیـەك کـە چارەنووسـی خـۆی

دەستنیشان بکات و دەوڵەتێکی سەربەخۆی هەبێت، یاخود ئەگەر نەتوانرا سەربەخۆبێت بە ئازادی خۆی ببێت بە بەشێك لە دەوڵەتێکی گەورەتر لە خۆی. ئەمەش مانای ئەوەیە کە تەواوی ئەو پرانسیپانەی کە سیستمی نێودەوڵەتی و یاسای نێودەوڵەتی و ڕەوایەتی نێودەوڵەتی لەسەر بنیادنراوە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو پرانسیپە گرنگە. بەمەش ئەتوانین بڵێین کە ناسیۆنالیزم لەمڕۆدا بنەمای ئەخلاقی و مەعنەوی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان پێکدەهێنێت بە ڕادەیەك کە ئەو ڕێکخراوەی کە تەواوی دەوڵەتانی جیهان لە خۆی دەگرێت و نوێنەرایەتی ڕەوایەتی نێودەوڵەتی دەکات ناوی (نەتەوە یەککگرتووەکان)ی لێنراوە.

## ناسیۆنالیزم وەك ئایدیۆلۆژیا

*Nationalism as Ideology*

زاراوەی ناسیۆنالیزم، وەك هەر زاراوەیەکی تری بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکان، لە وێنەی زاراوەکانی (دیمۆکراسی، شۆڕش، لیبرالیزم، سۆشیالیزم.. هتد) مانایەکی فراوانی هەیە، بەڵام ئەتوانین بڵێین بە شێوەیەکی گشتی بە مەبەستی دەربڕینی دوو چەمکی جیاواز بەکاردەهێنرێت:

<u>یەکەمیان</u>، وەك بیروباوەڕێکی سیاسی یان وەك ئایدیۆلۆژیایەك، بە مانای کۆمەڵێك پرانسیپی سیاسی کە کەسێك یان گروپێك یان بزاڤێك باوەڕپێدێنن و پشتیوانی لێدەکەن.
<u>دووەمیان</u>، وەك بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی- سیاسی، بە مانای ئاراستەیەك لە کۆمەڵگە جیاوازەکاندا کە لە ئاستی جیهاندا و لە دوو سەدەی ڕابردوودا کاریگەری خۆی هەبووە و بەشێك لە چەمکە سیاسییە باوەکانیشی گۆڕیوە.

شێوازو دەرکەوتەکانی ناسیۆنالیزم وەك بیرێکی ئایدیۆلۆژی، هاوشێوەی زاراوە و بیروباوەڕەکانی تر جیاوازن لە یەکتری، بەڵام ئەوەی ناسیۆنالیزم جیادەکاتەوە لەوانە ئەوەیە کە ناتوانرێت پێناسەیەکی دیاریکراوی بۆ بکرێت و جۆرێك لە ڕێکەوتنی هاوبەشی بۆ دروست بکرێت لە نێو بیرمەنداندا. هۆکاری سەرەکی پشت ئەم نەتوانینەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بیرمەندێکی کلاسیکمان نییە کە ئەدەبیاتێکی کلاسیکی دەوڵەمەندی لە بارەی ناسیۆنالیزمەوە پێشکەش کردبێت بۆ ئەوەی هەمووان لە کاتی گفتوگۆکاندا بۆی بگەڕێنەوە. حاڵەتێك کە فەیلەسوفەکان بە (چەمکی هێشوویی؛ المفهوم العنقودي) تەعبیری لێدەکەن، کە بریتییە لە بیرۆکەیەکی خاوەن چەندین توخمی پێکەوەبەستراوی یەکترتەواوکەر.

<u>(ئەنتۆنی سمیث *Anthony Smith*)</u> یەکێکە لە گرنگترین ئەو ناوانەی کە شیکارێکی باشی لەبارەی ناسیۆنالیزمەوە پێشکەش کردووە، لە ڕاستیدا ئەم بیرمەندە کۆمەڵە بابەتێکی پێشکەش کردوین کە ئەتوانین بە تەوەرێکی گونجاوی دابنێین بۆ پێکهێنانی (چەمکی هێشوویی) لە بیری ناسیۆنالیستیدا.

## بابەتە جەوهەرییەکانی ناسیۆنالیزم

١. مرۆڤایەتی بە سروشتی خۆی دابەش دەبێت بۆ چەندین نەتەوە.
٢. هەر نەتەوەیەك خاوەنی کەسێتی تایبەتمەندی خۆیەتی.
٣. نەتەوە سەرچاوەی هێزو دەسەڵاتی سیاسییە.
٤. بۆ ئەوەی تاکەکان خودو ئازادی خۆیان بسەلمێنن، پێویستە لە سایەی بەیداخی نەتەوەیەکدا کۆببنەوە.

٥. نەتەوەكان ناتوانن بوونی خۆیان بسەلمێنن لە چوارچێوەی دەوڵەتدا نەبێت.

٦. وەلائی تاك بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی لە پێش هەر وەلائێكی ترەوەیە.

٧. بەهێزكردنی دەوڵەتی نەتەوەیی مەرجێكی سەرەكییە بۆ بەدەستهێنانی ئازادیو پێكەوەگونجان لە چوارچێوەی سیستمی جیهانیدا.

* Anthony Smith: Theories of Nationalism, 2nd ed. (London: Duckworth, 1983), P. 21.

(ئێرنێست گێلنەر Ernest Gellner)یش لای خۆیەوە پێناسەیەكی بەمێزی بۆ (ناسیۆنالیزم) كردووە، كە تێیدا ئەڵێت: "ناسیۆنالیزم بە پلەی یەكەم پرانسیپێكی سیاسییەو باوەڕی بە چوونیەكبوونی مانای سیاسیو نەتەوەیی هەیە". ئەمەش مانای ئەوە ئەگەیەنێت كە ناسیۆنالیزم بە پلەی یەكەم پرانیسپێكی ئەخلاقییەو لەسەر ئەوە بنیادنراوە كە نەتەوەكان خاوەن بوونێكی سەربەخۆنو ئەم بوونەشیان هاوشانە لەگەڵ كۆمەڵگا سیاسییەكاندا، پێویستە هەر نەتەوەیەكیش بواری بۆ بڕەخسێنرێت بۆ ئەوەی ببێتە خاوەن خودموختارییەكی سەربەخۆی تەواو. لەم سۆنگەیەشەوە ناسیۆنالیزم وەك بیرێكی ئایدیۆلۆژیانە پێش هەموو شتێك لە شێوەی پرانسیپێكی ئەخلاقی نۆرمەتیڤدا خۆی دەنوێنێتو پەیوەندیدار دەبێت بە جیهانەوە چ وەك ئەوەی هەیەو چ وەك ئەوەی پێویستە ببێت!!

لایەنگرانی ناسیۆنالیزم ڕایان وایە كە دەوڵەت، تەنانەت هەستی نەتەوایەتی، بەو پێیەی كە دەربڕی جۆرێك لە خود سەربەخۆییو هەستكردنە بە ئینتیمای نەتەوەیی، لەگەڵ تێپەڕبوونی كاتداو بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی یان لانی كەم لە چەند سەدەی ڕابردوودا دروست بووە. لێرەوە سوود وەرگرتن لە مێژوو یەكێكە لە بابەتە جەوهەرییەكان لە دیدی ناسیۆنالیستیدا بۆ جیهان، بەردەوام هەوڵدەدرێت كە ئەوەی (بەسەرچوو، بنەڕەتی، ڕەسەن، تەقلیدگەراو ئەزەلی)یە دووبارە ئامادەبكرێتەوەو بەرهەم بهێنرێتەوە. هەرچەندە ئەم پرانسیپە خۆی لە خۆیدا مێژوویەكی نوێی هەیەو ئەگەڕێتەوە بۆ كۆتایەكانی سەدەی هەژدەو سەرەتاكانی سەدەی نوزدە، ئەو گۆڕانكارییانەی كە بەسەر سیستمی جیهانییدا هاتنو سەرەتایەك بوون بۆ هاتنە كایەی زاراوەی (نەتەوە *Nation*)و وشە هاوماناكانی لە زمانەكانی تردا.

بە شێوەیەكی گشتی ئەتوانین سێ قۆناغی سەرەكیو یەكترتەواوكەر دیاری بكەین بۆ پەرەسەندنی زاراوەی (نەتەوە)و پرانسیپی (ناسیۆنالیزم):

قۆناغی یەكەم پەیوەستە بە سەردەمی ڕۆشنگەرییەوەو بەشێوەیەكی تایبەتیش بەندە بە مافی گەلان لە بڕیاردانی چارەنووسی خۆیاندا. ئەم مافەش كاتێك بەدیدێت كە كۆمەڵێكی مرۆیی خاوەنی كۆمەڵێك بەرژەوەندی هاوبەش بنو بواری ئەوەیان بۆ بڕەخسێت كە بە گونجاوترین هۆكار ئەو بەرژەوەندیە بەدیبهێنن.

ئەم بیرۆكەیەش لە بنەڕەتدا لە بیرۆكەی (دەوڵەتی شار، *Polis*)ی گریكی دێرینەوە وەرگیراوە، هەمان ئەم بیرۆكەیەش بەتوندی لای (جان جاك ڕۆسۆ *Jean Jacques Rousseau*) دەردەكەوێتەوە، چونكە (ڕۆسۆ) لای خۆیەوە پرانسیپەكانی بیروباوەڕی مۆدێرنی داڕشتەوە سەبارەت بە دیمۆكراسیو ڕەوایەتی حوكمی زۆرینە. لەلایەكی تریشەوە (جۆن ستیوارت میل *John Stuart Mill*) بە یەكێك لە پێشەنگەكانی

بیری دیموکراسی دادەنرێت کە پاش (ڕۆسۆ) جەختی کردوەتەوە لەسەر گرنگی (حکومەتی نوێنەرایەتی، الحكومة التمثيلية) وەك باشترین شێوازی سیستمی سیاسی: واتە هەر کاتێك بیرۆکەی حکومەتی نوێنەرایەتی قبوڵبکرێت وەك ئامرازێك بۆ بەدیهێنانی پرانسیپی دیاریکردنی چارەنووس لای تاکەکان بە شێوەیەکی بەکۆمەڵ، ئەو دەمە ڕێگا کراوە دەبێت لەبەردەم پرانسیپی دیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەکاندا.

قۆناغی دووەمیش لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی فەڕەنسای ساڵی (١٧٨٩)دا سەرهەڵدەدات، کاتێك نەیارانی حوکمی پاشایەتی ئازناوی (نەتەوە La Nation)یان بۆ خۆیان هەڵبژارد، کە مەبەستیان کۆی تاکەکانی گەلی فەرەنسا بوو بە جیاوازی پیشەو ئازناوی پێشوویانەوە. لەم دۆخەشدا زاراوەی (نەتەوە) پێش هەموو شتێك دەربڕی بیرۆکەی هاوڵاتی هاوبەش و گشتی بوو کە بەهۆیەوە یەکسانی بەدیدەهێنرێت، واتە بیرۆکەی یەکێتی گەل. لەلایەکی تریشەوە دروشمەکانی شۆڕشی فەرەنسا کە بریتیبوون لە (ئازادی، یەکسانی و برایەتی) ئەوا بە هەڵگری ئەم بیرۆکەیە دائەنرێت، بەر بڵاوترین هوتاف شۆڕشیش بریتی بوو لە دەستەواژەی (بژی نەتەوە Live La Nation). لێرەوە پێکەوەبەسترانی چەمکی (نەتەوە) لەگەڵ چەمکی (یەکسانی) لە نێوان ئەوانەی کە لە سایەی دەوڵەتدا دەژین بواری ڕەخساند بۆ دەرکەوتنی نۆبەرەی چەمکی (دیموکراسی).

ئەم پەرەسەندنەی فەرەنسا هاوشانی پەرەسەندنێکی گەورەی تر بوو لە هەردوو کیشوەری ئەمریکای باکورو باشووردا، یەکەمیان لە باکور لە شۆڕش دژی حوکمی بەریتانیا لە ساڵەکانی (١٧٧٦-١٧٨٣)دا، دووەمیشیان لە شۆڕش دژی حوکمی ئیسپانی لە باشور لە ساڵەکانی (١٨٢٠-١٨٢٨) خۆیان نمایش کرد.

لە قۆناغی سێهەمیشدا چەمکی دیموکراسی و سیاسییانەی (نەتەوە) گرێدرایەوە بە ڕەگەزی سێهەمیەوە کە ئەویش بریتی بوو لە بیرۆکەی ڕۆمانسیەتی ئەڵمانییەوە کە بە (گەل Volk) ئاوزەد دەکرا، ئەم وشەیە ئاماژەیە بۆ کۆمەڵگەیەك کە پشت بە دابونەریت و کەلتوورو مێژوو دەبەستێت زیاتر لە ناسنامەی سیاسی. کرۆکی چەمکی (گەل Volk) کە بیرمەندانی وەك (هێردەر Herder)و (فیختە Fichte) بەرگرییان لێدەکرد، خۆی لەوەدا چڕ دەکردەوە کە مرۆڤایەتی دابەشدەبێت بۆ چەندین گەلی جیاوازو ئەتوانرێت لە ڕێگەی گەڕان و پشکنینەوە تایبەتمەندی ناسنامەکانیان لێکتر جیا بکرێتەوە. لێرەوە هەر وەك چۆن زانایان توانیان وێنەی ورد سەبارەت بە ڕووەك و کانزاکان و گیانداارانی سەر زەوی بکێشن، هەروەها چۆن زانایانی زمانناسی توانیان هێڵکارییەکی ورد سەبارەت بە جیاوازییەکانی نێوان زمانەکانی جیهان بکێشن، بە هەمان شێوەش ئەتوانرێت ناسنامەی گەلانی سەر زەوی دیاریبکرێت و وێنەی جیاوازیەکانیشیان بە وردی بکێشرێت.

لە ئەنجامی پێکەوە گرێدانی هەر سێ قۆناغەکەی پێشوو، لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا پرانسیپێکی سیاسی دەرکەوت کە ئەمڕۆ پێی دەگوترێت (ناسیۆنالیزم). لە بەناوبانگترین ئەو کەسانەش بانگەوازیان بۆ ئەم پرانسیپە نوێیە کرد بریتیبوو لە (جیۆسیپە مازینی Giuseppe Mazzini) ئیتاڵی کە ڕای وابوو دەرکەوتنی نەتەوەکان

مەسەلەیەکی بڕاوەیەو کۆتایی هاتووەو هەریەکەیان لەسەر خاکی نیشتمانی خۆی سەرهەڵدەداتو پێویستە سەربەخۆش بن. لە ڕاستیدا ئەزموونی ئیتاڵیا نموونەیەکمان پێشکەش دەکات لەبارەی دۆخێکەوە کە تێیدا چەند قەوارەیەکی دابەشبووی کەرتوپەرت یەکدەگرنەوە.

(مازینی) دوو ڕەگەزی دیکەش دەخاتەڕوو کە ڕۆڵیان دەبێت لە بەرەو پێش بردنی چەمکی مۆدێرنی ناسیۆنالیزمدا: <u>ڕەگەزی یەکەم</u> بریتییە لە چەمکی ئەخلاقیی نەتەوە، ئەم چەمکە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە تاکەکەس نابێت بە تەنها ئینتیمای بۆ نەتەوە هەبێت بەڵکو لەوەش زیاتر دەبێت گوێڕایەڵییەکی کوێرانەی هەبێت بۆ خواستی نەتەوەکەی. بەم ڕێگەیەش هەرچی چەمکی کۆنەکانی وەلاو خۆشەویستی نیشتمانو ئینتیما بۆ کۆمەڵگا هەیە ئەبن بە بەشێك لە سیستمی دەوڵەتی نەتەوەیی مۆدێرن.

<u>ڕەگەزی دووهەم</u> لای (مازینی) بریتییە لە بیرۆکەی (خێزانی نەتەوەکان) بەو مانایەی کە پاش ئەوەی جیهانمان دابەشکرد بۆ چەندین نەتەوە، ئەتوانرێت ئەم نەتەوانە هانبدرێن لەسەر هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی لە ڕێگەی پارێزگاریکردن لە ناسنامەو مافی بڕیاردانی چارەنووسەوە. بۆیە ئەم پرانسیپە نوێیە ئەتوانێت ئاشتی لە نێوان نەتەوەکاندا بەرقەرار بکات.

<u>(ئێرنێست ڕێنان Ernest Renan)</u>ی نووسەری فەرەنسایش ڕای وایە کە هەستی نەتەوایەتی بریتییە لە ڕاپرسییەك، کە لە ڕێگەیەوە ئەو کۆمەڵگەیانەی بە درێژایی مێژوو دروستبوون، ڕۆژانە جەخت دەکەنەوە لەسەر مافی بڕیاردانی چارەنووسو بەدیهێنانی خواستو ئارەزووەکانیان.

## ناسیۆنالیزم وەك بزاوتێك

***Nationalism as a Movement :***

ئەو بیری نەتەوایەتییەی کە لە سەرچاوەکانی کۆتایی سەدەی هەژدەهەمەوە دەرکەوت، تەشەنەکردنێکی بەربڵاوی بەخۆیەوە بینی لە تەواوی بەشەکانی تری جیهاندا، تا وای لێهات شێوەی بیرێکی ئایدیۆلۆژیانەی لە خۆی گرت. لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا لە چەند شوێنێکی ئەورووپادا ناسیۆنالیزم دەرکەوتو کاریگەریی خۆی پیشاندا، وەك یۆنانو ئەڵمانیاو ئیتاڵیاو ئیرلەنداو پاشتریش لە ئیمپراتۆریەتە فرەنەتەوەکانی وەك ئیمپراتۆریەتی نەمسایی-هەنگاریو ئیمپراتۆریەتی بروسیاو ڕوسیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

بەهۆی ئەو فشارە ناوخۆییو دەرەکییانەی کە تووشی ئەو ئیمپراتۆریەتانە هاتن، ناچاربوون کە دانبنێن بە داوای سەربەخۆیی هەندێك لە نەتەوە ژێر دەستەکانیاندا، تا سەرئەنجام ئەو چوار ئیمپراتۆریەتە لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لەبەریەك هەڵوەشانەوەو نەخشەی وڵاتە تازە سەربەخۆکان دەرکەوت. لە بەشی خۆرئاوای ئەورووپاش یەکێك لە قەوارە فرە نەتەوەکان ناچاربوو دانبنێت بە سەربەخۆیی یەکێك لە هەرێمە یاخیبووەکانیدا، ئەمەش کاتێك بوو کە بەریتانیا بە ناچاریی لە ساڵی (١٩٢١)دا سەربەخۆیی بەخشی بە (ئیرلەندا).

هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەمو دەرئەنجامەکانی بوارێکی گونجاوی ڕەخساند بۆ ڕاگەیاندنی مافی چارەنووس وەك پرانسیپێکی جیهانی، پاش ئەوەی کە بە تەنها قۆرخکرابوو بۆ ئەورووپاو نوخبەی سپی پێستی گەلی ئەمریکا. لە ڕاستیدا ڕاگەیاندنی ئەم مافە

بەهۆی دوو ڕووداوی گەورەوە ڕەهەندێکی جیهانی وەرگرت، کە یەکەمیان شێوازێکی ڕادیکالانەی وەرگرت لە شۆڕشی بەلشەفیکەکانی ڕوسیا لە ساڵی (١٩١٧)دا، دووەمیشیان شێوازێکی لیبراڵانەی وەرگرت لە ڕاگەیاندنی چواردە خاڵەکەی (ودرۆ ویڵسن)ی سەرۆکی ئەمریکا لە ساڵی (١٩١٨)دا.

پێش هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم، زۆر لە نەتەوەخوازەکان باوەڕیان وابوو کە لە ڕێگەی بەدەستهێنانی مافی فیدراڵی یان هەرێمایەتییەوە لە ناوخۆی دەوڵەتێکدا دەتوانن مافە نەتەوایەتییەکانیان بەدەستبهێنن بەبێ ئەوەی لە وڵاتەکەیان جیاببنەوە یان لە هەوڵی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی کەلتووریدا بوون وەك ئەوەی کە لە دۆخی هەندێك وڵاتی وەك چیکۆسلۆفاکیاو بەلجیکاو سویسرادا بەرجەستەبوو بوو. بەڵام لەپاش جەنگی جیهانی یەکەم مافی چارەی خۆنووسین بەتوندی لەگەڵ سەربەخۆیی تەواودا پێکەوە گرێدراون و پێشبینییەکەی (مازینی) ئیتاڵی سەبارەت بە سەرهەڵدانی سەردەمی مافی چارەنووس و دەرکەوتنی (خێزانی نەتەوەکان) لە واقیعدا هاتەدی.

لە ڕاستیدا سێ هۆکاری سەرەکی ڕێکربوون لە بەردەم هاتنەدی ئەو پێشبینییەدا لە پێش جەنگی جیهانی یەکەم:

یەکەم: ڕێگری هێزە ئەورووپییە کۆلۆنیالیستەکان لە بەخشینی سەربەخۆیی بە گەلانی ژێر دەسەڵاتیان لە ئاسیاو ئەفریقادا، بۆیە دەبینین کە هیچکام لە بەریتانیاو فەرەنساو هۆڵەنداو بەلجیکا ڕازینەبوون لەسەر بەخشینی سەربەخۆیی بە گەلانی ژێر دەستیان، ئەم دۆخەش درێژەی کێشا تا کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووەم، کە یەکێك لە دەرئەنجامەکانی بریتیبوو لە وێرانکردنی وڵاتە دۆڕاوەکان و لاوازکردنی بەشێکی زۆری وڵاتە براوەکان. لێرەوە پرۆسەی کۆتاییهێنان بە سەردەمی کۆلۆنیالیزم و ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی بە فراوانی پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی بیستی ڕەنگڕێژ کرد.

دووەم: ناسیۆنالیزم هۆکارێك نەبوو بۆ جێگیرکردنی ئاشتی لە نێوان وڵاتاندا، بەقەد ئەوەی هۆکارێك بوو بۆ هەڵگیرسانی ململانێ و دەرکەوتنی سیستمی دیکتاتۆری ستەمکارو لە کۆتاییشدا بەرپاکردنی جەنگە جیهانییەکان. واتە هەرچەندە (خێزانی نەتەوەکان) دروستبوو بەڵام خێزانێکی پڕ ئاشوب و ئاژاوەبوو دوور لە بەختەوەریی و ئارامی. هۆکاری پشت ئەم ئاژاوەیەش ئەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە ئەو نەتەوانەی کە زمان و ئایین کۆی کردبوونەوە، دژیەکبوونی داواکارییە مێژووییەکانیان پەرت و بڵاویکردبوونەوە.

بەکورتی هیچ جۆرە هاوئاهەنگی و پێکەوە گونجانێك لە نێوان داواکارییە نەتەوەیی و داخوازییە هەرێمییەکاندا نەبوو، چونکە کێشمەکێش و ناکۆکی لەسەر هەرێمەکان لە وڵاتانی بەلکان و... هتد. کۆمەڵێك ململانێی نەتەوەیی و نەژادی لێکەوتەوە کە هەوڵەکانی میانگیری و دووبارە داڕشتنەوەی سنوورەکانیش سوودیان نەبوو لە کپ کردنەوەیدا. هەرچی ئەو سەربەخۆییەش بوو کە بەریتانیا بە ئیرلەندای بەخشی لە ڕاستیدا بوو بە هۆی دروستبوونی ڕق و کینەی هاوشێوەی ئەوەی بەلکان، لەوەش زیاتر لەلایەکی ترەوە شەپۆلی ناسیۆنالیزمی توندڕەو هەردوو وڵاتی ئەڵمانیاو ئیتالیای گرتەوەو هەردوو بزووتنەوەی نازیزم و فاشیزم بەپشتبەستن بە بیرۆکەی هێزو فراوانخوازی سەربازییەوە هاتنە گۆڕەپانەکە. هەموو ئەوانەش لە یەك کاتدا بواریان ڕەخساند بۆ

دەرکەوتنی لایەنە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی ناسیۆنالیزم.

هۆکاری سێیەمی پشت بەدینەهاتنی خۆزگەو خەونەکانی ساڵی (١٩١٨) بەڕوونی لەپاش جەنگی جیهانی دووەم زیاتر بەدەرکەوتن، چونکە گرژی و ئاڵۆزی تەنانەت پەیوەندیەکانی نێوان ئەو دەوڵەتانەشی گرتەوە کە خاوەنی سەربەخۆیش بوون، تەنانەت ئەوانەش کە لایەنگری پرانسیپی مافی چارەنووس و ناسنامەی نەتەوایەتیش بوون. ئەمەش بەڕوونی لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی وەك (ئەمریکا و ئەورووپای خۆرئاوا)دا ڕەنگی دایەوە. بەتایبەت لەپاش شەستەکانی سەدەی بیستەوە لە (هەرێمی باسکی ئسپانیا و لای کاتۆلیکەکانی ئیرلەندای باکور و سکۆتلەنداو دورگەی کۆرسیکا).

لە ولایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاش دەنگی ناڕەزایی بڵندبوویەوە؛ سەرەتا بەدەرکردنی لائیحەی مافەکانی مرۆڤ بۆ داکۆکی کردن لە مافی ڕەش پێستەکان و پاشانیش هۆشیاری نەتەوەیی و نەژادی لە ناوەندی کۆمەڵگا ئیتنیەکانی دیکەی جگە لە سپی پێستەکاندا تەشەنەی کرد. لە کەنەداش دانیشتووانی هەرێمی (کیوبیک)ی فەرەنسی زمان داوای مافی زیاتر و دەسەڵاتی خودموختارییان دەکردو تەنانەت هەندێکجار داوای سەربەخۆیش دەکەن. بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە تەواوی ئەم ڕابوونە ئیتنی و نەتەوەییانە لەخۆرئاوای ئەورووپاو باکوری ئەمریکادا لەلایەن ئەو وڵاتانەوە گەمارۆدراون و تا ئێستاش هیچ کێشەیەکیان بە هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەت و ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لەلایەن ئەو نەتەوانەوە کۆتایی پێنەهاتووە.

بارودۆخی خۆرهەڵاتی ئەورووپای پاش ڕوخانی ئەزموونی کۆمۆنیستی لەو وڵاتانەدا بەجۆرێکی تر بوو، تەنانەت ئەتوانرێت بەتەقینەوەی هەستی نەتەوەیەکان دابنرێت پاش ساڵانێکی زۆر لە بێدەنگ کردن، چونکە لای ئەوان ناسیۆنالیزم مانای دژایەتی حوکمی سۆڤیەتی و گەڕانەوە بۆ پەیوەندیەکانی پێش ئەزموونی کۆمۆنیستی دەگەیاندو لەگەڵ داواکاری ریفۆرمی ئابووری و پیادەکردنی دیمۆکراسیدا پێکەوە گرێدرابوون. هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو کە ڕۆڵێکی بەرچاوی بینی لە تاودانی هەستی ئۆپۆزسیۆنی هەڵکشاوی دژ بە کۆمۆنیزم لە خۆرهەڵاتی ئەورووپادا. لەوەش زیاتر بیری ناسیۆنالیزم دوچاری خودی یەکێتی سۆڤیەتیش بوو، چونکە یەکێتی سۆڤیەتی پاش جەنگی جیهانی یەکەم لەسەر بنەمای دەوڵەتی فرە ڕەگەز بنیادنرابوو. هەر بۆیە لەگەڵ لاوازبوونی مشتی پۆڵایینی یەکێتی سۆڤیەت لە (١٩٩١)دا بەشێك لەو نەتەوانە سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاندو نزیکەی (١٥) دەوڵەتی نوێ لەسەر نەخشەی سیاسی جیهانی دروست بوون. ئەم گۆڕانکارییانەش لە هەندێك حاڵەتدا لەسەر دەستی بژاردەیەکی روناکبیری حیزبی شیوعیش بە ئەنجام ئەگەیەنران و سەرئەنجام بارودۆخێك دروست بوو کە لە مێژووی سیستمی مۆدێرنی جیهاندا هاوشێوەی نییەو لە ڕوسیاو دەرەوەیدا ژمارەیەکی زۆر دەوڵەتی سەربەخۆ لەدایك بوون. بەمەش زۆر بەڕوونی کاریگەری ناسیۆنالیزم لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و سیستمی سیاسی جیهانیدا دەبینین.

## ناسیۆنالیزم و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان

## *Nationalism and International Relation :*

دەرئەنجامەکانی سەرهەڵدان و تەشەنەکردنی

لەم پرانسیپە لەئاستی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا فرە ڕەهەندبوون، لەئاستی کاریگەریی ناسیۆنالیزم لەسەر سیستمی نێودەوڵەتی یان لەئاستی ئەو کێشە شیکاریی و ئەخلاقیانەی کە بەهۆی ناسیۆنالیزمەوە هێنرانە نێو کایەی توێژینەوەو پیادەکردنەوە لە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا.

بەشێوەیەکی گشتی ئەتوانین باس لە چوار دەرئەنجامی سەرەکی بکەین:

<u>یەکەم</u>: ناسیۆنالیزم کۆمەڵێك بەهاو تەشریعاتی نوێی هێنایە کایەوە لە ئاستی سیستمی دەوڵەتدا. بە چاوپۆشین لە بوونی چەندین پاساوی پەیوەست بە چەمکە تەقلیدییەکانی وەك سەروەریی و پێداویستیەکانی و پرانسیپی دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆیی دەوڵەتاندا کە بەهۆی سیستمی (وێستفالیا)وە چەسپێنرابوون، هێشتا سیستمی دەوڵەت ئەتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە ئەو بەڕاستی نوێنەرایەتی بەرژەوەندییەکانی گەلانی سەربەخۆ ئەکات، لێرەشدا گرنگی چەمکی (دەوڵەتی-نەتەوە)و ئەو مانایانە دەرئەکەوێت کە لە خۆیان دەگرێت بۆ نموونە ئەو مانایەی کە پێی وایە حکومەتەکان نوێنەری کرداریی و ڕاستەقینەی گەلەکانیان، هەرچەندە کەسانێکی زۆر هەن کە دژی ئەو مانایە دەوەستنەوە.

هەرچۆنێك بێت، پرانسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووس، وەك پرانسیپێکی جیهانی قبوڵکراو، بە بنەمای سەرەکی سیستمی نێودەوڵەتی هاوچەرخ دادەنرێت. هەریەکە لە پەیماننامەی کۆمەڵەی گەلان و میساقی نەتەوە یەکگرتووەکانیش لەسەر گریمانەی ئەو پرانسیپە بنیادنراون، هەروەها سیستمی یاسای نێودەوڵەتیش لەسەر هەمان پرانسیپ داڕێژراوە. لێرەوە ڕەنگە دەوڵەتان نوێنەری ڕاستەقینەی ئەو نەتەوانەبن کە حوکمیان دەکەن، هەرچەندە ئەگونجێت بەشێوەیەکی کرداریش وانەبن، بەڵام لە ئاستی نێودەوڵەتی و لە کۆڕو کۆبوونەوە دیپلۆماتی و یاساییە نێودەوڵەتیەکاندا دەوڵەت بە تاکە نوێنەری نەتەوەکان دادەنرێت لە ژێر سایەی ئەو سیستمە نێودەوڵەتیەی کە لە ئەمڕۆدا باڵادەستە. بۆ نموونە لە بڕگەی (٢)ی مادەی (١) ی میساقی ($UN$)دا نووسراوە: "پەرەپێدانی پەیوەندی دۆستانە لەنێوان نەتەوەکاندا لەسەر بنەمای ڕێزگرتنی پرانسیپی یەکسانی لە مافی بڕیاردانی چارەنووس بۆ گەلان و گرتنەبەری ڕێوشوێنی گونجاو بۆ پشتیوانیکردنی ئاشتی جیهانی".

<u>دووەم</u>: ناسیۆنالیزم وەك ڕەگەزێکی بنەڕەتی ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە پرۆسەی بنیادنانی دەوڵەت و پێکهێنانی ناسنامەیەکی هاوبەش و هۆشیارییەکی هاوبەش لە نێوخۆی کۆمەڵگاکاندا. بەدرێژایی مێژوو گەلان ئەو دروشمە دووبارە دەکەنەوە کە پێویستە تاکەکان گیانی خۆیان بکەن بە قوربانی لەپێناو کۆمەڵگەکانیاندا. بەڵام دەوڵەتی نەتەوەیی هاوچەرخ لە ژێر فشاری ئەو ڕێژە زۆرەی کۆچکردنی بە لێشاوی دانیشتوانی بۆ شارە گەورەکان کە پێویستی بوون بۆ بەرەنگاربوونەوەی کێبڕکێ و هەڕەشەکانی دەرەوە، لە هەمان کاتدا بەشێوەیەکی بەردەوام پێداگری کردوە لەسەر بەهێزکردنی هەستکردنی بە کەسێتی نەتەوەیی و ئامانجی نەتەوەیی هاوبەش. لەگرنگترین ئەو هۆکارانەش کە لەو پێناوەدا بەگەڕخران بریتی بوون لەچاودێری کردنی خوێندن و کەلتوور و بڕەودان بەگیانی کاری خۆبەخش لەپێناو بنیادنانی سوپایەکی نیشتمانی و بەهێزکردنی مێژووی نیشتمانی و بەرهەمهێنانی فیلمی

پاڵەوانە نەتەوەییەکان. هەموو ئەو هۆکارانەش پێکەوە ڕۆڵیان دەبێت لە بەتینکردنی هۆشیاری و هەستی نەتەوەیی و ناسنامەی هاوبەش لە نێوان تاکەکانی نەتەوەیەکداو دەبێتە هۆی قبوڵکردنی بیرۆکەی دەوڵەتی نەتەوە. بەم مانایەش ناسیۆنالیزم بەشداریەکی چالاکی دەبێت لە پشتیوانی کردنی دەستەبژێری سیاسی ڕوناکبیرو سیستمی باڵادەست. زۆرجار ئەوانەی کە لە بارەی ناسیۆنالیزمەوە نووسیویانە ئەو ڕاستیە دووپات دەکەنەوە کە ناسیۆنالیزم پاڵپشتێکی گەورەی هەبووە لەو وڵاتانەی کە پێشتر کۆلۆنیالکراوبوون چونکە لەو دۆخانەدا سنوورو کەسێتی دەوڵەت لە دەرەوە سەپێنراوە بەسەریدا.

ئەوەی گومانی تێدانییە ئەوەیە کە پیادەکردنی ناسیۆنالیزم بەشێوازێکی فەرمی بەشێك بوو لەپرۆسەی بنیادنانی نەتەوەکانی جیهانی سێهەم لەژێر چاودێری و ئاراستەی دەوڵەتاندا. بەڵام ناتوانرێت ئەم پرۆسەیە بە تەنها کورتبکرێتەوە لە جیهانی سێهەمدا، چونکە لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکانیشدا، چ لە (فەرەنسا، ئەمریکا یان بەریتانیا) دەوڵەت پشتیوانی لە هەستی ناسنامەی نەتەوەیی و ئامانجی نەتەوەیی هاوبەش دەکات، لە ڕێگەی خوێندن و کەلتوورو هۆکارەکانی ترەوە. لە ڕاستیدا ناسیۆنالیزم بووە بە بەشێکی دانەبڕاو لە پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا لە تەواوی جیهاندا، لە هەمانکاتدا بووە بە ڕەگەزێکی تەواوکەری پرۆسەی پشتیوانیکردنی هێزی دەوڵەت لە ئاستی نێودەوڵەتیدا، چونکە هیچ دەوڵەتێك ناتوانێت بەردەوامی و بوونی خۆی بسەلمێنێت لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا ئەگەر نەتوانێت لای هاوڵاتیانی خۆی هەستی نەتەوایەتی هاوبەش و ئامانجی نەتەوەیی هاوبەش دروست بکات لە ئاستی ناوخۆدا.

سێیەم: هەستی نەتەوایەتی پاڵنەرێکی بەهێزبوو لەدابڕشتن و دووبارە داڕشتنەوەی نەخشەی نێودەوڵەتیدا، واتە لە پرۆسەی دیاریکردنی ئەو زەویانەی کە دەوڵەتانی لەسەر بنیاد دەنرێت و پاشانیش دیاریکردنی ئەو سنوورانەی کە لێکتریان جیادەکاتەوە. مانای ئەم پرۆسەیەش ئەوەیە کە لانی کەم لە ڕووی تیۆرییەوە نەخشەی جیهان ڕەنگدانەوەی واقیعی دابەشبوونی نەتەوەکانە لەسەر زەویدا، واتە وێنەی دەوڵەتان لەسەر ئەتڵەسی جیهان نمایشی ئەو بارودۆخەیە کە پێشتر نەتەوەکانی لەسەر دابەش بووە. لە ڕاستیدا ئەم پرۆسەیە زیاتر لە پرۆسەی ڕومانێکی جیۆلۆجی یان دیاریکردنی تۆپۆگرافیای سروشتی بەشەکانی گۆی زەوی دەچێت، بەڵام ناوەڕۆکی پرۆسەکە تەواو جیاوازەو بە ئاشکرا ڕۆڵی فاکتەری مێژوویی و کاریگەریی لە دیاریکردنی سنوورەکاندا ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەیە تەنانەت زۆرجار ڕێکەوت (صدفە) ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت. بۆ نموونە لە ئەوروپادا هەندێکجار بەهۆی ماندووبوونی سوپاکان لەجەنگدا، بەرەکانی کۆتایی جەنگ کراون بەخاڵی سنوورەکان، یاخود لە جیهانی سێهەمدا بەهۆی ڕێکەوتنی سوپاو یەکە بەڕێوەبردنە کۆلۆنیالیەکانەوە سنوورەکانی دیاریکراون، تەنانەت سنوورە جێگیرەکانیش لەو حاڵەتە بەدەرنین، بۆ نموونە سنووری نێوان ئەمریکاو کەنەدا یان سنووری نێوان ئیسپانیاو پورتوگال بەرجەستەکەری مێژوویەکن کە ڕێکەوت ڕۆڵی تێدا بینیوە. هەمان حاڵەت لە پرۆسەی داڕمانی بلۆکی کۆمۆنیزمیشدا دەبینرێت.

لێرەوە ئەگەینە دەرئەنجامێك کە هەندێك لەنەتەوەکان خاوەنی بزاوتێکی نەتەوەیی بوون

کە لە پێناو هەڵوەشاندنەوەو دووبارە بنیادنانەوەی دەوڵەتێکی دانپێدانراودا خەباتی کردووە، لە هەندێك حاڵەتی تردا نەتەوەیەکی تر خاوەنی بزاوتێك بووە کە لە هەوڵی یەکخستنی چەند بەشێکی دابڕاودا خەباتی کردووە بۆ ئەوەی لە یەك دەوڵەتی یەکگرتوودا یەکیان بخات، لە نموونەی یەکگرتنەوەی ئیتالیاو یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا لەسەدەی نۆزدەهەمدا، هەروەها سەرهەڵدانی چەندین بزوتنەوەی نەتەوایەتی وەك ناسیۆنالیزمی (عەرەبی، ئیرلەندی، کوری و سۆماڵی و... هتد). لەسەدەی بیستدا.

هەرچی دەرئەنجامی چوارەمی ناسیۆنالیزمە ئەوا پەیوەستە بە پەیوەندی ناسیۆنالیزم بەسیستمی جیهانیەوە، لە ڕاستیدا ئەم پرانسیپە لە سیستمی جیهانیدا سەرچاوەی چەندین قەیران بووەو بگرە لە هەندێك کاتدا هەڵگیرسێنەری جەنگەکانیش بووە. بۆ نموونە لەو کێشەو ناکۆکیانەی کە لە نێوان هەردوو جەنگە جیهانیەکەدا سەبارەت بە دابەشکردنە جوگرافیەکان ڕوویاندا، بیروڕایەك دروست بوو پێی وابوو کە ڕازیبوون بەپرانسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووس ڕەنگە ببێتە هۆی بەرپابوونی ئاشتی لەنێوان گەلاندا. بەڵام لەمێژوویەکی نزیکدا کێشە سنووریەکانو ناکۆکیە ناوخۆییەکان لە دەوڵەتە فرە ڕەگەزو نەتەوەکاندا هەمیشە قەیرانو جەنگیان لێوە دروست بووە، وەك دۆخی ململانێی عەرەب – ئیسرائیل و یۆگسلاڤیای جارانو کێشەی کشمیرو سیریلانکاو ڕواندا.

لێرەدا ئەوەی بارودۆخەکە مەترسیدارتر دەکات ئەوەیە کە ناسیۆنالیزم ڕۆڵی فاکتەرێکی کاریگەر دەبینێت لەدیاریکردنی هۆکارو پاساوەکانی هەڵگیرساندنی جەنگ لەنێوان دەوڵەتاندا، لە نموونە دیارەکانی ئەم ئاراستەیەش هەوڵەکانی ئەڵمانیا بۆ هەژموون بەسەر ئەوروپادا، هەوڵەکانی یابان بۆ هەژموون بەسەر خۆرهەڵاتی ئاسیا لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا دا لەڕێگەی داگیرکردن و ملکەچکردنی چەندین هەرێمو وڵاتەوە.

ئەو دەرئەنجامەی لەئەزموونی کۆلۆنیالی ئەڵمانی و ئیمپراتۆریەتی یابانیەوە دەستمان دەکەوێت پێمان دەڵێت کە ناسیۆنالیزم هێزێکی ڕوخێنەرە، بەهۆی ئەوەشەوە دژایەتی ناسیۆنالیزم ڕووبەرێکی فراوانتری بەخۆیەوە بینیوە، چونکە لە ئاستی نێودەوڵەتیدا هاوشانە لەگەڵ کۆمەڵێك سیاسەتی دیکتاتۆریو ڕقی ڕەگەزپەرستیدا کە سەرچاوەکانیان لە ناوخۆی دەوڵەتدایە بەهۆی بەکارهێنانی هەستو بیری ناسیۆنالیستی لەلایەن ئەو ڕژێمە دیکتاتۆرانەوە لەلایەك دژ بەکارە ناوخۆییەکانو لەلایەکی تریشەوە بەمەبەستی فراوانخوازی و سیاسەتی دوژمنکارانە لەدەرەوە.

## چوار گفتوگۆی فراوان *Four Debates*

بابەتی ناسیۆنالیزم یەکێکە لەو بابەتانەی کە مشتومڕێکی فراوانی لێکەوتۆتەوە لەچوارچێوەی دیبەیتە (*Debate*) سیاسیە گشتییەکاندا، هەروەها لەچوارچێوەی زانستە کۆمەڵایەتیەکانیشدا، لێرەدا حاڵی ناسیۆنالیزم وەك حاڵی هەر هێزێکی ئایدیۆلۆژی تر وایە. تێپەڕبوونی ئەو چەندین ساڵەی کە تێیدا گفتوگۆیەکی ڕاستەوخۆی کاریگەر لەسەر ناسیۆنالیزم نەکراوە تەنها لەلایەن مێژوونووسانەوە نەبێت، ئەو ڕاستیە پیشان دەدات کە ناسیۆنالیزم (وەك چەمك) ئاڵۆزەو کێشە دەنێتەوە، لەپێشەوەی ئەو کێشانەش پێناسە نەکردنی ناسیۆنالیزمە بە پێناسەیەکی ئایدیۆلۆژی پڕدن.

لەلایەکی تریشەوە بەشێکی گرنگی ئەو کێشانە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو چوارچێوە گشتییەی کە چەمکی ناسیۆنالیزمی تێدا پێشکەش دەکرێت و شیکار دەکرێت، چونکە بەشی زۆری ئەو جەدەلەی کە سەبارەت بە ناسیۆنالیزم ورووژێنراوە لەلایەن کایەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە نەبووە، بەڵکو لەلایەن کایەیەکی تری زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە بووە کە زانستی کۆمەڵایەتییە.

لێرەوە ئەو گفتوگۆیانەی کە سروشتێکی کۆمەڵایەتیان هەیە یان ئەو گفتوگۆیانەی کە لە چوارچێوەی تیۆری سیاسیدا سەبارەت بە ناسیۆنالیزم ئەنجامدراون ئاماژەو ناوەڕۆکی گرنگیان تێدایە بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە لێرەدا چوار لەگرنگترین ئەو گفتوگۆیانە ئاماژە پێدەدەین:

**یەکەم: دادگەری لەبەرامبەر ئۆردەر**

*Justice Versus Order*

هەر لە سەرەتاوە سیستمی جیهانی پشتی بەدوو پرانسیپ بەستووە کە بریتین لە: پرانسیپی سەروەری دەوڵەتان و، پاراستنی ئاشتی لەنێوانیاندا. کەواتە لەڕووی گریمانەییەوە پێویستە کە بڕیاردانی چارەنووس و دەربڕینی داواکاریە نەتەوایەتیە ڕەواکان چوونیەک بن لەگەڵ ئەو دوو پرانسیپەدا، لە واقیعیشدا چوونیەکن. هەرکاتێکیش ناکۆکی و جیاوازی ڕوویدات ئەوا لە چوارچێوەی ئەو سیستمە جیهانییەدا میکانیزمی گونجاو ئامادەیە بۆ گەیشتن بەڕێکەوتنی ئاشتیانە، وەك: داوەریکردن و ڕاپرسی گشتی و یەکلاکردنەوەی لەڕێگەی دانوستانەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا پێویستمان بەتوێژینەوەیەکی مێژوویی وردو قوڵ نییە سەبارەت بە مێژووی سیستمی نێودەوڵەتی لە ماوەی دوو سەدەی ڕابردوودا بۆ ئەوەی بگەینە ئەو ڕاستییەی کە هەمیشە کۆمەڵێك ململانێ هەبوون و هەندێکیشیان گەشتونەتە حاڵەتی جەنگ و پاشانیش ستەمی لێکەوتۆتەوە. لێرەوە ئەگەینە دەرئەنجامێك کە پرانسیپەکانی سیاسەتی هاوسەنگی هێزەکان پێچەوانەی پرانسیپی مافی بڕیاردانی چارەنووسە، چونکە بۆ ئەوەی ئاشتی لە نێوان زلهێزەکاندا بپارێزین ڕەنگە پێویست بێت کە هەندێك ناوچەی نفوز لە نێوانیاندا دابەش بکرێت یان لە نێوان خۆیاندا بگەنە ڕێکەوتنێك بۆ ئەوەی هەر زلهێزێك چەند ناوچەیەکی کۆلۆنیالکراویان دەست بکەوێت. بۆ نموونە ڕوسیاو بروسیا لەنەوەدەکانی سەدەی هەژدەهەمدا پۆڵەندایان لەنێوان خۆیان دابەشکرد کە پێشتر شانشینێکی سەربەخۆ بوو، بە مەبەستی پاراستنی هاوسەنگی هێز لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، زلهێزە ئەوروپییەکان لە نێوان خۆیاندا ڕێکەوتن لەسەر دروستکردنی ناوچەی نفوزو کۆلۆنیالی تایبەت لە هەردوو کیشوەری ئاسیاو ئەفریقا.

لە قۆناغی جەنگی ساردو دوای ئەوەشدا وڵاتانی خۆرئاوا بێدەنگ بوون بەرامبەر ڕوسیا بۆ ئەوەی هەژموونی خۆی بسەپێنێت بەسەر گەلانی خۆرهەڵاتی ئەورووپاو گەلانی ڕوسیا خۆشیدا، ئەوەش لە پێناو پاراستنی هاوکاری لە هەندێك بواری تردا کە هەستیارییان زیاترە بۆ مەسەلەکانی ئارامی و ئاسایشی جیهانی. نموونەی ڕوونی ئەم حاڵەتەش بریتییە لە هەڵوێستی نێگەتیڤی وڵاتانی خۆرئاوا سەبارەت بە هەردوو شۆڕشی هەنگاریای ساڵی (١٩٥٦)و

شۆڕشی چیچان لە ساڵی (١٩٩٤)، دەبینین لە هەردوو حاڵەتەکەدا کاردانەوەیەکی روون لەلایەن خۆرئاواوە پیشان نەدراوە بۆ پاراستنی مافی بڕیاردانی چارەنووس بۆ ئەو دوو نەتەوەیە.

لە چەندین ناوچەی تری جیهانیشدا، بەئاشکرا لەپێناو پاراستنی ئاسایشدا مافی چارەنووسی چەندین نەتەوە پشتگوێ خراوە. بۆ نموونە لەساڵی (١٩٦١)ەوە لەپاش هەڵگیرسانی جەنگ لە ئەفریقادا دەوڵەتە ئەفریقییەکان ئامادەنەبوون دانبنێن بە سەربەخۆیی ئەریتریا لە ئەسیوبیا تا ساڵی (١٩٩١) کاتێك بارودۆخی هەرێمی و نێودەوڵەتی بەتەواوەتی ڕەخسا. لەوەش زیاتر تا ئێستا هیچ دەوڵەتێك نییە لەجیهاندا کە ئامادەیی خۆی دەرببڕێت بۆ دانپێدانانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ نزیکەی (١٥–٢٠) ملیۆن کورد کە لەهەرێمەکە لە ئێران و تورکیاو عێراقدا دەژین[1] تەنانەت لە پاش لەبەریەك هەڵوەشانەوەی بلۆکی کۆمۆنیستی هەرچەندە لە سەرەتاوە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ئامادەیی تێدابوو کە سەربەخۆیی ببەخشێت بەهەر دەوڵەتێکی نوێ، بەڵام دواتر کۆدەنگییەکی گشتی لە نێوان وڵاتاندا پێکهات لەسەر کۆتایی هێنان بەو بارودۆخە بەخێرایی. بۆیە هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە کاتێك وەزیری دەرەوەی بەریتانیای ئەوکاتە (دۆگلاس هێرد *Douglas Hurd*) لە کۆبوونەوەیەکی (پەیمانگای شایانەی لەندەن بۆ کاروباری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان *Royal Institute of International Affairs*) لە مانگی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٣) لە وتەیکدا ئەڵێت: (هیوادارم کە لەوە زیاتر دەوڵەتی نەتەوەیی دیکە سەرهەڵنەدات).

لە ڕاستیدا هەر ئەو گومانانەش بوون کە لەشت مەسەلەی دابەش بوونی ڕای دروستکەرانی بڕیاری سیاسی خۆرئاواوە بوون سەبارەت بە یوگسلافیای پێشوو لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستدا، چونکە بەڕوونی لەوە دڵنیانەبوون کە دەبێت هەتا چ سنوورێك پشتگیری مافی بڕیاردانی چارەنووس بکرێت و لە کوێدا ئەو پشتگیرییە ڕابگیرێت. ئەم دۆخەش هۆکاری سەرهەڵدانی کێشەیەکی تر بوو، چونکە ئەگەر مافی کۆمەڵەیەك بێت کە سەربەخۆیی خۆی ڕابگەیەنێت ئەوا نابێت هیچ ڕێگرێك دابنرێت لەبەردەم کەمینەیەکدا، کە لە چوارچێوەی ئەو کۆمەڵەدا دەژی، بۆ ئەوەی سەربەخۆیی خۆی ڕابگەیەنێت. ئەم مەسەلەیە لەسەر سربەکانی بۆسنەو کرواتیا ئەچەسپێت، هەروەك چۆن بۆ ئیرلەندای باکورو روسەکانی ئۆکرانیاش دەگونجێت، هەروەها بۆ عەرەبەکانی ئیسرائیلیش ڕاستە، لەڕابردووشدا بۆ ئەڵمانییەکانی دەرەوەی سنووری ڕایخی هتلەریش باس دەکرا، بەڵام ئەوەی جێگەی مشتومڕ نییە ئەوەیە کە ناگونجێت هەر کۆمەڵێەك لەجیهاندا کە خاوەنی داواکارییەکی ڕەوا بێت لەبارەی ناسنامەکەیەوە ببێت بەخاوەنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ!

بۆ نموونە لەجیهاندا نزیکەی چوار هەزار زمان هەیە، بەڵام هیچ کەسێك بیر لەدروستبوونی چوار هەزار دەوڵەت ناکاتەوە، چونکە تەنانەت ئەو نەتەوانەش کە بەیەك زمان ئەدوێن ئەگونجێت زیاد لە دەوڵەتێکیان هەبێت وەك زمانی (عەرەبی، ئیسپانی، ئینگلیزی، فەرەنسی، ئەڵمانی، فارسی و مەلاوی...هتد).

پرسیار لێرەدا ئەوەیە: پێویستە لەکوێدا هێڵی جیاکەرەوە بکێشین؟ نزیکترین وەڵامیش ئەوەیە کە پێویستە جۆرێك لەهاوسەنگی لەنێوان (دادگەری و ئۆردەر *Order*)دا دروست بکەین.

**دووەم: مێژوو لەبەرامبەر مۆدێرنیتی**
*History Versus Modernity*

ناسیۆنالیزم پشت ئەبەستێت بە بانگەشەی بەردەوامیی مێژوویی، بۆ نموونە ئەگوترێت: بوونی ئەم نەتەوەیە ئەگەڕێتەوە بۆ پێش چەندین سەدە مێژووکەش لەو ساتانەوە دەست پێدەکات کە تێیدا دروست بووە، جا ئەگەر ئەو ساتەوەختە راستەقینە بێت یان خەیاڵی. بە مانایەکی تر بەدەستهێنانی سەربەخۆیی و گەشتن بە دۆخی دەوڵەت بریتییە لە بە لوتکە گەشتنی ئەو مێژووە دێرینە. لەو چوارچێوەشدا چەند زاراوەیەك بەکارئەهێنرێت وەك (زیندووبوونەوە، ڕابوون و ڕێنیسانس). هەروەها گرنگی ئەدرێت بە مێژووی باوباپیران و ئەو مێژووە بەکارئەهێنرێت بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو ناکۆکیانەی کە لە ژینگە کۆمەڵایەتیەکەدا روودەدەن سەبارەت بە دیاریکردنی ڕادەی (ڕەسەنایەتی) وپێچەوانەکەشی. ئەمە سەرەڕای رۆڵی مێژوو لە دیاریکردنی سروشتی ئەو زەویەی کە نەتەوە لەسەری ئەژی: ئایا تەنها زەویەکی مێژووییە یان سروشتییە یان دیاری خوداوەندە، کە بێگومان کاریگەری گەورەی دەبێت لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا.

لێرەوە کاتێك نەتەوەیەك بیەوێت رەوایەتی بوونی نەتەوەیەکی تر بخاتە ژێر پرسیارەوە، شتێکی سروشتییە کە پەنا دەبات بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ئەو نەتەوەیە خاوەنی مەرجەکانی بەنەتەوەبوون نییە یان خاوەنی مێژوویەکی دێرین نییە یان ئەم نەتەوە لێرە دروست نەبووە و لە شوێنێکی تر سەریهەڵداوە یان هەر لەکۆنەوە بەکرێگیراوی بێگانە بووە، لێرەدا مێژوو هەموو شتێکە و ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت. تێگەیشتن لە ناسیۆنالیزم بەگوێرەی ئەو چەمکەی پێشوو بریتییە لە شێوازی باوی تێگەیشتن لای زۆرینەی بزاوتە ناسیۆنالیستەکان. ئەم دەروازەیەش بە (دەروازەی بەردەوامی) ناودەبرێت.

بە پێچەوانەی ئەو جۆرە تێگەیشتنەوە زانایانی کۆمەڵناس ڕایەکی تر پێشکەش دەکەن کە دەڵێت: نەتەوە قەوارەیەکی هەرەمەکییەو مێژووی دروست بوونیشی نوێیە. ئەم ڕایەش بە (تێگەیشتنی مۆدێرن) ناسراوە. بەپێی ئەم تێگەیشتنە مۆدێرنە دەگونجێت کە نەخشەی دابەش بوونی نەتەوەکانی ئەمڕۆ جیاوازتر بوایە لەوەی کە ئێستا هەیە!! هەروەها دەکرا چەند پرۆسەیەکی هەرەمەکی وەك (دیاریکردنی سنوورەکان لەلایەن هێزە کۆلۆنیالیستەکان، جەنگە جیهانیەکان و سەرکەوتنی چەند کۆمەڵەیەکی سیاسی دیاریکراو) نەتەوەو دەوڵەتی تریان لێوە پەیدا ببوایە.

بە دەربڕینێکی تر ئەم تێگەیشتنە مۆدێرنە ڕای وایە کە ناسیۆنالیزم دەرئەنجامی قەدەرێکی مێژوویی نییە، بەڵکو بریتییە لە کاردانەوەیەك بەرامبەر داڕمانی شێوازە کۆنەکانی رێکخستنی کۆمەڵگاکان کە پشتیان بە ئایین و ڕەچەڵەك و بنەماڵە حوکمڕانەکان و ژیانی گوندنشینی دەبەست. لەهەمان کاتدا بریتییە لە رێگەیەك بۆ بەخشینی هەستێکی بەهادار و ئامانجدار بە دانیشتوانی شارە مۆدێرنەکان.

ناسیۆنالیزم، هەستێکی نوێی ئینتیمابوون دەخوڵقێنێت، حاڵەتێك کە (بێنیدیکت ئەندرسۆن *Benedict Anderson*) بەزاراوەی (کۆمەڵگای خەیاڵی) ناوی دەبات، مەبەستی (ئەندرسۆن) لە خەیاڵ بریتییە لە بیرۆکەی کۆمەڵێك خەڵك کە مرۆڤ ئەیانناسێت و رەنگە بەشێکیش بێت لەو کۆمەڵەیە، بەڵام ناتوانێت بە دیداری هەموویان بگات. رابردووش بە هەموو ئەو داب و نەریت و زمان و ترادیسیۆنانەوە کە لە

خۆیان دەگرێت، ئەو شتە نییە کە لەلایەن ئێستاوە دیاری دەکرێت، بەڵکو لە ڕاستیدا ڕابردوو شتێکە کە سەرکردە سەربازییەکان و بیرمەندەکان بەکاری ئەهێنن وەك بەڵگەیەکی مادی و سامانێکی یەدەك. ئەگەر ڕابردووش نەبێت ئەوا داب و نەریت و ترادیسیۆنی تایبەت دائەهێنرێت. ئەمەش خۆی لە خۆیدا لەنگی نییە، چونکە لەگەڵ ئەو سوودانەی کە لە ناسیۆنالیزمدا بەدی دەکرێت، زیاد لەوەش ئەکرێت وەك شتێکی حەتمی تەماشا بکرێت، یەکێك لە پێشەنگەکانی مۆدێرنێتە دەڵێت: یەکێك لە سیحرەکانی ناسیۆنالیزم ئەوەیە کە ڕێکەوت (صدفە) دەگۆڕێت بە قەدەر.

لە نێوان ئەو دوو جۆرە تێگەیشتنەشدا هەندێك دەروازەی تر دەبینرێن کە لەوان پەرگیریان کەمترە. بۆ نموونە هەندێك لە توێژەران رایان وایە کە هەرچەندە نەتەوەکان و ناسیۆنالیزم بە تێگەیشتنی سیاسی هاوچەرخ، قەوارەی تازە پەیدابوون، بەڵام هەمیشە پشت ئەستوورن بە رەگی کەلتووری و سیاسی و زمانی دێرینی وا کە نیگای ئەوەمان پێدەبەخشێت کە (نەتەوەو ناسیۆنالیزم) هەرگیز ناکرێت وەك قەوارەیەکی کاتی و تێپەڕ تەماشا بکرێن.

لەبەرئەوە ئەتوانین مێژووی گەلانی (ئینگلیزی، روسی، چینی، میسری یان ئیتاڵی) بنووسینەوە، ئەگەر حاڵەتی بەردەوامی رەدبکەینەوە. ئەمەش لە راستیدا هەڵوێستی نووسەری ناودار (ئەنتۆنی سمیث *Antony Smith*)ە کە جەخت دەکاتەوە لەسەر (رەمزیەت، سیمبول). بە شێوەیەکی تایبەتیش (سمیث) چەمکی (ئیتنیك) بەکاردەهێنێت بە پشت بەستن بەزاراوە فەرەنسییەکە، بەمانای گروپێکی ئیتنی، وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو کۆمەڵانەی کە هێشتا لەسەردەمی ناسیۆنالیزدا، بنەمایەکن بۆ دروست بوونی نەتەوە مۆدێرنەکان.

هەندێك لە نووسەران ئەم چەمکەیان بەکارهێناوە بۆ جیاکردنەوەی چەند جۆرێکی جیاوازی نەتەوەکان، لەلایەك ئەوانەی کە خاوەن مێژوویەکی دێرین و بنەڕەتێکی ئیتنین وەك (چینییەکان و ئەڵمانییەکان) لەلایەکی تریش ئەوانەی کە مێژووی دروست بوونیان قوڵ نییەو لە ئەنجامی سیستەمی کۆلۆنیالیزمی ئەوروپاییەوە دروست بوون وەك (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئوسترالیاو زۆرێك لەوڵاتانی ئەمریکای لاتینی).

بەم جۆرە ئەتوانین نەتەوە ئیتنیەکان و نەتەوە سیاسیەکان لێکتر جیابکەینەوە. شێوازی دێرین و شێوازی نوێی نەتەوەکان، واتە جیاکردنەوەی ئەو دۆخانەی کە دەوڵەت نمایندەی نەتەوەیەکی خاوەن مێژوو دەکات لەو دۆخانەی کە دەوڵەت خۆی هۆکارێك بووە بۆ دروست کردنی نەتەوەو بەهۆی دەوڵەتەوە جۆرێك لە هاوکاری لەنێوان دانیشتواندا دروست بووە. رەنگە ئەم دابەشکردنە بەشێك لە راستی تێدا بێت، بەڵام نابێت لە گرنگی ئەو راستیە کەم بکاتەوە کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا هەموو دەوڵەتان کار لەسەر بەهێزکردنی بیرۆکەی نەتەوایەتی و نوێکردنەوەی دەکەن. بۆ نموونە دەوڵەتانی وەك (بەریتانیاو فەرەنساو یابان) هەر یەکەیان لای خۆیەوە وزەو توانای جۆراوجۆر بەکاردەهێنێت لە پێناو چاندنی هەستێکی تایبەت بەناسنامەو زمان و مێژووی هاوبەش لەنێوان گەلەکانیاندا، لە رێگەی دووبارە رێکخستنەوەی هەستە کۆن و لاوازەکان بەرامبەر بەترادیسیۆنی نەتەوەیی.

### سێهەم: لایەنە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی ناسیۆنالیزم *Positive and Negative*

لە کاتی گفتوگۆکردن لەبارەی رۆڵی ناسیۆنالیزم لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، شتێکی سروشتیە کە هەوڵی بەدیهێنانی هاوسەنگی بدرێت لەنێوان ئەرکە پۆزەتیڤ و خوازراوەکانی ناسیۆنالیزمو ئەرکە نێگەتیڤ و نەویستراوەکانی ناسیۆنالیزمدا.

لە رووی لایەنی پۆزەتیڤەوە ئەتوانین لانی کەم چوار بەڵگە دیاری بکەین:

أ. ناسیۆنالیزم پرانسیپێکی رەوایەتی پێشکەش دەکات کە بنەمای سیستمی دەوڵەتی مۆدێرن پێکدێنێت. ئەم بەڵگەیەش ئەوە روونەکاتەوە کە مافی دەوڵەتە، بەڵکو ئەرکی دەوڵەتە، کە نوێنەرایەتی گەلەکەی بکات، بەمەش دەوڵەت رەوایەتی بەدەست دەهێنێت لەرێگەی رەزامەندی گەلەکەیەوە، بەم رێگەیەش چەمکی (حکومەتی نوێنەرایەتی) پیادە دەکرێت کە لەلایەن بیرمەندان (رۆسۆ، میل)ەوە پێشکەش کران لە ئاستی نێودەوڵەتیدا.

ب. ناسیۆنالیزم بەدیهێنەری پرانسیپەکانی دیمۆکراسیە: ناسیۆنالیزم بریتییە لەو ئامرازەی کە لەرێگەیەوە پرانسیپەکانی بزوتنەوەی رۆشنگەریی تایبەت بەحکومەت لە گۆرەپانی نێودەولەتیدا جێبەجێ دەکرێت.

ج. ناسیۆنالیزم خزمەتی پیادەکردنی ئەرکێکی دەروونی گرنگ دەکات، چونکە ناسیۆنالیزم هەستی ئینتیمابوون دابین دەکاتو رەگو بنەرەتی تاك دیاری دەکاتو مێژوو و داهاتووی دیاری دەکات، هەروەها شێوازی گونجاوی دەربڕینی کەلتووریش دیاری دەکات. ئەم پێداویستیانەش بریتین لە پێداویستیە سەرەکیەکانی تاكو بەبێ دیاری کردنیان بێهیوایی و پشێوی دروست دەبێت، کەواتە گرنگی ناسیۆنالیزم لێرەدا بریتییە لە دابینکردنی ئەم پێداویستیە دەروونیانە لەم سەردەمەدا.

د. ناسیۆنالیزم یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکانی دامێنانو فرەیی مرۆڤایەتی، تەقینەوەی هەستی نەتەوایەتی بەدیهێنانی چەندین هەنگاوی گەورەی لەبوارەکانی (هونەرو ئەدەبیاتو میوزیكو وەرزشو زمانو تەنانەت هونەری چێشت لێنان) بەدوای خۆیدا هێنا. لەم بوارانەدا ناسیۆنالیزم بە تەنها سودی بەو گەلانە نەگەیاندووە کە کاریگەر بووە لەسەریان، بەڵکو سوودی بەتەواوی مرۆڤایەتی گەیاندوەو بەبێ ئەو دامێنانەش جیهان ئەگۆرێت بۆ شوێنێکی پڕ لە ناسۆرو دڵەڕاوکێ. تازەترین نموونەش لەسەر ئەم حاڵەتە بریتییە لە درەوشانەوەی فرە کەلتووری لەو کۆمەڵگایانەی کە رێگە بە گروپە ئیتنیە هەمەچەشنەکان ئەدات کە کەلتووری خۆیان دەربڕن.

هەروەها لەلایەنی نێگەتیڤیشەوە، چەند بەڵگەیەکی بەهێز هەیە:

أ. ناسیۆنالیزم سەرچاوەی ململانێو جەنگەکانە. بە تایبەت لە سەردەمی نوێدا ناسیۆنالیزم وەك ئەفرەتێکی لێهاتووە لە هەڵگیرساندنی جەنگە جیهانیەکانو پاکتاوی رەگەزیو جینۆسایدی بەکۆمەڵو قەیرانی بێ سنوور لە ئاستی نێودەوڵەتیدا، هەموو ئەوانەش بەهۆی پێداگری ناسیۆنالیزم لەسەر دەستگرتن بەزەویو هاندانی هەستی سۆزداری سەبارەت بە سیاسەتە نیشتمانیو جیهانیەکان. لێرەدا ئەگونجێت ناسیۆنالیزم وەك بیرێکی فەلسەفی خوازراوی رەوا خۆی نمایش بکات، بەلاّم پاش ماوەیەکی کەم تووشی لادان دەبێت رووەو شێوازی دیکەی بیرکردنەوەی سیاسی نەشیاوی وەك (تۆقاندنی بێگانەکان)، واتە دروست کردنی هەستی بەکۆمەڵی رقو کینەی بەرامبەریان یان شۆڤێنیزمو دژایەتی لێکانەکانو وڵاتەکانیان یان ئەنگێزەی

عەسکەرتاریانە کە بریتییە لە بەکارهێنانی هێز لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا یان ئیمپریالیزم کە بریتییە لە ئارەزووی بنیادنانی ئیمپراتیۆریەتێك کە گەلانی تر ملکەچی ویستو بەرژەوەندیەکانی خۆی بکات.

ب. هەرچەندە ناسیۆنالیزم هەوڵی ئەوەش بدات کە خۆی لە پێکدادانی سەربازی دووربخاتەوە، بەڵام هێشتا بە ڕێگرێك دادەنرێت لە بەردەم هاریکاریو چارەسەرکردنی مەسەلە نێودەوڵەتییەکان، لە بوارە جیاوازەکانی بازرگانیو کۆچکردنو ژینگەو هەر مەسەلەیەکی نێودەوڵەتی دیکە. هەمیشە جیهان پێویستی هاوکارییەکی نێودەوڵەتی فراوانترو کارکردن بەپرانسیپی بەرژەوەندییە جیهانییە هاوبەشەکان هەیە لە بەرامبەر دەستگرتن بەتایبەتمەندییە نەتەوەییەجیاکەرەوەو دژیەکەکان. ئەگەر ئاتاجی جیهان بە باروودۆخێکی لەم شێوەیە پێداویستیەکی بەردەوامو هەمیشەیی بێت، ئەوا لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ئەم پێویستیە زیاترە بەهۆی مەترسی بڵاوبوونەوەی چەکی ئەتۆمیو مەترسی هەڕەشەکانی سەر ژینگەی جیهانی.

ج. ناسیۆنالیزم ئەبێتە هۆی لەبەریەك هەڵوەشانەوەی دەوڵەتانو وێرانکردنی چەندین قەوارەی سیاسیو ئابوری کە شایانی بەردەوامبوونن لەجیهاندا، چونکە پەرتکردنی دەوڵەتە گەورەکان بۆ چەندین قەوارەی بچووك خزمەت بەکەس ناکات. لێرەدا ڕەنگە هەندێك کێشە بەهۆی نایەکسانی سیاسیو شێوازی دابەشکردنی داهات لە کۆمەڵگەدا دروست ببێت، بەڵام بێگومان ئەم کێشانە لە ڕێگەی جیابوونەوەو دابەشکردنی وڵاتەوە نابێت.

د. ناسیۆنالیزم لەدیسدێکی لۆکاڵییەوە مەسەلەیەکی خوازراو نییە: چونکە ئەبێتەهۆی دروستکردنی کەشێکی بارگاوی بەدەمارگیریو دیکتاتۆریەت لە ناوخۆی وڵاتدا. لێرەدا ڕەنگە شێوازێکی دیاریکراوی حوکمڕانی هەبێت کە پرانسیپی ناسیۆنالیزمو بیرۆکەی ئاسایش بەکاربهێنێت بە مەبەستی پاراستنی دەسەڵاتەکانیو مانەوە لە کورسی حوکمڕانیدا. هەروەك ئەگونجێت گروپێکی زۆرینە پرانسیپی ناسیۆنالیزم بەکاربهێنێت بەمەبەستی بێدەنگ کردنو ملکەچکردنو پاکتاوکردنی هەر گروپێکی تر کە سەر بەو زۆرینەیە نەبێت لە وڵاتدا.

لە دۆخێکی لەو شێوەیەدا، دەوڵەت ئەتوانێت پاساوی جیاواز بەرەنگاری فشارە نێودەوڵەتیەکان ببێتەوە. چونکە ئەو دەوڵەتەی کە دەستدرێژی دەکاتە سەر مافی هاوڵاتیانی پەنا دەبات بۆ چەند بیانوویەکی زانراوی سواو تا لە ڕێگەیانەوە ڕووبەڕووی فشارە دەرەکییەکان ببێتەوە، کورتەی ئەو پاساوانەش لەو خاڵەدا کۆدەبێتەوە کە هەموو ڕەخنەگرتنو فشارێکی دەرەکی جۆرێکە لە دەستێوەردان لە ژیانی نەتەوەداو ئەوانەی کە ڕەخنە دەگرن دوژمنی نەتەوەنو هەڵگری بەمای دەوڵەتێکی تر بێگانەن.

لە ئاستی کەلتووریشدا ناسیۆنالیزم بانگەشەی ئاسۆیەکی بەرتەسكو جۆرێك لە خۆپەرستی دەکاتو دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ ئاڵوگۆڕی کەلتووریو کارلێکردنی دەوڵەمەندی نێوان کەلتوورەکانو ئایینەکانو زمانە جیاوازەکانی کە سەردەمی هاوچەرخی پێدەناسرێتەوە. ئەو خاڵانەی سەرەوەش ئەوە ڕووندەکاتەوە کە بۆچی بەدرێژایی سەرهەڵدانی پرانسیپی ناسیۆنالیزم هەمیشە کەسانێك هەبوون کە بەتوندی ڕەخنەیان لێگرتووەو وەك ئامرازێکی هەژموونگەریی لەناوخۆی کۆمەڵگەکاندا تەماشایان کردوە.

### چوارەم: ئەو لایەنانەی کە شایانی وەلائی بنەڕەتین *Objects Of Primary Loyalty*

ئەو داواکاریە ئەخلاقیەی کە ناسیۆنالیزم بانگەشەی بۆ دەکات چەند بابەتێکی ناوەندی دێنێتە پێشەوە کە پەیوەندیداران بە تیۆری سیاسییەوە، لەهەمان کاتیشدا پرۆسەکانی بەجیهانیکردنیش هەمان ئەو بابەتانە دەوروژێنن. کرۆکی ئەو داوایەش ئەوەیە کە تاکە کەس، بەو پێیەی کە لەدایك بووی شوێنێکی دیاری کراوەو سیفەتی هاولآتی بوونی بەدەستهێناوە، ئەوا پێویستە (وەلا)ی بۆ ئەو نەتەوەیە هەبێت بە پلەی یەکەمو لە پێش هەر شتێکی ترەوە، لە زۆربەی حاڵەتەکانیشدا ئەم (وەلا)یە بۆ ئەو دەوڵەتە پێشکەش دەکرێت کە نمایندەی ئیرادەی ئەو نەتەوەیە دەکات. هەر ئەم پرانسیپیەشە کە بنەمای سیستمی دەوڵەتی لەسەر بنیادنراوەو رەوایەتی سیستمی نێودەوڵەتیش بەندبووە بەهەمان پراسنیپەوە لە ماوەی دوو سەدەی ڕابردوودا.

ئەو بەڵگانەش کە ئەم داوا ئەخلاقییەی لەسەر بنیادنراوە، وەك باسکرا، بەڵگەی بەهێزن بەلآم لەڕاستیدا ئەو بەڵگانە بریتین لە وەلآمی پرسیارێك کە وەلآمی دیکەش هەڵدەگرێت، لانی کەم لە سەردەمی بەجیهانیکردندا لە رووی واقیعییەوەو بە شێوەیەکی گریمانەیی سێ لایەن هەن لەبەردەم تاکەکەسدا بۆئەوەی (وەلا)ی خۆییان پێببەخشێت، ئەوانیش: دەوڵەتی–نەتەوەیی، هەندێك کۆمەڵەو گروپ کە لە دەوڵەتی نەتەوەیی گەورەترنو سنووری دەوڵەتیان تێپەڕاندووە وەك (ئایین، چینی کرێکار، کۆی مرۆڤایەتی، ئەورووپا بەگشتی) یان هەندێك گروپو پێکهاتەی تر کە لە دەوڵەت بچوکترنو لە ناوخۆی دەوڵەتدان، وەك (خێزان، خێڵ، گروپە لۆکالیەکان، دامەزراوە بازرگانیەکان).

هەرچی بابەتی پرسیارکردنیشە سەبارەت بەوەی کام لەو سێ لایەنە شایەنی ئەوەن کە مرۆڤ (وەلا)یان پێشکەش بکات، ئەوە پرسیارێکی نوێ نییە: چونکە پێش سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم (وەلا) پێشکەش هەندێك قەوارەی ئایینیو خێزانی دەکرا. لە رۆژگاری ئەمرۆشدا زۆرێك لە بزوتنەوە سیاسیو کۆمەڵآیەتیەکانی وەك (کۆمۆنیزم، کاتۆلیکیەت، بزوتنەوە ئیسلامیەکان، بزوتنەوەکانی ژنان، ماسۆنیەتو مافیاکان) داوا لە شوێنکەوتەکانیان دەکەن کە (وەلا)یان پێشکەش بە لایەنێك بکەن کە دەوڵەتی تێپەڕاندووە. هەندێکجار بڕیاردانی پێشکەش کردنی (وەلا) بۆ نەتەوەیەك کە لە کەمینەکانو گەلە چەوساوەکان پێکهاتووە، مانای ئەوەیە کە نابێت (وەلا)ی خۆی پێشکەش بە نەتەوەیەکی فراوانتر بکات کە لە شێوەی دەوڵەتەکەدا خۆی نمایش دەکات. نمونەی ئەم حاڵەتەش وەك کەسێکی بە بنەچە سکۆتلەندی یان ئیرلەندی وایە کە لە چوارچێوەی بەریتانیادا دەژی، کە بە ئەزموون دەرکەوتووە زۆرێك لەو کەسانە (وەلا)ی خۆیان پێشکەش کردووە بە گروپە لاوەکیەکە.

لەمانایەکی نزیك لەوەشدا (گراهام گرین *i raham i reene*)ی نووسەر پای وایە کە بەلای ئەوەوە وا باشترە کە خیانەت لە وڵآتەکەی بکات نەك خیانەت لەهاوڕێکانی.

هەرچی ئەو نووسەرانەشن کە لایەنگری بزووتنەوەکانی ژنانن، ئەوا رەخنە لەو شێوازە دەگرن کە نەتەوە کاری پێدەکات، چونکە پیاوان بە تەنها حوکمڕانی دەکەنو خاسیەتە جیاکەرەوەکانیشی دیاری دەکەن، بۆیە دەرئەنجام نەتەوەیەك دەبێت کە خزمەتی بەرژەوەندیەکانی پیاوان دەکاتو ژنان دەچەوسێنێتەوە، لەو بارەیەوە خاتوو (ڤێرجینا

وۆلف *Virgiuia Woolf*)ی ڕۆماننووس دەڵێت: (من وەك ژنێك، نیشتمانم نییە!).

لە ڕاستیدا هەڵبژاردن لە نێوان ئەم سێ دەستەیەدا کە (وەلا)یان پێشکەش دەکرێت، بە پێویست هەڵبژاردنێکی ڕەها نییە. چونکە زۆرینەی خەڵك لەیەك کاتدا (وەلا)یان پێشکەش بەهەر سێ لایەنەکە دەکەن، هەوڵی ئەوە دەدەن کە بەبێ ئەوەی تووشی کێشەیەکی گەورە بێن ڕێگەیەك بدۆزنەوە بۆ ئەوەی هەر سێ بوارەکە پێکەوە کۆبکەنەوە. بەڵام هەمیشە دڵەڕاوکێ و نائارامی ئامادەیی دەبێت، بە تایبەت لە سەردەمی بەجیهانیکردندا، کە لە ژێر سایەیدا مەسەلەی (وەلا)ی نێودەوڵەتی بازنە فراوان دەورووژێنرێت و هەندێکجاریش لاوازی دەوڵەت بوار دەڕەخسێنێت بۆ دەرکەوتنی سەنتەری نوێی ڕەوایەتی بەخشین کە لۆکاڵین و چوارچێوەشیان بەرتەسك ترە، بۆ نموونە (پرۆسەکانی تەواوکاری لە چوارچێوەی یەکێتی ئەورووپادا، پەرەسەندنی کەلتووری گەنجانە و بەرخۆری لە ئاستێکی جیهانیدا، کارکردن لە کۆمپانیایەکی فرە ڕەگەزدا) هەموو ئەوانە بوار دەڕەخسێنێت کە ئاڵوگۆڕێکی ئاڵۆز ڕوودەدات لە مەسەلەی (وەلا)دا. لە ئێستادا وەلامێکی حازربەدەست لەمبارەیەوە، وەك مەسەلەکانی تری تایبەت بە ناسیۆنالیزم، ئامادە نییە.

**پەراوێز:**

١-هەرچەندە ئاماژەکردنی نووسەر بۆ ئەو ڕاستییە هەڵوێستێکی باشە، بەڵام بێگومان ژمارەی کورد لەو وڵاتانەدا گەلێك لەو ژمارەیە زیاترە. (وەرگێڕ)

**سەرچاوە:**

ئەم بابەتە بریتییە لە بەشێك لە کتێبی: عولمة السیاسة العالمیة، تحریر: جون بیلیس وستیف سمیث، ترجمة ونشر مرکز الخلیج للأبحاث، ٢٠٠٤.

# ناسیۆنالیزمی پەڕگیر: فاشیزم

د. شاهۆ سەعید

### داگیرکردنی دەسەڵات:

فاشیزم رەوتێکی توندڕەوە لە هەر عەقیدەیەکی سیاسی، کە ماف دەداتە خۆی هەقیقەتی سیاسی و بەهای کۆمەڵایەتی و تەنانەت بەهای ئیستاتیکیش لە نەیارانی خۆی زەوت بکا. لەسەر ئاستی پراکتیکی چەشنێکی فەرمانڕەواییە، کە بەناوی عەقیدەیەکی پیرۆزەوە تیرۆرو ترساندن و پاکتاوکردن دژی نەیارانی ناوخۆو دەرەوەی پێڕەودەکا. فاشیزم، لە زمانی سیاسەت و فیکردا، لە چەندین کۆنتێکستی جیاوازدا بەکاردێ، بەڵام لەڕووی مێژووییەوە ئەو ئایدیۆلۆجیا سیاسییە بوو، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، لەسەر دەستی بێنیتۆ مۆسۆلینی لە ئیتالیا پەرەی سەندو هاتەسەر حوکم[1]. لە بەکارهێنانی باودا فاشیزم وەك ئاوەڵناوێك بۆ هەموو ئەو ئایدیۆلۆجیاو سیستمە سیاسیانە بەکاردێ، کە هاوشێوەی فاشیزمی ئیتالین. وەك رایشی سێیەمی نازیست لە ئەڵمانیا، رژێمی فرانکۆ لە ئیسپانیا، رژێمی سالازار لە پورتوگال، بیرۆن لە ئەرجەنتین و بەعسیزم لە عێراق و... هتد[2].

زۆرجار ئایدیۆلۆجیای فاشیزمی ئیتالی و ناسیۆنالیزمی سۆسیالیست لە ئاڵمانیا (نازیزم) وەك هاوتای یەکدی بەکاردێن، چونکە ئەو دوو ئایدیۆلۆجیایە لە جومگە سەرەکیەکانیاندا لەیەکدی دەچن و کاتێکیش هاتنەسەر حوکم، لەزۆر رەفتاردا ئەزموونیان گۆڕییەوەو سەرەنجامیش لەجەنگی جیهانیی دووەمدا بوونە هاوپەیمانی یەکدی لە تەوەری دژ بە هاوپەیمانانی خۆرئاوا.

دەرکەوتنی فاشیزم هاوزەمانی دەرکەوتنی سیستمی کۆمۆنیزمی سۆڤێتی و بڵاوبوونەوەی فیکری مارکسی بوو لە ئەوروپا و جیهاندا. (کارل فریدریك) پێیوایە هەردوو سیستمەکە، لەڕووی مێژووییەوە، زادەی سەدەی بیستەمن و هەردووکیان لە وردەکاریەکانی سەپاندنی دەسەڵاتدا ئەزموونیان گۆڕیوەتەوە، بەتایبەتی سەبارەت بە خستنەگەڕی هەموو کۆششێك لەپێناو داگیرکردنی هەموو خانە رەمزی و ماتریاڵیەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگاو دامەزراندنی

دەسەڵاتێکی مەرکەزیی، هەرەمیی، عەسکەرتاریی و گشتگیر، کە لە ئەدەبیاتی سیاسیی نوێدا بە سیستمی تۆتالیتاری ناودەبرێ[٣].

تۆتالیتاریزم سیستمێکی تایبەتە، کە لەسەدەی بیستەمدا سەری هەڵداو لەپاڵ زەبروزەنگدا پەنای برد بۆ تەکنەلۆجیای زانستی و بیرۆکراتیەتی کارگێڕی و سوودی لەهەموو بەرهەمو داهێنانەکانی دنیای مۆدێرن وەرگرت. بەم مانایە سیستمی تۆتالیتار لە مێژووی کۆندا بوونی نەبووەو ناکرێ ڕژێمە ستەمگەرو داپڵۆسێنەرە کۆنەکان بە ڕژێمی تۆتالیتار ناوببرێن.

سەبارەت بە خەسڵەتە سەرەکیەکانی سیستمی تۆتالیتاری دەکرێ بڵێین زۆربەی ئایدیۆلۆجیا دۆگماکان هەڵگری ستریسی تۆتالیتارین، چونکە ئایدیۆلۆجیستە دۆگماکان، چەپ بن یان ڕاست.. کۆنزێرڤاتیڤ بن یان پێشکەوتوخواز، ئاینی بن یان عەلمانی...، خاوەنی پرۆژەی سیاسیی گشتگیرن بۆ دەوڵەت، خۆیان بە خاوەنی دوا ماف دەزانن سەبارەت بە بڕیاردانی چارەنوسی وڵات و هاوڵاتیان و شێوازی حوکمڕانی و داڕشتنی پێوەرەکانی نیشتمانپەروەری و خیانەت و دیاریکردنی بنەماکانی ئاسایشی گشتی و ناونانی دوژمن و پیلانگێڕە دەرەکی و ناوخۆییەکان. سیستمی تۆتالیتاری لەڕێگای ئەو ئایدیۆلۆجیا ڕەسمییەوە، کە بڕوای پێیەتی، ماف دەداتە خۆی دەستوەرداتە وردەکاریەکانی ژیانی هاوڵاتیان و حوکم لە سەر بەها سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و هونەرییەکان بدا سەبارەت بە جوانی و ناشرینی، خێرو شەڕ، دۆست و دوژمن، ڕاستی و ناڕاستی و.. هتد.

خەسڵەتێکی تۆتالیتاریزمی فاشیست بریتیە لە چڕکردنەوەی دەسەڵات و دەوڵەت لە تاقە حیزبێکدا، یاخود تاقە گروپێکی ڕێکخراودا، هەروەها چڕکردنەوەی دەسەڵاتی ئەو حیزب و گروپەش لە دەستی تاقە سەرکردەیەکدا. چونکە فەلسەفەی سیاسیی تۆتالیتاریزم لەسەر یەکتایی دادەمەزرێ: یەك دەوڵەت، یەك نەتەوە، یەك دەسەڵات، یەك حزب، یەك ئایدیۆلۆجیا، یەك سەرکردەو یەك ڕابەر. لەو پێناوەشدا فاشیزم دەزگای پۆلیسی نهێنی بەناو هەموو دامودەزگا سیاسی و کۆمەڵاتی و کارگێڕی و ڕۆشنبیریەکاندا بڵاودەکاتەوە. ئەو تۆڕە نهێنیانە ڕۆڵی دەسەڵاتی سێبەر دەبینن لەناو دەسەڵاتە ئاشکراکاندا، ئەرکیان چنینەوەی زانیارییە دەربارەی باسوخواسی ناو خەڵکی و هەڵسوکەوتیان، ڕاپۆرتنوسین دەربارەی هەر دیاردەو قسەو هەڵوێستێك کە بەگوێرەی ئایدیۆلۆجیای ڕەسمی دەچنە خانەی یاساغەوە. لە دەوڵەتی تۆتالیتاریدا هەموو هاوڵاتییەك فایلێکی تایبەتی لەدەزگای پۆلیسی نهێنیدا هەیە، کە بەگوێرەی زانیاریەکانی ناو ئەو فایلە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ و دەرفەتی کارو چارەنوس و ژیانی دیاریدەکرێ[٤].

مۆنۆپۆلکردنی هەموو دەزگاکانی ڕاگەیاندن و پروپاگەندەو ڕیکلام، لەلایەن دەسەڵاتی سیاسییەوە، خەسڵەتێکی تری ئەو دەسەڵاتەیە. ئیتر دەزگاکانی وەك: (ڕادیۆ، تەلەفزێون، ڕۆژنامە، گۆڤار، ناوەندەکانی پەخش و بڵاوکردنەوە)، بەمەبەستی پروپاگەندە لە بەرژەوەندیی دەسەڵاتی سیاسی و گوزارشتکردن لە ئایدیۆلۆجیای ڕەسمی و دزێوکردنی وێنەی نەیارانی دەرەکی و ناوخۆیی، دەخرێنەگەڕ. لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتیش دەسەڵاتی تۆتالیتار خانەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی داگیردەکا و سەرجەم سەندیکاو ڕێکخراوە پیشەیی و جەماوەرییەکان

دەکاتە پاشکۆی حزب و گروپی دەسەڵاتدار. هەروەك چۆن لەسەر ئاستی پەروەردەیی سەرجەم ناوەندەکانی خوێندن و فێرکردن، لە باخچەی ساوایانەوە تا زانکۆ، بەمەبەستی بانگەشەکردن بۆ ئایدیۆلۆجیای رەسمی بەکاردێنێ. داگیرکردنی شادەمارەکانی ئابووری وڵات، چ ئەوەی پەیوەندیی بە سامانی سروشتییەوە هەیە یان پەیوەندیی بە بەرژەوەندیی تاکەکانەوە هەیە، سیمایەکی تری تۆتالیتاریزمی فاشیستە. بۆ ئەو مەبەستە دەزگایەکی دارایی و چاودێریی مەرکەزیی دادەمەزرێنێ بۆ بەکەرخستنی هەموو توانا ئابورییەکان، ئاراستەکردنیان بۆ خزمەتی نوخبەی سیاسی، خۆراکبەخشین بەدەزگا داپڵۆسێنەرەکان، کڕینی وەلای هاوڵاتیان و پەخشکردنی پروپاگەندەی سیاسی و ئایدیۆلۆجی لە بەرژەوەندیی دەسەڵاتدا.

هەمیشە دەسەڵاتی فاشیست وەك دەسەڵاتێکی عەسکەرتاری دەردەکەوێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەخلاقێکی پیشەیی لە دەزگای سەربازی دادەماڵێ. سەرەتا دەستدەگرێ بەسەر دەزگا سەربازییەکان و هێزە چەکدارە ناوخۆییەکاندا، پاشان بێلایەنی لە دەزگای سەربازی دەستێنێتەوە و پرنسیپە پیشەییەکان و پلەبەندیی نێوان جەنەراڵەکان نابوت دەکا و پێوەری ئایدیۆلۆجی بەسەریاندا دەسەپێنێ. بەڵام لەکاتێکدا ئەو رژێمە رێز لە پرنسیپە سەربازیەکان ناگرێ، کەچی دیسپلین و زەبتوڕەبتی سەربازی بەسەر هەموو دەزگا مەدەنیەکاندا دەسەپێنێ و سیمایەکی عەسکەرتاریی بە هەموو بوارەکانی دەوڵەت دەبەخشێ. سەرەتا تۆتالیتاریزم بانگەشە بۆ پیرۆزکردنی ئایدیۆلۆجیای حزبی فەرمانڕەوا دەکا، تا لەو رێگەیەوە فرەیی سیاسی لەناو بەرێ و زۆرترین ئەندام و شوێنکەوتو، لە خولگەی دەسەڵاتی سیاسیدا، گردبکاتەوە. بەڵام لە قۆناغێکی تردا لەرێگەی گەورەکردنی سوپا و دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانەوە رۆڵی راستەقینەی حزبیش پەراوێزدەخا، لەناو ئەو دامودەزگایانەشدا پۆلیسی نهێنی گەورەترین رۆڵ دەبینێ. هەربۆیە لە رژێمی تۆتالیتاریدا، بەرواڵەت وادەردەکەوێ کە حزب و دەزگا داپڵۆسێنەرە ئاشکراکان وڵات دەبەن بەرێوە، بەڵام لە راستیدا پۆلیسی نهێنی ئەو کارە دەکا. هەربۆیە، وەك "فیلیپ برۆ" ئاماژەی پێدەدا، لە ئەڵمانیای سەردەمی نازیزمدا، کاتێ کێبڕکێ کەوتە نێوان حزب و پۆلیسی نهێنی (S.S) هیتلەر پشتی پۆلیسی نهێنی گرت، هەروەها لە سەردەمی ستالینیشدا ئەوەی بەڕاستی حوکمی دەکرد پارتی کۆمۆنیست نەبوو، بەڵکو دەزگای (K.G.B) بوو[*].

## فاشیزم لەگرێی شکستەوە بۆ پاساوی فیکری:

فاشیزمی ئیتاڵ و نازیزمی ئەڵمانی هەڵقوڵاوی قەیران و ئەنجامە کارەساتبارەکانی جەنگی جیهانی یەکەم بوون. هەرچەندە ئەو جەنگە کۆتایی هاتبوو، بەڵام هاوکێشە سیاسییەکانی بەجۆرێك تێکدابوو کە پێکەوەژیانی نێوان نەتەوە ئەوروپییەکانی خستبووە بەرمەترسی، بەجۆرێك ئەگەری سەرلەنوێ هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە هەموو ئانوساتێکدا لەئارادا بوو. خەڵکی وڵاتە شکستخواردوەکانی ئەو جەنگە، لەپاڵ قات و قڕی و قەیرانە ئابوورییە سەختەکاندا، هەستیان بە غەدرێکی گەورە دەکرد، هەستیان دەکرد کەرامەتیان پێشێلکراوە و غروریان بریندارکراوە لەئاست میللەتانی وڵاتە سەرکەوتوەکاندا. ئەڵبەتە دۆخی لەو جۆرە فرسەتێکە بۆ جەنگاوەرو فەرماندەو تیۆرسازە راسیستەکان، تا هەموو بوغزو گرێیەکی سایکۆلۆجی و ڕقێکی

نەژادپەرستی و ئایدیۆلۆجی بقۆزنەوە، بەئاراستەی سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی خۆیان و گرتنەدەستی حوکم.

جەنگاوەرە دێرینەکانی ئەو وڵاتانە، کە لە هەموو کەس زیاتر جەزرەبەی شکستیان چەشتبوو، شانە سەرەتاییەکانی چەند گرووپێکی نهێنیان پێکهێنا، کە دواتر بوونە هەوێنی فاشیزم و عەقیدەی راسیزم لە ئەڵمانیا و ئیتالیا، دژ بە دیموکراسی و لیبراڵیزم و کشانی هەژموونی سۆسیالیستی سۆڤێتی. بەهەمان شێوە جەنگاوەرە دێرینەکانی فەرەنسا، لەنێوان ساڵانی ١٩١٨-١٩٣٩، رێکخراوی "خاچی ئاگر"یان دامەزراند، بۆ دژایەتیکردنی سیستمی دیموکراتی و وروژاندنی هەستی نەتەوەیی فەرەنسییەکان. بەڵام رێکخراوی "خاچی ئاگر"، وەك شانەکانی فاشیزمی ئیتالیا و نازیزمی ئەڵمانیا، پەنای نەبرد بۆ زەبروزەنگ و چووە هاوپەیمانێتییەوە لەگەڵ چەند گرووپێکی تردا، چونکە جەنگاوەرە دێرینەکانی فەرەنسا، وەك هاوتاکانیان لە ئەڵمانیا و ئیتالیا، هەستیان بە گرێی شکست و ئیهانەی نەتەوەیی نەدەکرد و خۆیان وەك جەنگاوەری دۆڕاو نەدەهاتە بەرچاو[٦].

تیۆرسازە فاشیست و نازییەکان هەمیشە خۆیان وەك هەڵگری تاقە هەقیقەت و تاقە ئایدیۆلۆجیای سیاسی راستەقینە نیشاندەدا، هەندێکیان هەوڵیان دەدا، بەپشتبەستن بە کولتووری فەلسەفی، پاساوی فیکریی بۆ عەقیدە و رەفتارەکانی خۆیان بدۆزنەوە. بەڵام هیچ کام لە سەرکردە فاشیستەکان خاوەن پاشخانێکی فیکری نەبوون و خۆیان لە هەموو بەڵگاندنێکی فەلسەفی و سیاسی دەدزییەوە. واتە هێندەی هەوڵیاندەدا حەماسەت بوروژێنن و بڕیاری رەها بدەن سەبارەت بە نیشتمانپەروەری و خیانەت، هێندە هەوڵی قەناعەتپێهێنانی تیۆری و ئەقڵانی شوێنکەوتوەکانی خۆیان نەدەدا.

بۆ نموونە، ساڵی ١٩١٩، کاتێ مۆسۆلینی بانگەشەی بۆ فاشیزمی ئیتالی دەکرد، بۆ خۆدزینەوە لە هەر پاساوێکی فیکری دەیوت: "عەقیدەی ئێمە کارو کردەوەیە"، هەمیشە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە فاشیزم ئایدیۆلۆجیا نیە، بەڵکو دیسپلینێکە لەسەرەوە بۆ خوارەوە، بۆ تواندنەوەی هەموو جیاوازییەکان لە سیستمێکی گشتگیردا. ساڵی ١٩٢٤ ووتی: "ئێمەی فاشیست جورئەتی ئەوەمان هەیە کە هەموو تیۆرە سیاسییە تەقلیدییەکان رەتبکەینەوە. ئێمە لە یەك کاتدا ئۆرستۆکرات و دیموکراتین، شۆڕشگێڕ و کۆنەپەرستین، پرۆلیتارو دژ بە پرۆلیتاریشین، ئاشتیخواز و شەڕخوازین. ئێمە تەنها لە یەك پنتی جێگیردا یەکدەگرینەوە: کە ئەویش نەتەوەیە". بەڵام ساڵانی ١٩٢٩-١٩٣٠ مۆسۆلینی هەوڵیدا ئایدیۆلۆجیایەك بۆ فاشیزم دابڕێژێ، کە تا ئاستێکی زۆر ئاڵۆز و بێسەروبەر بوو، هیچ قووڵاییەکی فیکریشیی تێدا نەبوو. هەرچی هیتلەرە، کاتێ ساڵی ١٩٣٣ لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا بانگەشەی بۆ پارتی نازیزم دەکرد، ئەوەی رەتکردەوە کە بەرنامەیەکی ئاشکراو روون پێشکەش بکا، دەیوت: "بەرنامەکان بێ هوودەن، ئەوەی گرنگە ئیرادەی مرۆییە". لە کتێبەکەی هیتلەردا "تێکۆشانی من" هیچ قووڵاییەکی فیکری و شارەزاییەك لە زانستی سیاسیدا بەدیناکرێ، ئەوەی نوسراوە زیاتر لە یاداشت دەچێ، کە تیایدا هەست و سۆزی ئەڵمانییەکان دەبزوێنێ و هانیان دەدا بۆ کاری بێوچان[٧].

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێ بیریارو ئایدیۆلۆجیست هەن، کە دەشێ تێزەکانیان وەك هەوێنی ئایدیۆلۆجیای فاشیستی لەقەڵەم

بدرێ، وەك: ماكیاڤیللی: كە بیریارو راوێژكارێكی سیاسی بوو، داهێنەری بیرۆكەی دەسەڵاتی رەها بوو لە ئیتالیای سەدەی حەڤدەدا. مۆسۆلینی ئیعجابێكی زۆری بە ماكیاڤیللی هەبوو، بەتایبەتی سەبارەت بە پیرۆزكردنی هێزو بایەخدان بە كولتووری میلیتاریی رۆمای كۆن و زیندووكردنەوەی رۆحیەتی جوامێری و جەنگاوەریی لای ئیتالیەكان[٨].

فیختەو نیچەش، وەك دوو فەیلەسوفی دیاری ئەوروپی، سترێسی فاشیانە لە نوسینەكانیاندا هەیە. یەكەمیان بڕوای بە دامەزراندنی بازاڕی نەتەوەیی داخراو هەبوو، كە نازیەكان لە تیۆرە سۆسیالیستییە نەتەوەییەكەیاندا پشتیان پێ دەبەست و پێیانوابوو هەر نەتەوەیەك ئابوری و سۆسیالیزمی تایبەت بەخۆی هەیە، واتە ناكرێ باس لە بازاڕی جیهانی یان سۆسیالیزمی ئەنتەرناسیۆناڵ بكرێ[٩]. بەڵام دووەمیان، واتە فریدریك نیچە، فەیلەسوفی ئیرادەی هێزو جوامێری بوو، رەخنەی سەختی لە مۆدێرنیتەو ئەقڵانیەتی خۆرئاوایی دەگرت. زۆر لە نازیەكان لەژێر كاریگەریی ویدا بوون، بەتایبەتی سەبارەت بە بیرۆكەی سوپەرمان و رەتكردنەوەی كولتووری مێینەیی و پیرۆزكردنی ئیرادەو جوامێری[١٠]. لیست (*List*)یش، كە زانایەكی ئابووریناس بوو، وەك فیختە بڕوای بەتیۆرەی نەتەوەیی هەبوو بۆ بەسیاسیكردنی ئابووری و دامەزراندنی سیستمێكی ئابووریی- سیاسیی یەكانگیر. هەرچی ئۆزوۆڵد شپنگلەرە، كە خاوەنی كتێبی "داڕمانی خۆرئاوا"یە، دژایەتی سەرسەختی سۆسیالیزمی نێودەوڵەتی دەكاو پەیامێك پێشكەشی نەتەوەی ئەڵمانیا دەكا بەوەی كە دەبێ بەرگری لە سنووری شارستانیەتی ئەوروپی بكا دژی نەتەوەكانی ئاسیاو توخمە فرەڕەنگەكان. پێیوایە زیادەڕۆیی لە ئەقڵانیەتی پیشەسازیدا ژیاری خۆرئاوایی بەرەو هەڵدێر دەباو دەبێ بیرۆكەی سۆسیالیزم لە ماركسیەت پاكبكرێتەوەو ئابوریی ئەڵمانیا ئاوێتەبكرێ لەگەڵ دیسپلینی جێرمەنی و زەبتوڕەبتی كەلەپوری پروسی. ئەڵبەتە كەلەپوری شۆڕش و عەقیدەی ئەڵمانیبوونی سوننەتی، بەتایبەتی لای رۆدبێرتۆس، لاسال و دۆرینگ، هەمان رۆڵی هەبوو لە بەهێزكردنی رۆحیەتی راسیستی لای ئەڵمانیەكان[١١].

## داگیركردنی هەقیقەت:

فاشیزم و نازیزم لە سەردەمێكدا دەركەوتن كە قەیرانە ئابوری و كۆمەڵایەتیەكان باڵیان بەسەر زۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا كێشابوو، زۆرینەی خەڵك دووچاری نائومێدی هاتبوون لەئاست موژدەكانی لیبراڵیزم و بیرۆكەی پێشكەوتن و ئەفسانەی ئامێرو پیشەسازی و كرانەوەی بازاڕو پەیوەندییە بازرگانیەكان. فاشیەكان ئەو دۆخە نالەبارەیان قۆزتەوە بۆ بانگەشەكردن دژی لیبراڵیزم و قەناعەتپێهێنانی خەڵكی بەوەی كە ئازادی ئابوری و كرانەوەی سنورەكان بەڕووی كاڵا بیانیەكاندا تەنها كارەسات وماڵوێرانیی لێدەكەوێتەوە. ئەوان دژی لیبراڵیزم بوون و پروپاگەندەیان بۆ مۆدێلێك لە سۆسیالیزم دەكرد لە چوارچێوەی دەوڵەتی نەتەوەییدا، واتە ئاوێتەكردنی سۆسیالیزم لەگەڵ ناسیۆنالیزمدا.

ئەوان پێیان وابوو سۆسیالیزمی راستەقینە سۆسیالیزمێكی نەتەوەییە، نەك نێودەوڵەتی. گۆبلز دەیوت تەنها سۆسیالیزمی ناسیۆنالیستی (سۆسیالیزمی راستەقینە)یە، چونكە چینەكان ناكا بەگژ یەكدا، بەڵكو رۆحیەتی نەتەوەییان تێدا پەروەردە دەكاو

پێکەوە ڕێکیاندەخا لەبۆتەی دەوڵەتی نەتەوەییدا. مۆلەر ڤان دنبرۆك لە کتێبی "رایشی سێیەم"دا دەڵێ: "هەر نەتەوەیەو سۆسیالیزمی تایبەت بەخۆی هەیە"، هەروەها پێیوایە مارکس خاوەنی هیچ هەستێکی نەتەوەیی جێرمانی نەبوو، چونکە کەسێکی جولەکە بوو، مارکس -بەڕای وی- مرۆڤی لە ڕەهەندە ڕۆحییەکانی بەتاڵدەکردەوە، کە گرنگترینیان ڕۆحی نەتەوەییە. لای ڤان دنبرۆك (نازیزم) بڕوای بە سۆسیالیزمێکی ڕۆحی و ئایدیاڵ هەیە نەك سۆسیالیستی ماتریالیستی. ڕێکخستنی ئابوری و هێنانەدی داپەروەری لای وی لەڕێگەی ململانێی چینەکانی نێوان یەك نەتەوەوە نایەتەدی، بەڵکو لەڕێگەی هاوکاری نەتەوەیی نێوان چینە جیاوازەکانەوە دێتەبوون.

مۆسۆلینی-ش پێیوابوو فاشیزم فەلسەفەیەکی ڕۆحانییە، چونکە هێزی دەوڵەت هێزێکی ڕۆحانییە. فاسیۆ (یان مەشخەڵی داس هەڵگرەکان)، کە دروشمی فاشیەکان بوو، ڕەمزی یەکێتی و هێزو دادپەروەری بوو لە چوارچێوەیەی سیستمێکی سۆسیالیستی نەتەوەییدا. مۆسۆلینی لە ڕەتکردنەوەی سۆسیالیزمی مارکسیدا دەیووت: "فاشیزم دژی ئەو شێوازەی سۆسیالیزمە کە بزاوتی مێژوویی لە ململانێی چینەکاندا کورتدەکاتەوەو یەکێتی دەوڵەت پشتگوێ دەخا. دەوڵەتی فاشیست چینەکان لە تاکە هەقیقەتێکدا دەتوێنێتەوە، کە هەقیقەتێکی ئابوری و ئەخلاقییە"[12].

بەڵام لە ڕاستیدا بانگەوازکردن بۆ سۆسیالیزم و دادپەروەریی نەتەوەیی تەنها وەك دروشم و فێڵێکی تەکتیکی مایەوە کە فاشیست و نازیەکان بۆ دژایەتیکردنی سۆسیالیزمی سۆڤێتی بەکاریان هێنا، بەڵام لەسەر زەمینی واقیع دەسەڵات بەدەست نوخبەیەکی ئۆلیگارشیی دیاریکراوەوە مایەوە کە پەیوەندیی باشیان لەگەڵ خاوەن موڵك و کارگەکاندا هەبوو. سەرمایەدارانی ئیتالیاو ئەڵمانیا لە سۆسیالیزمی نەتەوەیی نەدەترسان و بگرە زۆربەیان بەپارە پشتگیریان لە مۆسۆلینی و هیتلەر کرد. فاشیست و نازیەکان لە ڕێگەی حەماسەتی نەتەوەییەوە توانیان سەرنجی تەواوی چینەکان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن، بەڵام سەرەنجام هێندەی کاریان بۆ سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی خۆیان و گەورەکردنی ماشێنی جەنگ و پڕوپاگەندەی ئایدیۆلۆجی کرد، کاریان بۆ چەسپاندنی سۆسیالیزم و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی نەکرد[13].

### جەماوەری فاشیست:

لێکۆڵینەوە سۆسیۆلۆجیەکان دەربارەی جەماوەرو شوێنکەوتوانی فاشیزم و نازیزم گەیشتوونەتە چەند دەرەنجامێك. هەندێك لەو لێکۆڵینەوانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە جگە لە سەرمایەداران و پیشەوەرو بازرگانەکان، جەماوەرێکی زۆری سەر بەچینی ناوەڕاست پشتیوانییان لەو دوو ڕژێمە کردووە، چونکە ترسی ئەوەیان هەبوو دوورکەوتنەوەیان لە دەسەڵات ببێتەهۆی هەژاربوونیان. هەمیشە ڕژێمە دیکتاتۆرو دەسەڵاتگەرەکان پەنا دەبەن بۆ ئەو کەسانەی کە ئاستی بژێوییان لەخوار ناوەندەوەیە تا بیانکەنە کادری کارای ناوەڕاست و ڕابەرایەتی لەشکری ڕێکخستن و چینە پلیشاوەکانیان پێ بکەن، ئیتر چارەنوسی ئابوری ئەوە کادرانە دەبەسترێتەوە بە چارەنوسی دەسەڵاتەوەو دەبنە زامنی هێشتنەوەی حوکمی دەسەڵاتداران. پاولو مۆنلی جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکاتەوەو پێیوایە "فاشیزم ئەو شۆڕشە بوو کە چینی

ناوەڕاست سەری خست"، چونکە تاکەکانی ئەو چینە لەڕووی پەیکەری ڕێکخستنەوە دەبنە کادری ناوەڕاست، لە ڕووی پروپاگەندەشەوە دەبنە بانگەشەچیی ئایدیۆلۆجی.

هەرچەندە فاشیزم نەیتوانی دادپەروەری ئابوری‌و کۆمەڵایەتی بێنێتەدی‌و باری گوزەرانی چینە هەژارەکان باش بکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانی پشتیوانی بەشێکی زۆریان بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. جان تۆشار لە کتێبەکەیدا "مێژوی فیکری سیاسی" ئامارێکی سۆسیۆلۆجی دەربارەی جەماوەری فاشیزم وەردەگرێ. بەگوێرەی ئەو ئامارە، ساڵی ١٩٢١، لە کۆی ١٥٠,٠٠٠ ئەندامی حزبی فاشیست، جەماوەری سەر بە چینە جیاوازەکان بەمجۆرە دابەشببوون: ١٨,٠٠٠ خاوەن موڵك و زەوی، ١٤,٠٠٠ بازرگان، ٤٠٠٠ خاوەن کارگە، ١٠,٠٠٠ پیشەوەری بچووك، نزیکەی ٨,٠٠٠ فەرمانبەر، ١٤,٠٠٠ بەردەست، ٢٠,٠٠٠ خوێندکار، لەگەڵ ٦٠,٠٠٠ جوتیارو کرێکار(١٤).

## پیرۆزکردنی شەڕو جوانکاریی مەرگ:

فاشیستەکان زۆر زیرەکانە توانیان ئەو نائومێدییە گەورەیەی خەڵکی وڵاتەکانیان بگۆڕن بۆ ئومێدێکی ئەفسونی‌و خەونبینینی یۆتۆپی بە ئایندەیەکی جیاوازەوە. برازیلاك، کە یەکێك بوو لە ئەدیبە دڵسۆزەکان بۆ فاشیزم‌و لەو پێناوەشدا گیانی سپارد، دەیوت: "فاشیزم چامەی شیعریی سەدەی بیستەمە". نیشاندانی فاشیزم وەك چامەیەکی شیعریی تەنها پەرگیرییەکی ئەدەبی نەبوو، بەڵکو بەشێکیش بوو لەو کەش‌و سروتە کۆمەڵایەتییە پڕچالاکی‌و حەماسەتەی کە هەزاران کەسی مەست کردبوو. شیعریەتی فاشیزم لە چوار ئاستی سەرەکیدا دەرکەوت:

١. شیعری جەماوەری‌و ئاهەنگی گروپە گەورەکان: عەقیدەی فاشیزم هەموو ئەندامانی خۆی لە فێستیڤاڵی دەستەجەمعیدا کۆدەکردەوەو پەیوەندییەکی ئەوتۆی لەنێوانیادا دروستدەکرد کە شەوانە تا درەنگ پێکەوە دەمانەوەو شیعری بەکۆمەڵیان دەوت‌و گۆرانییان دەچڕی. برازیلاك پێیوابوو فاشیزم، بەر لەهەر شتێك، هاوڕێیەتیەکی بەکۆمەڵە. بەڵام لە واقیعدا فاشیزم هەموو هاوڕێیەتیەکی سروشتی دەکوشت‌و تەنها بڕوای بە هاوڕێیەتییەك هەبوو کە لەخڕبوونەوەی مێگەل‌و هیستریی مرۆڤەکان دەچوو لەژێر دیسپلین‌و چاودێریی توندا.

٢. شیعری دیسپلین و زەبتورەبت: بەتایبەتی لە لایەن ئەندامانی کەرتە تایبەتەکانی مۆسۆلینییەوە، کە دەچوونە خولی ڕاهێنانی تایبەت‌و سوێندی شەرەفیان دەخوارد کە دەستبەرداری کەسایەتی تایبەت‌و فەردانیەتی خۆیان بن‌و لە ناو کەرتەکاندا بتوێنەوە.

٣. شیعری لاوێتی‌و جەستەو ژیان لە سروشتی والادا: فاشیزم هانی گەنجانی دەدا تا ببنە داینەمۆی گۆڕانی ڕیشەیی‌و ئەوەی نوێی شۆڕش‌و جەنگ، تەماحی دەخستە بەردەم کوڕو کچە تازەپێگەیشتووەکان تا دەستبەرداری کولتوری پیرەکان بن‌و کولتوری تایبەت بە خۆیان، لە پەیوەندییەکی ڕۆمانتیکیدا لەگەڵ سروشتدا، بەرهەم بێنن.

٤. شیعری هەڵوێستی عەمەلی‌و رسکەو جەنگ‌و بەرزڕاگرتنی جوامێری‌و بەهای نێرینەیی: فاشیەکان پێیانوابوو تەنها لە جەنگدا مەعدەنی ڕاستەقینەی مرۆڤ دەردەکەوێ‌و ترسنۆکەکان لە ئازاکان جیادەبنەوە. تەنها لە کاتی جەنگدا هاوڕێیەتی ڕاستەقینەی نێوان جەنگاوەران

بەرجەستەدەبێ. دۆریۆ، کە نوسەرێکی فاشیست بوو، پێیوابوو جەنگ سەرەتای لێکتێکەیشتنی راستەقینەی نێوان مرۆڤەکانە، تەنها پاش جەنگێکی گەورە کۆمەڵگای ئەوروپی پێگەی خۆی وەرئەگرێتەوەو پاشان سیستمێکی فاشیستی گەردوونی لەدایکدەبێ[١٥].

### سەرکردەی فاشیست:

رابەر لە عەقیدەی فاشیزمدا پێگەیەکی کاریزمی و ئەفسانەیی هەیەو لەلایەن جەماوەرەکەیەوە تەقدیسدەکرێ تا ئەندازەی پەرستن. هەموو ئەو سروتە وتاربێژی و درامی و دروشمبازییەی لەدەوری سەرکردەوە دەئاڵێ سیحرێکی ئەوتۆی پێدەبەخشێ، کە شوێنکەوتوانی وادەزانن توانای بان- سروشتی و لەڕادەبەدەری هەیەو دەتوانێ ئەو کارانە ئەنجامبدا کە لەتوانای خەڵکی ئاساییدا نین. مۆسۆلینی لە دەسەڵاتەکەیدا هەموو نەریتە کۆنەکانی پیرۆزکردنی سەرکردەی زیندوو کردەوە، وەك: (تاکڕەوی و دیکتاتۆریەت لە حوکمدا، دروشمی داس هەڵگران، دەریا هی ئێمەیە..). هەرچی هیتلەرە کەلەپوری رۆمانتیکیی ئەڵمانیای زیندوکردەوە بۆ بەخشینی سیمایەکی ئەفسانەیی بە نازیزم، هەموو ئەو وێنە میتۆلۆجییسە دێرینانەی ژیاندەوە کە هاوبەندییەکی نەستەکی لەنێوان سەرکردەو جەماوەردا دروستدەکەن، وەك ئەفسانەکانی رۆزێنبێرگ دەربارەی هاوبەندیی نەژادو خوێن[١٦].

عەشقی جەماوەری فاشیست بۆ سەرکردە دەگاتە رادەیەك، کە شوێنکەوتوانی هەموو ئیرادەیەکی زاتی لەدەستدەدەن و بەتەواوی دەچنە ژێر سیحری سەرکردەوە، تەنانەت هەندێجار دەچنە دۆخی هیستریی بەکۆمەڵەوە، کوێرانە تەسلیمی هەموو فەرمانێکی دەبن. ئەلفرێد رۆزنبێرگ، کە وەك تیۆرسازی نازیزم دەژمێردرێ، بۆ پاساودانی ئەم حاڵەتە چواندێکی بایۆلۆجی پێشکەشدەکردو دەیووت پەیوەندیی نێوان سەرکردەو جەماوەر وەك پەیوەندیی نێوان جەستەو ئەقڵ وایە، چونکە ئەرکی سەرەکیی سەرکردە بریتییە لە دابینکردنی هاتوچۆی خوێنی ئیتنی بەجەستەی نەتەوەدا. هەروەها دەیووت: "پەیوەندیی نێوان سەرکردەو میللەت وەك پەیوەندیی نێوان هەست و نەست، ئاگایی و نائاگایی وایە". ئەو دۆخە هیسترییە کارێکی وای کردبوو کەسانێکی زۆر بکەونە پەرستن و عەشقێکی سایکۆپاتی یەکلایەنەوە لەگەڵ سەرکردە فاشیست و نازیەکاندا. یەکێك لە دادوەرە گەورەکانی سەردەمی حومکی نازیست لە ئەڵمانیا، پاش دیدارێکی کورت لەگەڵ هیتلەردا، بەمجۆرە گوزارشت لە دۆخی دەروونیی خۆی دەکا: "خرۆشانێکی پڕ خۆشنودیی گەورە بە گیانمدا هات. تەماشای چاوەکانیم کردو ئەویش تەماشای چاوەکانی کردم. پاشان ئارەزووم کرد خێرا بگەڕێمەوە ماڵەوەو لەگەڵ ئەو هەستە گەورەیەدا بژیم کە لە پەلوپۆی خستبووم". هارمن رۆشەن لە کتێبی "شۆڕشی نیهلیستی"دا، لەسەر زمانی یەکێك لە جەنگاوەرەکانی ئەو دەمەوە، دەڵێ: "ئەڵبەتە سات لەدوای سات کەسایەتی فوهرەر - سەرکردەی حزبی نازیست- زیاتر دەبێتە تەلیسم و نهێنی. تەنها لەو کاتانەدا، کە نەتەوە لە وەرچەرخانی گەورەدا ڕووبەڕووی چارەنوسی خۆی دەبێتەوە، سەرکردە دەردەکەوێ و دەبێتە کەسێکی سەرسوڕهێنەر، کارێکی بان-سروشتی یان وتارێکی ناوازە پێشکەشدەکا. بەڵام لەوە بەدواوە ون دەبێ، وەك چۆن یەزدان غەیب دەبێ!.... رۆژێ دادێ

دەبێ هەموان فوهرەر تەقدیس بکەن لەپێناو تەواوکردنی کارەکەیدا.."[17].

فاشیست و نازییەکان هەمیشە بایەخ بە ئەنگێزە نائەقڵانی و نائاگاییەکانی جەماوەری خۆیان دەدەن. پێیانوایە گەر مرۆڤ زۆر ئاقڵ بێ دەبێتە بوونەوەرێکی ترسنۆك و بێئیرادە. هیتلەر لەبەردەم شوێنکەوتوەکانی خۆیدا دەیووت: "ئەوە ئەقڵ نەبوو ئەڵمانیای لە میحنەت رزگارکرد.... ئەوە ئەقڵ نیە ئێوەی هاندا بێن بۆ لای من، بەڵکو ئەوە ئیمان بوو فەرمانی پێدان... کەواتە مەسەلەکە مەسەلەی: ئیمان و تاعەت و خەباتە". بەهامان شێوە مۆسۆلینی بڕوای بە ئەفسانەو خورافە هەبوو وەك جوغزێکی کۆکەرەوەی ئەندامانی نەتەوە، هەربۆیە ساڵی ١٩٢٢ ووتی: "ئێمە ئەفسانەی خۆمانمان دروستکردووە.. ئەفسانەی ئێمە نەتەوەیە، گەورەیی نەتەوە"[18].

## ئۆرستۆکراتیەتی فاشیزمو دەوڵەت:

فاشیزم دژی پرنسیپەکانی دیموکراسی و یەکسانی و چونیەکییە لە مافی دەنگداندا. مۆسۆلینێ بەئاشکرا دژی یاسای ژمارەو چەندایەتی هاوڵاتیان بوو، پێیوابوو کارێکی ڕەوایە گەر کەمینەیەکی فاشیست دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێ بەسەر زۆرینەدا. بەهەمان شێوە هیتلەر پێیوابوو مەحاڵە پیاوە گەورەکان لەڕێی هەڵبژاردنەوە بێنە سەر حوکم، دەیوت: "مێژووی جیهان بەرهەمی کەمینەکانە"[19]. فاشیست و نازیەکان هەمیشە تەئکیدیان لەسەر بوونی کەمینەیەکی دەستەبژێر (نوخبە) دەکردەوە، کە پێویستە حوکمی زۆرینە بکا، بەڵام لە راستیدا ئەوەیان ڕوون نەدەکردەوە کە میکانیزمی دەستنیشانکردنی ئەو نوخبەیە چۆنەو کێ ئەو مافەی هەیە نوخبەیەك دەستنیشان بکا بۆ رابەرایەتیکردنی زۆرینەی خەڵك، تەفسیری وان بۆ نوخبە تەفسیرێکی نائەقڵانی و تەمومژاوی بوو. مۆسۆلینی بڕوای بە لۆجیکی هێز هەبوو، بڕوای بە ڕەوایەتی حوکمی ئەو کەسانە هەبوو کە دەسەڵاتی خۆیان دەسەپێنن. هەرچی هیتلەرە بڕوای بە بەهێزترین نوخبەی ناو نوخبەی ئیتنی ئارییەکان هەبوو، بڕوای بە ڕەوایەتی حوکمی ئەو نوخبەیە هەبوو کە دەبێتە هەڵگری پەیامی نەتەوەی ئەڵمان: "ئەرکی بەهێزەکان ئەوەیە کۆنترۆڵی لاوازەکان بکەن نەك تێکەڵاویان ببن، ئەرکی لاوازەکانیش ئەوەیە دەسەڵاتی بەهێزەکان پەسەند بکەن، ئەرکی دەوڵەتیش، بەدیاریکراوی، ئەوەیە چینەکان بتوێنێتەوە لە تاکە هەقیقەتێکی ئابوری و ئەخلاقیدا"[20].

فاشیستەکان دەوڵەت تەقدیسدەکەن، چونکە پێیانوایە ئامرازێکی نیشاندانی ئیرادەی هێزە بەدەست بەهێزەکانەوە، هەروەها زەمانەتێکە بۆ پاراستنی کەسە لاوازەکان. لای ئەوان دەوڵەت هەموو شتێکەو تاکەکان، وەك خۆیان، هیچ نین لەبەردەم جەبەروتی دەوڵەتدا، دەیانووت /: هەموو شتێك لەپێناو دەوڵەتدایەو هەموو شتێکیش لە ڕێگەی دەوڵەتەوە مەیسەر دەبێ.

دەوڵەت لای ئەوان یەکەیەکە قابلی دابەشبوون نیسە. دەوڵەت دەزگایەکی تۆتالیتاریی گشتگیرە، کە دەبێ خاوەنی یەك دەسەلات بێ و هەموو دەسەڵاتە جیاوازەکانی تێدا بتوێتەوە، واتە وەك مۆنتسکیۆ تۆکڤێل، بڕوایان بە دابەشکردنی دەسەڵاتەکانی دەوڵەت نەبوو. پێیانوابوو دەوڵەت تەنها حوکمی ئەو کەسانە پەسەند دەکا کە بەڕێوەی دەبەن، دژایەتیکردنی دەسەڵاتدارانیش واتە دژایەتیکردنی خودی دەوڵەت. لێرەوە فاشیەکان بڕوایان بە ئۆپۆزیسیۆنی نیشتمانی نەبوو، هەموو ئۆپۆزیسیۆنێك خائنە نەك تەنها بەرامبەر دەسەڵاتداران بەڵکو خائنە دەرهەق

بەخودی دەوڵەتیش. مۆسۆلینی دەیوت: "هەموو شتێك لەناو دەوڵەتدایەو هیچ شتێك لەدەرەوەی دەوڵەت بوونی نیە". هەروەها دەیووت: "قەیرانەکان تەنها بە دەوڵەتو تەنها لەناو دەوڵەتدا چارەسەر دەکرێن". بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو پیرۆزکردنەشدا مۆسۆلینی دیدێکی ڕۆشنی نەبوو دەربارەی دەوڵەتو دەسەڵاتی سەندیکایی، کە هەمیشە بەشێوەیەکی تەمومژاوی، جەختی لەسەر دەکردەوە. تیۆرەی وی تێکەڵەیەك بوو لە خۆزگەو ئەفسانەو بوغزو حەزی تێکەڵو پێکەڵ[21].

فاشیست و نازیەکان بڕوایان وابوو لەبەرئەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت گشتگیرە دەبێ ئابوری وڵاتیش بەشێك بێ لەسیاسەتو هەرگیز نابێ سیاسەت ببێتە بەشێك لە سیستێمی ئابووری. ئابووری لای ئەوان شتێکی لاوەکی بوو، چونکە وەك هیتلەر دەیووت: "مێژوو فێری کردووین کە هیچ گەلێك لەرێگەی ئابوورییەوە نەبووە بە گەلێکی مەزن"، دەوڵەت لای ئەو: "خەباتێکی ئیتنی بوو نەك ڕێکخستنێکی ئابوریی"[22].

مۆسۆلینی بڕوای وابوو دەوڵەت حەقیقیەتێکە دەکەوێتە پێش نەتەوەو سەرو نەتەوەوە، چونکە دەوڵەت نەتەوە دروستدەکاو دەرفەتی پێدەبەخشێ تا گەشە بکاو بکرێتەوە. مۆسۆلینی هەمیشە جەختی دەکردەوە کە گەورەیی نەتەوەی ئیتالیا بەندە بە دامەزراندنی دەوڵەتی فاشیستەوە، چونکە فاشیزم تیۆرەی دەوڵەت- نەتەوەیە، نەك تیۆرەی نەتەوە- دەوڵەت. دەیووت: "بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونە باوەی کە وەك بنەمای لیکۆڵینەوەکان لەلایەن دەستورناسانی دەوڵەتی نەتەوەییەوە لە سەدەی نۆزدەدا پەنای بۆ دەبرا، نەتەوە ئەفرێنەری دەوڵەت نیە، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەوڵەت نەتەوە دەخولقێنێو ئیرادە دەبەخشێ

بە گەلی هوشیارو یەکێتیو بوونی، بەکردەوە، تیادا بەرجەستەدەکا". بەڵام ئایدیۆلۆجیای ناسیۆنالیزمی سۆشیالیستی (نازیزم) پەیوەندیی نێوان دەوڵەت و نەتەوە بەجۆرێکی تر دەبینن. دەوڵەت لای نازیەکان تەنها ئامرازێك یان ئامێرێکە بۆ غایەتێك کە میللەتە، واتە: (ڤۆلك $VOnK$). نەتەوەی ئەڵمانی لای نازیزم تەنها ئەڵمانەکانی سەدەی بیستەم نیە، بەڵکو هەقیقەتێکی بایۆلۆجیو مێژوویە، لەیەك کاتدا نەژادی ئەڵمانیاو مێژووی ئەڵمانیاشە، هەربۆیە دەوڵەتی نازیست، بەبڕوای ئەوان، چرکەساتی بەرجەستەبوونی چارەنوسی ئەڵمانیا بوو[23].

### هەقیقەتی زانستیو ڕەوایەتی مۆنۆپۆڵ:

ئالان بۆلۆك پێیوایە هیتلەر داروینیزمی بەجۆرێك تەفسیر دەکرد کە لەگەڵ تیۆرە نەژادپەرستیەکەیدا بگونجێ. هیتلەر جەختی دەکردەوە کە لەنێوان نەژادە مرۆییەکاندا نەژادی بەهێزو خاوەن خوێنی پاك هەیە، کە گەر پارێزگاری لە خوێنی پاکی خۆی بکا بەسەر نەژادەکانی تردا سەردەکەوێ، چونکە بەگوێرەی یاسای پەرەسەندنی داروین مانەوە تەنها بۆ بەهێزەکانە[24]. لە ئەسکی یازدەیەمی کتێبی "تێکۆشانم"دا، کە لەژێر ناونیشانی "گەلو نەژاد"دایە، هیتلەر جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکاتەوە. هەروەها کتێبی "ئەفسانەی سەدەی بیستەم"ی ئەلفرێد ڕۆزنبێرگ، کە وەك مانیفێستی نەژادپەرستیی نازیەکان لەقەڵەم دەدرێ، پێشنیاردەکا سەرلەنوێ مێژووی مرۆڤایەتی بنوسرێتەوە، بەجۆرێك ئەو حەقیقەتە بسەلمێنێ کە هەمور شارستانیەتە گەورەکانو هەموو سیستەمە سیاسییە مەزنەکان بەرهەمی بیرو کۆششی ئاری نەژادەکانە.. لەبەرامبەردا نەژادەکانی تر، بەتایبەتی جولەکەو

سامییەکان، هەمیشە ژەهریان لەناو مرۆڤایەتیدا بڵاوکردۆتەوە، وەك ژەهری دیموکراسیو مارکسیزمو سەرمایەداری، هەروەك چۆن بڕێك بەسەهای ژنانەیان پیرۆزکردووە، وەك خۆشەویستیو زەلیلیو کۆیلایەتی. هەر لەو سیاقەدا نازیەکان گەورەترین بوغزی خۆیان بەرامبەر سامیەکان، بەتایبەتی جولەکە، دەردەبڕی. ئەڵبەتە ئەو بوغزە لەقۆناغێکی تردا بووە واقیع و لە قەتڵوعامی هۆلۆکۆست-دا بەرجەستە بوو. نازییەکان پێیان وابوو مرۆڤ لە سێ نەژادی سەرەکی پێکدێ: "یەکەم: نەژادی ئەفرێنەری کولتور، واتە ئارییەکان. دووەم: نەژادی کولتورپارێز، کە توانای وەرگرتنو خۆگونجاندنی هەیە، بەڵام توانای ئەفراندنی نییە. سێیەم: نەژادی تێکدەری کولتور، واتە جولەکە"[٢٥].

لەپشت ئەو رقە ئەستورەی فاشیستەکانی ئیتالیاو نازیستەکانی ئەڵمانیاوە دژی شارستانیەتو نەتەوەکانی تر، زەمینەیەکی کۆمەڵایەتیو گرێیەکی سایکۆلۆجی گشتی خۆی مەڵاس دابوو، پەیوەست بوو بەشکستی ژێرخانو قەیرانە ئابوریو کۆمەڵایەتییە کەڵەکەبووەکانی ئەڵمانیاو ئیتالیای پاش جەنگی جیهانی یەکەم. بەڵام هەرگیز فاشیستەکان ئەو گرێیەیان نەدەسەلماند، بگرە پێیانوابوو نەتەوە مەزنەکان بەرهەمی رۆحی جەنگاوەرییە نەك بەرژەوەندیی ئابوری. مۆسۆلینی لەمبارەیەوە دەیووت: "فاشیزم، ئێستاو هەمیشە، بڕوای بە پیرۆزیو قارەمانێتی هەیە، بڕوای بەو کارو کردەوانەیە کە بەرژەوەندیی مادییان لەپشتەوە نییە. بڕوای بە تیۆرەی ئابوریانەی مێژوو نییە. چونکە ئەو تیۆرەیە مرۆڤەکان وەك کۆمەڵێك بووکەڵە وێنادەکا، کە شەپۆلەکانی شانسو رێکەوت دەیانهێنێو دەیانبات"[٢٦].

باڵادەستی جولەکە لەبواری بازرگانیدا رقی نازیەکانی بەرامبەر سامیەکان ئەستورتر کردبوو. پێیان وابوو دەبێ بەهەر نرخێك بێ ئابوری ئەڵمانیاو تەنانەت ئەورووپاو جیهانیش لەدەستی سامیەکانو میللەتە ناجێرمەنیەکان دەربهێندرێو بدرێتەوە بە خاوەنی راستەقینەی ئابوری جیهان کە دەسەڵاتی پان-جێرمەنی نازیستە. واتە نازیەکان حەزیان بەزیندوکردنەوەی خەونی گلێۆمی دووەم دەکرد، بۆ پتەوکردنی ئابوری ئەڵمانیا، بەڵام لەرێگەی بازرگانیو کێبڕکێی ئابورییەوە نا، بەڵکو لەرێگەی جەنگو زەبروزەنگەوە. گلیۆمی دووەم پێیوابوو، لەرێگەی کرانەوەی بازاڕەکانی ئەڵمانیاو دۆزینەوەی بازاڕی نوێ بۆ کاڵا بازرگانیەکانو پەیوەندیی نێوان سیستەمە ئابورییە نەتەوەییەکانەوە، ئەڵمانیاو میللەتە جێرمەنیەکان دەتوانن پێگەی شیاوی خۆیان لە کیشوەری ئەورووپادا بەدەست بێننەوە. بەڵام پان-جێرمەنیزمی هیتلەر پشتئەستوور بوو بە فراوانخوازیی سەربازی و سیاسی. ساڵی ١٩٣٢ هیتلەر جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەڵمانیا ناتوانێ لەرێگەی ئابورییەوە دەسەڵات بگرێ بەسەر جیهاندا، چونکە ئەوە هێزی سیاسی و میلیتاریی دەوڵەتە کە دۆخی پێشکەوتن دەڕەخسێنێ، نەك پێچەوانەکەی[٢٧].

بەمجۆرە سیستەمی ئابوریی رایشی سێیەم چووە خزمەتی ئابوریی جەنگ و قەبەکردنی ماشێنی سەربازییەوە، کە دواتر جەنگی گەردوونیی دووەمی لێکەوتەوە. واتە هەمان لۆجیکی مۆسۆلینی، بەهەڵەوگێڕاوی، بەسەر خۆیو هیتلەردا جێبەجێ بوو، کە پێیوابوو راکردن بەشوێن بەرژەوەندیی ئابوریدا مرۆڤەکان دەکاتە کۆیلەی هاوکێشەکانو بووکەڵەی دەستی مێژوو. فاشیزمو نازیزم وەك دوو ئایدیۆلۆجیای ناسیۆنالیستی پەرگیری دژە

بەرژەوەندیی ئابوریی دەرکەوتن، بەڵام لە پشت دروشمەکانیانەوە خواستێکی پاوانخوازی ئامادە بوو بۆ داگیرکردنی هەموو ئابوریی جیهان.

## پەراوێزەکان:

(١) هێڵە گشتییەکانی فاشیزمی ئیتالی لەو وتارێکی بێنیتۆ مۆسۆلینیدا کورتدەبێتەوە، کە ساڵی ١٩٣٢ نوسیویەتی، لەژێر ناونیشانی "فاشیزم چییە؟". بڕوانە:

*Benito Mussolini, What is Fascism, 1932. Italian Encyclopedia on the definition of Fascism. http//www.fprdham.edu/halsall/mod/mussolini-fascism.html*

(٢) بڕوانە: جان توشار، تاریخ الفکر السیاسي، ت: علي مقلد. ط١، بیروت: الدار العالمیة، ١٩٨١، ص٦١٨. دەربارەی فاشیزمی فرانکۆو سالازار، بەبەراورد لە گەڵ فاشیزمی مۆسۆلینیدا، "پۆل لویس" ئەم کتێبەی نوسیوە:

*Paul H. Lewis, Latin Fascist Elites: The Mossolini, franco, and Salazar Regimes. Westport: Praeger, 2002. Chpters: 1, 5-11.*

(٣) جان تۆشار، سەرچاوەی پێشوو، ل٦١٨. لە ئەدەبیاتی زانستی سیاسیدا سێ نوسەری بەناوبانگ دەربارەی تۆتالیتاریزم نوسیویانە: کارل فریدریك، هانا ئارانێت و ریمۆن ئارۆن. بڕوانە: فیلیب برو، علم الاجتماع السیاسي، ت: د. محمد عرب صاصیلا. ط٢، بیروت: المؤسسة الجامعیة للدراسات والنشر، ٢٠٠٦، ص١٩١.

(٤) دەربارەی سیما و خەسڵەتەکانی تۆتالیتاریزم، بڕوانە راناێکی پێشوومان دەربارەی کتێبی "بنەماکانی تۆتالیتاریزم"ی هانا ئارێنت، بەناونیشانی "تۆتالیتاریزم: ئایدیۆلۆجیایەکی لێکدراو و رژێمێکی فرمەندکار"، گۆڤاری سەردەم، ٢٠٠٧، ژمارە ٥١، ل٢٧-٤٣. هەروەها بڕوانە: فیلیب برو، علم الاجتماع السیاسي، ص١٩٧-١٩٨.

(٥) بڕوانە: جورج سباین، تطور الفکر السیاسي، الکتاب الخامس، ت: راشد البراوي. القاهرة: دار المعارف، ١٩٧١، ص١١٨٤-١١٨٠. دەربارەی پەیوەندیی نێوان حزب و دەزگا داپڵۆسێنەرە ئاشکراکان و دەزگاکانی پۆلیسی نهێنی بڕوانە: فیلیب برۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٦.

(٦) جان تۆشار، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٢٠.

(٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦١٩.

(٨) ساڵی ١٩٢٤ مۆسۆلینی تێزێکی زانکۆیی لەسەر کتێبە بەناوبانگەکەی ماکیاڤیللی "میر" نوسی، کە تیایدا بەرگری لە هەموو ئەو بیرۆکانە دەکا کە بوونەتە هەوێنی ئایدیۆلۆجیای فاشیزم. بڕوانە: بنیتو موسولیني، تعلیق عام ١٩٢٤ علی کتاب الأمیر، في مقدمة کتاب: نیکولو میکیافیللي، الأمیر، ت: فاروق سعد. ط٩، بیروت- بغداد: دار الآفاق الجدیدة- مکتبة التحریر، ١٩٨٨، ص٥-١١.

(٩) دەربارەی تیۆرەی "دەوڵەتی بازرگانی داخراو" لای فیختە، بڕوانە: دیدیە جولیا، فیختە، ت: حسیب نمر. بیروت: المؤسسة العربیة للدراسات والنشر، ص٩٩-١٠١.

(١٠) دەربارەی پیرۆزکردنی جەنگ و ئیرادەی هێز لای فریدریك نیچە بڕوانە: فریدیرك نیتشە، هکذا تکلم زرادشت، ت: فلیکس فارس، بیروت: دار القلم، طبعة بغداد: مکتبة النهضة، ١٩٨٦، ص٧١-٧٣.

(١١) دەربارەی کاریگەریی لیست و شپنگلەر لەسەر فاشیزمی ئەورووپی بڕوانە: جان تۆشار، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٢٠.

(١٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٢٠-٦٢١.

(١٣) جۆرج سباین پێیوایە هەر یەك لە هیتلەر و مۆسۆلۆلینی توانیان، لە یەك کاتدا، گەمە لەسەر هەردوو ژێی نەتەوەیی و ناسیۆنالیستی بکەن، تا شەرعیەتێکی گشتگیر بە خۆیان ببەخشن کە گوایا دەتوانن نوێنەرایەتی سەراپای نەتەوە بکەن، بەهەموو چینەکانیەوە، بڕوانە: جورج سباین، تطور الفکر السیاسي، ص١١٤٣-١١٤٤.

(١٤) جـان تۆشـار، هـەمان سەرچـاوەی پێـشوو، ل٦٢١-٦٢٢.

(١٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٢٢.

(١٦) دەربـارەی پیرۆزکردنـی رابـەر لـە عەقیـدەی فاشیـستیدا بڕوانـە: سەرچـاوەی پێـشوو، ل٦٢٢. هـەروەها: فیلیـپ بـرو، سەرچـاوەی پێـشوو، ل١٩٥. هـەروەها: مـوریس دیفرجیـە، الأحـزاب الـسیاسیة، ت: علـی مقلـد وعبدالحسن سـعد، ط٣، بـیروت: دار النهـار للنشر، ١٩٨٠، ص٢٧.

(١٧) جـان تۆشـار، سەرچـاوەی ئامـاژە پێـدراو، ل٦٢٣.

(١٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٢٣.

(١٩) هیتلـەر، کتێبـی "خـەباتم"، لـە: جـۆرج سبایتەوە، سەرچاوەی ئاماژە پێدراو، ل١١٦٦.

(٢٠) تۆشار، سەرچاوەی ئاماژە پێدراو، ٦٢٤.

(٢١) هـ. س. پ، ل٦٢٤. هەروەها: موریس دیفریجە، سەرچاوەی ئاماژەپێدراو، ل٢٧٠.

(٢٢) تۆشار، هـ. س. پ، ل٦٢٥

(٢٣) هـ. س. پ، ل٦٢٥.

(٢٤) ئانتۆنی گیدنز ئاماژەدەکا بۆ داروینیزم، وەك دیدێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی (*Social Darwinism*)، کە ژمارەیەك لە راسیستەکان پەنایان بۆ بردووە بۆ سەپاندنی دیدی نەژادپەرستی لە بەرژەوەندیی هەندێ میللەت، کە گوایا بەهێزترو گەشەکردووترن لە رووی هوشیاری زەینی و جەستەیی و رەنگی پێستەوە، دژی میللەتانێکی تر کە گوایا لاوازترن و دەبێ، بەگوێرەی یاسای پەرەسەندنی سروشتی، لەناو بچن یان رادەستی بەهێزەکان بین. بڕوانە: انتونی گیدنز، جامعەشناسی. ت: منوچهری صبوری. چ١، تهران: نشرنی، ١٣٧٣، ص٦٨٣ و٨١٥.

(٢٥) دەربـارەی ئـەو ئەسـکەی کتێبەکـەی هیتلـەر بڕوانە: سبایین، ل١١٦٨. دەربارەی کتێبی "ئەفسانەی سـەدەی بیـستەمی"ی رۆزێنبێـرگ بڕوانـە: هـەمان سەرچاوە، ل١١٦٩-١١٧٣.

(٢٦)

*Benito Mussolini, What is Fascism, 1932. Italian Encyclopedia on the definition of Fascism.*

(٢٧) بڕوانە: جان تۆشار، ل٦٢٦-٦٢٧.

# فاشیزم و نازیزم

د.مەهدی مەحفوز

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

بە پشت بەستن بە فەلسەفەی "هیگڵ" سەبارەت بە دەوڵەتی نەتەوە، "بسمارك" توانی سستمێکی سیاسی بەهێز لە پروسیا دابمەزرێنێت، ئەمەش توانای ئەوەی پێبەخشی تا سوپای فەرەنسا لەسەر خاکی ئەڵەمانیا بکاتە دەرەوەو یەکیەتی نەتەوەیی ئەڵەمان لە ساڵی ١٨٧٠دا بەدی بێنێت. تێکەڵبوونی ئەڵەمانیا بە شێوەیەکی بەهێز و کاریگەر لە سیاسەتی جیهانیدا و ئەو گەشە ئابوری و کۆمەڵایەتیەی ئەو وڵاتە بەخۆیەوە بینی، لەگەڵ هەوڵدانی بۆ ئەوەی لە کۆلۆنیالیزەکردنی ناوچە جیاجیاکاندا پشکی هەبێت، بووە مایەی ئەوەی لەگەڵ دوو دەوڵەتی کۆلۆنیالستی گەورەی وەك بەریتانیا و فەرەنسا دوچاری کێشە و ناکۆکی بێت.

هەریەك لە فەرەنسا و بەریتانیا، بەهۆی سیاسەتە کۆلۆنیالیستیەکانیانەوە توانیان زۆرترین ناوچە پڕ خێر و بێرەکانی دنیا بۆ خۆیان پاوان بکەن و لە بەرامبەریشدا جگە لە ناوچە هەژار و بێ کەڵکەکان، هیچیان بە ئەڵەمانیا ڕەوا نەبینی، ئەمەش خواستە کۆلۆنیالیستیەکانی ئەڵەمانیای تێر نەدەکرد. بەریتانیا و فەرەنسا لە ڕێی کۆلۆنە زۆرو زەوەندەکانیانەوە توانیان، گەشە و بەرەو پێشچونێکی خێرا بۆ پیشەسازیەکانیان دەستەبەر بکەن، ئەویش لە ڕێی پەیداکردنی کەرەستەی خاوی پێویست بۆ پیشەسازی، یاخود بە دابینکردنی بازاڕی بەرخۆری بۆ ساخکردنەوەی بەرهەم و کاڵاکانیان. بەڵام ئەڵەمانیا کە دەیویست پەرە بە بواری پیشەسازی بدات و بەرفراوانی بکات، لەلایەك ڕووبەڕووی کێشەی دەسکەوتنی کەرەستەی خاو بووەوە و لە لایەکی دیکەشەوە نەیدەتوانی بازاڕ بۆ ساخکردنەوەی کاڵاکانی بدۆزێتەوە. هاوکات زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان کێشەیەکی تر بوو کە بەر تەسکی ڕووبەری خاکی ئەڵەمانیا توانای لە خۆگرتنی نەبوو، هەروەها نەشیاندەتوانی بەدەوڵەتانی دراوسێدا بڵاوببنەوە، یاخود ڕوبکەنە وڵاتە تازە کۆلۆنەکراوەکان ئەویش لەبەر کەمییان.

سەبارەت بە ئیتاڵیاش، ئەوا ئەویش حاڵی لە حاڵی ئەڵمانیا چاکتر نەبوو. ئیتاڵیا سەرەڕای ئەوەی توانی یەکیەتی نەتەوەیی بەڕابەرایەتی "کاڤور" دەستەبەر بکات، بەڵام نەیتوانی جگە لە چەند ناوچەیەکی پەراوێز و چەند ڕووبەرێکی بچوک، هیچ شوێنێکی دی کۆلۆنیالیزە بکات. لە هەلومەرجی ئەو کێبڕکێ کۆلۆنیالستیە لە پێناو پاوانخوازی ئابووری و پیشەسازی زیاتردا، دۆخێکی پڕ گرژی و نائارامی لە ئەورووپادا دروست بوو کە بووە مایەی بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی، جەنگێك کە ماوەی زیاد لە چوار ساڵی خایاند. دەکرێت بڵێین لە میانەی ئەو جەنگە جیهانیەدا، ئەورووپا بەسەر دوو بەرەی دژبەیەکدا دابەش بوو، لەلایەك هاوپەیمانەکان کە بریتی بوون لە (بەریتانیا و فەرەنسا و ڕوسیا و ئیتاڵیا)، لەگەڵ وڵاتانی میحوەر کە پێکهاتبوو لە (ئەڵەمانیا و تورکیا) لەلایەکی ترەوە.

ئەگەرچی ئەو جەنگە بە تێکشکانێکی قورسی ئەڵمانیا و لایەنگرانی کۆتایی هات، بەڵام کاریگەری سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی خۆی هەبوو، کاریگەریەك بووە مایەی دروستبوونی بزاوتگەلێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی وەها کە پشت ئەستوور بوون بە فەلسەفەی ڕەگەزپەرستی سەربازی و پاوانخوازی، لە گرنگترین ئەو بزوتنەوانەش کە شایەنی باسن، حیزبی نازیزستەکانە لە ئەڵمانیا و حیزبی فاشیزمە لە ئیتاڵیە.

مێژووی نازیزم لە ئەڵەمانیا لەگەڵ ئەو پشێوی و نائارامیەدا دەست پێدەکات، کە لەگەڵ هەرەسهێنانی سستمی میلیتاری ئەڵەمانی لە ساڵی ١٩١٨دا دروست بوو، واتە لەگەڵ کۆتایهاتنی جەنگ و هاتنە سەرکاری سۆسیالستەکاندا دەستی پێکرد، سۆسیالستەکان لەو قۆناغەدا دەبوو چارەسەری کێشەگەلێکی زۆریان بکردایە کە جەنگێکی چوار ساڵەی ماڵوێرانکەر بۆی جێهێشتبوون. لە پاڵ ئەم کێشە تاقەت پڕوکێنانەشدا، دەکرێت باس لەو سەرشۆڕی و بریندار بوونەش بکەین کە گەلی ئەڵەمانی لە دوای ئەو شکستە سەربازیەو ئەو کۆت و بەندە سەختانەی پەیماننامانەی ڤرسای سەپاندی بەسەر وڵاتەکەیاندا، هەستیان پێدەکرد. هاوکات داڕمانی بەهای دراوی ئەڵەمانی، بەهۆی ئەو قەرەبووە زۆرانەی دەبوو ئەڵەمانیا بیداتە وڵاتانی سەرکەوتوو لە جەنگدا، بووە مایەی دروستکردنی دۆخێکی ئابووری خراپ لە ئەڵەمانیادا، ئەم دۆخە خراپ و ناهەموارەش لە بار بوو بۆ ئەوەی ئاقارگەلێکی سیاسیی ڕاست ڕەو و چەپڕەو دروست بێت، لە دژی دەسەڵاتی سۆسیالستی فەرمانڕەوا.

کۆماری ئەڵەمانی تازە دروست بوو، دەبوو چارەسەری هەموو ئەو کێشانە بکات و لە پێناو مانەوەشیدا بەگژ تەواوی هێزە ئۆپۆزسیۆنەکاندا بچێتەوە، ئیتر چەپەکان بن کە دەیانویست شۆڕشێك لە وێنەی شۆڕشی بەلشەڤ ڕوسیا بەرپا بکەن، یاخود ڕاستڕەوەکان کە هەوڵی گێڕانەوەی سستمی پادشایەتیان دەدا.

لەم سەروبەندەدا "ئەدۆلف هتلەر" کە سەرگەرمی کۆکردنەوەی لایەنگرانی بوو لە ژێر ناوی پارتی کرێکارانی نیشتمانی سۆسیالستی کە بە حیزبی (نازیزم) ناسرا، بە زەبری هێز هەوڵی کودەتایەکی شکست خواردوی دا لە دژی حکومەت، ئەم هەوڵە سەرنەکەوتووەی بووە مایەی ئەوەی لە ساڵی ١٩٢٣ دا زیندانی بکرێت. لەو ماوەیەی لە زینداندا بوو، "هتلەر" هێڵە گشتیەکانی کتێبە بەناوبانگەکەی (کفاحی) داڕشت کە ئایدیا سەرەکیەکانی فەلسەفەی نازیزم لە خۆ دەگرێت. ساڵی ١٩٢٤

و دوای دەرچوونی لە زیندان، "هتلەر" لەسەر کاری حیزبایەتی خۆی بەردەوام بوو، تا تەنگەژە ئابووریە بەناوبانگەکەی ساڵی ١٩٢٩ سەریهەڵدا، ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر یارمەتی دا بۆ ئەوەی پێگەیەکی گرنگ لە ژیانی سیاسی ئەڵمانیدا بۆ خۆی بەرێت. لە ساڵی ١٩٣٣ گەیشتە دەسەڵات، بەتایبەت دوای ئەوەی پارتەکەی لە هەڵبژاردنە گشتیەکانی ئەڵمانیادا سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا، هەر بۆیە لەلایەن ڕاوێژکاری ڤایمارەوە ڕاسپێردرا بۆئەوەی حکومەت پێکبهێنێت و خۆشی سەرۆکایەتی بکات.

سەبارەت بە فاشیزمیش، ئەوا سەرهەڵدانی لە ئیتاڵیادا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆکارانەی لای خوارەوە:

هۆکاری یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ خەسڵەت و هەلومەرجی تایبەتی میللەتی ئیتاڵیا. هەر چەندە "کافور" یەکیەتی نەتەوەیی بۆ ئیتاڵیا دەستەبەر کرد و سستمێکی پەرلەمانی وەکی سستمی بەریتانی تێدا دامەزراند، بەڵام میللەتی ئیتاڵیا بەهۆی بونی جیاوازی کلتوری گەورە لە نێوان ئەوان و گەلی بەریتانیادا، ئەو شێوازەی لە سستمی سیاسی پێ قبوڵ نەکرا.

دووەمین هۆکار دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئیتاڵیا لە بەرامبەر ئەو قوربانیانەی لە جەنگدا پێشکەشیکرد، وەك پێویست پاداشت نەکراو قەرەبووی زیانەکانی نەکرایەوە. واتە لە دەستکەوتەکانی جەنگ، تەنها هەندێ ناوچەی پەراوێز و چەپەکی بە نسیب بوو، ئەو ناوچانەش ئەوانە بوو کە هاوپەیمانەکانی لە وڵاتانی زلهێز لە کیشوەری ئەفریقیا دەست بەرداریان بوو بوون. سەرەڕای ئەوانەش، هاوکات لەگەڵ ئەو ئاشتیەی لەگەڵ تەواوبونی جەنگدا ئیتاڵیای گرتەوە، جەنگ کاریگەری خراپی لەسەر کۆمەڵگەی ئیتاڵی بەجێهێشت، لە هەموو ئاستەکانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا.

بەرزبوونەوەی نرخی خۆراك و باج و کەمی گاز و بەنزین، هۆکار گەلێك بوون پاڵیان بە میللەتی ئیتالیاوە نا تا بپرسن کە لە بەرامبەر بەشداریکردنیان لە جەنگدا چییان دەسگیر بووە. هەموو ئەمانە هەستی لاوازی و بێ ئیرادەییان لە ناخی گەلی ئیتاڵیادا وروژاند و وایان لێهات بە حەسرەتەوە لە ڕابوردوی بەهێزی ڕۆمای خاوەن ئیمپراتۆریەت بڕوانن، کارێك کە بووە مایەی بزواندن و جۆشدانی هەستی نەتەوایەتی بۆ گەڕانەوەی ئەو شکۆ و دەسەڵاتەی ڕابردوو بۆ ئیتاڵیا. ئەمەش وایکرد خەڵك لە سستمی حوکمڕانی ئیتالیا پڕ بن و بە چاوی ڕکەوە سەیری بکەن. لێرەوە پشێوی و نا ئارامی دەست پێدەکات و قەیرانی حکومی و تیرۆری سیاسی پەرە دەسێنێت. حوکمڕانی دەستوریش تەنها بەڕواڵەت دەمێنێت.

لەو قۆناغە ناسك و چارەنوسسازەو لەو کەش و هەوا ئاڵۆزەدا، لەسەر گۆڕەپانی سیاسی وڵاتی ئیتاڵیا، پارتی فاشی بەڕابەرایەتی "بنیتۆ مۆسۆلینی" هاتە ئارا. لەگەڵ هاتنە ئاراشیدا ژمارەیەکی زۆرر لەوانەی لە بارودۆخەکە ناڕازیبوون، پەیوەندییان پێوەکرد. "مۆسۆلینی" شەڕێکی بێئامانی لە دژی بزاوتی کۆمۆنستی لە وڵاتەکەیدا دەست پێکرد، کە بووە مایەی خراپتربونی بارودۆخەکەو وڵات دوچاری پشێویەکی قوڵ بوو، تا حکومەت ناچار بوو لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢دا دەست لە کار بکێشێتەوە، دوای ئەوە داوا لە "مۆسۆلینی" کرا حکومەتی تازە پێکبهێنێت.

سەرەتا "مۆسۆلینی" حوکمی پەرلەمانی هێشتەوە، بەڵام هەر ئەوەندەی لە ساڵی دواتردا بواری بۆ ڕەخسا، ئیتر حەقیقەتی پرانسیپە

سیاسیەکانی خۆی ئاشکرا کرد و سانسۆرێکی توندی لەسەر بواری ڕۆژنامەنوسی داناو نەیارە سیاسییەکانی لە کونجی زیندانەکاندا توند کرد و فەرمانی تیرۆرکردنی ژمارەیەکیشیانی دا. هاوکات بۆ ئەوەی بتوانێت بە خواست و ویستی خۆی حوکم بکات، یاسایەکی هەڵبژاردنی نوێی دەرکرد کە ڕێگەی پاوانخوازی زیاتر و دیکتاتۆرییەتی ڕەهای لە ئیتاڵیادا پێ دەدا.

## "مۆسۆلینی" و فاشیزم

### یەکەم/ ژیانی "مۆسۆلینی":

"بنیتۆ مۆسۆلینی" ساڵی ١٨٨٣ لە شاری (برادیدا بیۆ) لە هەرێمی کۆمۆ لە ئیتاڵیا لە دایک بووە. باوکی ئاسنگەر بووە و دایکی مامۆستا. کاتێك دەگاتە تەمەنی هەژدە ساڵان دەبێتە مامۆستا، بەڵام هەر زوو لەو کارە تاقەتی دەچێت و وازی لێدێنێت. دوای ئەوە لە نێوان سویسراو فەرەنساو نەمساداديت و دەچێت. بەهۆی تێکەڵبوونی بە ئانارشیست و سۆسیالیستەکان، دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتانە یان زیندانیان دەکرد یاخود لە وڵاتەکانیان دەریاندەکرد و ڕێگەی مانەوەیان نەدەدا. لە بیست و یەك ساڵیدا دەگەڕێتەوە ئیتاڵیا بۆ بەجێ گەیاندنی خزمەتی سەربازی لە ڕیزی سوپای وڵاتەکەیدا، پاشان وەك نوسەرێك لە یەکێك لە ڕۆژنامە سۆسیالستیەکاندا کار دەکات. دوای کۆتایهاتنی جەنگی نێوان ڕوسیا و ئەڵمانیا و لایەنگیریکردنی ڕوسەکان لەلایەن پارتی سۆسیالستی ئەڵمانیەوە، "مۆسۆلینی" دەستبەرداری بیروباوەڕی سۆسیالستیانەی بوو، بوو بە ناسیۆنالستێکی دەمارگیر و داوای لە وڵاتەکەی کرد لەگەڵ نەمسادا بچێتە جەنگەوە، بۆ ئەوەی خواستە ناسیۆنالستەکانی وڵاتەکەی بێتە دی. پەیوەندی بە سوپاوە کرد و لە چەند شەڕێکدا بەشداربوو، لە یەکێك لەو شەڕانەدا برینددار دەبێت. دوای کۆتایهاتنی جەنگی جیهانی یەکەم، لە ساڵی ١٩١٩ دەست بە دامەزراندنی پارتی فاشی دەکات، داوا دەکات وڵاتەکەی دەسکەوتی جەنگی تر بە دەست بێنێت، سەرباری ئەو دەسکەوتانەی بە پێی ڕێکەوتننامەی ئاشتی لە ڤێرسای دەستی کەوتبوو.

"مۆسۆلینی" دەیویست حیزبەکەی بکاتە بەهێزترین و تاکە حیزب لە ئیتاڵیادا. حیزبێك کە دیسپلینێکی زۆر وردی هەبێت و وەك ئیسپارتەییەکان ژیانێکی زبر و زەحمەت بژی و لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بێت، بۆ ئەوەی هەر ڕۆژێك بێت دەسەڵات بگرێتە دەست. "مۆسۆلینی" بە فیعلی توانی ئامانجەکانی بەدی بێنێت. بەهۆی سەرکەوتنی لایەنگرانی بەسەر کۆمۆنیستەکاندا لەلایەك و لە دەستدانی کۆنترۆڵکردنی وڵات لەلایەن حکومەتە لیبرالیەکەی ئیتاڵیاوە لەلایەکی ترەوە. "مۆسۆلینی" توانی چینی ناوەڕاست و مەلاك و توێژی پیشەسازان بەلای حیزبەکەیدا ڕابکێشێت. تا ناوەڕاستی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ حیزبی فاشی لە گەورە بوون و بەرفراوانیدا بوو، لەوەبەدواوە "مۆسۆلینی" لەگەڵ ئەندام و لایەنگرانی پارتەکەیدا ڕویان لە ڕۆما کرد و دەسەڵاتی گرتە دەست و پادشاش هەندێ دەسەڵاتی شکڵی بۆ مایەوە.

### بنەماکانی تیۆری فاشیزم:

سەرەتا کە "مۆسۆلینی" حیزبی فاشی دروستکرد، هیچ جۆرە تیۆرییەکی سیاسی گشتگیری نەبوو، ئەوەی هەیبوو ئەو بیرو بۆچوونانە بوو کە لە نوسینی ژمارەیەك لەو بیریارانەی وەرگرتبوو کە لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی "هیگڵ"دا بوون، دەربارەی دەوڵەتی

نیشتمانی نەتەوەیی و دەربارەی یەکیەتیی ئەو دەوڵەتە نیشتمانیە وەك بوونەوەرێکی زیندوو. ساڵی ١٩٢٩ "مۆسۆلینی" بڕیاری دا تیۆریایەکی سیاسی گشتگیر بۆ پارتەکەی دابڕێژێت، بۆ ئەم مەبەستەش "جیۆڤانی جەنتیلی" یەکێك لە ئەندامانی قوتابخانەی هێگلیزمی ئیتاڵی ڕاسپارد، بۆ ئەوەی بە ئەو ئەرکە هەستێت[1]. "جەنتیلی" تیۆریای فاشیزمی لەسەر تیۆریای دەوڵەتی هیگڵی دارشت کە پێیوایە دەوڵەت بونەوەرێکی زیندووەو ژیان و یەکیەتی تایبەتی خۆی هەیە، هاوکات دەوڵەت بەپێی ئەو تیۆریا هیگڵیە بوون و ئامانجی تایبەتی خۆی هەیە، جیاواز لەو ژیان و ئامانجە تایبەتیانەی تاکە کەس هەیەتی. لێرەوە فاشیزم ئەو تیۆریایەی دەوڵەتی ڕەتکردەوە کە پێیوایە دەوڵەت لەسەر ئایدیای گرد کردنەوەی نێوان تاکە کەسەکان دادەمەزرێت.

بەڵکو پێیوایە دەوڵەت بریتیە لە بەرهەمی بەرەو پێشچونێکی هەمیشەیی و بەردەوام، لەبەرئەوە دەبێت پاراستن و برەودان بە توانستەکانی یەکەمین ئامانج بێت. بۆیە پێویستە تاکەکەس بەرژەوەندی دەوڵەت بخاتە پێش بەرژەوەندی خۆیەوە.

ئەرکی دەوڵەتە کاربکات بۆ خزمەتکردن بە بەرژەوەندی تاکەکان، بەڵام ئەگەر هاتوو بەرژەوەندی تاکەکەس لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتدا یەك نەهاتەوە، ئەوا دەبێت تاکەکەس لە پێناو زامنکردنی بەرژەوەندییە باڵاکانی دەوڵەتدا، دەستبەرداری بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆی بێت. ئەگەر واش نەکات، ئەوا دەبێت بەزەبری هێز ناچار بکرێت، چونکە قوربانیدانی تاکەکەس بۆ دەوڵەت یەکێکە لە ئەرکە سەرەکییەکانی، ئەم ئەرکەش لای فاشیزم بە بەرزترین بەهای ئەخلاقی ئەژمار دەکرێت.

دەکرێت ئایدیای فاشیزم دەربارەی دەوڵەت بەمجۆرە کورت بکەینەوە. هەموو شتێك بۆ دەوڵەت، تەنها دەوڵەت هەیە و بەس، هیچ شتێك لە دەرەوەی قەوارەی دەوڵەت بوونی نییە. هەوڵی بەردەوامی فاشیزم بۆ ئەوە بوو دەوڵەتێکی بەهێز و سەربەخۆ بونیاد بنێت، دەوڵەتێك کە لەسەر ڕەگەزپەرستی و ماق پاوانخوازی دروست بووبێت، ئەو ئامرازانەشی دەیانگەیاندە ئەو ئامانجە، ئەمانەبوون:

**یەکەم: پشت بەستن بە پرانسیپی هێز**

بەبۆچونی فاشیزم، ڕۆحی میلیتاریزم لە ڕۆحی مەدەنیەت بەرز و باڵاترەو سەرکەوتوو لە دۆڕاو و تێکشکاو پەسەندترە. هەر بۆیە ئەوانەی شایەنی ژیان و مانەوەن، ڕۆڵە بە جەرگەکانی نەتەوەن، نەك ترسنۆك و لاوازەکان. هاوکات ئەندامانی حیزب بە کەڵك تر و شایستە ترن لەوانەی سەر بەحیزب نین. لێرەوە، فاشیزم پرانسیپی چونیەکی و جیاوازینەکردن ڕەتدەکاتەوەو لەگەڵیشیدا چەمك گەلێکی وەك دیموکراسی و دەسەڵاتی میللی ئافەرۆز دەکات. چونکە بە بۆچونی ئەوان دەسەڵاتی میللی وەهم و درۆیەو، دەسەڵاتی هەمیشەیی هەر بۆ دەوڵەتە. هاوکات پێویستە بەرپرسیارێتی حوکمڕانی تەنها لە دەستی دەستەبژێرێکی تایبەت و دیاریکراودا بێت. بەمجۆرە فاشیزم ئایدیای دیموکراسی و ماق تاکەکەسی لە دەست نیشانکردنی فۆرمی حوکمڕانیدا ڕەتدەکردەوە.

**دووەم: پشت بەستن بە سۆز و پڕو پاگەندە لە ئاڕاستەکردن و مۆبیلیزەکردنی جەماوەردا.**

فاشیزم باوەڕی بە ڕۆڵی عەقڵ نەبوو لە ڕێنمایکردنی خەڵکدا، لەبەرئەوە دەیویست لە ڕێی ئامرازی سۆزداری ناعەقڵانی خەڵك بەلای

خۆیدا ڕابکێشێت و وایان لێبکات باوەڕ بە ڕاست و دروستی ئاقاری فاشیزم بهێنن و شوێن سەرکردە مەزن و نەمرەکەیان بکەون. ئەمە وا دەکات دارو دیواری خوێندنگاکانی ئیتاڵیا پڕ ببێت لە وێنەکانی "مۆسۆلینی"، لەگەڵیشیدا ئەو دەستەواژەیان بە بیری خەڵك دەهێنایەوە کە هەمیشە "مۆسۆلینی" لەسەر هەقە.

فاشیزم هەر تەنها بەوەندەوە نەوەستا کە پاوانی دەسەڵاتی سیاسی بکات، بەڵکو دەیویست پڕوپاگەندە لە پێناو ئاڕاستەکردنی کۆمەڵگەشدا بەکاربهێنێت، ئەویش بە مەبەستی سەپاندنی مۆدێلێکی تایبەتی ژیانکردن و فەلسەفەیەکی تایبەتی بوون کە لە بیروباوەڕی ئایینی نزیك دەبووەوە[٢]. ئەم پرۆسەیەش لە بچوکترین یەکەی کۆمەڵگەوە دەستی پێدەکرد کە خێزان بوو. لە خێزاندا باوك ئەو فەرمانڕەوا ڕەهایەیە کە پێویستە سەرجەم ئەندامانی خێزان گوێڕایەڵی بکەن و لە فەرمانەکانی دەرنەچن.

سێیەم: بەو پێیەی باوەڕی بە یەکسانی و چونیەکی نەبوو،

فاشیزم قەناعەتی بە گرنگی ئینتمای نەژادی دەداو، ئەو مافەی بەڕەوا دەزانی کە بە حوکمی ئینتیمای نەژادی یان نەتەوەیی، هەندێ لە میللەتان حوکمڕانی میللەتانی دیکە بکەن و باڵادەست بن بەسەریانەوە. فاشیزم لە هەوڵی بێوچاندا بوو بۆ ئەوەی شکۆمەندی و سەروەری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بگەڕێنێتەوە بۆ ئیتاڵیا.

بێگومان هەر هێزێك پشت بەو پرانسیپانە ببەستێت، ناتوانێت ڕێز لە یاسایەکی نێو دەوڵەتی بگرێت کە سنور بۆ باڵابوون و پاوانخوازی و دەسەلاتی دابنێت. هەر لەبەرئەوە فاشیزم ئافەرۆزی تەواوی ئەو ڕێکخراوە نێو دەوڵەتی و یاسا نێو دەوڵەتیانەی دەکرد کە بڕوایان بە سەروەری وڵاتان هەبوو، لە بەرامبەریشدا ئەوان پێیان وابوو هێز لەسەروو یاساوەیە.

فاشیزم بڕوای تەواوی بەوە هەبووکە باڵاترین و کاملترین فۆرمی دەوڵەت، ئەوەیە لەسەر ڕەگەزی یەکیەتی جوگرافی و مرۆیی و مێژوویی دروست بووبێت. لێرەوە کاتێك فاشیزم ئایدیای نێودەوڵەتی ڕەتدەکردەوە، لەبەرئەوەبوو کە بڕوای وا بوو دۆخی جەنگ لە نێوان وڵاتاندا، دۆخێکی سروشتیە لە نێوان مرۆڤدا. لەبەرئەوە پێویستە دەوڵەت خزمەتی خۆی بکات، بەبێ گوێدانە بەرژەوەندی وڵاتانی دیکە. تەنانەت ئەگەر دەوڵەت پێویستی بە کەرەستەی خاو هەبوو بۆ پیشەسازیەکانی یان بازاڕی دەرەکی ویست بۆ ساخکردنەوەی کاڵاکانی، یان خاك و زەوی پێویست بوو بۆ نیشتەجێکردنی هاوڵاتیانی، ئەوا شەڕ ئامرازێکی شەرعیە بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانە. هەروەها فاشیزم پێیوایە شەڕ ئەو دۆخە سروشتیە کە هێزی ئەفراندن و کارەکتەری مەزن لە نەتەوەدا دروست دەکەن، بۆ ئەوەی دەوڵەت بگەیەننە ژیانێکی نمونەیی و یەکڕیزیەکی توندوتۆڵ.

## "ئەدۆلف هتلەر" و نازیزم

### یەکەم/ ژیانی "ئەدۆلف هتلەر"[٣]

"ئەدۆلف هتلەر" ساڵی ١٨٨٩ لە شاری *Braunau* کە شارێکی سنوریە لە نێوان نەمساو ئەڵمانیادا لە دایك بووە. باوکی فەرمانبەری گومرگ بووە. لە تەمەنی سیانزە ساڵیدا باوکی دەمرێت و لە پانزە ساڵیشدا دایکی. لەدەستدانی دایك و باوکی لەو تەمەنەدار پێویستی زۆری بە پارە، ناچاری

دەکەن ڕوبکاتە ڤییەنای پایتەختی نەمسا، لەو سەفەرەشیدا ئەوەی هەیبوو ئەو جلوبەرگەی بەری و خەونی ئەوەی لە بواری نیگارکێشیدا ببێتە هونەرمەندێك. بەڵام کاتێك ئەکادیمیای هونەر قبوڵی ناکەن، بڕیار دەدات ئەندازیاری تەلارسازی بخوێنێت. بەهۆی دەستکورتی و بێ پارەیی، ناچار دەبێت دەستبەرداری خوێندنەکەی بێت و بگەڕێتەوە منشنی پایتەختی هەرێمی باڤاریا و لەوێدا پارتی کرێکارانی نیشتمانی سۆسیالستی ئەڵەمانی دروست بکات، ئەو پارتەی لەماوەیەکی کەمدا لاوانی ئەڵەمانیا بەلای خۆیدا پەلکێش دەکات.

"هتلەر" یەکەمین هەنگاوی بۆ بەهێزکردنی پێگەی حیزبەکەی ئەوە بوو کە لە ساڵی ۱۹۲۰ بەرنامەیەکی بیست و پێنج خاڵی بۆ دانا، هەروەها (الصليب المعكوف)ی کردە دروشمی پارتەکەی. ساڵی ۱۹۲۳ لە ئەنجامی هەوڵی کودەتایەکی شکست خواردودا، دەستگیر دەکرێت و بۆ ماوەی سیانزە مانگ دەخرێتە زیندانەوە، لەو ماوەیەدا کتێبە بەناوبانگەکەی (کفاحی) دەنوسێت کە تیایدا بەدوور و درێژی باسی لە بەرنامەی کاری حیزبەکەی و هێڵە سەرەکیەکانی سیاسەتی حیزب کردووە.

لە ماوەی مانەوەی لە ناو زیندان و سەروەختی دادگایکردنیدا، "هتلەر" تا دەهات ناوبانگی زیاتری پەیدا دەکرد و لەناو توێژی گەنجانی ئەڵەمانیادا هەواداری زۆرتری بۆ دروست دەبوو، چونکە ئەو گەنجانە داخ لە دڵ و ناڕازی بوون، لەو دەرەنجامانەی جەنگی جیهانی یەکەم کە سوکایەتیەکی زۆری تێدا بوو بۆ گەلی ئەڵەمانیا.

دوای دەرچوونی لە زیندان "هتلەر" سەرکەوتوانە لەسەر کاری سیاسی حیزبایەتی خۆی بەردەوام بوو، تا ساڵی ۱۹۳۳. لەو ساڵەدا هەڵبژاردنی گشتی ئەنجامدراو نازیەکان زۆرینەی کورسیەکانیان مسۆگەر کرد، لە پای ئەمەدا "هتلەر" بوو بە سەرۆك وەزیران و تا کۆتایی دووەم جەنگی جیهانیش لەو پۆستەیدا مایەوە، جەنگێك کە ئەڵەمانیای دوچاری شکستێکی قورسکرد و وای لە "هتلەر" کرد لە هەشتی ئایاری ۱۹٤٥دا خۆی بکوژێت.

دووەم/ بنەما فکریەکانی نازیزم:

بنەما فکریەکانی نازیزم دەکرێت لەو تەنها کتێبەدا بدۆزرێتەوە کە "هتلەر" نوسیویەتی بە ناوی (کفاحی)یەوە. گرنگترین ئەو بنەمایانەش بریتیە ■ هەڵوێستی نازیزم لە ڕەگەزپەرستی و ئەرکی دەوڵەت و ڕۆڵی پڕو پاگەندەو پەروەردە و سیاسەتی دەرەوەی وڵات.

أ-ڕەگەزپەرستی:

لە نەسکی یازدەهەمینی کتێبی (کفاحی)دا، "هتلەر" باس لەوە دەکات کە ڕەگەزی ئاری باڵاترین ڕەگەزە و ئەوان بنەمای پێشکەوتن و شارستانیەتی مرۆڤایەتین. هێز و تایبەتمەندی ڕەگەزی ئاری، لەوەدایە کە تەواوی تواناکانی خۆی دەخاتە خزمەتی گروپ[٤]. "هتلەر" پێیوابوو هۆکاری شکستی ئەڵەمانیا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە گەلی ئەڵەمانیا، گرنگی مەسەلەی ئینتیمای نەژادی و ڕۆڵی ئەو مەسەلەیەی لە بەرەو پێشبردنی مرۆڤایەتیدا، بەهێند نەگرتبوو.

بە بۆچوونی ئەو مرۆڤایەتی تەنها بەهۆی هەوڵ و چالاکی تاکە ڕەگەزێکەوە بەرەو پێش چووە کە ئەویش ڕەگەزی ئاریاییە. ڕەگەزی ئاری شارستانیەتی دروست کرد و هەر ئەویش ئەو شارستانیەتەی گواستەوە بۆ ئەمریکا و ئامرازی هونەریشی بەخشی بە خۆرهەڵاتی دوور.

لەبەرئەوە ڕەگەزی ئاری دەتوانێت هەڵگری شارستانیەت بێت و ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرێت. ئەوە تەنها ئارياييەكانن كە هەست بە ئەرك و لێپرسراوێتی دەكەن و ئامادەن لە پێناو بەرژەوەندی گشتيدا، قوربانی بە بەرژەوەندیيە تايبەتييەكانی خۆيان بدەن. هەر بە هۆی ئەم گيانی بەخشندەييەوە، ئارياييەكان توانيان دەسكەوتی گەورە بە دەست بێنن. بەڵام سەرەوەختێك ئارياييەكان نەيانتوانی خوێن پاكی خۆيان بپارێزن و ڕازی بوون بەوەی لەگەڵ ڕەگەزە ئاست نزمەكانی ديكەدا تێكەڵ بن، ئيتر خەسڵەت و تايبەتمەندی ژياری خۆيان لە دەست دا. بەم پێيە نەتەوەی ئەڵەمانيا بۆ ئەوەی بەهێز بێت، پێويستە بزانێت چۆن چۆنی ڕەگەزی خۆی بە پاكێتی دەهێڵێتەوە كە مەرجی سەرەكيە بۆ يەكانگيری و يەككرتويی نەتەوەيی. كەواتە بە بڕوای "هتلەر" ڕەگەز هەموو شتێكە و هەموو گرنگيەكی تاكەكەس لە ناو ئەودا دەتوێتەوە، بەم پێيە "هتلەر" هەموو بەهايەكی تايبەتی كارەكتەری مرۆڤ ئافەرۆز دەكات و گرنگی پێنادات.

لە كاتێكدا "هتلەر" باسی لە باڵادەستی ڕەگەزی ئاری دەكرد و ستايشی ئاری نەژادەكانی دەكرد، هاوكات بە چاوێكی سوك و ڕقێكی زۆرەوە سەيری جولەكەی دەكرد و پێيوابوو يەكەم شتێك كە پێويستە بكرێت بۆ فەراهەم كردنی يەك ڕيزی نەتەوەيی، ئەوەيە كە ڕەگەزی جولەكە پاكتاو بكرێت، لەبەرئەوەی جولەكە لە ڕەگەزی ئاری نين، هاوكات خاوەنی نمونەيەكی باڵا نين و هيچ ڕۆحێكی قوربانيدانيان تێدا نيە لە پێناو گروپدا. بگرە بە پێچەوانەی ئەوەوە بەردەوام ئامادەی ئەوەن هەرچی ئامرازێكی وێرانكەرە بەكار بهێنن، لە پێناو گەيشتن بە ئامانجەكانيان. لەبەرئەوە "هتلەر" دوپاتی دەكاتەوە كە شكستی ئەڵەمانيا لە جەنگی جيهانی يەكەمدا، هۆكارەكەی جولەكەبوو، بۆيە دەبێت ڕيشە كێش بكرێن.

ب-دەوڵەت و ئەركەكانی[5]:

بە بۆچونی نازيزم دەوڵەت لە خۆيدا ئامانج نييە، بەڵكو ئامرازێكە بۆ بەرزڕاگرتنی شكۆی نەتەوە. پێويستە لەسەر دەوڵەت كە ئينتيمای ڕەگەزی ميللەت بە پاكی ڕابگرێت و كار بۆ ئەوە بكات كە سەرزەمينی پێويست دەستەبەر بكات و هەوڵبدات بۆ ئەوەی حوكمی نەژادی ئاری بەر قەرار بێت. بەم پێيە "هتلەر" پێيوابوو دەوڵەت دوو ئەركی هەيە، ئەركێك لەسەر ئاستی ناوخۆيی و ئەوی ديكەشيان لەسەر ئاستی دەرەكی.

ئەركی دەوڵەت لەسەر ئاستی ناوخۆ:

لەم ئاستەدا دەبێت دەوڵەت ئامراز و دەزگايەكی بەڕێوەبردن بێت كە سەرۆك لە ڕێی تاكە حيزبێكەوە كۆنترۆڵی دەكات، ئەمەش بۆ ئەوەی بواری گەلی ئەڵەمانی بدات كە لە ڕووی ڕەگەزييەوە يەككرتووە، تا مانەوەی مسۆگەر بكات و بەرەو پێش بچێت، ئەويش لە ڕێی بەجێ گەياندنی ئەم ئەركانانەی لای خوارەوە:

١-چاودێريكردن و پاراستنی پاك و بێگەردی نەژادی ئاری، لەگەڵ پەروەردەكردنی ميللەت بە جۆرێك كە گوێڕايەڵ بێت و پەرە بە هێز و توانا و هەست و سۆزی نەتەوايەتيشی بدرێت.

٢-مافی هاوڵاتی بوون بە تەنها بۆ ئەوانە قۆرخ بكرێت كە سەر بە ڕەگەزی ئاريين. بەم پێيە دەبێت هەموو ئەوانەی سەر بە ڕەگەزی ئاری نين لە پلە و پايە گشتيەكان و لە مومارەسەكردنی مافی هاوڵاتی بوون دوور بخرێنەوە، هەروەها پەيوەندی ژن و

ژنخوازیشیان لەگەڵ غەیرە ڕەگەزی خۆیان لێ قەدەغە بکرێت.

٣-پێکهێنانی دەستەیەکی بژاردە، ئەمەش لە ڕێی گەڕان و سۆراخکردنەوە دەبێت لە ناو سەرجەم ئەندامانی گروپدا، بە مەبەستی دیاریکردنی چاکترین کەس تا ئەرك و پلەوپایەی گشتیان پێ ببەخشرێت، بەبێ گوێدانە ئینتمای کۆمەڵایەتیان، پێویستە دەسەڵات و سەرکردایەتیش بدرێتە دەست ئەو کەسانە.

## ئەرکی دەوڵەت لەسەر ئاستی دەرەکی:

بەو پێیەی نازیستەکان بڕوایان وایە کە ڕەگەزی ئاریایی لەسەرو هەموو ڕەگەزەکانی دیکەوەیە، ئەوا "هتلەر" پێیوابوو کە ئەڵەمانیا ڕۆڵێکی شارستانی مەزن لەم جیهانەدا دەگێڕێت، لەبەر ئەوە ماڤ ئەوەی هەیە میللەتە لاواز و بێ دەسەڵاتەکان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی یاخود لە ناویان بەرێت. لێرەوە نازیستەکان پێیان وابوو ئەڵەمانەکان لە هەر کوێیەکی دنیابن، ڕۆڵەی نەتەوەی ئەڵەمانن و پێویستە لەسەریان وەلاو پابەندبونی خۆیان دوپات بکەنەوە، هاوکات دەبێت ئەو ناوچانەی ئەورووپاش کە ئەڵەمانی لێ دەژی بخرێنەوە سەر نەخشەی دەوڵەتی ئەڵەمانیا، تەنانەت ئەگەر کەمینەش بن لەو ناوچانەدا. بۆ گەیشتن بەم ئامانجانەش، پێویستە ئەڵەمانیا لە سیاسەتی دەرەوەیدا، ئەم ڕێگایانە بگرێتە بەر:

١-ئەڵەمانیا کار بۆ ئەوە بکات سەربەخۆی و سەروەری ڕاستەقینەی خۆی بەدەست بێنێتەوە کە لە دوای شکستی سەربازی جەنگی جیهانی یەکەمەوە لە دەستی دابوو.

٢-ئەڵەمانیا هەوڵی وەرگرتنەوەی ئەو ناوچانە بدات کە لە دوای جەنگ لە دەستیدان و، نەمێڵێت لە داهاتودا دەوڵەتێکی سەربازی بەهێز لەسەر سنورەکانی دروست ببێت، ئەگەر دەوڵەتێکی وەهاش دروست بوو، ئەوا پێویستە ئەڵەمانیا لەناوی بەرێت.

٣-هەوڵی ئەوە بدات سنورەکانی بەرفراوان بکات و بیگەڕێنێتەوە بۆ ئەودیو سنورەکانی ١٩١٤، چونکە سنوری ئەو کاتە بەشی پێویستی و ئاسایشی ئەڵەمانیا ناکات. لەبەرئەوە دەبێت ئەڵەمانیا کار بۆ ئەوە بکات تەواوی ئەڵەمانەکان لە خۆی بگرێت، بە ئەڵەمانەکانی وڵاتی نەمساشەوە. سەرەڕای ئەوانەش پێویستە لەسەر ئەڵەمانیا کار بۆ ئەوە بکات کە ئامڕازەکانی بوون و مانەوە بۆ ڕەگەزی ئەڵەمانی دەستەبەر بکات، ئەویش لە ڕێی پێدانی ڕووبەری زەوی زیاتر بە دەوڵەتی ئەڵەمانیا کە لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانەکەیدا بگونجێت. ئەم هەڵوێستەی دواییان ڕێبازی کایەی زیندوو لەخۆدەگرێت، کە نازیزم بانگەشەی بۆ دەکرد.

## پڕوپاگەندە:

پڕوپاگەندە و شێوازەکانی بەلای نازیستەکانەوە، گرنگیەکی گەورەی هەبوو. بەهۆیانەوە نازیزم توانی جەماوەری گەلی ئەڵەمانیا بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و وایان لێ بکات باوەڕ بە ئایدۆلۆژیا و بیرو بۆچونەکانیان بهێنن. "هتلەر" دوای ئەوەی کەوتە ژێر کاریگەری پڕوپاگەندەی فاشیزمەوە، هەوڵی خۆی خستە گەڕ بۆ ئەوەی ڕۆڵێکی سەرەکی بداتە ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەکردن، لە پێناو خزمەتکردن بە نازیزم ■ بە ئامانجەکانی خۆی بگات. هەر بۆیە بەشێکی گرنگی لە کتێبی (کفاحی) تەرخانکرد بۆ ڕونکردنەوەی چۆنیەتی چون بەرەو میللەت و دواندنی و کارتێکردنی، ■ قەناعەتی لا پەیدا بکرێت بۆ ئەوەی باوەڕ بە ئایدۆلۆژیای نازیزم بهێنێت.

لێرەوە ئیتر نازیزم پشت بە پڕوپاگەندە دەبەستێت و بە ئامرازێکی گرنگی دەزانێت بۆ گەیشتنە مەبەست. سەبارەت بە شێوازی پشت پێ بەستنیشی، ئەوا "هتلەر" لەو باوەڕەدابوو کە سەرەکیترین شتێك لە پڕوپاگەندەدا دووبارە کردنەوەو وتنەوەی ئایدیا سادە و ساکارەکانە بە بەردەوامی. پڕوپاگەندە لەبەرئەوەی ئاراستەی تەواوی گەل دەکرێت، ئەوا دەبێت باس لە بابەتە ئاسانەکان و ئەو مەسەلانە بکات کە جێ سەرنج و گرنگی پێدانی ڕای گشتیە. ئاستی زیرەك و تێگەیشتنی تاکە کەسەکانیش کەمتر بێت، ئەگەری کەوتنە ژێر کاریگەری پڕوپاگەندەشیان زیاتر دەبێت(٦). لەبەرئەوە نابێت پڕوپاگەندە پشت بە بابەتی بوون ببەستێت. بابەتی بوون لە پڕوپاگەندەدا بە نیشانەی لاوازی دادەنرێت. وەك چۆن خەڵك ستایشی کەسانی بەهێز و سەرکەوتنەکانیان دەکەن و بە سوکیش سەیری کەسانی بێهێز و شوستیەکانیان دەکەن، ئەوا واچاکە پڕوپاگەندە جەخت لەسەر هێز و ئیرادە بکات، بۆ ئەوەی بچێتە دڵی خەڵکیەوەو کاریان تێ بکات.

پەروەردە:

لە پێناو مانەوەو پاراستنی ڕۆڵی پێشەنگایەتی نەتەوەی جێرمانی، "هتلەر" پێیوابوو دەبێت گرنگی بە پاکی و بێگەردی نەژادی ئاری بدرێت. بەڕای ئەو ئەم کارەش تەنها لە ڕێی پەروەردەوە دەکرێت. پێویستە لەسەر سیاسەتی پەروەردە لە ئەڵمانیادا، کە ئاگای لە سەلامەتی تەندروستی گەنجانی ئەڵمانیا بێت، هاوکات کارەکتەری ئەڵمانی بە شێوەیەکی ڕاست و دروست پەروەردە بکات، ئەویش لە ڕێی دروستکردنی ئیرادەیەکی پۆڵایین و زیادکردنی توانای مرۆڤی ئەڵمانی بۆ هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی.

هەروەها پێویستە لە پەروەردەکردندا، جەخت لە ڕۆشنبیریی ڕەگەزپەرستی بکرێتەوەو لە ناخی لاوانی ئەڵمانیادا بچێنرێت. ئەو لاوانە نابێت ڕێگەیان پێ بدرێت قوتابخانە جێ بهێڵن، تا ئەو کاتەی هەموو شتێك لە بارەی چۆنیەتی پاراستنی ڕەگەزی ئاریایی بە پاك و بێگەردی، فێر دەبن. ئەمە ئەو ئایدیاو پرانسیپانەبوو کە نازیزم لەسەردەمی حوکمڕانی "هتلەر"دا، بەشێوەیەکی سەختگیرانە بەسەر گەنجانی ئەڵمانیادا پراکتیزەی کرد. بە فیعلیش توانی بەشی زۆری ئەو گەنجانە مۆبیلیزە بکات و بیانخاتە خزمەت دەوڵەتی نازیزم و ئامانجە سەربازیە پاوانخوازیەکانیەوە، کارێك کە بووە مایەی هەڵایسانی دووەم جەنگی جیهانی و ئەم جەنگەش ڕانەوەستا، تەنها بە لەناوچوونی نازیزم و خۆکوشتنی "ئەدۆڵف هتلەر"ی دامەزرێنەری نەبێت لە ٨ی ئایاری ١٩٤٥ دا.

پەراوێزەکان:

١-د. ابراهیم اباظة و د. عبد العزیز غنام: تاریخ الفكر السیاسي، ل ٣٨٢.

٢-هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٣.

٣-بڕوانە کتێبی (کفاحی) ئەدۆڵف هتلەر: دار الكتب الشعبیه، بیروت.

٤-د. ابراهیم اباضة و د. عبد العزیز غنام: تاریخ الفكر السیاسي، ل ٣٩٠.

٥-ئەدۆڵف هتلەر: هـ. س. پ.

٦-ئەدۆڵف هتلەر: هـ. س. پ.

سەرچاوە:

الدكتور مهدي محفوظ: اتجاهات الفكر السیاسي في العصر الحدیث – المؤسسة الجامعیة للدراسات و النشر و التوزیع؛ بیروت–الطبعة الاولی، ٢٠٠٧. ص ٢٢٢-٢٤٣.

# گەشەکردنی ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە ناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا

د. ئەلبێرت عیسا

## هەستی ناسیۆنالیزمی عەرەبی:

هەستی ناسیۆنالیزمی عەرەبی یان ئایدیۆلۆجیای عوروبە ئەوەندە کۆن نیە لە مێژووی میللەتی عەرەبدا. لە راستیدا مێژووی دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی پاش جەنگی جیهانی یەکەم، واتا پاش هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریای عوسمانی و پێکهاتنی دەوڵەتی عێراق و فەلەستین و لوبنان و سوریا. لەو سەردەمەدا، کاتێک ئەم وڵاتانە کەوتنە ژێر دەستی هێزە کۆلۆنیالیستەکانی فەرەنسا و بەریتانیای مەزنەوە، رۆشنبیر و کەسایەتی سیاسی کەوتنە پرسیارکردن لە خۆیان سەبارەت بە دروستکردنی دەوڵەتێک کە سەرجەم میللەتی عەرەب بخاتە ژێر سێبەری خۆی. کەواتە هەتا کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم، ناسیۆنالیزمی عەرەبی نەبوو بە دۆکترینێکی سیستماتیکی سەرنجراکێشەر. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەستی ناسیۆنالیزم پێشینەی خۆی نەبوبێت لە مێژووی میللەتی عەرەبدا و لە تێروانین و نوسینی هەندێ بیرمەندی عەرەب بەرجەستە نەبوبێت. بۆیە پێویستە ناسیۆنالیزمی عەرەبی، هەروەک هەموو دیاردەیەکی دیکە، نەبینرێ وەک بازنەیەکی پچڕاو لە مێژووی پاڵەپەستاوی میللەتی عەرەب، بەڵکو پێویستە تەماشا بکرێ وەک دیاردەیەک کە رەگی خۆی لە رابوردوی میللەتی عەرەبدا داکوتیوە. بەپێی ئەم پێوانەیە، دەتوانرێ دەرکەوتنی هەستی ناسیۆنالیزمی عەرەبی بگەرێنرێتەوە بۆ دوو قۆناغ: قۆناغی یەکەم کە لە سەردەمی پێش تێکشکان و هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریای عوسمانی پێدەگات و تەشەنەدەسێنێ. قۆناغی دوەم کە لە سەردەمی دەستێوەردانی هێزە کۆلۆنیالیستەکان لە دروستکردنی کیانە سیاسی و ئیداریەکان لە ناوچەکەدا دەبێ بە بناغە بۆ ناسیۆنالیزمی بەعسی پاش جەنگی جیهانی دووەم. تێبینی دەکەین کە ئەوەی سەردەمی ئیمپراتۆریای عوسمانی سروشتێکی خۆجیاکەرەوەی نەبوو و بە شێوەیەک یان بە شێوەیەکی دیکە سەربەخۆیی و یەکیەتی نەکرابوو بە دروشمی

کاری سیاسی خۆی. بەڵام ئەوەی سەردەمی کۆلۆنیالیزمی ئەورووپی نێوان دوو جەنگی جیهانی، سیمای بەرگری لە خۆ و پەرچەکردارانەو کۆنەپەرستانەو هێرشبەری وەرگرتبوو. ئەگەر ئەوەی سەردەمی عوسمانییەکان بریتی بوبێ لە هێزێك کە نەدەگەڕا بە شوێن مۆدێلێکی سیاسی، ئەوەی سەردەمی پاش جەنگی جیهانی یەکەم، هەوڵی ئەدا نمونەی دەنگدانەوەی بزووتنەوەی فاشی و نازی لە ئیتالیاو ئەڵمانیا بکات بە مۆدێلێك. تێگەیشتنی دیاردەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی لەم دوو سەردەمە و بەراوردکارییەك لە نێوان بنچینە ئایدیۆلۆجییەکانیان و ئەو بارودۆخەی کە هێنایانە کایەوە، زۆر یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتنی هۆکارەکانی توند و تیژی لە مێژوی عێراقدا. بە بێ تێگەیشتنی ئەم دوو قۆناغەی تەشەنەسەندنی هەستی ناسیۆنالیزمی عەرەبی، ئەستەمە قۆناغی سێهەم تێبگەین کە بریتییە لەوەی بەعسییەت و فۆرمە ئەوپەڕەکانی ناسیۆنالیزم.

## عەرەب لە ناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا:

دەوڵەتی عوسمانی بریتی بوو لە ئیمپراتۆریا کە باڵی کێشابوو بە سەر ڕووبەرێکی زۆر لە ئاسیا و ئەورووپای ناوەڕاست، هەر لە دەروازەکانی ڤیەننا هەتا باب المندب و لە قەوقازەوە هەتا ئۆقیانوسی ئەتلەسی لە ژووروی ئەفریقا و لە ڕێگەی سوڵتانەکانیەوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەو ناوچانە حوکمی دەکرد. وڵاتە عەرەبییەکانیش بە زۆری لەژێر دەسەڵاتی ئەم ئیمپراتۆریایە بوون. سووریاو حیجاز و میسر بە ئاسانی سەرفرویان هێنابوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی و لە ساڵی ١٥٥٦ بەشێکی زۆری جەزائیر و تونس و تەرابلس چووبوە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەوە و تەنانەت عێراقیش لە ساڵی ١٦٣٨ بە تەواوی لە ژێر هەژموونی عوسمانییەکان بوو. بەڵام زۆربەی زۆری ئەم وڵاتانە کە لە پێشدا لەلایەن مەمالیکەکانەوە داگیر کرابوون، ڕاستەوخۆ لەلایەن ئیستەنبولەوە ئیدارە نەدەکران، واتا بە دەگمەن لە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی عوسمانییەکانەوە بەڕێوە دەچوون[1]. بۆ نمونە مەکەو مەدینە لە سەر حیسابی میسر یارمەتی ئەدران و ناوچەکانی دیکەش جۆرە سەربەخۆییەکیان هەبوو کە لەلایەن چەند ئەمیر و سەرکردەیەکی عەرەب بەڕێوە دەبران. ئەو وڵاتانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوون، شێوە ڕێکخستنێکی ئیدارییان هەبوو کە هێڵی سەرەکی لە شێوەی ڕێکخستنی ئیداری فارسەکان و بیزەنتینییەکان و سەلجوقیەکان و مەمالیکەکان وەرگیرابوو[2]. ئەم دابەشکردنە ئیدارییەش بەو شێوەیە بوو کە هەتا ئەم ساڵانەی دواییش بەردەوام بوو، ئاسەواری خۆیشی لە ناو سیستمی ئیداری ناوچەکە بەجێهێشتوە. بچوکترین یەکەی ئیداری، بریتی بوو لە گوند یان لادێ و کۆمەڵێك لە لادێ ناحیەیان پێکدەهێنا. کۆمەڵێك لە ناحیە قەزایان پێکدەهێنا و کۆمەڵێکیش لە قەزا سەنجەق (یان لیوایان) پێکدەهێنا کە لەلایەن پارێزگارەوە (متصرف) بەڕێوە دەبراو کۆمەڵێکیش لە لیوا ولایەتێکیان پێکدەهێنا. بە سەرووی سەرجەم ئەم دابەشکردنە ئیداریانە، واتا بۆ هەر ولایەتە والییەك هەبوو کە بە شێوەیەکی گشتی بە پاشا ناسرابوو و ئەویش دەسەڵاتی باڵای خۆی هەبوو لە بواری دادوەری و سەربازیی و سیاسی و، هەروەها بەرپرسی یەکەم بوو لە هێشتنەوەی پەیڕەو و ئاسایشی گشتی و کۆکردنەوەی باج و پەیوەندی لەگەڵ ئیستەنبول[3].

لە سەدەی نۆزدەهەمدا، کۆی ولایەتە عەرەبییەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی بریتی بوو

له ١٢ ولایەت: ولایەتی حجاز، ولایەتی بیروت، ولایەتی یەمەن، ولایەتی بەسرە، ولایەتی بەغدا، ولایەتی موسڵ، ولایەتی حلب، ولایەتی سوریا، ولایەتی جەزائر، ولایەتی تەرابلسی رۆژئاوا، ولایەتی تونس، ولایەتی میسر[٤]. بەم شێوەیە، وڵاتە عەرەبییەکان بەم سیستمە ئیدارییە بەڕێوە دەبران و دەشێ بوترێ کە هەتا نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم ، ولایەتە عەرەبییەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بریتی بوون لە چەند ولایەتێکی وەك موسڵ و بەغداو بیروت و حەلەب و صیداو شام (دیمەشق) کە کۆی دانیشتوانیان لە شارە سەرەکیەکان لە ٥٠٠,٠٠٠ تێپەڕی نەدەکرد و ئەوانەی نێو دورگەی عەرەب بریتی بوون لە لە ولایەتی حیجاز و یەمەن...هتد[٥].

سەبارەت بە ژمارەیان لە ناو ئیمپراتۆریای عوسمانییدا، عەرەب نزیکەی نیوەی ئیمپراتۆریاکەیان پێکدەهێنا: پێش جەنگی جیهانی یەکەم، دانیشتوانی دەوڵەتی عوسمانی، وڵاتی میسری لێ دەرچێ، بریتی بوون لە ٢٢ ملیۆن. لەم ژمارەیە ١٠ دە ملیۆن و نیوی عەرەب بوون و ٧ ملیۆن و نیوی تورك بوون و باقیەکەی بریتی بوون لە پێکهاتەکانی دیکە[٦]. لە سەر ئاستی نوێنەرایەتی ژمارەیی، لە کۆی ٢٤٠ ئەندامی مجلس المبعوثین (واتا ئەنجومەنی نوێنەران)، عەرەب ٦٠ شەست ئەندامیان هەبوو لە کاتێکدا تورکەکان ١٥٠ ئەندامیان هەبوو. هەروەها لە ناو ئەنجومەنی پیران کە سەرجەم ئەندامانیان لە سەرەوە دیاری دەکران، عەرەب تەنها ٣ سێ کورسیان لە کۆی ٤٠ چل ئەندام هەبوو[٧]. بەپێی هەندێ سەرچاوەی دیکە، ئەم خەمڵاندنە نەختێ بە شێوەیەکی جیاواز ئاماژەی پێدراوە: بۆ نمونە هەندێك دەڵێن کە لە کۆی ٢٧٥ نوێنەر، ١٤٢ تورك بوون و ٦٠ عەرەب[٨] و هەندێکی دیکەش ژمارەی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران بە ٢٢٨ دەخەمڵێنن کە لە ناویدا ١٠٧ نوێنەر تورك بوون و ٤٥ نوێنەر عەرەب[٩]. هەرچۆنێك بێت، بە هەموو شێوەیەك، بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی دانیشتوان، ژمارەی نوێنەری عەرەب هاوتا نەبوو لەگەڵ ژمارەی گشتیان[١٠].

## هاووڵاتیان لە ناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا:

هەرچیەك بوایە پێناسەی نەتەوەیی یان ئاینیان، ئەندامانی ئیمپراتۆریای عوسمانی دانەنەدران بە هاووڵاتی راستەقینە، بەڵکو ملکەچ بوون بۆ سوڵتان وەك رەعیە (مێگەل). سوڵتانی عوسمانی تەنها سەروەر و تەنها سەرچاوەی یاسا بوو. بە ناوی ئیسلامەوە، سوڵتانی عوسمانی پەیامی رۆحی رائەپەڕاند، واتا نوسراوی خودای ئەدا بە مرۆڤایەتی. لە پێناوی بەجێهێنانی کاری ئاینی، سوڵتان دەسەڵاتی خۆی دەپاراست و فراوانی دەکردەوە و نوێنەرایەتی کۆمەڵگەی موسڵمانانی دەکردو ئەمانیش پێویست بوو باوەش بکەن بە باوەڕی راست و سەرپێچی نەکەن لە یاسای خودا. بە لای سوڵتانەوە، باوەڕی ئاینی و دەسەڵاتی سیاسی بە شێوەیەکی توند و تۆڵ بە یەکەوە بەسرابوونەوە. سوڵتان نوێنەرایەتی بەرجەستەبوونی دەسەڵاتی رۆحی و دنیایی (کاتی) دەکرد لە هەمان کاتدا[١١]. بەپێی ئەم جیهانبینیە، هاووڵاتیان بریتی بوون لە رەعیە و رەعیەکانی سوڵتانیش، موسڵمان و ناموسڵمانیان دەگرتەوە. ئایا موسڵمانان و ناموسڵمانان بە یەك چاو تەماشا دەکران؟ ناکرێ یەکلایەنانە تەماشای شتەکان بکرێ. دەکرێ بوترێ کە لە زۆر شوێن و سەردەمدا جیاوازیەکی زۆر نەدەکرا لە نێوان ناموسڵمانان و موسڵمانان. بەڵام لە سەردەمی لاوازی و هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریا، ناموسڵمانان تا رێژەیەك بە نزمی تەماشا دەکران و دۆخێکی نزمتریان هەبوو و سوکایەتیان پێدەکرا بە بەراورد لەگەڵ موسڵمانە

سوننیەکان. تێبینی دەکرێ کە بە شێوەیەکی گشتی، ژیانی ناموسڵمانەکان پارێزرابوو لەلایەن ویست و خۆشی دەسەڵاتە تورکەکان. سەبارەت بە گوزارشتی "رەعیە"، ئەوە راستە کە سەرجەم میللەتانی ژێر دەستی حوکمڕانی عوسمانی دائەنران بە "رەعیە"[12]، بەڵام سەبارەت بە کۆمەڵگە ناموسڵمانەکان، ئەم ووشەیە واتای "دۆخێکی نزمکەرەوەو داماوی دەگەیاند بە بەراورد لەگەڵ موسڵمانەکان"[13]. بەم واتایە، ناموسڵمانەکان بەڕاستی یەکسان نەبوون لەگەڵ موسڵمانە سوننیەکان. بە پێچەوانەوە، ئەوان دائەنران بە هاووڵاتی پلە دوو و قەرزار کە دەبوایە باج بدەن، بەڵام موڵکایەتیان لەژێر "امان" بوو، واتا پارێزرابوو لەلایەن ویست و حەزی دەسەڵاتی عوسمانیەوە[14]. دەشێ بەم بۆنەیەوە بوترێ کە لە بار و دۆخی جیاواز جیاواز و سەردەمە قەیرانیاوییەکان، ناموسڵمانەکان، ریسوا دەکران و مامەڵە دەکران وەك کافر. بە بۆنەی دۆخی مەسیحیەکان، بۆ نمونە، زۆر لە نوسەران ئەوە دەگێڕنەوە کە بۆ نمونە کاتێك مەسیحیەك لە ناو شەقامدا دەبینرا، بە شێوەیەکی سووك تەماشا دەکرا و ئەگەر بە ناو گەڕەکێکی موسڵماندا تێپەڕ بوایە، منداڵان و هەرزەکاران دوای دەکەوتن و سوکایەتیان پێدەکرد و زللە و شەقیان لێئەدا و دایان ئەنا بە سەگێك کە ئەوەڕێ[15]. مەسیحیەك، وەك ئەوی دیکەی جیاواز، واتا وەك ئەوەی کە موسڵمان نەبوو، ناچار دەکرا گوێنیەك هەڵبگرێ بەسەر شانیەوە کە پێی دەوترا "گوێنی پێداویستەکان" و مافی ئەوەی نەبوو کە بەبێ ئەم گوێنیە بچێتە دەرەوەو ناچار دەکرا سەوزەو بقولیاتی (پاقلەو نۆك و فاسۆلیا...) تێبکات[16]. لە لایەکی دیکەشەوە رێی پێ نەئەدرا سەروپێچ (عمامە) یان پێڵاوی سوور لەپێ بکات و سواری ئەسپ ببێ[17] و دەبوایە رەنگی جلەکانی جیاواز بوایە.

لەم بارەیەوە، دۆخی مەسیحیەکان لەو سەردەمەدا بەم شێوەیەی خوارەوە وەسفکراوە:

"مەسیحیەکان نابێ لە ناو شارەکاندا سواری ئەسپ ببن : بۆ ئەوان قەدەغەیە سولی زەرد و شاڵی سپی و هەموو جلێکی رەنگ سەوز لە بەر بکەن. ئەوان دەتوانن رەنگی سوور بۆ پێ و رەنگی شین بۆ جل و بەرگ بەکار بێنن..."[18]. زیاتر لەمەش، لێرەو لەوێ هەندێ پێکدادانی مەزهەبی دەستیان دەکرد بە دەرکەوتن کە دەبوونە هۆی توند و تیژی کە مەسیحیەکانی ناچار دەکرد سەرپێچە سپیەکانیان بگۆڕن بۆ رەنگی رەش[19]. هەتا نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم زۆر شتی دیکە هەبوون کە پەیوەندیە دادوەریەکانی نێو پێکهاتەکانی ئیمپراتۆریای عوسمانیان بەجارێ شێواندبوو و تەنانەت لە هەندێ دۆخی رۆژانەی دیکەش، ژیانی سایکۆلۆجی و کۆمەڵایەتی ناموسڵمانانی شێواندبوو. بۆ نمونە ناموسڵمانەکان کاتی چوونە ناو حەمامەوە ناچار دەکران جلی تایبەتی لەبەر بکەن بۆئەوەی کاتی خۆ رووت کردنەوە جیا بکرێنەوە لە موسڵمانان. هەروەها داوا دەکرا کە ئەو خانوانەی کە ناموسڵمانەکان دروستیان دەکردن نزمتر بن لەوانەی موسڵمانەکان و جگە لەمەش شەهادەی ناموسڵمان لە سەر موسڵمانێك بە هیچ شێوەیەك قبوڵ نەدەکرا[20]. دەشێ بەم بۆنەیەوە بوترێ کە چەند جارێك باڵوێزی بەریتانیا سکاڵای خۆی دەربڕی سەبارەت بەوەی کە دەوڵەتی عوسمانی شەهادەی ناموسڵمانی قبوڵ نەدەکرد لە سەر موسڵمانێك و ئەمە بوویوە هۆی ئەوەی کە زۆرینەی موسڵمانان هێرش بەرنە سەر ناموسڵمانان بەبێ ئەوەی سڵ بکەنەوەو بترسن لە سزا بە هۆی نەبوونی شاهیدی ئەو موسڵمانانەی کە لەگەڵ ئەو کردارانەدا نەبوون. ئەم مەسەلەیە خرایە بەردەم ئەنجومەنی زانایان

(کە سەرجەمیان پیاوی ئاینی بوون) بۆ دەنگدان لـە سـەری، بـەڵام بـە تێکـڕای دەنـگ ئەنجومـەن بڕیـاری دا کـە بـە هـیچ شـێوەیەك ڕێگەیـەکی ڕەوا (شەرعی) نیە بۆ چارەسەری ئەو مەسەلەیە، واتا شاهیدی ناموسڵمان قبـوڵ نـەکرا دژی موسـڵمان لـە کـاتی سـکاڵا دەربڕینـدا[٢١]. دەشـێ ئـەوەش وەبیرنەچێتەوە کە تەنانەت منشوری تەنزیماتی ساڵی ١٨٥٦ کە ئاماژەی ئەدا بە "مامەڵەکردنی سەرجەم تبعەی دەوڵەت بە شێوەیەکی یەکسان" بەبێ جیاوازی ئاین و ئاینزا و هێشتنەوەی ئەرك و مـاف بـۆ سـەرجەم پێکهاتـە ناموسـڵمانەکان، نەیتوانی کاریگەریەکی ئەوتۆی هـەبێت بۆ سەر ئەو بارودۆخە[٢٢].

ئەو توندو تیژیەی کە بوو بوو بە یاوەری ئەو سـەردەمە، نـاوی نـرا "عهـد الفـتن" و ئەمـەش وەبیرمـان دێنێتـەوە کـە چۆن لـە سـاڵی ١٨٤١ و ١٨٤٥ و بەتایبـەتی لـە سـاڵی ١٨٦٠، چـەند سەربڕینێکی مەزهەبی ئەنجامدران. بەڵام دەشێ زوو بـە زوو هێـڵ بـە ژێـر ئەوەشـدا بهێنـرێ کـە دەوڵـەتی عوسـمـانی زیـاتر لـە هاووڵاتیـان بەرپرسـێتی ئـەم دیاردەیـەی هـەبوو. لـە زۆر بۆنـەدا، دەوڵـەتی عوسمـانی خەڵکەکـەی بـە کاردەهێنا وەك ئامرازێکی سیاسی هانی ئەدان و هیچیـشی نـەدەکرد بـۆ وەسـتاندنی لـەم قەسابخانەیە[٢٣] و هـەروەها گرنگە بوترێتـەوە کە ئـەم هەڵمەتانـەش لـە هـەموو شـوێنێك ئـەنجام نەدەدران و بـەردەوام نـەبوون لـە سـەرجەم سەردەمەکانی دەسەڵاتی عوسمانی.

وەبیرنەچێتەوە کـە ئـەم جوداکاریانـە تـەنها پەیوەسـت نـەبوون بـە مەسـیحیەکانەوە. گرووپـە ناموسڵمانەکانی دیکەش، کەم یان زۆر، بە هـەمان شێوە مامەڵـە دەکـران. بـۆ نموونـە، یەزیدیـەکان، ئـەوانیش زۆریـان چێشت و لـە ڕاستیدا بـە دوو شـێوە دەچەوسـێنرانەوە: یەکـەم وەك کـورد و دووەم وەك کەمایەتیەکی ئاینی. یەزیدیەکان کە ئاینەکـەیان چـەند ئێلێمێنتێکـی بتپەرسـتی و زەردەشـتی و مەسـیحیەت و ئیـسلام پێکـەوە کۆدەکاتـەوە، بـە شـێوەیەکی توند و تیـژ مامەڵـە دەکـران لەلایـەن تـورك و عـەرەب و تەنانـەت لـە لایەن کوردە موسڵمانەکانیش. دەشێ ئەوە وەبیر بخرێتەوە کە ماوەی چوار سەدەی حوکمڕانی عوسمـانی، چەندین کۆکوژی ڕێکخران و لە زۆر کات و شوێنداو بە شێوەیەکی فراوان سیاسەتی جوداکاری بەکارهێنرا دژیـان[٢٤]. بە بەردەوامی یەزیدیەکان دادەنران بە زەندەق و هەڵگەڕاوە لە ئاین و، تۆمەتبار دەکران بەوەی کە ئاینی خۆیان بـە جێهێـشتوە و خیانـەتیان کـردوە لـە ڕێنماییـەکانی قورئـان و شـەریعەت. سیاسـەتی جوداکـاری ئـاینی بەرامبـەریان، پاڵی نا بە زۆر حاکم ئاگر بەردەنە شوێنی عیبادەتیان و قەبری مردووەکانیـان هەڵکـەنن و ئـاینی ئیـسلام بـە زۆر بەسـەریاندا بـسەپێنن...[٢٥]. مەبەسـت لـە زۆر هێرشـی توند و تیژییـەوە بـوو کـە هـەوڵ بدەن بیانگێڕنـەوە "ئـاینی ئەسلی" خۆیـان[٢٦]. بـەم شـێوەیە، یەزیدیـەکان دەبـوو بـەرەنگاری کێشەیەکی گـەورە بوونایە کە بریتی بوو لەوەی کە ئەگەر ئیسلام بن، ئەوا دەبێ ملکەچیبکەن بۆ خزمـەتی سـەربازیی یـان، وەکو مەسیحیەکان و جوولەکان، بەدەلی لێخۆشبوون لەو خزمەتە بدەن. مـشتومڕو ڕەخنـەو نـاکۆکی لـە زۆر بۆنـەو زۆر شـوێنی نیـشتەجێیان بـوون بـە هـۆی توندو تیژیەکی بێ ئەندازە[٢٧].

بێگومـان، حاڵـەتی ئەرمەنیـەکان و ئـەو کۆکوژیـەی ئەنجامدرا دژیـان زۆر ناسـراوە هـەتا لێرەدا بە درێژی باس بکرێ. بەڵام ئەوەندە بەسە بـوترێ کـە ئـەو قەسـابخانەیەی لـە سـەردەمی سوڵتان عبد الحمیددا ئەنجامدرا، کێشەو گرفتی پێکـەوە ژیـانی پێکهاتـەکانی ئیمپراتۆریـای عوسمـانی بـە ڕوونـی دەردەخـات. لـە ئـەنجامی نـەبوونی ئایدیۆلۆجیایـەکی لێبـووردەیی

*tolerance* کە زەمینە خۆش دەکات بۆ پێکەوەژیانی بیر و بۆچوون و باوەڕ و نەریت و هەڵسوکەوتی جیاواز، کۆکوژیەکان سەرجەم توێژە کۆمەڵایەتی و ئاینیەکانیان گرتەوەو نازناوی "سوڵتانی سوور"یان بەخشی بە سوڵتان عبد الحمید.

بەکورتی، کەمایەتیە ناموسڵمانەکان لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا، هەرچیەك بوایە ئینتمای ئێتنیکیان، دائەنران بە هاوولاتی پلە نزمتر لە زۆرینەی موسڵمان. ناسیۆنالیستی عەرەبی، ساطع الحصری هێلێ بە ژێر ئەوەدا دێنێ کە لە سەردەمی عوسمانیەکاندا، دۆخی پەیوەندی نێوان ئاینەکان لە "فقهی" ئیسلامیەوە سەرچاوەی دەگرت کە موسڵمانان دەخاتە پلەیەکی بەرزتر بە بەراورد لەگەڵ ناموسڵمانان. حکومەتی عوسمانی بە شێوەیەکی جیاواز مامەڵەی هاوولاتیانی ناموسڵمانانی دەکردو بە ئیمتیازەوە تەماشای موسڵمانانی دەکرد. حکومەتی عوسمانی موسڵمانانی دادەنا بە هاوولاتی کە ئینتمایان بۆ دەوڵەت هەبوو و ئەوانی دیکەشی وەك بێگانە تەماشا دەکرد[٢٨]. هەرچۆنێك بێت، ئەم کەتێگۆریزە کردن و جوداکاریە ئاینیە بەردەوام بوو و ژیانی کەمایەتیە ناموسڵمانەکانی داپۆشی لە سەردەمی هەموو حوکمڕانی عوسمانیدا. لەبەرئەوە، کەمایەتیە ناموسڵمانەکان لە پراکتیکدا مومارەسەی مافەکانی خۆیانیان نەدەکرد و دانیان پێدا نەدەهێنرا وەك یەکسان لەگەڵ زۆرینەی موسڵمان.

شایستەی وەبیرخستنەوەیشە کە ئیمپراتۆریای عوسمانی، وەك نوێنەرایەتیەکی سوننی، جوداکاری بەکاردەهێنا تەنانەت بەرامبەر موسڵمانە شیعەکانیش. جوداکاری مەزهەبی کە بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکاردەهێنرا بەرامبەریان، ئەوانی دورخستبوەوە لە مومارەسەی دەسەڵاتی سیاسی و ئیداری. لە سەردەمی جیاواز جیاوازدا، ئەم جوداکارییە هەروەها بووبوە هۆی چەندین پێکدادان کە ئارامی و سەقامگیریان خستبوە مەترسیەوە. ئەوەندە روونە کە پێویست ناکات درێژە بدرێ بەوەی کە ئەم ململانێ و پێکدادانانە لە مێژووی عێراقی سەردەمی سەرەتاکانی ئیسلام رەگیان داکوتیوەو هەتا دوایین رۆژی ئیمپراتۆریای عوسمانیش، عێراقیەکان ئەوەندە هوشیار نەبوون سەبارەت بە چەمکی ناسیۆنالیزم یان سەربەخۆیی سیاسی. هوشیاری عێراقیەکان زیاتر لە ناو هەستی ئاینیدا قەتیس مابوو کە لەلایەن سێکتاریزمی مەزهەبی نوێنەرایەتی دەکرا. عێراقیەکان دەوڵەتیان دەبینی وەك کیانێك کە دەبوو نوێنەرایەتی مەزهەبیان بکات و دورخستنەوەیان لەم نوێنەرایەتیە هەستی خۆبەنزمدانان و هەڵوێستی دژایەتی پەرە پێدەسەند لە ناویاندا.

هەرچۆنێك بێت، لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا، یەکسانیەکی تەواو نەبوو لە نێوان موسڵمان و ناموسڵمانەکان. بەڵام نابێ ئەوەش وەبیربچێتەوە کە هەرچەندە ئەم نایەکسانیانە بەشێوەیەکی رەسمی، ("لە سەر کاغەز") نەمابوون، واتا لە ساڵی ١٨٥٦ لە لایەن یاسای حەتتی هومەیون رەتکرابوونەوە، بەڵام لە پراکتیکدا سیستمی کۆنی "میللەت" بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو. ووشەی "میللەت" لە زاراوەکانی ئیمپراتۆریادا، سەرجەم کۆمەڵگە ئاینیە ناموسڵمانەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی عوسمانی دەگرتەوە. بەم شێوەیە میللەتی روم یان ئەرمەنی یان یەهودی هەبوون و هاوولاتیەتی هەر رەعیەیەك لەناو سیستمی "میللەت" دەگەڕایەوە بۆ ناوی ئاینی ئەو "میللەتەی" کە ئینتمای بۆ هەبوو. ئەگەر

ئینتمای ئاینی رەعیە جیاواز بوایە لە ئینتمای ئێتنیکی، ئەوا رەعیە بە ناوی ئینتما ئاینیەکەی ناو دەبرا. لە سوریا، بۆ نمونە، تاکەکانی هەمان نەتەوە بە ئاینی جیاوازەوە، بە ناوە ئاینیەکەیان یان مەزهەبەکەیان ناسرابوون. بۆ نمونە دەوترا میللەتی مارۆنی یان میللەتی یۆنانی کاتۆلیك. هەرچۆنێك بێت، عوسمانیە تورکەکان وشەی "میللەتیان" بە کاردەهێنا بۆ هێما کردن بە ئاین و نەتەوە لە یەك کاتدا، بەو پێیەی دەستەواژەی "ئاین و میللەت یەك شتن"[٢٩] بڵاو بوو لەناو ژینگـە سیاسـی و کۆمەڵایەتیـەکانی ئیمپراتۆریاکە. بەم شێوەیە، دەتوانرێ تێبینی بکرێ کە لە سوریا "وشەی ئاین هاوواتا بوو لەگەڵ وشەی نەتەوە و تەنانەت لەگەڵ نیشتیمانیش"[٣٠]. لە بەر ئەمە، هێڵی جیاکەرەوە لە رێگەی ئینتمای ئێتنیکی، بوونی نەبوو؛ بەڵکو لە رێگەی ئاینەوە بوو، پێناسەی تایبەتی رەعیەی سوڵتان، "عوسمانلی" بوو و هاووڵاتیەتی ئەو بریتی بوو لە ئاینی ئەو کۆمەڵگەیەی ("میللەت") کە ئینتمای بۆ هەبوو[٣١].

تێبینی دەکرێ کە خەسڵەتێکی هەرە تایبەتی هەست و سۆزی هاووڵاتیان لەناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا، بریتی بوو لەوەی کە بیروباوەری ئاینی بە قوڵی چەقی سەندبوو لەناو گیانیاندا و کاریگەریەکی بەرچاوی هەبوو لە ژیانیاندا. قونسوڵی گشتی فەرەنسی لە سوریا لە ساڵی ١٨٥٦، بەم شێوەیەی خوارەوە گوزارشتی لە رۆڵی ئاین لە ژیانی خەڵکیدا دەکرد: "لە کۆمەڵگەی خۆرهەڵاتیدا، ئاین لە هەموو شوێنێکەو تێکەڵی هەموو شتێك بووە. نەریت و زمان و ئەدەب و دەزگاکان، هەمویان ناسەواری (ئاینیان) پێوە دیارە، هەمویان سروشتێکی دەرکەوتوی ئاینیان پێوەیە. مرۆڤی خۆرهەڵاتیی ئەوەندە نەبەستراوەتەوە بەو ووڵاتەی کە تیایدا لەدایکبوە– ئەو، نیشتمانی نیە... ئاینی هەیە. ئەو، بەستراوەتەوە بە ئاین وەك چۆن لە شوێنی دیکە (خەڵکی) بەستراونەتەوە بە نیشتیمان. نەتەوەی ئەو (واتا مرۆڤی خۆرهەڵاتیی) بریتیە لەو تاکانەی کە هاوبەشن لە هەمان ئاین کە هەمان باوەڕ tcul پراکتیزە دەکەن: بەلای ئەوەوە بێگانە شتێکی دیکەیە"[٣٢].

بەلای خۆشیانەوە، عوسمانیەکان مێژووی عوسمانیان بە بەشێك لە مێژووی ئیسلام دادەنا و تەماشای سوڵتانە عوسمانیەکانیان دەکرد وەك وارسی خەلیفەکانی راشیدین و ئەمەویەکان و عەباسیەکان. هەرچەندە سوڵتانە عوسمانیەکان خۆیان تورك بوون، بەڵام ناوی خۆیان نابوو "عوسمانی". لەو سەردەمەدا وشەی "تورك" جۆرە سوکایەتیەکی دەنوان و تەنانەت هەندێ لە مێژوونووسان بە تورکەکانیان دەگوت "بێ ادراك"، واتا سیفەتی "تێنەگەیشتوو"یان دەخستە پاڵ ناوەکەیانەوە[٣٣]. لە راستیدا وشەی "تورك" تەنها لە نزیکی کۆتایی ئیمپراتۆریای عوسمانی هاتە کایەوە و هەتا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم، ئەم وشەیە بەکاردەهێنرا بۆ ئاماژەکردن بە جووتیارێك کە نەزان بێت[٣٤]. لە ئیستەنبوول، بۆ نمونە، ئاوزەنەدکردنی گەورەپیاوێکی خەڵکی ئیستەنبوول بە "تورك"، دادەنرا بە ریسواکردن و بە شێوەیەکی زۆر خراپ تەماشا دەکرا چونکە ئەو، خۆی بە تورك پێناسە نەدەکرد بەڵکو خۆی بە ئەندامی ئیمپراتۆریای عوسمانی دادەنا[٣٥]. تەنانەت لە زمانی رەسمیشدا، دەوترا زمانی "عوسمانی" نەوەك زمانی "تورکی". جگە لە عورفی دەوڵەت و نوسراوی رەسمی، تەنانەت زمانی ئەدەبیش بە زمانی عوسمانی ناسرابوو و نوسەر و ئەدیبەکانیش کە بەرهەمهێنەری ئەدەبێکی ئەریستۆکراتیکی نێوان سوڵتان و

وەزیرەکان بوون، ئەوانیش، بەرهەمەکانیان بە بەرهەمی عوسمانی بە خەڵکی دەناساند.

هەرچۆنێك بێت، لە گۆڕەپانی سیاسیدا، باس لە عوسمانی و ئیسلامی دەکرا نەوەك لە تورك و تەنانەت بیرۆکەی ناسیۆنالیزمی تورکی بە واتای شتێکی جیاواز لە چوارچێوەی عوسمانی و ئیسلامی بە هیچ شێوەیەك نەدەهاتە بیری پیاوە سیاسییەکانی دەوڵەت و خەڵکی سادەو جەماوەریش پێی بێگانە بوون. تەنانەت هەتا سەردەمی ئەوەی کە پێی دەوترێ سەردەمی "تنظیمات"[٣٦]، دەوڵەتی عوسمانی مایەوە وەك دەوڵەتێکی عوسمانی- ئیسلامی و ئەو بەرهەمە ئەدەبیە بەجۆشانەش کە کاریگەری خۆرئاوایان لەسەر بوو لە سەردەمی تەنزیمات، بە بەردەوامی شانازیان دەکرد بە گەورەیی وسەربەرزیی عوسمانیە موسڵمانەکان[٣٧] و باسیان لە نیشتیمانی عوسمانی و میللەتی ئیسلامی دەکرد. بۆ نمونە، شاعیری تورکی ئەو سەردەمە، نامق کمال، یاخود، عبدالحق حامد، کە دادەنرێن بە دوو شاعیری نیشتمانپەروەری ئەو سەردەمە، باسیان لە تورك نەدەکرد، بەڵکو باس لە نیشتمانپەروەریی عوسمانی لەسەر بنچینەی سۆزی ئیسلامیان دەکردو شانازیان بە مێژووی عوسمانی- ئیسلامیەوە دەکرد. نامق کەمال کە دادەنرێ بە "باوکی نیشتیمانپەروەریی" لە ناو جیهانی عوسمانیدا، بانگەشەی دەکرد بۆ رۆحی نیشتیمانپەروەریی عوسمانی نەوەك بۆ ئەوەی تورك و سەرجەم نوسینەکانی لە شیعرو پەخشاندا پەیوەندیدار بوون بە جۆشی عوسمانی-ئیسلامیەوە. تەنانەت لە یەکێك لە هۆنراوەکانی، باس لە "نیشتیمانی جوان" دەکات کە دەبێ بە پۆشاکی رەشەوە بڕوات بۆ کەعبەو دەستێکی درێژبکاتەوە بۆ پەیامبەر و دەستەکەی دیکەشی بۆ مەشهەدی کەربەلا و سنگی بکاتەوە بۆ ئەوەی ئەو شەهیدانە پیشان بدات کە گیانیان لە پێناوی ئەودا بەخشیوە، ئەمجا لە خودا بپاڕێتەوە کە موسڵمانان بپارێزێ لە فێڵی دوژمنان... هەروەها عبدالحق حامد جیاوازی نەدەکرد لە نێوان مێژووی عوسمانی و ئەوەی ئیسلام و زۆربەی زۆری شانۆگەری و رواياتەکانی سیمای نیشتیمانپەروەریان پێوە دیار بوو: نیشتیمانپەروەری عوسمانی- ئیسلامی وەرگیراو لە مێژووی ئەندەلوس وەك مێژووی نەتەوەیی بۆ عوسمانیەکان[٣٨].

لە بەرئەمە، دەتوانرێ بوترێ کە هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و تەنانەت هەتا سەرەتای سەدەی بیستەمیش، سەرجەم شاعیر و نوسەران لە ناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا و زۆربەی پیاوە سیاسییەکان و جەماوەر پەیوەست بوون بە نیشتمانپەروەری عوسمانی-ئیسلامی و مێژووی عوسمانی و ئیسلامیان پێکەوە تێکەڵ دەکردو بێ باك بوون لە مێژووی سیاسی تورك. مێژوو بۆ ئەوان بریتی نەبوو لە مێژووی نەتەوەی تورك، بەڵکو بریتی بوو لە مێژووی عوسمانیەکان وەك موسڵمان.

هەمان دیاردە تێبینی دەکرێ سەبارەت بە هوشیاری عەرەب لەناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا بەو واتایەی کە عەرەبە موسڵمانەکانیش بە چاوێلکەی ئیسلامەوە تەماشای مێژوویان دەکرد و باوەڕیان هەبوو بەوەی کە عوسمانیەکان وارسی رەوای خەلیفە موسڵمانەکان بوون و مێژووی عوسمانیان بە تەواوکەری مێژووی گشتی ئیسلام لە قەڵەم ئەدا. لە بەر ئەم هۆیە، دەتوانرێ بوترێ کە لەو سەردەمەدا، بۆ عەرەبەکانیش شتێك نەبوو کە پێی بوترێ هوشیاری عەرەبی و لەلایەکی دیکەشەوە "مەسەلەی عەرەب" هێشتا بوونی نەبوو لە سیاسەتی جیهانیدا. تەنانەت وشەی "عەرەب"یش ئاماژەی پێ دەدرا وەك دەلالەت لە "کۆچەری ناشارستانی" (البدوي غير المتحضر)

کە دادەنرا بە کیانێکی پەیوەندیدار بە "دواکەوتن و هەمەجییەت" (التأخر و الهمجیة)[39]. دەتوانرێ بە ئاسانی هەڵێنجێنرێ کە لەناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا، عەرەبەکانیش، هەرچەندە موسڵمان بوون، وەك رەعیەی سوڵتان تەماشا دەکران و سەرجەمیان دادەنران بە "برا لە باوەڕدا"، واتا موسڵمانن پێش ئەوەی تورك بن یان عەرەب. بەم بۆنەیەوە یەکێك لە نوسەرە بەرچاوەکانی عەرەب و دامەزرێنەری گۆڤاری وەرزی "المنار"، رشید رضا (کە بۆنەمان دەبێ باسی لێوە بکەین)، لە نوسینێکدا دەیگوت کە یەکیەتی عەرەب دەوەستێتەوە سەر ئیسلام و زمانی عەرەبی و عەرەبەکان دوایین خەڵکن کە هوشیاری ئینتمای رەگەزییان پەرە پێسەندبێ چونکە زۆربەیان موسڵمانن و وەك موسڵمان هوشیارن تەنها سەبارەت بە هاوڵاتیەتی ئاینیان[40]. جگە لەمەش، ئیمپراتۆریای عوسمانی کە ستروکتوری دەسەڵاتی پێکهاتبوو لە چوارچێوەیەکی ئاینی، مەبەستی تواندنەوەی عەرەب نەبوو و میللەتی عەرەبیش موسڵمان بوو، لەم بارەیەوە هەستی جیاوازی نەبوو لەگەڵ حاکمە عوسمانیەکان.

**بزووتنەوەی عەرەبی:**

لە راستیدا، پێش بزووتنەوەی وەهابی و ئەوەی محمد علی پاشا، ویستی عەرەبەکان بۆ سەربەخۆیی یان باشترە بڵێین بۆ ئۆتۆنۆمی لەناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا دەستی نەکردبوو بە دەرکەوتن، نە لەنێو دورگەی عەرەب و میسر و نە لە لوبنان و سوریاش. ئەوە راستە کە لە یەمەن، یەمەنیەکان بە ویستی خۆیان ملکەچ نەبوون بۆ حوکمی عوسمانی و جار جار رادەپەڕین دژی هەژموونی ئیمپراتۆریا، بەڵام ئەم راپەڕینانە پەیوەندیان نەبوو بە هوشیاریەکی سیاسی سیستێماتیك. یەمەنیەکان باوەڕیان هەبوو بەوەی کە خەلافەتی ئیسلامی دەبێ بگەڕێتەوە بۆ قورەیش و بنەماڵەی ئیمام زەید کە بە "امیر المؤمنین" ناویان دەبرد. لەبەر ئەم هۆیە دانیان نەدەنا بە ڕەوایی خەلافەتی "ال عثمان" لە نێو دورگەی عەرەب. وەك ئەنجام، زۆر جار لە ناوچە شاخاویە سەختەکان شەڕیان دەگێڕا دژی سوپای عوسمانی و بەو شێوەیە کێشەو گرفتیان بۆ حکومەتی عوسمانی دروست دەکرد[41].

سەرەتای بزووتنەوەی عەرەبی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی وەهابیەکان و لە راستیدا ئەوان دادەنرێن بە دەستپێشخەری بزوتنەوەی ئۆتۆنۆمی دژ بە تورك. بەڵام ئەم بزوتنەوەیەش بە هیچ شێوەیەك دانانرێ بە دەربڕێکی راستەقینە بۆ هەستی تایبەتمەندیەتی میللەتی عەرەب. ئەمەش وەك ئەوەی یەمەنیەکان، بە پلەی یەکەم بریتی بوو لە بزوتنەوەیەکی ئاینی. ئەوەی وەهابیەکان خەسڵەتی پەرچەکردارێکی سایکۆلۆژی هەبوو دژ بە عوسمانیەکان کە گوایە حکومەتی عوسمانی و سوڵتانی عوسمانی دەیەوێ چاکسازی بکات لە سەر مۆدێلی ئەوروپی. بەڵام لە هەمان کاتدا لە ئەنجامی لاوازیی ئیمپراتۆریای عوسمانی بوو. کاتێك ئەمیر محمد ئال سەعود لە ساڵی ١٨٠٦ بە سەربەرزیەوە هاتە ناو مەکەوە لە نوێژێکی هەینیدا، نوێژکەرەکان ناوی ئەویان هێنا وەك پیاوێکی دەسەڵاتدار نەك ناوی سوڵتانی عوسمانی سوڵتان سەلیمی سێهەم[42]. بەڵام دەتوانرێ بوترێ کە جۆشی سیاسی وەهابیەکان زیاتر بەند بوو بە ئاینی ئیسلامەوە نەوەك بە مەسەلەی ئینتمای نەتەوەیی. لەو سەردەمەی ئەمیر محمد ئال سەعود، قونسوڵی فەرەنسی لە بەغدا دەیگوت کە لەوانەیە یادەوەری هێزی کۆنی عەرەبەکان بژێتەوە لە دڵی عەرەبەکان و ئەم دیدەی وەردەگرت لەوەی کە رۆژێك وەهابیەك بە مێلۆدیەکی پێغەمبەرانە دەیگوت "کات

نزیکبۆتەوە بۆ ئەوەی ببینین کە عەرەبێك دابنیشێ لەسەر تەختی خەلیفەکان. ئێمە بۆ ماوەیەکی زۆر ناڵاندمان لەژێر دەستی داگیرکەر"[٤٣]. هەرچۆنێك بێت، وەهابییەکان هەرچەندە لە سەرەتادا لاواز بوون و چەند جارێك بەزێنران (١٨١٠ و ١٨١٧) لەلایەن محمد علی پاشا، بەڵام لە کۆتاییدا توانیان بە شێوەیەکی هەمیشەیی مەکە لەساڵی ١٩٢٤، لە رێگەی سەرکردایەتی مەلیك حسین، بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە. بەڵام هەروەکو ئاماژەمان پێدا، بزووتنەوەی وەهابی کە لە نەجد سەری هەڵدا بە هیچ شێوەیەك ناسیۆنالیست نەبوو و وەهابییەکان خەمی دامەزراندنی دەوڵەتێکی عەرەبییان نەبوو[٤٤]. لەڕاستیدا وەهابییەکان پاکخواز (صفائی، *purist*) بوون کە باوەڕیان بە گێڕانەوەی ئاینی ئیسلام بۆ سەرچاوەی رەسەنی خۆی هەبوو، دژی کەمتەرخەمی و بێ باکی بەرامبەر ئاین و گومڕایی و زەندیقی بوون. بۆ وێنە دۆکترینی وەهابی بریتی بوو لە بەرەو بەرەنگار بوونەوەیەك دژ بەو هێزە کۆمەڵایەتیانەی کە لەو سەردەمەدا باو بوون و هەوڵدانێك بوو بۆ ژیانتنەوەی دەسەڵات و هێزی ئەو عەشیرەتە عەرەبانەی کە هێشتا لە نەزانی و بێ باکی دەژیان بەرامبەر بە ئاین و شەریعە لەلایەکەوە و دژی ئیمپراتۆریای عوسمانی کە ئیسلامی پەرە پێ سەندبوو لە میانەی ئەو ساڵانەی کە حوکمڕانی ئەو ناوچانەی دەکرد لە لایەکی دیکەوە[٤٥]. وەهابییەکان بانگەشەیان دەکرد بۆ وەستان دژی هەموو شتێك کە لە ئیسلامی یەکەمەوە هەڵگەڕاوەتەوە و هەموو شتێك بە پێچەوانەی ئیسلامی راستەقینەوە بێت، پێویستە، بە دیدی ئەوان، لابرێت و موسڵمان دەبێ ڕووی راستەقینەو پاکژی ئیسلام بپارێزێ. لە راستیدا دامەزرێنەری بزووتنەوەی وەهابی، محمد عبد الوهاب (١٧٠٣-١٧٨٧)، دەیگوت کە ئەو ئیسلامەی سوڵتانی عوسمانی بەرگری لێ دەکرد، بریتی نەبوو لە ئیسلامی راستەقینە چونکە نوێنەرایەتی موسڵمانانی نەدەکرد، لە بەرئەوە سوڵتان نوێنەرایەتی سەرکردەی راستەقینەی "الامة"ی نەدەکرد. لەو ساڵانەی کە لە ژیاندا بوو، عبد الوهاب یەکی گرت لەگەڵ ئیبن سعود و بە هێزێکی بچوکەوە دەوڵەتێکیان لە سەر بنچینەی شەریعە دامەزراند[٤٦]. لە بەر ئەم هۆیە، دەتوانرێ بوترێ کە بزووتنەوەی وەهابییەکان جگە لە دروستکردنی گرفتی هەنوکەیی، ئەو تایبەتمەندیە سیاسیە بەرچاوەی نەبوو، خاوەنی ئەو هێزە گەورەیە نەبوو کە بوونی ئیمپراتۆریای عوسمانی بخاتە مەترسیەوە.

جوڵانەوەیەکی دیکە کە هەستی دەربڕی دژ بە ئیمپراتۆریای عوسمانی و سەروەری تورکی، بریتی بوو لەوەی محمد علی پاشا لە میسر لە نێوان ١٨٣٠ و ١٨٤١دا. هێزەکانی ئەم سەرکردە بە ڕەسەن تورکە، سوریاو دەورووپشتیان داگیر کرد. بەڵام ئایا ئەمەش دەژمێردرێ بە خەباتی ناسیۆنالیستی عەرەب بۆ دامەزراندنی ئیمپراتۆریایەکی عەرەبی سەربەخۆ لەوەی عوسمانییەکان، یان ئایا ئەم بزوتنەوەیە دەوەستایەوە سەر هەستێکی ناسیۆنالیست؟ نەخێر. بە بۆچوونی زۆر لە نووسەرە عەرەبەکان و بەتایبەتی بە بۆچوونی ناسیۆنالیستی عەرەب، ساطع الحصری، بزووتنەوەی محمد علی کە هەرچەندە ناژمێردرێ بە بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیست، بەڵام توانی بە شێوەیەکی فراوان خزمەتی هەستی ناسیۆنالیزمی عەرەبی بکات چونکە بوارێکی فراوانی رەخساند بۆ بنیادنانی راپەڕینێکی فیکری و ئەدەبی عەرەبی[٤٧]. هەرچۆنێك بێت دیدی ئەم یان ئەو بیرمەند، دەتوانرێ بوترێ کە محمد علی پاشا، "دامەزرێنەری میسری نوێ"[٤٨]، توانی بۆ

ماوەیەك میسر بكات بە كیانێكی سەربەخۆ، بەڵام ئەم سەربەخۆییە هەژێنەرێك نەبوو بۆ ئامادەكردنی ئایندەی میللەتی عەرەب بۆ هەستی نینتمای ئێتنیكی جیاواز. محمد علی پشتگیری عەرەبەكانی نەبوو، زێدەڕەوی نیە ئەگەر بوترێ كە ئەو پیاوێكی هەلپەرست بوو كە دەیویست كەڵك وەربگرێ لە لاوازبوونی ئیمپراتۆریای عوسمانی و هەوڵ كێبڕكێی هێزی بەریتانی و فەرەنسی لە پێناوی دەسەڵاتی شەخسی خۆی و بە دەستەوەگرتنی جڵەوی حوكمی سیاسی بقۆزێتەوە. محمد علی توانی دەزگای نوێ لە میسر دابمەزرێنێ، بەڵام لە هەمان كاتدا سەرجەم ئەو بەربەستانەی شكاند كە بەرامبەر بە دەسەڵات و چاكسازیەكانی وەستابوونەوە. محمد علی سوپا و هێزی دەریایی نوێی دامەزراند كە لەلایەن فەرەنسیەكانەوە مەشقیان پێ دەكرا و سیستمێكی مەركەزی لە بواری كارگێڕی و باج بنیادنا، بەڵام ئەمانە لە پاڵپێوەنەرێكی ئایدیۆلۆژیەوە سەرچاوەیان نەدەگرت، بەڵكو لە ئەنجامی خەبات بوون بۆ دەسەڵاتی شەخسی[٤٩]. لە بەرئەوە دەتوانرێ، هەرچۆنێك بێت، گومان هەبێت سەبارەت بەوەی كە محمد علی ویستبێتی دەوڵەتێكی عەرەبی بنیادبنێ.

بەڵام لە هەندێ ووتاری سەیر، تێبینی دەكرێ كە ئیبراهیم پاشای كوڕی كە پاش باوكی دەسەڵاتی گرتە دەست، ویستویەتی گوزارشت بكات لە ئامانجی خۆی بۆ بنیادنانی دەوڵەتێكی عەرەبی. هەستی پۆزەتیڤی ئیبراهیم پاشا بۆ میللەتی عەرەب لە چەند ووشەیەكدا دەردەكەوێ كە دەربڕیون بۆ میوانێكی فەرەنسی: "من تورك نیم، من منداڵ بووم كاتێك هاتم بۆ میسر و لەو كاتەوە خۆری میسر خوێنی منی گۆڕی و بە جارێك منی كرد بە عەرەب"[٥٠]. لە نامەیەكیدا بۆ باوكی، ئیبراهیم پاشا بەم شێوەیەی خوارەوە گوزارشتی دەكرد لە هەست و بیروباوەڕی: "جەنگ لەگەڵ توركەكاندا بریتی بوو لە جەنگێكی ناسیۆنال و رەگەزیی و مرۆڤ دەبێ (ئامادە بێت) ژیانی خۆی بەخت بكات لە پێناوی نەتەوەی خۆی"[٥١]. بێگومان ئیبراهیم پاشا عەرەب نەبوو، بەڵام ئەم ووشانە بەبێ هۆكارێك نەوتراون. جاری وا هەیە كە خەبات بۆ دەسەڵات وا لە مرۆڤ دەكات كە شتێك بكات بە داردەست لە پێناوی فراوانكردنی رووبەری ئۆتۆریتای خۆی. جاری وا هەیە كە بەبێ پاڵپشتێكی ئایدیۆلۆژی و دیدێكی فەلسەفی تایبەت، گەڕان بە شوێن دەسەڵاتدا ئەو كەسایەتیانە بەند دەكات لە ناو قەفەزی خۆپەرستی و كردەی هەڵەشە. هەرچۆنێك بێت، دەشێ رووناكی بخرێتە سەر ئەوەی كە جگە لە هەندێ زانیاری پچڕ پچڕ، هیچ نیشارەتێكی سیستماتیك نیە بۆ سەلماندنی هەستی ناسیۆنالیستی ئیبراهیم پاشا یان ئەوەی باوكی.

جگە لەو ناوچانەی كە باسمان لێوە كردن، لە لوبنانیش چەند جوڵانەوەیەك ئارامی سیاسی ئیمپراتۆریایان خستبوە گومانەوە. لە لوبنانیش هەستی دژ بە تورك دەستی كرد بە پەرەسەندن لە ئەنجامی هەندێ فاكتەری دەرەكی كە پەیوەندیدار بوون بە كاریگەری پەروەردەی ئەورووپی و بیرۆكەی سیاسی پەیوەست بە شۆڕشی فەرەنسیەوە و هەندێك فاكتەری دیكەش، وەك ژیانەوەی زمان و ئەدەبی عەرەبی و بڵاوبونەوەی رۆژنامە بە زمانی عەرەبی و گەشتی لوبنانیەكان بۆ دەرەوەی ناوچە بە تایبەتی بۆ فەرەنساو گەڕانەوەی نۆر لە كۆچبەرەكان لە ئەمریكاوە. مەسیحیەكانی لوبنان رۆڵێكی سەرەكیان هەبوو لە پەرەپێدانی هەستی دژ بە تورك. بۆچی؟ چونكە ئیمپراتۆریای عوسمانی موسڵمان بوو و بۆ ئەوان تەنها نوێنەرایەتی موسڵمانانی دەكرد.

لەبەر ئەم هۆیە دەسەڵاتی عوسمانیان دادەنا بە دەسەڵاتێکی بێگانە. بەپێی هەستی ئەوان، حکومەتی عوسمانی، حکومەتی ئەوان نەبوو و ئەم هەستەش پەیوەندییەکانی ئاڵۆزتر دەکرد و بارودۆخێکی قەیراناوی دەهێنایە کایەوە. لە راستیدا هۆکارێکی دیکە هەبوو کە بە هەموو شێوەیەك ئەوان هەستی ناڕەزایی خۆیان دەربەبڕی دژ بە ئیمپراتۆریا: شەڕی ئەهلی ساڵی ١٨٦٠ کە بووە هۆی نانەوەی قەسابخانەیەکی گەورە دژی مارۆنییەکان لەلایەن دروزەکانی ناوچە شاخاویەکان و موسڵمانانی کەناری دەریا. پاش ئەو قەسابخانەیەی کە لەو شەڕە کەوتەوە، مارۆنییەکان، چیتر، دوو دڵ نەمانەوە لە کارکردن بۆ جیابونەوەیەکی تەواو لە ئیمپراتۆریای عوسمانی[٥٢].

## رۆڵی مێژوویی و سیاسی مەسیحییەکان لە پەرەپێدانی ناسیۆنالیزمی عەرەبی:

لە راستیدا مەسیحییەکانی لوبنان رۆڵێکی گەورەیان بینی لە پەرەپێدانی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و دەتوانرێ ئەمانە بژمێردرێن بە دەستپێشخەری هەستی ناسیۆنالیزم لە جیهانی عەرەبیدا. جگە لە هەستی جیاوازی ئاینی و سیاسەتی جوداکاری دەوڵەتی عوسمانی، دوو فاکتەری گرنگ ئەم رۆڵەیان خستە بەرچاو: فاکتەری پەیوەندی بازرگانی بە جیهانی ئەورووپاو کاریگەری کاری گروپە مژدەبەخشە ئاینییەکان لەناو جیهانی عەرەبیدا بەتایبەتی لە لوبنان.

دەزانرێ کە بەهۆی پێگەی جوگرافییەوە، لوبنان هەر لە سەردەمی فینیقیەکانەوە، دەروازەیەکی گەورەی کردبووەوە بۆ پەیوەندییە بازرگانییەکان لەگەڵ ئەورووپادا بە تایبەتی لەگەڵ فەرەنسا. لوبنان بریتی بوو لە یەکەم ناوەندی بازرگانی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و پردێکی بەرچاوی دروستکردبوو لەنێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا. لەنێو سەرجەم هاوڵاتیان، مەسیحییەکان رۆڵێکی گەورەیان بینی لەم پەیوەندییە بازرگانیانە. بۆچی؟ چونکە هەر لە سەردەمی تورکەکانەوە، پێش ساڵی ١٨٥٦، یەهودی و مەسیحییەکان لە گوندەکاندا بۆیان نەبوو بە سەربەستی ببن بە خاوەن زەوی و هەتا ساڵی ١٨٧٦ هەمان یاسا جێبەجێ دەکرا بەسەر سەرجەم بێگانەکانی ناو ئیمپراتۆریای عوسمانی. ئەنجامی ئەم سیاسەتە جوداکارییە ئەوە بوو کە ژمارەیەکی زۆر لە هاووڵاتیانی مەسیحی لادێکانی خۆیانیان بەجێهێشت و رویانکردە ناو شارەکان بۆ زامنکردنی ژیانی خۆیان و خێزانەکانیان. وەك زۆر ئاسانە هەڵێنجێنرێ، شارەکان، بۆ ئەو سەردەمەو هەموو سەردەمێك، بریتیی بون لە ناوەندی بازرگانی و لە بەر ئەوە زۆر ئیمکانیاتی دیکەیان پێشکەش بە خەڵکی دەکرد. وەك تێبینی دەکرێ ژیان لە شاردا زۆر بواری بە تایبەتی بواری بازرگانی دەڕەخساند بۆ هاووڵاتیانی مەسیحی. لەگەڵ رۆیشتنی کاتدا، مەسیحییەکان زۆربەی زۆری توێژی بازرگانانیان پێك هێنا و دەتوانرێ بوترێ کە زۆرێك لە مەسیحیە لوبنانییەکان بوون بە بازرگانی دەوڵەمەند لە ناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا. لە ئەنجامی پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ئەورووپادا، زۆر لە هاووڵاتیانی مەسیحی داب و نەریت و زمانی بێگانە فێر بوون. بەم شێوەیە، ئەوانەی کە وردە وردە دەوڵەمەند دەبوون، بەشداریەکی بەرچاویان دەکرد لە گەشەسەندن و پێشخستنی وڵاتەکە. بێگومان، فراوانبوونەوە و گەشەسەندنی بواری بازرگانی، پرۆسەی بەخۆرئاواییبونی جیهانی عەرەبی (و بە تایبەتی پرۆسەی بەخۆرئاواییبونی لوبنانی) پێشخست. بەم شێوەیە، لە سەدەی نۆزدەهەمدا،

بیروت بوو بە ناوەندی بازرگانی: دوکان و بازاڕی لوبنانی پڕبوو بوون لە شمەك و کاڵای کارگە ئەورووپی و ئەمریکیەکان. جگە لەمەش، ئەم گەشەسەندنە زۆر لە کۆچبەرە لوبنانی و سوریەکانی هاندا کە لە بەرازیل و ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا و ئوستورالیا. هتد بگەڕێنەوە بۆ وولاتی خۆیان و ئەو سەروەت و سامانەی خۆیان خەرج بکەن کە بۆ چەندین ساڵ لە هەندەران کۆیان کردبووەوە. شایستەی ئاماژەیە، تەشەنسەندنی بواری بازرگانی و پرۆسەی گەشەسەندن، دەرگایەکی دیکەی کردەوە و کاریگەریەکی دیکەی دروستکرد لە سەر بوارەکانی ژیان: بواری رۆشنبیری و زانیاری و بەتایبەتی لە بواری پەروەردە. بواری پەروەردەی خۆرئاوایی و بەتایبەتی ئەوەی فەرەنسا، رۆڵێکی گەورەی بینی لە هاندانی هەستی دژ بە تورك و لە ئەنجامدا هەستی نیتمای عەرەبی وورووژاند. بیروباوەڕی خۆرئاوایی و بەتایبەتی بیروباوەڕی فەرەنسی لەناو دەڤەرەکانی ئیمپراتۆریای عوسمانیدا، بەتایبەتی لەلایەن قوتابخانە پەروەردەییە ئاینیەکان بڵاوکرانەوە. بۆ نمونە، پاش ساڵی ١٨٣١ یەسوعیەکان چەند قوتابخانەیەکی مژەبەخشیان کردەوە لە بیروت و غزیر و زحلەو دمشق و حلب. لازەریە ئەمریکیەکان چەند دەزگایەکیان کردەوە، هتد. بێگومان قوتابخانەی سەر بە پرۆتستانتەکان و زانکۆی یەسوعیەکانی سانت جۆزێفیش کە لە بیروت لە ساڵی ١٨٧٥ دامەزرا[٥٣]، بریتی بوون لە دەزگا هەرە گەورەو بەرچاوەکان.

پێویستە سەبارەت بە چالاکی مژدەبەخشە خۆرئاواییەکان خاڵێك روون بکرێتەوە: راستە کە نێردراوە مەسیحیە مژدەبەخشەکان هاتبوون بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی باوەڕی مەسیحی لەناو هاوڵاتیان. ئەوەش راستە کە هەرچەندە هاتبون بۆ ئەو مەبەستە، بەڵام زۆر هەوڵ و تەقەللایان بە ئاڕاستەی بەرزکردنەوەی پرێستیجی سیاسی وڵاتەکانیان بوو. لەبەر ئەم هۆیە شتێکی سەرسەڕهێنەر نیە بیر بکرێتەوە لەوەی کە ئەمانە، سەرجەمیان، لەلایەن حکومەتەکانیانەوە نێردرابوون و بە تەواوی لەلایەن حکومەتەکانیانەوە پشتگیریان لێدەکرا. بەم بۆنەیەوە، دەتوانرێ گوتەی یەکێك لە گەورەترین کەسایەتی سیاسی فەرەنسای کۆماری دوەم، گەمبێتە *Gambetta*، وەبیربهێنرێتەوە کە دەیگوت: "کەردینال لەڤیجری *Lavigerie* و مژدەبەخشەکانی (لە سوریا) زیاتر لە لەشکرێك خزمەتی فەرەنسایان کردوە". "بەڵێ، زیاتر لە لەشکرێك خزمەتیان کردوە، زیاتر لە دەستەیەکی ئیستۆلەکەمان (کەشتی جەنگەکەمان)"[٥٤]. هەروەها نوێنەری بانگخوازەکان بەو بۆنەیەوە دەیگوت: "ئێمە هەموو سوریامان ئەوێ، لە غەزەوە بۆ ئەدەنە و لە لوبنانەوە بۆ موسڵ"[٥٥]. پێویستە تێبینی شتێکی دیکەش بکرێ: ئەوە راستە کە لە ناو پرۆگرامی ئەو قوتابخانەو دەزگا پەروەردەییە مژدەبەخشانە کە دامەزران، بابەتی سیاسی نەدەخوێندران. ئەوە راستە کە بابەتەکان بریتی بون لە فیزیاو کیمیاو بیرکاری، هتد. بەڵام شارەزا بوون بە زمان و ئەدەب و کولتور و مێژووی فەرەنساش بەشێك بوو لە ئامانجی ئەم دەزگایانە. بەم بۆنەیەوە، وەزیری دەرەوەی فەرەنسا، بەم شێوەیەی خوارەوە قونسوڵی گشتی لە بیروت ئاگادار دەکردەوە سەبارەت بە بەخشینی زەمالاتی خوێندن لە ناو قوتابخانە یەسوعیەکان لە سوریا.

"کاتێك (سیستمی) زەمالات دامەزرا لە سوریا، دوو ئامانجی سەرەکی پێشنیازکران: یەکەم بریتی بوو لە بنیادنانی یاوەر *client* لە

نێوان ئەو خێزانانەی کە هەڵدەبژێردران بۆ زەمالات. ئامانجی دووەم بریتی بوو لە چاندنی تۆوی جۆش لە ناو گیانی منداڵ و سەرەك دەزگاکان بۆ خوێندنی زمانی فەرەنسی. توانیمان بەشێك لەم دوو ئامانجە بپێکین، چونکە ژمارەیەکی دیاریکراو لە خێزانە بەرچاوەکانمان بەستەوە بە خۆمانەوە کە گەنجترینیان لە ناو چوارچێوەی خۆشەویستی بۆ فەرەنسا پەروەردە کراون. ئەمانە بە لایەنی کەمەوە توانیان زانیاریان هەبێت سەبارەت بە زمان و مێژوی (فەرەنسا)"[٥٦].

مەسیحیەکان بەشێکی بەرچاویان لە دانیشتوانی سوریاو لوبنان پێك دەهێناو دەتوانرێ بە دڵنیایی بوترێ کە لە لوبنان زۆرینەی دانیشتوانیان پێکدەهێنا[٥٧]. مەسیحیەکان دابەش بوو بوون بە سەر سێ گروپی (ئاینزای) سەرەکیەوە: ئۆرتۆدۆکس، کاتۆلیك و پرۆتستانت. ئۆرتۆدۆکسەکان دەژمێردرێن بە کۆنترین گروپی ئاینی لەناو وڵاتە عەرەبیەکاندا. ئۆرتۆدۆکسەکان پێکهاتبون لە سێ بەشی سەرەکی: نەستۆریەکان، یەعقوبیەکان و رۆمی ئۆرتۆدۆکس. نەستۆری و یەعقوبیەکان کە ناسراون بە "سریانە کۆنەکان" مەراسیمی ئاینیان بە زمانی سریانی رادەپەڕاند و رۆمی ئۆرتۆدۆکس کە پێیان دەوترێ "سریانی ئۆرتۆدۆکس"، بە زمانی یۆنانی لە کەنیسەکانیان تەراتیلی نوێژیان جێ بە جێ دەکرد. هەر لە سەردەمی یۆنانیەکانەوە هەتا ساڵی ١٨٩٩ ئەو بەترەکیانەی کە سریانی ئۆرتۆدۆکسیان پێکدەهێنا، واتا بەترەکیەی ئەنتاکیا و قودس و ئەسکەندریەو زۆربەی زۆری بەترەك و مەترانەکان، یۆنانی بوون و نوێژو مەراسیمی ئاینی بە زمانی ئاینی بوون. پاش ساڵی ١٨٩٩، واتا پاش هەڵبژاردنی "دومانی" (کە مەترانێکی خەڵکی سوریا بوو) بە مەتران، وردە وردە دەستکرا بە عەرەبیاندنی کەنیسە ئۆرتۆدۆکسەکان لە پێشدا لە ئەنتاکیا کە بارەگاکەی لە دیمەشق بوو و دوایش لە قودس و ئەسکەندریە[٥٨]. شایستەی وەبیرخستنەوەیە کە ئەمانە لە لایەن روسیاوە پشتگیریان لێ دەکراو یارمەتی دەدران. بێگومان ئاسانە هەڵێنجێنرێ کە روسیا وەك وڵاتێکی بە ئاینزا ئۆرتۆدۆکس، خۆی بە پارێزەری ئۆرتۆدۆکسیەت دەزانی. لەبەرئەوە هەڵوێستێکی هاوکاریانەی هەبوو لەگەڵ ئۆرتۆدۆکسە لوبنانی و سوریەکان و هەنگاوی باشی دەنا بە ئاراستەی دروستکردنی قوتابخانەو دەزگا پەروەردەییەکان. بەڵام لەبەر دووری جوگرافی لەم ناوچەیە، روسیای قەیسەری هیچ تەماعێکی ئیقلیمی نەبوو و هەوڵی نەئەدا هەژمونی سیاسی خۆی بسەپێنێ بە سەریاندا. تەنانەت پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەریش، میراتی ئیمپراتۆریای عوسمانی، هەموری، بە جێهێڵرا بۆ فەرەنساو بەریتانیای مەزن و چیتر ئۆرتۆدۆکسیەتی روسی نەمایەوە وەك یەکێك لە فاکتەرەکانی قەوارەی ئاینی و سیاسی.

ئاینزای پرۆتستانت تەنها لە سەدەی نۆزدەهەم لەلایەن مزگێبەخشە ئینگلیز و ئەمریکیەکانەوە بڵاوکرایەوە. بە بەراورد لەگەڵ ئۆرتۆدۆکس و کاتۆلیك، پرۆتستانتیزم ئاینزایەکی نوێ بوو و هەروەها نامۆ بوو بە کولتوری ئاینی سوریاو لوبنان چونکە بە شێوەیەکی سەرەکی تایبەت بوو بە بەریتانیاو ئەمریکاوە. یەکەم کاری مژدەبەخشە پرۆتستانتەکان بریتی بوو لە وەرگێرانی ئینجیل بۆ زمانی عەرەبی و ئەمجاش هەڵسان بە پێگەیاندنی خەڵکی ئاینی لە نێوان عەرەبەکان. ئەنجامی ئەم دوو کارە، نوێژکردن و راپەڕاندنی مەراسیمی ئاینی بە زمانی عەرەبی لێکەوتەوە. لەگەڵ رۆیشتنی کات، نوێژکردن و خوێندنەوەی

تەراتیلی ئاینی لە ناو کەنیسەو قوتابخانە پرۆتستانتەکان بە تەواوی بوو بە زمانی عەرەبی. وەك تێبینی دەکرێ، پرۆتستانتەکان یەکەم گروپ بوون کە هەڵسان بە بڵاوکردنەوەی زمانی عەرەبی بە لایەنی کەمەوە لەنێوان خەڵکی ئاینیدا. ئەم بایەخەی گروپە پرۆتستانتەکان بە مەسەلەی زمان و کولتووری عەرەبی، نێردراوە مژدەبەخشەکانی دیکەشی هاندا بە هەمان ئاراستەدا. هەستی کێبڕکێی ئاینزایی پاڵی نا بە فەرەنسا و ئیتالیاشەوە هەمان کار ئەنجام بدەن. ئەمانیش وەك مژدەبەخشە بەریتانی و ئەمریکیەکان هەڵسان بە دامەزراندنی قوتابخانەو دەزگا پەروەردەییەکان لەناو لادێ و شاردا لەپێناوی بڵاوکردنەوەی ئاینزای کاتۆلیك لەناو خەڵکیدا. ئەگەر، بۆ نمونە، ئەمریکیەکان قوتابخانەیەکیان لە گوندێك دامەزراندایە، یەسوعیەکان، ئەوانیش، دەچون قوتابخانەیەکی دیکەیان دەکردەوە[٥٩]. لەو ساڵانەی دواییدا فەرەنسا بوو بوو بە ئەکتەرێکی گرنگ و رووبەری کاری ئیتالیەکانی کز کردەوە و ئیتالیای ناچارکرد بواری بۆ چۆڵ بکات. ئەمجا، فەرەنسا بە کێبڕکێ لەگەڵ بەریتانیاو ئەمریکادا، توانی بە شێوەیەکی چالاك نێردراوە کاتۆلیکەکان هان بدات و دەستبڵاوانە دەستی یارمەتی دارایی و ئیداری و سیاسیان بۆ درێژبکاتەوە. بەم شێوەیە، پاش ساڵی ١٨٧٠، بە تایبەتی پاش پەراوێزخستنی بانگخواز و مژدەبەشە ئیتالیەکان و گرنگیدان بەوانەی فەرەنساوە لەلایەن پاپاوە، فەرەنسا بوو بە جەمسەرێکی پتەو نەك تەنها بۆ هاوکاری و یارمەتی ئاینزایی لە سوریاو لوبنان، بەڵکو بۆ دەست بەسەراگرتنی سیاسی وڵاتەکەی بە سەر ئەو دوو وڵاتەدا و هەروەها بۆ هاندانیان دژی دەوڵەتی عوسمانی[٦٠].

جێی باسە کەئەوەی فەرەنسا کردی لە بواری ئاینیدا، توانی بەرهەمی خۆی هەبێت لە بواری سیاسیدا. جگە لە هاندانی زمان و کولتووری عەرەبی، فەرەنسا بەشداریکرد لە هێنانەکایەو پێکهێاندنی چەندین گروپ و کەسایەتی سیاسی کە ئیمپراتۆریای عوسمانیان دادەنا بە هێزێکی دژ کە پێویست بوو تیایدا چاکسازی بکرێت لە بواری ئازادی و یەکسانی مەسیحیەکان لەگەڵ باقی هاووڵاتیان. ئەمانە قەناعەتیان هەبوو بەوەی کە پێویست بوو پشت بەستوو بونایە بە ئەوروپیەکان و بە تایبەتی بە فەرەنسا لە پێناوی پاراستنیان لە زۆرینەی موسڵمان. ئەم گروپ و کەسایەتیانە بوون بە بەردی بناغەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و بە تایبەتی لە چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە بەهێزترین هەستی دژ بە ستەمکاری عبد الحمید و حکومەتەکەیان پێکهێنا لە سوریا کە ئەو سەردەمە سەنجەقی لوبنانیشی دەگرتەوە.

## بیرمەندە مەسیحیەکان و ناسیۆنالیزمی عەرەبی:

هەروەك لە پێشدا ئاماژەمان پێدا، لەو سەردەمەدا ناسیۆنالیزمی عەرەبی بوونێکی راستەوخۆی نەبوو لە ناو هەستی جەماوەری عەرەبی و ئەو پەیوەندیانەی کە تاکی عەرەبی بە گروپەکەیەوە دەبەست بریتی بوون لە پەیوەندیەکی ئاینی و ناوچەیی. ئەو سەردەمە موسڵمان یان ناموسڵمان هەبوو و موسڵمانیش سوننی بوو یان شیعی و مەسیحی مارۆنی یان ئۆرتۆدۆکس یان کاتۆلیك یان پرۆتستانت بوو. مەسەلەی یەکیەتی نەتەوەیی زیاتر لە نێوان ژمارەیەك لە رۆشنبیر و بیرمەندی مەسیحی پێشکەش دەکرا وەك رزگاربون لە هەژموون و دەست بەسەراگرتنی تورکەکان. کەسایەتیە هەرە ناسراوەکان بریتی بوون لەمانەی خوارەوە: ابراهیم الحوراني، اديب اسحق، يعقوب صروف،

ابراهيم اليازجي، فارس نمر پاشا، شاهين مكاريۆس و احمد فارس الشدياق. ئەمانە زۆر كاریگەری کەسایەتیەكی زۆر رەخنەگرو نارازی لە دەسەڵاتی عوسمانیان لە سەر بوو: الياس حبالين. الياس حبالين مەسیحیەكی مارۆنی بوو و مامۆستای زمانی فەرەنسی بوو لە كۆلێجی پرۆتستانتی سوری لە لوبنان لە نێوان ١٨٧١-١٨٧٤.

الياس حبالين لە ساڵی ١٨٣٩ لە لوبنان لەدایك بوو بوو و لە ساڵی ١٨٨٩ لە میسر ماڵئاوایی لە ژیان كردبوو. لە قوتابخانەی پیاوە ئاینیە لازەریەكان خوێندنی تەواو كردبوو و بە باشی فێری زمان و ئەدەبیاتی فەرەنسی بوو بوو. بۆ ماوەیەك لە قوتابخانەو كۆلێجەكانی بیروت وانەی وتبوەوە و لە ساڵی ١٨٦٦ بوو بوو بە سەرۆك نووسەرانی رۆژنامەیەكی لوبنانی بە ناوی "لبنان" و هەتا ساڵی ١٨٧٥ لە قونسولیەی فەرەنسی لە لوبنان لەلایەن حكومەتی فەرەنسیەوە دامەزرابوو وەك وەرگێڕ[٦١]. الياس حبالين فۆلتێری خوێندبۆوە و بیر و رای زۆر شۆڕشگێڕ و پێشكەوتنخوازنە بوو. دەوترێ كە لە وانەو موحازەرەكانیدا باسی سیاسەتی دەكرد و سكاڵای خۆی دەردەبڕی سەبارەت بە ناعەدالەتی توركەكان و قوتابیانی هان ئەدا دژی حكومەتەكەیان. قوتابیەكانی كە سەرجەمیان مەسیحی بوون، ئەوانیش لەژێر كاریگەری مامۆستاكەیان بیر و رای خۆیان بڵاودەكردەوە لە نێوان خەڵكی. سلیم عمون یەكێك بوو لەوانە. سلیم عمون یەكێك بوو لەو گەنجە بەپەرۆشانە بۆ مەسەلەی رزگار بوون لە حوكمڕانی عوسمانی و بۆ ئەم مەبەستەش رێكخراوێكی دامەزراندبوو و لەژێر كاریگەری الياس حبالين خەڵكی هان ئەدا لەپێناو رزگاركردنی لوبنان.

بێگومان، ئامانجی ئەم گەنجانە بریتی بوو لەوەی كە رزگاریان بێ لەو سوكایەتیەی كە پێیان دەكرا و لە بچوك كردنەوەیان لەلایەن توركەكانەوە. بۆ ئەم گەنجانە، ئیمپراتۆریای عوسمانی دەسەڵاتێكی بێگانە بوو چونكە نوێنەرایەتی ئاینەكەیانی نەدەكرد و پێگەی سایكۆلۆژی و كۆمەڵایەتی ئەوان جیاواز بوو لەوەی عەرەبێكی موسڵمان: عەرەبێكی موسڵمان دەیتوانی هەست بكات كە حكومەتەكە حكومەتی خۆیەتی چونكە موسڵمانە هەرچەندە ناشێ ئەوەش فەرامۆش بكرێ كە ئیمپراتۆریای عوسمانی بریتی بوو لە مۆنۆپۆل سوننی بە سەر ئاینزاكانی دیكەدا. بەڵام زۆر گرنگە زوو بە زوو تیشك بخرێتە سەر ئەوەی كە، هەرچۆنێك بێت، دوو خاڵی گرنگ موسڵمان و مەسیحیان لە یەكتر نزیك دەكردەوە: هەردوكیان دەچەوسانەوە لە ژێر حوكمی توركی و هەردوكیان ئینتمای ئێتنیكیان عەرەب بوو. لە بەر ئەرە، خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا بۆ رەتكردنەوەی چەوساندنەوە بریتی بوو لە عەرەبایەتی یاخود عروبە[٦٢]. عروبە دەیتوانی موسڵمانی عەرەب و مەسیحی "بە زمان و كولتور عەرەب" پێكەوە كۆبكاتەوەو هەستی نارەزایی تیژ بكاتەوە دژی دوژمنی داگیركەر. لەبەر ئەم هۆیە، رۆشنبیرە مەسیحیەكان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی كە بۆئەوەی لوبنان رزگار بكەن لە هێزی عوسمانی، پێویست بوو دەست لەناو دەست كار بكەن لەگەڵ ئەو موسڵمانە عەرەبانەی كە بەرژەوەندیان پێكەوە دەگونجا. ئەم یەكگرتنە لە ژێر سێبەری عروبەدا، تەنها گەرەنتی دەبەخشی بە هەردوو لایەن كە بەردەوامی بدەن بە خەبات دژی ناعەدالەت و زۆرداری و زامنكردنی مافی یەكسان لەگەڵ توركەكان. لەبەر ئەمە، موسڵمان و مەسیحی یەكیان گرت بۆ دامەزراندنی رێكخراو و كۆمەڵی نهێنی. دەزانرێ كە لە ساڵی ١٨٨١ نامیلكەیەك دەركەوت لە لەندەن لەلایەن

ڕێکخراوێکی نهێنی بە ناوی "جمعية حفظ حقوق الملة العربية" کە داوا لە عەرەب و "مەسیحیەکانی سوریا"ی دەکرد یەکتری بگرن و "نەتەوەی عەرەب" ڕزگار بکەن لە دەستڕێژکاری تورك[٦٣]. هەروەها مەسیحیەکان زۆر موسڵمانی عەرەبیان ڕێکخست لە ناو ڕێکخراوێکی ماسۆنی نهێنی کە لە بیروت دایانمەزراندبوو. بەم شێوەیە موسڵمان و مەسیحی پێکەوە کاریان دەکرد بۆ هێنانەدی ئامانجەکانیان. ئەم ڕێکخراوە لە ڕێگەی بەیاناتەوە (ئیعلاناتەوە) کە لە ساڵی ١٨٨٠ لە سوریا دەرکەوتن بانگەشەی دەکرد بۆ عەرەبەکان و بۆ "ڕابووردوی مەزنیان" کە خۆیان ڕزگار بکەن لە خراپە و هەڵسوکەوتی ناڕەوای زۆرداری تورك.

یەکێکی دیکەی مەسیحیە لوبنانیەکان کە ڕۆڵێکی باڵای بینی لە پەرەپێدانی ناسیۆنالیزمی عەرەبی بوترس البستانی (١٨١٩-١٨٨٣) بوو. بوترس البستانی مەسیحیەکی لوبنانی سەر بە کۆمەڵگەی مارۆنیەکان بوو و لە ڕێگەی پەروەردەبوونی لە ناو سێمیناره مارۆنیەکان، بە باشی فێری زمانی عەرەبی و هەندێ زمانی بیانی بوو بوو. بۆ ماوەیەك لەو خوێندنگایانە وانەی دەگوتەوە کە لەلایەن قونسولیەت و پیاوە مژدەبەخشە ئینگلیزی و ئەمریکیەکانەوە لە بیروت دامەزرابوون. لە ساڵی ١٨٦٢، البستانی توانی قوتابخانەی "الوطنية" دابمەزرێنێت و لە ناویدا زمانی عەرەبی و زانستە نوێکان بخوێنرێت. لە بواری نووسین و ئەدەبی عەرەبیدا شارەزاییەکی قوڵی هەبوو: بۆ نمونە گۆڤاری وەرزی "الجنان" ی دامەزراند کە لە ناویدا بانگەشەی دەکرد بۆ نیشتمانی سوریا وەك یەکەیەکی جوگرافی. هەروەها توانی نیوەی ژیانی خۆی تەرخان بکات بۆ دانانی فەرهەنگی عەرەبی "المحيط" و ئینسیکلۆپیدیای عەرەبی "دائرە المعارف" کە بە شێوەیەکی گشتی پاڵێکی باشی نا بە ڕێزمان و ئەدەبی عەرەبی وخۆشەویستی بۆ زمانی عەرەبی و پڕ بوو لە بیری لیبراڵی ئەورووپی و ئەمریکی لە بواری زانست و پزیشکی و کاری ئەندازیاری. لە لایەکی دیکەوە، البستانی ئەو بیرۆکەیەی بڵاوکردەوە کە خۆرهەڵات ناتوانێ بەردەوام بێت بە بێ زانینی بیر و ئیکتشافاتی ئەورووپای نوێ. ئەوەی کە پێویستە عەرەب فێری بێت لە ئەورووپا، بریتیە لە گرنگی یەکیەتی نیشتمانی و ویستی هەموو ئەوانەی کە هەمان نیشتمانیان هەیە بۆ هاوکاری[٦٤]. لە ڕاستیدا البستانی هەڵوێست و دیدێکی زۆر زێدڕەوی نەبوو لە مەسەلەی تێڕوانینی بۆ ئەورووپا. بەلای ئەوەوە خەڵکی دەبوو ئەوە فێر بن کە لایەنی پۆزیتیڤ و لایەنی نێگەتیڤ هەن لە ناو کولتور و مێژووی ئەورووپادا. پێویستە لە سەر هاوولاتیان بەبێ هیچ دوودڵیەك لایەنە پۆزیتیڤەکان وەرگرن و ئەوانی دیکە بخەنە لاوە. البستانی قەناعەتی بە ئینتمائاتی مرۆیی هەبوو نەوەك بە ئینتمائاتی نەتەوەیی ڕەق و بەلای ئەو، ئاینەکان هەمان ئامانجیان هەیە و خەڵکی خۆرهەڵات و خۆر ئاوا هەمان سروشتی مرۆییان هەیە و لە یەك زنجیرەی باوو باپیرانەوە دێن و هەمان خودا دەپەرستن. بەڵام جیاوازی نێوان هەوەس و هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان و ئەوانەی شوێن و کات و سەردەم، وا دەکەن کە جیاوازی باو و نەریت پێویست بن. بۆ نمونە جیاوازی عەرەبەکان لە ڕابووردودا بریتی بوو لەوەی کە ئەوان خاوەنی شارستانیەتێکی بەرچاو بوون و هیچ هەڵەیەك لەوەدا نیە کە شانازی پێوە بکەن یان قەناعەتیان پەوە هەبێت کە هەموو ئەوانەی بە عەرەبی قسە دەکەن، مەسیحی بن یان موسڵمان، عەرەب بن. ئەو شارستانیەتەی کە عەرەب بنیادیان نابوو، پاش ماوەیەك لە دەستیانداو هۆکاری ئەم هەرەسهێنانەش پەیوەندی هەبوو بە زۆر بار و

دۆخ ئەك بە قەوارەیەکی ناوخۆیی. ئێستاش عەرەب بۆ ئەوەی خۆیان بژێیننەوە، دەبێ ئەو شارستانیەتە، کە گوازراوەتەوە بۆ ئەورووپا، بگەڕێننەوە بۆ خۆیان و بەو شێوەیە دەتوانن ئەوە وەرگرنەوە کە هی خۆیانە. لەبەر ئەوە، ئەگەر عەرەب دەیانەوێ فێر بن، دەتوانن خێراتر و بە ماوەیەکی کورتر لە ئەورووپا فێر بن. البستانی بانگەشەی دەکرد بۆ یەکیەتی و هانی گەشەپێدانی هەستی نیشتمانپەروەری ئەدا و خۆشەویستی نیشتمانی بە "باوەڕ" (ئیمان) لە قەڵەم ئەدا: بەم بۆنەیەوە دەستەواژەی پەیامبەر و عوسمانیە گەنجەکانی بەکاردەهێناو دەیگوت: "حب الوطن من الایمان" (خۆشەویستی نیشتمان بریتیە لە باوەڕ). لە گەرمەی قەیرانەکەی ساڵی ١٨٦٠، بانگەشەی بۆ "رۆڵەکانی نیشتمان" (ابناء الأمة) دەکرد کار بکەن لە پێناوی نیشتماندا و دوایش خۆی دەناساند بەوەی کە ئەو کەسەیە کە نیشتمانی خۆش دەوێ "محب للوطن"[٦٥]. دەشێ بوترێ کە نیشتمانپەروەریی بوترس البستانی نیشتمانپەروەریەکی عوسمانی بوو، بەو واتایەی کە بۆ ئەو نیشتمان بریتی بوو لە ئیمپراتۆریای عوسمانی هەرچەندە لە لایەکی دیکەشەوە سوریای دەکرد بە نیشتمانێکی نزیکتر. لە گۆڤارە وەرزیەکەی "الجنان" کە خۆی دایمەزراندبوو، دەیگوت کە "ئیمپراتۆریا نیشتمانی ئێمەیە، بەڵام وڵاتی ئێمە سوریایە"[٦٦]. بەو شێوەیە، هەرچەندە دیدی خۆی دەرنەدەبڕی سەبارەت بە جیابوونەوە لە ئیمپراتۆریای عوسمانی و مەدحی دەکرد لەبەر ئەوەی لە بیروت زۆربەی پۆستە گرنگەکانی دابوو بە عەرەبەکان، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی سوریای دائەنا بە نیشتمانی خۆی. بە لای ئەوەوە، سەرجەم ئەو خەڵکانەی لە سوریا دەژین هەمان زمان ئەدوێن و خاوەنی هەمان خاک و داب و نەریتی هاوبەشن. بێگومان البستانی یەکەم نوسەر بوو کە شانازی دەکرد بە ئینتمای بۆ "خوێنی عەرەبی"[٦٧]. بە لای ئەوەوە ئەگەر سوریا دەیەوێ گەشەبسێنێ پێویستە هاوڵاتیان خۆشیان بوێ و هاوکاری یەکتر بن. لەوانەیە لەبەرئەوەی رۆشنبیرێکی مەسیحی بوو و لە بەر گۆڕینی مەزهەبەکەی لە مارۆنیەوە بۆ پرۆتستانت، البستانی باوەڕێکی بەرچاوی هەبوو بە ئازادی ئاینی و یەکسانی و رێزی متبادل لە نێوان ئاینەکان و وەك مەسیحیەك بۆ مەسیحیەکان بنووسێ و بە لای ئەوەدا دەشکایەوە کە پێویستە ئەوان تەنانەت دوژمنەکانیشیان خۆش بوێ و دوور کەونەوە لە رۆحی تۆڵە سەندنەوە. بەم بۆنەیەوەو البستانی جیاکاریەکی دەکرد لە نێوان دوو ئاراستەی ئاینیدا: دەمارگیری (التعصب) کە سوریای روخاند و رێزی متبادل لە نێوان خەڵکی.

بوترس البستانی کاریگەریەکی بەرچاوی هەبوو بۆ سەر بازنەیەك لە رۆشنبیران سەبارەت بە بوونی عەرەب و کولتوری عەرەبی. لە ساڵی ١٨٧٥ هەندێ مەسیحی گەنجی سەر بە بازنە رۆشنبیریەکەی خۆی، کۆمەڵەیەکی نهێنیان دروست کرد و لە نێوان ١٨٧٩-١٨٨٠ دیوارەکانی بەیروتیان پڕ کرد لە ئیعلانات کە بانگەشەیان دەکرد بۆ ئۆتۆنۆمی سوریا بە یەکیەتی لەگەڵ لوبنان و دانان بە زمانی عەرەبی وەك زمانێکی رەسمی و ئازادی گوزارشتکردن و فراوان کردنەوەی بواری زانین[٦٨]. هەر وەك حورانی لە زمانی زین نورالدینەوە هێڵی بە ژێردا دێنێ، ئەم رێکخراوە نهێنیە ئەوەندە گرنگ نەبوو، بەڵام واتایەکی زۆر بەرچاوی هەبوو بۆ زیادکردنی هوشیاری سیاسی مەسیحیە سوریەکان و ئەو کولتورو بیرەی کە لە قوتابخانە مژدەبەخشەکانەوە وەریان گرتبوو، وایان لێ کردبوون کە زیاتر ببەسرێنەوە بە کۆمەڵگەی

خۆیان و خۆیان ببینن وەك کیانێکی جیاواز[٦٩]. پاش ئەوە، چ بەربەستێك هەبوو کە نەهێلێ مەسیحیەکان خەو بە لوبنانێکی سەربەخۆ ببینن؟ مەسیحیەکان، وەك ئاماژەمان پێدا، بریتی بوون لە کۆمەڵێکی بەرچاوی دانیشتوانی سوریاو لوبنان. ئەوان خۆیان بە جیاواز دادەنا لە هاوولاتیانی ئیمپراتۆریای عوسمانی کە پێش هەمور شتێك موسڵمان بوو.

تێڕوانینی بوترس البستانی سەبارەت بە پێکەوە ژیانی پێکهاتە جیاوازەکان لە سنورێکی بەرتەسك نەوەستایەوەو بەردەوامی بە خۆی دا. یەکێکی وەك بولوس نوجەییم و هەروەها هەندێکی دیکە بیریان لە لوبنانێکی سەربەخۆ دەکردەوە، لوبنان کە لە ساڵی ١٨٦١ەوە سەنجەقێك بوو لە ژێر پارێزگاری دەسەلاتی ئەوروپیداو کە زۆربەی دانیشتوانی مەسیحی بوون، شێوە ئۆتۆنۆمیەکی خۆی هەبوو. بۆ زۆر لەوانەی کە هەستی ئینتمای جیاوازیان هەبوو، لوبنان بریتی بوو لە پردێك بەرەو سەربەخۆیی لە ژێر دەسەلاتی ئەوروپیدا. بە لای بولوس نوجەییمەوە، لوبنان پێگەیەکی تایبەتی هەبوولە ناو سوریای جوگرافیدا و ئەگەر رۆژێك سوریا ئازاد بوایە، ئەوا لوبنان تیایدا دەبوو بە ئەکتەرێکی گرنگ و پێشەوا. هەمان تێڕوانینی بوترس البستانی بە شێوەیەکی گشتی دووبارە دەبوەوە لە لایەن هەندێکی دیکە کە سوریا هەر لە زنجیرە شاخەکانی تۆرۆسەوە هەتا بیابانی سینا دەبوو سەرجەم پێکهاتەکانی لە مەسیحی و موسڵمان و یەهودی و دروزی بگرتایە و بە هاوکاری لەگەڵ یەکتری وولاتێکیان بنیاد بنایە کە هیچ حیسابێکی نەکردایە بۆ زۆرینەو کەمینە.

دەتوانرێ بوترێ کە لە رێگەی تێڕوانینی البستانیەوە هەتا ئەوەی نزیکەی سەرجەم مەسیحیەکان، زمانی عەرەبی پێگەیەکی تایبەتی خۆی پەیدا کرد. سەرجەمیان قەناعەتیان بەوە هەبور کە هەرچەندە لە ئینتمای ئاینیدا جیاواز بوون لەگەڵ موسڵمانە عەرەبەکان، بەلام هەموویان خاوەن زمانێکی هاوبەش بوون. زمانی عەرەبی ئێلێمێنتێکی گرنگ بوو کە مەسیحی و موسڵمانانی پێکەوە دەبەستەوە. لەم سۆنگەیەوە، زمانی عەرەبی پردێك بوو کە هەموویانی پێکەوە دەبەستەوە و لە رێگەیەوە گوزارشت دەکرا لە کولتورێکی هاوبەش. ئەی چۆن مامەڵە لەگەڵ مێژودا بکرێ؟ دەزانرێ کە رابووردوو بۆ موسڵمانی عەرەب و مەسیحیەکان بە دوو چاویلکەی جیاواز تەماشا دەکرێ. ئایا مەسیحیەکانی سوریا دەیانتوانی تەماشای مێژووی ئیسلام بکەن وەك ئەوەی خۆیان؟ لەوە دەکات کە نوسەر و ئەدیبە مەسیحیەکان، مێژووی ئیسلامیان بە هۆکارێکی دەرەکی تەماشا نەکردبێ چونکە کاتێك شانازی دەکرا بە زمانی عەرەبی و بە کولتوری عەرەبیەوە، هیچ دژاو دژیەك تێبینی نەدەکرا لە نێوان زمان و کولتوری عەرەبی لە لایەکەوەو و ئیسلام لە لایەکی دیکەوە کە چوارچێوەیەکی عەرەبی هەیە. بۆ نمونە ابراهیم الیازجی هیچ دوو دڵی نەدەنواند لە بانگەشەکردنی عەرەب کە مەزنی رابوردویان لەبیر نەچێتەوە و بۆ ئەو مەبەستە هوشیار ببنەوە. ابراهیم الیازجی ئەندامی کۆمەڵەیەکی نهێنی بوو کە لە ساڵی ١٨٧٥ لەلایەن چەند گەنجێکی مەسیحی لە بیروت دامەزرابوو کە دەوترێ ئەمە دەژمێردرێ بە سەرەتای بزووتنەوەی عەرەبی کە بانگەشەی دەکرد بۆ جیابوونەوە لە ئیمپراتۆریای عوسمانی[٧٠]. یان لەم بارەیەوە یەکێکی وەك جورجی زیدان رۆڵێکی گەورەی بینی لە دروستکردنی هوشیاری بەرامبەر رابوردوی عەرەب. لە رێگەی چیرۆکەکانیەوە توانی وێنایەکی رۆمانتیکی بۆ رابوردوو بنیاد

بنیّ لە سەر وێنەی نوسەر و شاعیری ئینگلیزی والتەر سکۆت[٧١].

هیچ گومانێکیش ناکرێ لەوەی کە یەکێکی وەکو نجیب عازوری (١٨٨١-١٩١٦) نەبوبێ بە جولێنەری هەستی عەرەبی هەژێنەری ناسیۆنالیزمی عەرەبی. نجیب عازوری مەسیحیەکی خەلکی لوبنان بوو و فەرمانبەر بوو لە ناو ئیدارەی دەوڵەتی عوسمانی و بۆ ماوەیەك وەکالەتی پارێزگای قودسی وەرگرتبوو. نجیب عازوری لە پاریس خوێندنی تەواو کردبوو و هەر لەوێ لە ساڵی ١٩٠٤ کۆمەڵەیەکی دامەزراندبوو بە ناوی "کۆمکاری نیشتیمانی عەرەب" (League de la Patrie Arabe) و گۆڤارێکی وەرزی مانگانەی بڵاوکردبۆوە کە تەنها هەژدە ژمارەی لێ دەرچووبوو بە ناوی "سەربەخۆیی عەرەب" ( L'Indépendence Arabe و لە ساڵی ١٩٠٥ کتێبێکی بڵاوکردبۆوە بە ناوی "خەبەربوونەوەی میللەتی عەرەب" *Réveil de Le la Nation Arabe*. نجیب عازوری، وەك مەسیحیەك، یەکەم بیرمەندی عەرەب بوو کە بازێکی دا بە سەر دیدی ئەو سەردەمەو دەژمێردرێ بە یەکەم بڵاوکەرەوەی بیری ناسیۆنالیزمی عەرەبی. لە ژێر کاریگەری کواکبی، عازوری پێشنیازی دامەزراندنی دەوڵەتێکی عەرەبی دەکرد کە تیایدا دەسەڵاتی ئاینی جیابکرێتەوە لە دەسەڵاتی سیاسی. عازوری خەوی میللەتی عەرەب کە جیابێتەوە لە بنچینە ئاینیەکەی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی (کە مەسیحی و موسڵمانان بگرێتەوە) هێنایە کایەوە. لەم بارەیەوە، عازوری بیری دەکردەوە کە میللەتێکی عەرەب هەیە کە بە شێوەیەکی یەکسان موسڵمان و مەسیحی دەگرێتەوە. کێشەی نێوان هەردوو کۆمەڵگەی موسڵمان و مەسیحی دەستکردن و لەلایەن هێزە دەرەکیەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان دروست کراون. لە بەرئەوە مەسیحیەکان کەمتر عەرەب نین لە موسڵمانەکان[٧٢]. لە بەرئەوە عازوری بانگەشەی دەکرد بۆ یەککرتنەوەی کڵێسە کاتۆلیکیەکان بە ناوی "کڵێسەی کاتۆلیکی عەرەبی" و جیابوونەوە لە ئیمپراتۆریای عوسمانی و کردنی حیجاز بە ناوەندی خەلافەتێکی عەرەبی ئیسلامی کە پێکهاتبێت لە عێراق و سوریاو لوبنان و فەلەستین[٧٣]. سەبارەت بە سنوری ئەم دەوڵەتە، عازوری نوێگەریەکی دەهێنایە کایەوە، بەو واتایەی کە پێشنیازی دەکرد "ئیمپراتۆریایەکی عەرەبی" پێکبهێنرێ "لە دجلەو فراتەوە هەتا دەگاتە کەناڵی سویس و لە دەریای ناوەندەوە هەتا دەریای عەرەبی"[٧٤]. جۆری حوکم تیایدا دەبوو دەستوری بوایە کە بوەستایەتەوە سەر بناغەی ئازادی سەرجەم ئاینەکان و یەکسانی بەرامبەر یاسا. عازوری کە لەسەر بنچینەی زمان ئەم سنورانەی دیاریکردبوو، میسر و ژورووی ئەفریقای نەخستبوە ناو ئەم دەوڵەتە عەرەبیەوە چونکە بەلای ئەوەوە میسریەکان ئینتمایان بۆ بنەماڵەی بەربەری ئەفریقا هەیەو ئەو زمانەی کە پێش ئیسلام پێی ئەدوان هیچ یەکچونێکی نیە لەگەڵ زمانی عەرەبی، لەبەر ئەوە ئینتمایان نیە بۆ میللەتی عەرەب. زیاتر لەمەش، لە نێوان میسر و دەوڵەتی عەرەبی سنووری سروشتی هەیە کە پێویستە رێزی لێ بگیرێ لە پێناو دوور کەوتنەوە لە ئاژاوەو ناسەقامگیری. لە مێژوودا خەلیفە عەرەبەکان هەرگیز سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە لە کۆنترۆڵکردنی هەردوو وڵات لە هەمان کاتدا[٧٥]. سەبارەت بە هەڵوێستی لە ئیمپراتۆریای عوسمانی، عازوری هەڵوێستی دژ بە تورکی هەبوو چونکە بە بۆچونی ئەو، تورکەکان عەرەبیان روخاند. ئەگەر تورکەکان نەبونایە، عەرەب دەبوون بە شارستانیترین میللەت لە جیهاندا. عەرەب، عازوری دەیگوت،

باشترن لە تورك تەنانەت وەکو سەربازیش چونکە ئەو سەرکەوتنانەی کە تورکەکان بەدەستیان هێناون دەگەڕێنەوە بۆ شەڕکەرە عەرەبەکان[٧٦]. عازۆری هۆکاری خواستی جیابوونەوەو سەربەخۆیی لە ئیمپراتۆریای عوسمانی دەگەڕێنێتەوە بۆ نەویستنی سوڵتان عبدالحمید بۆ سیاسەتی گۆڕان لە ناو دەوڵەتدا. لەبەرئەوە عەرەب و کوردو ئەرمەنی دەبێ جیاببنەوە و ئەم جیابونەوەیەش دەبێتە هۆی هەرەسهێنانی دەسەڵات[٧٧].

## پەراوێزەکان:

(١) بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە بەروارەکانی داگیرکردنی عوسمانیەکان بۆ وڵاتە عەرەبییەکان بڕوانە، د. ابراهیم خلیل احمد، تاریخ الوطن العربي في العهد العثماني ١٥١٦-١٩١٦، مديرية دار الكتب للطباعة و النشر، جامعة الموصل، (بلا تاريخ)، ص ١١-٥٤.

*(2) Zeine N. Zeine، The Emergence of Arab Nationalism، Khayyat، Beirut، 1966، p. 27.*

(٣) بۆ زانیاری وردتر سەبارەت بە سیستم و دابەشکردنە ئیدارییەکان، بڕوانە ابو خلدون ساطع الحصري، البلاد العربية و الدولة العثمانية، دار العلم للملايين، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٦٠، ص ٢٩-٣٤، هەروەها بڕوانە ل ٢٣٠-٢٤٩.

(٤) د. ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربي في العهد العثماني ١٥١٦-١٩١٦، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٩.

*(5) Zeine N. Zeine، Ibid. p. 28-29.*

(٦) د. محمد كمال الدسوقي، دار الثقافة للطباعة و النشر، القاهرة، ١٩٧٦، ص ٢٣٠.

(٧) هـ س ل ٢٣٠.

(٨) بڕوانە ابو خلدون ساطع الحصري، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٠.

(٩) بڕوانە اورخان محمد علي، السلطان عبد الحميد الثاني، حياته و احداث عهده، دار مكتبة الانبار، الرمادي، ١٩٨٧، ص ٣٢١. لە ڕاستیدا دوا بەدای هەڵبژاردنەکەی مەشروتیەی دووەم، ئەنجومەنی نوێنەران کەپێکهاتبوو لە ٢٧٥ بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش کرابوو بەسەر پێکهاتەکانی ئیمپراتۆریادا: تورکەکان (١٤٢ ئەندام)، عەرەب (٦٠)، ئەلبان (٢٥)، رومەکان (٢٤)، ئەرمەن (١٢)، جوو (٥)، بولغار (٥)، سرب (٣)، فلاج (١)، بڕوانە ابو خلدون ساطع الحصري، البلاد العربية و الدولة العثمانية، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٠.

(١٠) بۆ بەراورد نێوان ژمارەی نوێنەرانی سەرجەم پێکهاتەکانی ئیمپراتۆریای عوسمانی، بڕوانە هـ س ل ٣٢١، بڕوانە هەروەها ل ١٢١.

*(11) Albert Issa، I Kurdi e I regimi che governano il Kurdistan، Politica ed Economia، Fodazione Cespe، XXII، N. 12، 1991، p. 23.*

بە پێی مادەی چواری یاسای بنەڕەتی عوسمانی، سوڵتان پارێزەرەی ئاینی ئیسلام و بوو و مادەی پێنج سوڵتانی پێناسە دەکرد وەك کیانێکی "پیرۆز" کە بەرپرسێتی بەرامبەر کەس نەبوو، بڕوانە ابو خلدون ساطع الحصري، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٧.

(١٢) لە ڕاستیدا موسڵمانان ناوی "تبعە"یان لێ ناونرابو و ووشەی "رەعیە" بەکار ئەهێنرا بۆ ناموسڵمانەکان، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی "رعیە" سەرجەم هاووڵاتیانی عوسمانیان دەگرتەوە کە ملکەچ بوون بۆ ویستی سوڵتان.

*(13) Zeine N. Zeine، Ibid. p. 30.*

*(14) Ibid. p. 30.*

(١٥) جرجيس فتح الله، نظرات في القومية العربية مدا و جزرا حتى العام١٩٧٠، اربيل، ٢٠٠٤، ص ٢٤.

(١٦) علي الوردي، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، من عام ١٨٣١ الى ١٨٧٢، الجزء الثاني، بغداد، ١٩٧١، ص ٣٨.

(١٧) جرجيس فتح الله، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥.

*(18) Zeine N. Zeine، Ibid. p. 31.*

(١٩) علي الوردي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٦-٤٧.

(٢٠) ابو خلدون ساطع الحصري، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٩.

(٢١) بڕوانە ابو خلدون ساطع الحصري، هـ س ل ٩١-٩٢.

(٢٢) هـ س ل ٩٢.

(٢٣) بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە علي الـوردي، سەرچاوەی پێشوو ل ٤٧-٤٩.

(٢٤) کاظم حبیب، الایزیدیة: دیانة قدیمة تقاوم نوائب الزمن، اربیل، ص ٨٤.

(٢٥) هـ س ل ٨٦-٨٧.

(٢٦) هـ س ل ٩٣. بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەوان و سیاسەتی جوداکاری لە سەردەمی عوسمانیدا، بڕوانە: عباس العزاوي، تاریخ الایزیدیةو اصل عقیدتهم، منتصف الثلاثینات من القرن العشرین، بغداد، (بدون تاریخ). بڕوانە هەروەها: زهیر کاظم عبود، لمحات عن الایزیدیة، بغداد، ١٩٩٤. هەروەها: شاکر فتاح، الایزیدیة و الدیانة الایزیدیة، بیروت، ١٩٩٧.

(٢٧) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: علي الوردي، لمحات اجتماعیة من تاریخ العراق الحدیث، من عام ١٨٧٦ الی عام ١٩١٤، الجزء الثالث، بغداد، ١٩٧٢، ص ٥١-٥٥.

(٢٨) ابو خلدون ساطع الحصري، محاظرات في نشوء الفکرة القومیة، بیروت، ١٩٧٦، ص ١٧٧.

(٢٩) هـ س ل ١٣٣.

*(30) Zeine N. Zeine, Ibid. p. 32.*

*(31) Ibid. pp. 32-33.*

*(32) Ibid. pp.33.*

(٣٣) ابو خلدون ساطع الحصري، محاظرات في نشوء الفکرة القومیة، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٤.

(٣٤) بڕوانە: د. ابراهیم خلیل احمد، تاریخ الوطن العربي في العهد العثماني ١٥١٦-١٩١٦، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٧.

*(35) Zeine N. Zeine, Ibid. p. 5.*

(٣٦) تەنزیمات بریتی بوو لە یەکەم قۆناغی چاکسازی لە ناو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا کە لە ساڵی ١٨٣٩ دەستی پێکرد. پێی دەوترێ "تنظیمات" چونکە لە سەرەتای قۆناغی هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریای ، دەویستا کار و باری دەوڵەت ڕێکبخرێ لە سەر بنچینەی نوێ لە سەرجەم بوارەکانی ئیداری و دارایی و دادوەری و پەروەردەییدا.

(٣٧) بڕوانە، ابو خلدون ساطع الحصري، نشوء...، ل ١٣٤-١٣٥.

(٣٨) بڕوانە هـ س ل ١٣٧-١٣٩.

(٣٩) ابو خلدون ساطع الحصري، مذکراتي في العراق، الجزء الثاني، دار الطلیعة، بیروت، الطبعة الاولی، ١٩٦٨، ص ٤٧٧.

*(40) Zeine N. Zeine, Ibid. p. 38.*

الیمن الحدیث، دار الفکر، الطبعة الثانیة، دمشق، ١٩٨٨.

*(42) Zeine N. Zeine, Ibid. p. 40.*

*(43) Ibid. p. 40.*

(٤٤) بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە بیری ئاینی وەهابییەکان و هەڵوێستیان بەرامبەر ئیسلام، بڕوانە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە کە لە ڕاستیدا زیاتر بەلای دژایەتی بزوتنەوەی وەهابی دەشکێتەوە نەوەک وەک کارێکی زانستی کە بەند بێ بە بێ لایەنی خولوقیەوە: د.. محمد عوض الخطیب، صفحات من تاریخ الجزیرة العربیة الحدیث، مرکز الغدیر للدراسات الاسلامیة، الطبعة الثانیة، قم، ١٩٩٦، ل ٧٠-٣٠٤.

*(45) Albert Hourani, Arabic Thought in the Liberal Age, 1798-1939, Oxford University Press, London, New York, Toronto, 1962, pp. 37-38.*

(٤٦) بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: د. ابراهیم خلیل احمد، تاریخ الوطن العربي في العهد العثماني، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٨.

(٤٧) ابو خلدون ساطع الحصري، نشوء الفکرة القومیة، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٧.

(٤٨) د.. ابراهیم خلیل احمد، تاریخ الوطن العربي في العهد العثماني ١٥١٦-١٩١٦، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤١.

(٤٩) بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە:

*Albert Hourani, Arabic Thought in the Liberal Age, Cf. pp. 51-54.*

*(50) Albert Hourani, Ibid. p. 261.*

*(51) Ibid. pp. 262-263.*

*(52) Zeine N. Zeine, Cf. p. 41.*

*(53) Ibid. p. 46.*

*(54) Ibid. p. 49.*

*(55) Ibid. p. 49.*

(56) *Ibid. pp. 49-50*

(٥٧) بە پێی ئەو ژمارانەی کە لە لایەن ئەلبێرت حورانییەوە پێشکەشکراون، لە ساڵی ١٩٤٤، مەسیحیەکانی لوبنان، ٥٣ لە سەدی کۆی دانیشتوانیان پێکدەهێنا. بڕوانە:

*Albert Hourani، Miniritíes in the Arab World، Oxford University Press، London، New York، Toronto، 1947، p. 63.*

بۆ پتر لە زانیاری سەبارەت بە ژمارەی مەسیحیەکان لە باقی وڵاتە عەرەبیەکان، بڕوانە هەمان سەرچاوە.

(٥٨) ابو خلدون ساطع الحصري، محاظرات في نشوء الفكرة القومية، سەرچاوەی پێشوو، ص ١٨٨-١٨٩.

(٥٩) هـ س ل ١٨٦.

(٦٠) هـ س ل ١٩٢-١٩٣.

*(61) Zeine N. Zeine، Cf. p. 60.*

*(62) Ibid. p. 61.*

*(63) Ibid. p. 65.*

*(64) Albert Hourani، Arabic Thought in the Liberal Age، Cf.، pp. 100-101.*

*(65) Ibid. p. 101.*

*(66) Ibid. p 274.*

*(67) Ibid. p 101.*

*(68) Ibid. p 274.*

*(69) Ibid. p. 274.*

(٧٠) بڕوانە:

*George Antonius، The Arab Awakening، New York، 1965، pp.79-89 in William L. Cleveland، The Making of an Arab Nationalist، Ottomanism and Arabism in the Life and Thought of Sati al-Husri، Princeton University، Princiton، New Jersey، 1971، p. 10.*

*(71) Albert Hourani، Arabic Thought in the Liberal Age، Cf. p. 277.*

*(72) Ibid. p 278.*

** Le Réveil de la Nation Arabe dans l'Asie Turque en Présence des Intérets et des Rivalités des Puissances Etrangères، de la Curie Romaine et du Patriarcat Oecuménique، Paris، 1905.*

(٧٣) د. ابراهيم خليل احمد، تاريخ الوطن العربي في العهد العثماني، سەرچاوەی پێشوو ل ٤٠٠. بڕوانە هەروەها ابو خلدون ساطع الحصري، محاظرات في نشوء الفكرة القومية، سەرچاوەی پێشوو ل ١٩٧.

*(74) Negib Azoury in Sylvia G. Haim (Selected and Edited by)، Arab Nationalism، An Antology، University of California Press، Berkeley & Angeles، 1962، p. 81.*

*(75) Ibid. p. 81.*

*(76) Albert Hourani، Arabic Thought in the Liberal Age، Cf.، pp. 278.*

*(77) Ibid. p. 279.*

**تێبینی:**

ئەم نوسینە بەشی یەکەمی کتێبێکی نوسەرە لەژێر ناونیشانی "ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە ئیمپراتۆریای عوسمانییەوە بۆ عێراقی سەردەمی فاشیزم: دیمەنی رابردوویەك کە نایەوێ رابووێ"، کە بەم زوانە، بەزمانی کوردی، لەلایەن مەڵبەندی کوردۆلۆجییەوە بڵاودەکرێتەوە و دەکەوێتە بەر دیدەی خوێنەران.

# دروستبونی بەعس

کەنعان مەکییە

لە عەرەبییەوە: حەمە رەشید

ئەزمونی نەتەوەگەرای عەرەبی عیراق کە لەگەڵ فەیسەڵدا دەرکەوت، ساڵی ١٩٤١ پوکایەوەو کۆتایی پێهات، چونکە ئەو نەوەیەی لە سییەکاندا رێبەرایەتی خەباتی دەکرد لە پێناوی نەتەوەگەرای عەرەبدا، لەسەر شانۆی رووداوەکان دوورکەوتەوە. ئەو دوورکەوتنەوە یا پاشەکشێیە لایەنێکی دەگەڕێتەوە بۆ سەرکوتکردنی سیاسیو ئەو دەرئەنجامانەکەی کە لە جەنگی جیهانی دوەمدا کەوتنەوە، بەڵام لایەنی هەرە گەورەی دەگەڕێتەوە بۆ دەرکەوتنی حیزبی شیوعی عیراق. نەتەوەگەرای عەرەبی لە کۆتایی چلەکاندا جارێکی دی لەشێوەی شانەی بچوکی خوێندکاران کە بەعسیەکانی سوریا دروستیان کردبو، لە چەند کۆلیژێکدا سەریانهەڵدایەوە. ئەو شانانە لە گەڕەکە سونەتشینەکانی بەغدا کە زۆربەیان خوێندکاربون، زۆر لەسەرخۆ گەشەیان دەکرد. حیزبی بەعسی عیراق ساڵی ١٩٥٢ بەڕەسمی وەك لقێکی حیزبی بەعسی سوریا دروست بو. لەو سەردەمەدا حیزب نزیکەی سەد ئەندامی هەبو کە زۆربەیان لەو سوننانە بوون کە پێش دروست بون یا راگەیاندنی حیزب، پەیوەندییان پێوەی کردبو.

ساڵی ١٩٥٥ لە ١٠٪ ئەندامانی حیزب لە عەرەبی غەیرە عیراقی بون. لە ساتەوەختی کودەتاکەی ١٩٥٨ بەسەر رژێمی پاشایەتیدا، ژمارەی ئەندامانی حیزب بۆ نزیکەی ٣٠٠ ئەندام زیادی کرد[1]. لەبەر ئەوەی نەتەوەگەرای عەرەبی رێکخراو ئارادەیەکی زۆر لە ساڵانی ١٩٤١و ١٩٥٨ بەرز بو، بۆیە دەبێ گرنگی بە سەرچاوەی ساڵانی چلەکانی بەعسی سوریا بدرێ، کە نێوەندێکی سروشتی نەتەوەگەرای عەرەب بو لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا.

**ئەو کەسایەتیو رووداوانەی حیزبیان دروستکرد:**

میشیل عەفلەقو سەلاحەدین بەیتار کە دوو دامەزرێنەری دانپیانراوی حیزب بون، لە گەڕەکی مەیدانی دیمەشق لەدایك بون[2]، ئەو گەڕەکەی بەخاتری خەباتی چەکدارانەی لەدژی

فرەنسییەکان لە کاتی راپەرینی ١٩٢٥ . ١٩٢٦ ئاوبانگی دەرکردبو. میشیل عەفلەق لە ژینگەیەکی مەسیحی ئەرتەدۆکسییەوە هاتبو، بەڵام سەلاحەدین بەیتار موسڵمانێکی سونەو لە خێزانێکی ئاینی ئاودار گەورە ببو. هەر دووکیان پەروەردەیەکی ئاینیان هەبو، بەمەبەستی تەواوکردنی خوێندنی زانکۆش بەرەو پاریس رۆیشتن‌و ساڵی ١٩٢٩ بۆ یەکەمجار لە پاریس ئاشنای یەکتربون. لەماوەی چوار ساڵی خوێندندا پەیوەندییەکی سیاسی پتەویان پێکهێناو یەکێتی خوێندکارانی عەرەبییان دامەزراند. ئەوەش کاریگەرییەکی گەورەی هەبو تا لەرێگەیەوە پەیوەندی بە خوێندکارانی دی وڵاتانی عەرەبییەوە بکەن. ئەو کەشوهەوا رادیکاڵە ئازادە فیکرییەی لە ماوەی رابونی سەردەمی قەیرانەکاندا سەرتاپای ئەورووپای گرتبووەوە ئەوانیشی بەرەو ئەو رابونە کێشکرد. بەرهەمەکانی مارکس، نیچە، لینین، مازنی، ئەندرێ جید، دیستۆفسکی و رۆبین رۆلاندیان بە پەرۆش‌و جۆش‌و خرۆشەوە دەخوێندەوە. رەنگە میشیل عەفلەق فەلسەفەی زیندەگەری (حیویە) بێرگسۆن . ی پێقبوڵ بوبێت‌و ستایش کردنی کردەوەی توندوتیژی بەکۆمەڵی جۆرج سۆرێڵ ـ یش سروش بەخشی بوبێت. بەڵام ئەوەش باکگراوندێکی شەخسی نیەو کەسیش ئەو راستیە نازانێت کە بونیادی فیکری میشیل عەفلەق چۆن دروست بوە. عەفلەق بە پێچەوانەی ناسیونالیستە عەرەبەکانی نەوەی یەکەم، هەرگیز دانیپیانەناوە کە کاریگەری ج بیریارێکی رۆژئاوای لەسەر بوە، بەڵکو لە چاوپێکەوتنێکی ئەریك رۆکۆدا بانگەشەی ئەوە دەکات کە لەگەڵ دەست پێکردنی جەنگی جهانی دوەمدا وازی لە خوێندنەوەی ئاراستە فیکریە رۆژئاواییەکان هێناوە[٣].

کاتێك گەڕانەوە بۆ دیمەشق، هەر دووکیان بە شێوەیەکی رێکوپێك لە گۆڤاری "تەلیعەی" هەفتانەی حیزبی شیوعی دەستیان بەنوسین کرد[٤]. بەیتار بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە خۆیان ئەو گۆڤارەیان دەکردوە، ئیدی ئەوەی کە میشیل عەفلەق‌و بەیتار ئەندامی حیزبی شیوعی بون یا نا بەتەواوەتی روون نیە، بەڵام ئاماژەکان وادەکەونەوە کە ئەندامی حیزبی شیوعی نەبون[٥]. عەفلەق بەتوندی ئەو بانگەشانەی رەتدەکردەوە[٦]، بەڵام هەرگیز شەیدایی خۆی بە رێکخستن‌و دیسپلینی حیزبی شیوعی نەدەشاردەوە. سەرەتای خۆداماڵینی لە سیاسەتی حیزبی شیوعی ساڵی ١٩٣٦ لەگەڵ هەڵبژاردنی حکومەتی بەرەی میلی دەستی پێکردو حیزبی شیوعی سوریا بە ئاشکرا دەستی بەکاری سیاسی کرد.

هێشتا روون نەبۆتەوە کە ج شتێك گەورەترین کاریگەری لەسەر ئەو دوو کەسە هەبوە، روداوەکانی فرەنسا یا هەڵوێستی فرەنسا دەربارەی پاریزگای ئەسکەندەرونە. بەهەر حاڵ ئەو دوو کەسە لە حیزبی شیوعی سوری هەڵگەڕانەوەو بەکرێگرتەی حیزبی شیوعی فرەنسی‌و حکومەتی فرەنسا تاوانباریان دەکردن. دواتریش قۆناغی منەکردن‌و تێڕامانی هاندەرو بیروباوەری کەسایەتییەکان دێت. لەسەرەوەختی جەنگی جهانی دوەمدا خوێندکاران لە دەوریان کۆبونەوە. "تاکەکان هەستیان بە بۆشایی دەکردو پێیان وابو رێبەرایەتی کۆن شکستی هێناوەو دەبێ بزوتنەوەیەکی نوێ دەربکەوێت"[٧].

ئاوکی حیزبی بەعس تەنها لەدوای شکستی فرەنسا لە ١٩٤٠دا شکڵی خۆی گرت. یەکەمین بڵاوکراوە لە شوباتی ١٩٤١ لەدژی فرەنسیەکان بڵاوکرایەوە. بەعسیش وەك ناسیونالیستە

عەرەبە عێراقییەکانی ساڵانی بیست و سییەکانی سەدەی بیستەم کە دوای سەربەخۆیی سوریا لە هێندێک ڕێنەی ریفۆرم بەدیارکەوتن، بوە رابردوویەکی لەیادکراو، کەچی بەعسییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لە چلەکاندا حیزب لە ئاکامی "خەبات" لەدژی فەرەنسییەکان شکڵی خۆی وەرگرتوە. عەفلەق ساڵی ١٩٣٦ جارێک گیرا، لەدوای سەربەخۆییشەوە بەلانیکەمەوە چوار جار لەلایەن رژێمی سوریاوە گیرا. عەفلەق تەنها دوای تەواوکردنی ماوەی زیندانییەکەی لەساڵی ١٩٥٤دا بوە سومبلی نیشتمانپەروەرێتی، بەڵام وەک سیاسییەکی کارا شتێکی ئەوتۆی لەگەڵ فەرەنسییەکاندا نەکرد، چونکە ئەوانیش سەرگەرمی شۆڕشبون لەگەڵ نازییەکاندا. بەڵام بەدڵنیاییەوە هەر دووکیان لەسەر ئارەزاییکردنی بەرنامەی پەروەردەو فێرکردن کە "دەستکردی ئیمپریالییەکان"[8] بو، لەلایەن وەزیری پەروەردەوە سزادران. بەهۆی ئەو رووداوەشەوە لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٢دا وازیانهێناو ژیانی خۆیان بۆ سیاسەت تەرخانکرد. لەو ماوەیەشدا، واتە لەکاتی قەیرانی رەشید عالی دا، عەفلەق و بەیتار لیژنەیەکی سوریان بۆ هاوکاریکردنی عێراق دروستکرد، ئەم لیژنەیەش ڕێگەی خۆشکرد بۆ ڕێکخستنی حیزب بەعس.

بەپێی یەکێک لە حەکایەتە نیمچە رەسمییەکانی حیزب، بەعس وەک پەرچەکردارێک لە بەرامبەر "سێ وەرچەرخانی سەرەکی"دا پەیگرت، کە لە ماوەی سییەکاندا روبەروی ئۆپۆزیسۆن دەبونەوە، ئەوانەی بەپێچەوانەی بەعسەوە نوقمی تێکۆشان بون لەدژی فەرەنسییەکان[9]. رەنگە گرنگترین وەرچەرخانیش حیزبی شیوعی سوریا بێت، ئەوانی دی حیزبی قەومی سوریا کە لایەنگری لە سوریای مەزن دەکردو ئیخوان موسلمین بو. بەڵام ئەو بیرۆکەی سەرەکییەی بەعسی لەسەر دروست بو، لە دەرەوەی ئەو سێ تەوەرەیە بو، ئەویش ناسیونالیستی عەرەبی بو.

هەر دووکیان لە سێ ماوەی جیاوازدا، ١٩٤٣، ١٩٤٧، ١٩٤٩، نەیانتوانی ئەندامێتی لە پارلەمانی سوریا بەدەست بهێنن، ئیدی عەفلەق سوێندی خوارد هەرگیز ئەو هەوڵە دووبارە نەکاتەوە. بەڵام بەیتار ساڵی ١٩٥٤ بەنوێنەری دیمەشق هەڵبژێردرا، پاشان چەندین پۆستی وەزاری وەرگرت. بەیتار لە ساڵانی چل و پەنجاکاندا دینەمۆی سەرەکی حیزب و ڕێکخەری نهێنی بو.

میشیل عەفلەق تەنها یەک کەرەت و بۆ ماوەی سێ مانگ پۆستی وەزاری وەرگرت، بەڵام رۆڵی حیزبی لە بەیتار گرنگتر بو. عەفلەقی فەیلەسوف و تیۆریستی سیاسی حیزب لەسەروی هەمو گومان و ململانێیەکەوە بو، پۆستی ئیداری بەلاوە گرنگ نەبو، بەڵام کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ئەندامانی حیزب هەبو. عەفلەق کەسێکی کۆشا و جیدی و خۆی بۆ ئامانجەکانی تەرخان کردبو، تەنانەت نەیارەکانیشی دانیانپیادەنا. ژیانێکی سادە دەژیا و گرنگی بە دەسکەوتی مادی نەدەدا، کاریگەری لەسەر ئەو کەسانە هەبو کە گرنگیان بە بیروباوەری دەدا. ئەو خوێندکارانەی عەفلەق و بەیتار لە دە ساڵی پێشودا لە دیمەشق وانەیان پێدەوتنەوە (١٩٣٣ - ١٩٤٢) رێگەی زانکۆ و ژیانی پراکتیکیان گرتەبەر (هەمیشە فێرکار). بۆیە کاریگەری حیزب بە پاڵپشتی نوسینەکانی عەفلەق لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی سوریا لە ساڵانی یەکەمدا زیادیکرد. بەعس لە سەرەتای دروستبونیدا هەروەکو حەنا بەتاتو بە دروستی دەڵێت، حیزبی عەفلەق بو[10].

سەرباری رووداوەکانی عێراق (١٩٣٦- ١٩٤١) دەربەستبونی فەرەنسا بەرامبەر بە تورکیا

سەبارەت بە ئەسکەندەرونە بە داتیشتوانە عەلەوی، ئەرمەنی سونەو تورکەکەیەوە، گرنگییەکی یەکلاکەرەوەی لە دروستبونی بەعسدا هەبو. فرەنسا سالّی ١٩٣٩ ئەسکەندەرونەی وەك بەشێك لە گرێبەستێك بە تورکیا بەخشی بۆ ئەوەی لە جەنگدا تورکیا لایەنگری لە هاوپەیمانان بکات. لە سالّی ١٩٣٦ەوە دەنەدانی هەستی گشتیو وروژاندنی ئەم بابەتە فێرکارێکی دی کە دەرچوی سۆربۆن بو بەڕێوەیدەبرد، ئەویش زەکی ئارسۆزی بو. زەکی لە تەمەنی سی سالّیدا هەلّمەتێکی توندڕەوانەی ڕەگەزپەرستی دەست پێکرد کە جەختی لەسەر ناسنامەی عەرەبی دەکردەوە. تورکەکانی سوریا بونە ئامانجی هەلّمەتەکەی ئارسۆزی، لەگەلّ ئەوەشدا ئەرمەنو سونییەکانیش کە پێی دەوتن "عەرەبە تورکەکان" لە هەلّمەتەکەی بە سەلامەتی دەرنەچون. ئارسۆزی لەسەر مامەلّەی فەرەنسییەکان لەگەلّ عەرەبدا بەرامبەر بە کەمە نەتەوایەتییەکان، لە ڕاڤەکردنێکیدا دەلّێت: "بیانییەکان بەخاتری بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە عەرەب دەترسان، بۆیە بۆ دورخستنەوەی ئەو هەڕەشانە پەموديان بەکاردەهێنا، ئیدی شتێکی ئاسایی بو بێبەهاترینو پۆخلّترین کەسانی سەرزەمین، بەسەر ئێمەی سەروەرانی جهان لە ڕابردودا پەسەند بکەن"[11]. کاتێك ئەم ئەندێشەیە لە خزمەتی نەتەوەگەرای عەرەب پایەداربو، لەفۆرمی ئاینزای عەلەویدا بەدیارکەوتو ئارسۆزی گشت ئەو فۆرمولّانەی لەپێکهاتەی نەتەوەی عەرەبیدا خستەڕوو[12].

لەدوای دەرکردنی ئارسۆزی لە ناوچەکە (سالّی ١٩٣٩) گروپێکی دروستکرد کە مەرجی سەرەکی بۆ بوون بە ئەندام: نوسین یا وەرگێڕانی کتێبێك بو کە پشکی لە "زیندوکردنەوە - بەعس" ی کەلەپوری عەرەبیدا هەبێت. بەشی کولتوری ئەو گروپە ناوی بەعسی عەرەبی بو، ئەوەش یەکەم بەکارهێنانی وشەی بەعس بو لە گروپێکی سیاسی ڕێکخراودا.

سالّی ١٩٤٤ ئەم گروپە لەگەلّ شانەیەکی بچوکی عەفلەقو بەیتاردا کە بارەگەکەیان لە دیمەشق بو یەکیانگرت، بەلاّم ئارسۆزی لەبەر ئەوەی دوژمنایەتی لەگەلّ عەفلەق هەبو، نەچوە ریزی ئەو ڕێکخراوە تازەیەوە. هێندێك کەڕەت ئارسۆزی خۆی بە "پەیامبەر" و "چارەنوسی" نەتەوەی عەرەب دەزانی[13]. بەلاّم عەفلەق هەرگیز مەسەلەکانی بەوجۆرە بە شەخسی نەدەکرد، هەرچەندە نوسینەکانی کێشو شەیدایی تیانەبو، بەلاّم زیاتر پێکەوە پەیوەستو گونجاوبون. سەیر ئەوە بو هەر دورکیان وەکیەك قەناعەتیان بەناسیونالیزمی عەرەبی هەبو. بەعسییە عێراقییە سونەکان زیاتر ستایشی عەفلەقیان دەکردو بە باوکی ڕۆحی خۆیانیان دەزانی، بەلاّم هاوتا عەلەوییە سورییەکان عەفلەقیان بە زەوتکار دەزانیو ئەو سیفاتانەیان دەدایە پالّ ئارسۆزی.

پابەپای گەشەکردنی حیزبی بەعس لایەنگرانی ئارسۆزی ئەزمونی سیاسەتی جەماوەرییو سەربازی ڕادیکالانەیان خزاندە نێو گفتوگۆکانی عەفلەقو بەیتارەوەو ئارسۆزییان لە بندەستی وەهیب غانم - ی ڕێبەر بەجێهێشتو براکەیو عەلەوییەکانی دیی ئەسکەندەرونە سالّی ١٩٤٩ یەکەمین ناوکی بەعسیان لە بەغدا دروستکرد. ئەسکەندەرۆنیەکان هیچ "تیورییەکی" تازەیان بۆ بەعس نەهێنا، تەنها وزەی ڕێکخستنو هەستکردن بە جۆرێك لە ئینتمای سیاسی بۆ گروپی "خەبات لەدژی ئیمپریالیزم"یان تیابو کە پێشتر لە مەسەلەی ئاشورییەکاندا (سالّی ١٩٣٣) نمایشکرا.

بەعس لە چلەکانی سەدەی بیستەمدا لە خوێندکار، مامۆستا، پاریزگا، پزیشکان و توێژە روناکبیرەکەی چینەکانی دی پێکهاتبو. تەموزی ساڵی ١٩٤٣ کاتێک گروپێکی کەمتر لە ١٠ کەسی بەیانی بەرنامەی کاری حیزبیان بڵاوکردەوە[١٤]، زۆربەی نوسەران پێیانوابو ئەو بەرنامەیە مێژوویی سەرەتای دەستپێکردنی کارەکانی حیزب بو. لە نیسانی ١٩٤٧دا کاتێک یەکەم کۆنگرە بەسترا، ژمارەی ئەندامانی حیزب هەر چەند سەد کەسێک دەبو، ئەویش دوای ئەوەی گروپی ئەسکەندەرۆنیەکان پەیوەندییان بەحیزبەوە کرد. دەستەیەکی جێبەجێکردن لە پێنج کەس دامەزرا کە عەفلەق سەرۆکایەتی دەکرد.

سونەکان لەساڵانی چلەکاندا سەرکردایەتی حیزبیان بەدەستەوە بو، بەڵام سونەکان لەڕووی ژمارەی ئەندامێتییەوە زۆرینەنەبون، تایبەتی دوای ئەوەی ئەسکەندەرۆنیەکان ساڵی ١٩٤٥ هاتنە ریزەوە. سەرباری زۆری عەلەوییەکان بەڵام تەنها یەکێکیان لەئاستی سەرکردایەتیدا بو. دوای هاتنەریزی ئەکرەم حۆرانی و دوای ئەوەش، ساڵی ١٩٥٢ زۆرێک لە جوتیاران و ئەفسەران بوون بە بەعسی، دابەشبونی چینایەتی حیزب لەگەڵ هاوشێوە سورییەکەی هاوتابو. لە کۆتایی شەستەکاندا عەلەوییەکان سەرکردایەتی لقی سوریای حیزبیان گرتەدەست، ئەویش بە دزەکردنی ئەفسەرانی سوریا بۆ ناو حیزب و بەوەش باڵی مەدەنی حیزب لاواز بو. بەڵام نەریتی مەدەنی حیزب لە عێراق بەردەوام بو، ئەوەش بە هەڵبژاردنی عەفلەق وەک باوکی رۆحی حیزب زیاتر ئاشکرا دەبێت.

گروپی حۆرانی، سەرباری زۆری ژمارەیان هەرگیز بەتەواوەتی تێکەڵ بەحیزب نەبون. حۆرانی دوای ئەوەی ساڵی ١٩٤١ پاڵپشتی لە رەشید عالی گەیلانی کردو ساڵی ١٩٤٨ یش فەرماندەیی هێزێکی ناسەربازی لە فەلەستین دەکرد، وەک ناسیونالیستێکی عەرەب ناوبانگێکی باشی پەیداکرد. ساڵی ١٩٤٣ حۆرانی بە نوێنەری شاری حەما هەڵبژێردراو تا ساڵی ١٩٥٨ وەک پارلەمانتار مایەوە. حۆرانی ساڵی ١٩٥٠ حیزبی ئیشتراکی عەرەبی لەسەر هەمان بەرنامەی بەعس دروستکرد کە ساڵی ١٩٤٧ لە یەکەم کۆنگرەی خۆیاندا پەسەندیان کردبو. "ئەم حیزبە ژمارەی ئەندامەکانی گەیشتە (١٠) هەزار ئەندام، هەروەها توانی زیاتر لە ٤٠ هەزار جوتیار راکێشێت، کاتێک بانگەوازی بەستنی یەکەم کۆنگرەی گشتی جوتیارانی لە حەلەب کرد، ئەوەش یەکەم کۆنگرەی گشتی جوتیاران بو لە مێژووی سوریادا"[١٥].

بەعس لەو دەمەی حۆرانی پەیوەندی پێوەکرد، نزیکەی ٤٥٠٠ ئەندامی چالاکی لە رێکخستنەکانیدا چالاکییان دەکرد، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لقی لە عێراق، ئوردون و لوبنانیشدا هەبو. هەر چەندە حیزب چالاکی و کاریگەری لە ژیانی سوریادا هەبو، بەڵام بنکەیەکی جەماوەری نەبو. ساڵی ١٩٥٢ لەگەڵ یەکبوندا ناوی بو بە حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی و دوا شکڵی خۆی وەرگرت. لەماوەی پەنجاو سەرەتای شەستەکاندا بوە هێزێکی جەماوەری لە سوریا و ساڵی ١٩٥٨ هێزی بزوێنەری پشت دروست بونی کۆماری عەرەبی یەککگرتو بو، ساڵی ١٩٦٣یش بۆ یەکەمجار لە عێراقدا دەسەڵاتی گرتەدەست.

بەکورتی، کەسایەتی و روداوەکانی دەیەی یەکەم ئەزمونی جۆراوجۆری بەدیاری بۆ بەعس هێنا: سەرکردەی شارەزاو مەدەنی چینی مامناوەندی و خوارەوەی کۆمەڵگە، فرەیی مەزهەبی و تەشەنەکردنی هەرێمایەتی لەو

١٠ ـ بەتاتو، هەمان سەرچاوە. ل ٧٣٠.

١١ ـ بەپێی هەڵسەنگاندنی ئارسوزی لەسەر رووداوەکانی ١٩٣٦ ـ ١٩٣٩ ئەسکەندەرونە بڕوانە: مشاكلنا القوميه و الموقف الاحزاب منها (دیمەشق ـ دار ئەلیەقزە ١٩٥٨)، ٩٦.

ئەم هەڵسەنگاندنە لەو رووەوە سەیرە کە جەخت لەسەر هەمان تایبەتمەندی عەفلەق (فیداکاری، کۆشا، ئایینی رێبەری، ئامانجگەرای) دەکاتەوە. ئەم تایبەتمەندییانە لەو داستان و روخسارانە دەردەکەوێت کە ئارسوزی لەسەر خۆی و ئەوانی دی نەخشەی دەکێشێت.

١٢ ـ عەلەوییەکان شیعەگەلێکن لە گروپە بیر تاریکەکان کە خەڵکانی بتپەرست، رێورەسمی وەرگرتنی ئەندامی تازەو کردەوەی سنورداری توندو دواکەوتوانە لەسەر ژنانیش لەلایەن ئەوانەوە قبوڵ دەکرێ. ئەوانە عەلی لە پێغەمبەر بە بەرزتر دەزانن و خۆیان لە هەمو موسڵمانانی دی بە باشتر دەزانن، چونکە لەو باوەڕەدان کە مانای شاراوەی سروش تەنها بۆ ئەوان ئاشکرا کراوە. ئارسوزی لە هەمان زەمینەوە مانای داهێنەرانە بەمیلەتیش دەدا. لەمڕووەوە ئاسوزی بەقوڵی لەژێر کاریگەری هانری بەرگوسن بوە. ئەو ئەزمونێکی میتافیزیکی خۆی یاددەکاتەوە کە ساڵی ١٩٢٨ ئەزمونی کردوە: "لە دەروازەی سۆربۆن نوقمی بیرکردنەوە بوم... ناکەمان شتێکم بۆ هات. رۆحم گۆڕانی بەسەردا هات و شێوەی تێڕوانیم بۆ جیهان بەتەواوەتی گۆڕا." بەمشێوەیە بیروباوەڕی نەتەوەگەرای عەرەبی قبوڵکرد. لە ئەریك رۆلۆ وەرگیراوە، پێرست ژمارە ٣.

١٣ ـ ئارسوزی، مشاكلنا... ١٠٢، ١٠٣.

١٤ ـ عەفلەق ئەم ژمارەیە لە سەرەتای قسەکانیدا لە یەکەمین کۆنگرەی میلی بەعس لە ساڵی ١٩٧٤دا راگەیاندوە: نضال: ١:٢١.

١٥ ـ بەتاتو، هەمان سەرچاوە، ٧٢٩.

١٦ ـ کۆنستاتین زوریق، وشیاری نەتەوەیی (بەیروت، دار ئەلمەکشوف، ١٩٤٠)، ٤٣، ٩ ـ ٤٨.

١٧ ـ میشیل عەفلەق، في سبيل البعث (بەیروت، دار ئەلتەلیعە، ١٩٥٩)، ٢٩ ـ ٣٠. ناونیشانی وتارەکە "ناسیونالیزم پێش هەمو شتێك مانای عیشق"ە. ئەم کتێبە وەك کتێبی پیرۆزی بەعسییەکانە. کۆمەڵێك نوسینی عەفلەقە لە ماوەی ١٩٣٥ ـ ١٩٥٠. وتەکانی من لە چاپی ١٩٥٩ی ئەم کتێبەوە وەرگیراوە.

١٨ ـ هەمان سەرچاوە، ٢٨، ٢٩.

١٩ ـ لە نضال وەرگیراوە ١:٢٧.

٢٠ ـ عەفلەق، في سبيل... ٣٩.

٢١ ـ لە وتاری "دەربارەی پەیامی عەرەب" وەرگیراوە، ١٩٤٦ کە لە وتاری "ناسیونالیزم بەمانای عیشق"، ١٩٤٠ دەچێت. هەمان سەرچاوە، ٧٦.

٢٢ ـ هەمان سەرچاوە، ٢٩.

٢٣ ـ هەمان سەرچاوە، ٢٩.

٢٤ ـ هەمان سەرچاوە. ٦٦.

٢٥ ـ نضال، ١:٢٨ بەیاننامەی تەموزی ١٩٤٣.

٢٦ ـ عەفلەق لە وتارخوێندنەوەیەکی ساڵی ١٩٦٧دا دەربارەی تێڕوانینی سەرەتایی حیزبی بەعس وتاردەخوێنێتەوە، تێڕوانینێك کە "هەرگیز لێی پاشگەزنەبۆتەوەو میلەتی عەرەبی لە حاڵەتی جەنگدا دەبینی. واتە حیزب ئەو واقیعە ترسناکەی دەوری میلەتی داوە فەرامۆش نەکردوەو قورسی ئەو نەخۆشییەی میلەتی ئیفلیج کردوە دەست نیشانکردوە"، ئەو تا ئەو رادەیە دەڕوات کە فێرکردنی هەموان بەو رۆحییەتە بە پێویست دەزانێت. عەفلەق دەڵێت دەکرێ جەنگ لە دوژمنی دەرەکی یا پۆختڵەوانی ناوەکی هەڵایسێت: میشیل عەفلەق خاڵی سەرەتا (بەیروت، موسسه العربيه ١٩٧١)، ٦٠ ـ ٦٢.

٢٧ ـ نضال ١:٢٨.

٢٨ ـ عەفلەق في سبيل البعث، ١٨. عەفلەق لە ساڵی ١٩٥٥دا هەڵپەیڤینی سیاسی بە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجی بەعس و مەحەك ئەزمونی بەسود بۆ ئامانجگەرایی بەعسی لەقەڵەم دەدا، هەمان سەرچاوە، ٤٢، چاپی ١٩٧٤.

٢٩ ـ نضال، ١:٢٨.

٣٠ ـ هەلومەرجی داتەپیو لە مادەی شەشەمی کارنامەی حیزبدا وەك ئاکە بەڵگەیەکی پێویست بۆ شۆڕشی دەرونی هەمەلایەنە لەقەڵەم دراوە (خەبات لە دژی ئیمپریالیزم و یەکێتی وەك بەڵگەی خەسڵەتی شۆڕشگێڕێتی حیزب باسکراوە)، هەمان سەرچاوە،

٤:٢٦. لێکۆڵینەوەی نیوەی یەکەمی في سبيل البعث، چاپی ١٩٧٤ ئەوە نیشان دەدا کە لە چەندین لاپەڕەدا باس لە داتەپین کراوە: ١٣، ٢٩، ٣٥، ٥٧ . ٦٠، ٣ . ٦٢، ٦٨، ٧٢، ٧٩، ٨١، ٩٠ . ٩١، ٩٤، ١٣٤، ٦ . ١٥٤، ١٦١، ٤ . ١٦٣، ١٦٦.

٣١ . لە وتارێکی ساڵی ١٩٤٤دا بە ناونیشانی "ئەوەی نوێی عەرەب" وەرگیراوە، لە في سبيل البعث، ل٦١و ٦٢. دوای چەندین ساڵ "پێشەنگ" لە جیاتی "ئەوەی نوێ" بەکارهێنراوە کە هەمان مانای هەیە. بەڵام سود وەرگرتن لە ڕشەکانی کۆمۆنیست گرنگی خۆی هەیە.

٣٢ . هەمان سەرچاوە، ٦٤. عەفلەق لە بەکارهێنانی پەیڤەکاندا ورد نیە، "ڕۆح" بە "فیکر" دەگۆڕێتەوە، ئەمە لە حاڵێکدا لە ١٩٤٠دا ئەم پەیڤە ڕەتکرابۆوە. بەڵام لە دەقەکەوە دەردەکەوێت کە ئەو دەربارەی چی قسە دەکات. هەڵبەتە ئەم نا وردییە لە یەکانگیری کەمناکاتەوە.

٣٣ . سامی شەوکەت ئەمە ئامانجەکانمانە (بەغدا وەزارەتی مەعاریف، ١٩٣٩)، ٣٦.

٣٤ . ئەضال ٣٠ . ٣٤: بەداخەوە هێندێك نوسەر دەربارەی بەعس سودیان لەم بەڵگەنامانە وەرگرتوەو وتارگەلێکیان هەڵبژاردوە کە جەخت لەسەر دیموکراسی، ئازادی ڕادەبڕین و پێویستی هاوکاری وەکیەکی میلەتان دەکەنەوەو ئەوە فەرامۆش دەکەن کە هەلومەرج و دەرئەنجام گرنگیان هەیە، نەك وشەی بێکەڵك و سواو.

٣٥ . بەیاننامەی تەموزی ١٩٤٣، هەمان سەرچاوە، ١:٢٨.

٣٦ . عەفلەق، في سبيل البعث ٤٩.

٣٧ . هەمان سەرچاوە، لە لاپەرەکانی ٤٧، ٤٩، ٤٥، ٤٦ وەرگیراوە.

٣٨ . زوریق، ئەلوەعی ئەلوەتەنی، ٣٢ . ١٢٣.

٣٩ . بڕوانە بەرنامەکەی ١٩٣٩یی کە ئیسلامی لە بەرامبەر یەکێتی عەرەبی دانتوە: ساتع ئەلحەسری، آراء و الاحاديث في الوطنيلە القومية (بەیروت، ١٩٨٤)، ٦٧ . ٥٦.

٤٠ . بەتاتو، هەمان سەرچاوە، ٧٣٢.

٤١ . عاقلاق، في سبيل البعث، ٣٠.

*42-Fouad Ajami, The Arab Predicament: Arab Political thought and practice Since ١٩٦٧ (Cambridge University Press, ١٩٨٢), .٢٧*

٤٣ . "ئێمە بە عەرەب ناڵێین لە ئایندەو بەجێگیر بوونی بەعس عەرەبی ئێوە دەچنە قەڵەمڕەوی ئازاد، یەکگرتوو سۆسیالیستییەوە . بە وتەی بەعس . بەڵام پێیان دەڵێین هەر لەمەوە ئێستا دورنوێنی ڕاستەقینەی ئایندەیە.. ئایندە بەپیرمانەوە دێت، لەناخماندا گەشەدەکات، چیدی بەشتێکی جودا لە ئێمە حیساب ناکرێ"، في سبيل البعث، ١٥٨، عەفلەق لەو باوەڕەدا بو "چارەنوس" وای بڕیار داوە کە بەعس بەمەبەستی ئەنجامدانی ئەرکی گرنگی میلی "هەڵبژێردراوە"، بەمەرجێك بەعسیەکان هەرگیز لەو ڕێگەیە لانەدەن کە چارەنوس بۆیانی دیاریکردوە، ئەم بەڵگە هێنانەوەیەش پێکەنیناوی دەردەکەوێت، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی ڕۆحییەتی قەدەرگەرای حوکمفەرما بەسەر ئەم بەشەی جهاندا لە شێوەی فێرکارێکی چالاك و پڕ وزە دەردەکەوێت. هەر وەها بڕوانە لاپەرەی ٤٣ چاپی ١٩٧٤ وتاری ساڵی ١٩٥٥ بە ناونیشانی "برداشت زنده ما از حزب". بڕوانە بەرپەرچدانەوەی پەیوەندی نێوان چارەنوسگەرای نەریتی لەگەڵ چەمکی عەفلەق لەسەر ئازادی لە وتارێکی ساڵی ١٩٥٠ بە ناونیشانی "دەربارەی شۆڕش، چارەنوس و ئازادی" ٥٥ . ١٥١ (چاپ ١٩٥٩).

٤٤ . عەفلەق، في سبيل البعث، ١١٤.

٤٥ . هەمان سەرچاوە، ١٥٤. لە چاپەکانی دواتر ئەم بەندە لابراوە.

٤٦ . عەفلەق ڕەخنەی لەو عەرەبانە دەگرت کە بیریان لە "مرۆڤدۆستی" دەکردەوەو ئەنگیزە زەبونەکانیانی ڕەخنە دەکرد. هەمان سەرچاوە، ٦٧ . ٦٩. ئەنجامگیری دەکات کە "گەورەترین هەوڵ و تێکۆشانی عەرەب لە ڕێگەی مرۆڤایەتیدا، بەرزکردنەوەی ئاستی ناسیونالیزمەکەی خۆیانە... بەفەرامۆشکردنی بیرکردنەوەی مرۆڤدۆستانە... هەم پێکەنیناوییەو هەم شەرمهێنەریشە کە عەرەبی هەژار خاکەکەیان لەلایەن خەڵکانی دییەوە داگیر کرابێت و بیر لە مرۆڤایەتی بکەنەوەو پارێزەری میلەتانی دی بن. مرۆڤدۆستی

داوامان لێدەكات ئەوانە لە بیربكەین تا ئەو كاتەی بەئاستی ئەوان دەگەین. هەر چەندە مرۆڤدۆستی رۆژئاوایی و روناكبیرەكانیان بە مەترسی مرۆڤدۆستی عەرەب نیە، بەڵام ئاسمانەو رووكاری ناسیونالیزمە "ئابێت فریوی بخوێن"، هەمان سەرچاوە، ٧٠.

٤٧ . هەمان سەرچاوە، ١٢٩.

٤٨ . هەمان سەرچاوە، ١٠٣.

٤٩ . هەمان سەرچاوە، ٤٠ . ٤١.

٥٠ . بەتاتو، هەمان سەرچاوە، ٤٠ . ٧٢٩. بەتاتو ئایدیۆلۆجیای عەفلەق بە"وەرگری ئارێكخراو" ناودەبات و خودی عەفلەق بە ناسیونالیستی مرۆڤگەرایی سەرسام بە دەسەڵاتی تاكگەرای سەردەمی رۆشنگەری ئەوروپا، دیموكراسی ژاكبونی، ئامانگەرای مازینی، دیدگای چینایەتی ماركس و دەستبژێری لینینی لە قەڵەم دەدا (ل٧٣١). بەڵام خودی عەفلەق لەگەڵ تاكگەرایی سەردەمی رۆشنگەری و مرۆڤگەرایدا ناكۆكە، ئەمەش خاڵێكی بەڵگەنەویستە. سەرئەنجام دەسەڵاتی فیكری رۆژئاوایی لەسەر ئەو زۆر بوە، بەڵام هەر چەندە فیكری عەفلەق وەرگر بێت، شتێك كە لە فیكریدا كاردەكات دەپرسێت كام شت؟ بەتاتو وەڵامێكی بۆ ئەو پرسیارە ئەوەرییە ناداتەوە.

٥١ . ئەبو جابر، بعث عرب، ١٣١، ١٣٩. هیچ كەس بەئەندازەی جابر هەوڵی نەداوە بەعس وابخاتەروو كە قابلی رێزو ئیحترامە. جابر دوای ئەوەی ساڵی ١٩٦٣ لە عراق حەمامێكی خوێن بەرپاكرا، دەنوسێت: بەعس بیروباوەڕێكی ئاشتیخوازانەو عاشقی ئازادییەو پەیوەندی بە پایەداربونی دەوڵەتی تاك حیزبییەوە نیە، بەڵام لە هەمان حاڵدا دەیەوێت بەشداری لە شارستانی جهانی و كاروباری مرۆڤایەتیدا بكات (٣٢ . ١٢٠). جابر دەڵێت عەفلەق "شتێكی تازەو عەرەبی لە زەمیندا هەبو، ئەوەش كاری لێكۆڵەرانی رۆژئاوای زەحمەت كرد، چونكە ئەوانە بە خوێندنەوەی رووكەشی نوسینەكانی بیرمەندانی رۆژهەڵات و بەبێ قوڵی تێگەیشتنی ناوەرۆكی عاتیفی وشە بەكارهاتوەكان، خەریكی ئەنجامگیرین" (ل٩).

*52-N. Salem Babikain, "Michel Aflaq: A Biographic Outline", in Arab Studies Quarterly, Institute of Arab Studies & A. A. U. G, Vol. ٢. (Spring ١٩٨٠),* .١٧٠

ئەریك رۆلۆ ئەنگیزەی دروست دەداتە پاڵ باڵی چەپی بەعسی دەنتی عەفلەقی كە لە دەیەی ساڵی ١٩٦٠ دروست بو. بەڵام ئەوە لەبیردەكات كە ئەم باڵە سەرباری نارەزایەتی كردنی عەفلەق بەرپرسیار بو لەبەرپاكردنی حەمامێكی خوێن لە عراقدا (١٩٦٣). س. جی. هێم لە پێشەكی ناسیونالیزمی عەرەبی یەكەم كەس بو كە باس لە توندوتیژی زاتی لە پەروەردەی بەعسی دەكات. (لەندەن، ١٩٦٢).

*53-Ajami, The Arab Predicament,* .٤٣

**سەرچاوە:**

ئەم بابەتە بەشێكە لە فەسڵی هەشتەمی كتێبی (كۆماری ترس) كە لە نوسینی (كەنعان مەكییە)یە، و وەرگێڕ وەك سەرچاوە پشتی بە هەردوو دەقە فارسی و عەرەبییەكەی كتێبەكە بەستووە.

# ڕۆڵی نەتەوەو کەمینەکان لە سیاسەتدا

د. حسین بەشیریە

لە فارسییەوە: حەسەن حسێن

## نەتەوەو ڕەگەز:

ململانێی ڕەگەزیی و نەتەوەییەکان بەردەوام ڕۆڵیان لە ژیانی سیاسی، دروست بوون و هەڵوەشانەوەی دەوڵەتەکاندا بینیوە. داگیرکردنی خاک و ناوچەکان لەلایەن نەتەوەی دیکەوە فاکتێکی پێکهاتنی دەوڵەتەکان بووە. هزری ڕەگەز و نەتەوەی باڵاتر لەمێژووی ئایدۆلۆژیا کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا، لەبارەیە زۆرکۆن و باوەکانە. ئەرەستۆ بەڵگەی بۆ ئەوە دەهێنایەوە کە هەندێک ڕەگەز خۆیەخۆ سەردار و هەندێکیش خۆیەخۆ کۆیلەن. هەندێک نووسەر لە جیاوازییە ڕەگەزییەکانەوە ڕوانیویانەتە جیاوازییە چینایەتییەکان. نووسەری فەرەنسی (هێنری دوبولنویلیە *gBsBes Bor saBh* ڕەگەزی نەجیبزادەکانی فەرەنسای بە فرانکی و خەڵکیشی بە ڕەگەزی گوڵەکان دەزانی. شۆڕشگێری فەرەنسی ( ئابێ سابییس) *Lbbea SBAes* وای لێکدەدایەوە کە شۆڕشی فەرەنسا بەرەنجامی خەباتی خەڵکی ژێردەستەی (گوڵەکان) بوو لە فۆرمی چینی سێیەمدا، کە داگیرکەرە فەرەنکییەکانیان لەپلەو پایەی خانەدانی وەدەرنا (مەبەست لە گوڵەکان دانیشتوانی ڕاستەقینەی وڵاتە کە فەرەنکییەکان ناوەکەیان گۆڕیبوو بە فەرەنسا. و.ك) . کۆنت دۆگۆبینۆ، نوسەری فەرەنسی لە کتێبێکی چواربەرگیدا دەربارەی نایەکسانی ڕەگەزەکانی مرۆیی( ١٨٥٣ . ١٨٥٥) بەڵگەی دەهێنایەوە کە جێرمەنەکان(ئەو مەبەستی لە خانەدانانی فەرەنسا واتە فرانکییەکان بوو کە لەسەر جێرمەنییەکان حساب دەکران) لەنێو هەموو ڕەگەزەکاندا ڕەگەزی باڵاترو داهێنەری کلتورو شارستانییەتی مرۆیی بون.

هەندێك نوسەری ئەڵمانی نەتەوەی سامی یا گەلی جورلەکەیان، لەئاستی ئەڵمانەکاندا، بە نەتەوەیەکی تێکدەرو لاساییکەرەوەو کۆسپی بەردەم پێشکەوتنی کەلتوریی دادەنا. بێگومان ئەم جۆرە بۆچوونانە هیچ جۆرە بنەمایەکی ئارگۆمینتی و عەقڵیان نییە، لێ خودی بۆچوونی نایەکسانیی نێوان ڕەگەزەکان و لەبلتر دانانی

یەکێك لە یەکێکی دیکە، دەرەنجامی سیاسی گەورەی لێکەوتووەتەوەو ململانێی زۆری لەگەڵ خۆیدا هێناوە. لە وڵاتانی فرە رەگەزو فرە نەتەوەدا، رەگەزە ژێر دەستەکان، بە هۆی تیۆرەی مافی سروشتیو یەکسانی مرۆڤەکانەوە، هۆکاری زەق کردنەوەی ململانێ سیاسییەکان بوون. باڵادەستی یەك رەگەز یا نەتەوەیەك بەسەر دامەزراوەکانی دەوڵەتدا، سەرچاوەی ناڕەزایەتیو ئازارە نەتەوەییەکان بووە. بەگشتی لە ئیمپراتۆرییە دێرینەکاندا گروپێکی رەگەزیی فەرمانڕەوای گروپەکانی دیکە بون. لە چاخی ئیمپریالیزمی نوێشدا، بە چەمکە مۆدێرنەکەی، پێکدادانی رەگەزیی بایەخێکی بەرچاوی هەبووە. لەم سەردەمەشدا وشیاریی رەگەزیو نەتەوەیی زیاتر چووە سەرو لە دەرئەنجامی کۆچکردنە مەزنەکانی کۆلۆنیالی و ئاکۆلۆنیالی رەگەزە جیاوازەکان رووبەرووی یەك بوونەوە. رەفتاری سپی پێستەکان لەگەڵ هیندییە سوورەکانو دانیشتوانی ئەسڵی ئەمریکا، بەتایبەتی لەسەرەتادا، رەنگدانەوەیەکی بەرچاوی لە سەر رووبەری ژیانی سیاسی هەبوو. لە ئەمریکای باکور سپی پێستەکان رێبازی راگواستنی هیندییە سوورەکانو لەناوبردنیانیان گرتەبەر. لەکاتێکدا لە ئەمریکای باشوور کۆچبەرە ئیسپانییەکان رێبازێکی دیکەیان هەبوو، خەڵکی ناوچەکانیان بۆ کارکردن لە زەویو زاری کشتوکاڵیدا تاودا. لەبەرامبەردا بارودۆخی ئەفریقیا، بەپێچەوانەی ئەمریکاو ئوسترالیاوە، رێگر بوو لەوەی ژمارەیەکی زۆری سپی پێست لەوێ نیشتەجێ بن.

ئیمپراتۆرییە مەزنەکان بە درێژایی مێژوو بەردەوام نەتەوەو رەگەزی جۆراوجۆریان گرتووەتە خۆ، بۆیە ئەمڕۆ ئەو وڵاتانەی کە خاوەن پێشینەیەکی ئیمپراتۆری بوون، خاوەنی پێکهاتەی نەتەوەییو رەگەزی زیاترن. کۆچکردنی نەتەوەکان بەهۆی زیادبوونی دانیشتوان، هەژاری یا سەرکوتی سیاسی، زەمینەی روو بەروو بوونەوەی رەگەزەکانی زیاتر کردووە. کۆچکردنی بەشێك لە خەڵکی هیند بۆ باشووری رۆژهەڵاتی ئەفریقیا. کۆچی ژاپۆنیو چینییەکان بەرەو کەنارەکانی ئۆقیانووسی ئارام لە وڵاتە یەککگرتووەکان، کۆچی (زۆرە ملێی) رەشپێستەکان بۆ ئەمریکا، کۆچی پەرشو بڵاوی گەلی ئیسرائیل( لەسەردەمی سەرگەردانیدا)، کۆچی سپی پێستەکان بۆ ئەفریقای باشوور... هتد. ئاکامی سیاسی بەرچاوی هەبووە. هەندێکجار خاوەن سەرمایەکان بەمەبەستی دەستکەوتنی هێزی کاری ملکەچو هەرزانو ململانێ کردن لەگەڵ سەندیکا کرێکارییەکاندا، پشتگیرییان لە کۆچی رەگەزەکانی دیکە کردووە. لەم نمونانەدا بەگشتی هەندێك جار ململانێ لەنێوان هێزی کاری بیانیو کرێکاری ناوخۆدا هەڵدەگیرسێت کە جاری وا هەیە بە ئاژاوەی رەگەزیی کۆتایی دێت. لەم حاڵەتانەدا پەیوەندییە ناسیۆنالیو رەگەزییەکان پەیوەندییە چینایەتییەکان دەکەن بە ژێرەوە. توندو تیژیی نەتەوەییو رەگەزی پێویستی بەبەدیهاتنی هەلومەرجی بابەتیو ئەندێشەیی تەواو هەیە. ناڕەوایيو نایەکسانی ئابووری کۆمەڵایەتی، وەك زەمینەیەکی ناڕەزایی، بە پاڵ دروست بوونی رێکخراوو هوشیاریی پێویستەوە زەمینەی چالاکی سیاسی دەرەخسێنن. بوار نەدان بۆ بەشداریی سیاسی بەبیانووی رەگەزیو هەڵاواردنی رەگەزیی لەنێو کاروباری سیاسیدا زەمینەی زۆربەی کێشمەکێشە ناسیونالییەکان بووە.

لەروانگەی کۆمەڵناسییەوە گرفتی کەمینە نەتەوەکانو پەیوەندییان لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیدا جێ باسی مشتومڕە گرنگەکانە. ناوی کەمینە نەتەوەییەکان بۆ ئەو گروپە نەتەوەییو

کەلتوورییانەی وڵاتێك بەکاردێت، کە دەوڵەت لەژێر فەرمانڕەوایەتی نەتەوەیەکی دیکەدا بێت. هاتنە ئارای کێشەی کەمینە نەتەوەییەکان لە وڵاتاندا بەرەنجامی دەرکەوتنی ناسیونالیزمی مۆدێرنە کە هەم بۆتە هۆی بەهێزکردنی هەستی هاوپشتی کەمینە نەتەوەییەکان هەم هەستی ناسیونالیستی نەتەوەی سەردەستیش.

هەندێك وڵات کە لە دوو هەرێمی کەلتووریدان، کەمینەی نەتەوەیی جۆراوجۆریان تێدایە. بۆ نموونە وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، ئەو وڵاتانەی ئەورووپا کە کەوتوونەتە نێوان دوو دەڤەری کەلتووریی ــ نەتەوەیی ئەڵمانیاو فەرەنساوە لە باروودۆخێکی ئاوادان. هەروەها لەو ناوچانەی کە دەکەونە نێوان دوو ناوچەی کەلتووری جێرمەن و سلاڤ لە رۆژهەڵاتی ئەورووپا، مۆزایکێك لە گەل و نەتەوەی جۆراوجۆر پێکهاتووە. کۆچ و داگیرکاریش کاریگەریی هەبووە لەوەی وڵاتێك فرەنەتەوە بێت، بێگومان هەموو کەمینەو نەتەوەکان ئارەزووی جیابوونەوەیان لە وڵاتی بنەڕەتی نییە. سەنگی وەفاداریی کەمینەکان بۆ حکومەتی ناوەندی بەهۆی جۆراوجۆرو جیاوازەوە دەگۆڕێت. کەمینە نەتەوەکان کەلتوور، مێژوو و زمانی هاوبەشیان هەیەو بەپێی ئاستی دەسەڵاتخوازیی نەتەوەی فەرمانڕەوا بەپلەی جۆراوجۆر خۆیان رێك دەخەن. دەشێت سیاسەتی حکومەتی ناوەندی، سەبارەت بە کەمینەو نەتەوەکان بە ئاقاری پاراستنی شوناسی کەلتووریی کەمینەکان یا کێشکردن و توانەوەیان لەنێو کەلتووری نەتەوەی سەردەستدا بڕوات. لە بەرامبەریشدا ئارەزووی کەمینە نەتەوەکان رەنگە بەئاراستەی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی سیاسی یا کەلتوریی بڕوات. ئاستی توانای سیاسی کەمینە نەتەوەکان بە فاکتەری جۆراوجۆرەوە بەستراوەتەوە، لەنێویاندا پێویستە بزانرێت ئایا نەتەوەیەکی تایبەت لە وڵاتێکدا بەشێکە لە نەتەوەیەکی گەورەتر کە لە خاکێکی دیکەدا دەوڵەتی دروستکردووە یا نا( وەکو نەتەوەی کورد لە ئێران یا عێراق)، بێگومان بەهێزیی یا لاوازی نەتەوەکان لە هەمبەر دەوڵەتی ناوەندیدا پەیوەندی بە کۆمەڵێك فاکتەرەوە هەیە لەوانەش، ژمارەی دانیشتوان، رووبەری زەوی، ئاستی گەشەسەندنی ئابووری، رێژەی پشکی کەمینە لە سامانی نیشتمانی و ...هتد. هەندێك نوسەر جیاکارییان لە نێوان کەمینەی نەتەوەیی هەمیشەیی و هەلکەوتەدا، کردووە. لە یەکەمیاندا، یەکگرتن لەگەڵ نەتەوەی سەنتەردا کردەیی نییە( وەکو کەمینە ئاسیاییەکان لە ئەمریکا)، بەڵام لە دووەمیاندا پێکهاتنی کەمینەی نەتەوەیی زیاتر لە ئەنجامی پارچە پارچە کردنی خاکەوە بووە( وەکو کەمینەی فارسی لە هەندێك وڵاتی دراوسێی ئێران) (کوردستانیش نموونەیەکە لە کەمینەی نەتەوەیی هەمیشەیی کە بەسەر چەند دەوڵەتێکدا دابەش کراوە. و.ك).

لەباری کۆمەڵناسی سیاسییەوە باسکردنی دوورودرێژی ماق کەمینە نەتەوەکان لە روانگەی یاسای نێو نەتەوەییەوە پێویست ناکات، چونکە ئەم مشتومڕانە کاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر پاراستنی ماق کەمینەکان دانەناوە. لە کۆنگرەی ڤییەننا ۱۸۱۵، کۆنگرەی بەرلین۱۸۷۸، کۆنفرانسی ئاشتی پاریس و خستنە رووی یاساو بنەمای سەربەخۆیی میللەتان لەلایەن وودرویلسۆنەوە تا رێککەوتنامەی کۆمەڵەی گەلان( عصبة الأمم) و جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بە ماق کەمینەو نەتەوەکان، باس و خواس کراوە.

بەدەر لەڕادەی کاریگەریی بڕیارنامە نێودەوڵەتییەکان لەسەر چاودێریکردنی ئەو مافانە، لەباری کۆمەڵناسی سیاسییەوە

پەیوەندی کەمینەکان لەگەڵ ناوەندداو رۆڵ و کاریگەری سیاسییان بەدەستووری وڵات و دامەزراوەکانی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی ئەم کەمینانەوە بەستراوەتەوە. ژمارەی کەمینەکانیش لە وڵاتێکدا کاریگەریی لەسەر دەسەڵاتی سیاسییان هەیە. سەدەکانی یەکەمینی زایینی لە ئەورووپای رۆژهەڵات و لە ئەنجامی کۆچی نەتەوەکانی تیۆتۆنی و سلاڤی پێکهاتەیەکی ئاڵۆزی نەتەوەکان هاتە ئاراوە. ئەم نەتەوانە بەدرێژایی چەندین سەدە بەشێوەی یەکەی سەربەخۆو جیا لە یەکدی لەپاڵ یەکدا ژیاون. گروپە نەتەوەییەکانی کە لە کۆچی گەورەوە دروست دەبن بە گشتی یەکێتی و هاوپشتی کەلتووری خۆیان دەپارێزن. بۆ نمونە لە ئەمریکا کەمینە چینیەکان لە شاری چاینە تاون ( o hina towns) لە رەشپێستەکان زیاتر شوناسی کەلتووریی خۆیان پاراستووە. رەش پێستەکانی ئەمریکا لە خێڵی جۆراوجۆر بوون کە بەگشتی بەیەك زمان قسەیان نەدەکرد. هەروەها بەردەوام بوونی ( ئیتالیا بچووکەکان)و ( پۆڵۆنیا بچووکەکان) (کەمینەی یەکپارچەی ئیتالی و پۆڵۆنی) نیشانەیەکە لە ناشایستەیی پرۆسەی کێش کردنی کەلتووریی لە ئەمریکا. لە ئەمریکای لاتینیش کەمینە دوو رەگەکان( مستیزۆ c estizo)، کە لە تێکەڵاوبوونی ئیسپانی و پورتوگالیەکان لەگەڵ دانیشتووانی سوور پێستی ئەم کۆمەڵگایانەدا دروست بوون، یەکێتی و شوناسی کەلتووری خۆیان لەبەرامبەر زۆرینەدا پاراستووە. کەمینە جولەکەکانی وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات و ناوچەکانی دیکە بە زۆری بە هۆی ترس و ناچارییەوە وڵاتانی خۆیان بەجێ دەهێشت و لێرەشەوە لەهەموو شوێنێك هاوپشتی و یەکێتی نەتەوەیی و ئایینی خۆیان دەپاراست. بەشێوەیەکی گشتی جیاوازیی ئاستی کەلتووریی نێوان کەمینە و نەتەوەی سەردەست، فاکتەرەکانی یەکپارچەیی نێوخۆی کەمینە( یەکێتی زمان،خێڵ، ئایین و هتد...)، هەروەها شێوەی هەڵسوکەوتی زۆرینە (نەرم ونیانی یا سەرکوت) ئەمانە هەمووی هۆکارن بۆ بەردەوامیی و یەکپارچەیی کەمینە نەتەوەیی و ئەتنییەکان. کاتێك فاکتەرگەلێکی وەك رەگەز، ناسیونالیزم، زمان و ئایین یەکتری توند دەکەنەوە، یەکپارچەیی و شوناسی کەمینەی نەتەوەیی بەهێز دەبێت.

جیاوازیی رەگەزی نێوان رەگەزە سەرەکییەکان جیاوازیگەلێکی بەرچاون. رەگەزناسێك، رەگەزە سەرەکییەکانی مرۆڤایەتی بەشێوەی خوازە کردووەتە چوار رەگەزەوە: رۆژ( سپی)، شەو(رەش)،زەردەپەڕ( زەرد)، تاریك و روونی بەیانی( سوور)[1]. ئەگەر فاکتەرە رەگەزییەکان لەئارادا نەبن، ئەوا رەنگە فاکتەری میللی و کەلتووری زەمینەی ناکۆکی دروست بکات. بۆ نمونە لە ئەورووپای رۆژهەڵات، سربەکان چیك، سلاڤ، مەسەدۆنی، کرواتەکان و...هتد جیاوازی رەگەزیی ئاشکرایان نییە، بەڵام هەریەکەیان پێشینەی نەتەوەیی، کەلتووریی و مێژوویی جیاوازیان هەیە، کە بە زۆری لەزماندا دەردەکەوێت. زمان دیارترین روکاری جیاوازیی کەلتووریی و نەتەوەیی نێوان نەتەوە جۆربەجۆرەکانە. بەردەوامیی زمان نیشانەی بەردەوامی سەربەخۆیی نەتەوەیی و کەلتورییە. پۆڵۆنییەکان کەماوەی ١٥٠ ساڵ ژێردەستەی روس، نەمساوی و ئاڵمانەکان بوون، زمانی خۆیان پاراست. ئێرانییەکان بەپێچەوانەی زۆربەی نەتەوەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە، لە سەدەکانی دەسەڵاتداریێتی عەرەبیدا، زمانی فارسی و بەشی زۆری کەلەپووری خۆیان پاراست. فەڕەنسییەکانی کەنەدا بە وابەستەبوونیان بە کەنیسەی کاسۆلیکییەوە تاڕادەیەکی زۆر شوناسی کەلتووریی خۆیان

پاراستووە. تەنانەت لە ئەمریکا، ئیرلەندییەکان بەهۆی پابەندبوونیان بە کەنیسەی کاسۆلیکییەوە توانیان لە کۆچبەرە ئەوروپییەکانی دیکە زیاتر شوناسی نەتەوەیی خۆیان بپارێزن. جیاوازی ڕادەی گەشەی ئابووریی نێوان گروپە نەتەوەییە جۆراوجۆرەکان دەبێتە هۆی بەردەوامیی جیاوازی شوناسیشیان. لە ئێران دواکەوتوویی ئابووری ئەو ناوچانەی نەتەوەکانی دیکەی تێدا نیشتەجێن، جیاوازیی کەلتووری، زمان و ئایینیی ئەو نەتەوانەو هەرێمەکانی ناوەندی زیاتر کردووە. بەسەرنج دان لەو فاکتەرانەی باس کران ڕۆڵی سیاسی کەمینەکان لەسەر ئاستی نیشتمانی بە: هاوپشتی، ڕێکخستن و سەرکردایەتی نێوخۆییان، ئاستی دوورە پەرێزی یا لێکەوتیان لەگەڵ زۆرینەداو هەروەها شێوەی هەڵس و کەوتی نەتەوەی سەردەستەوە، بەستراوەتەوە.

لە ئەمریکا، دوای جەنگی یەکەمی جیهان، دەرکەوت کە کەمینە نەتەوەییە جیاوازەکان بە پێچەوانەی چاوەڕوانی زۆرینەوە لێیان، لەگەڵ کەلتووری ئەمریکاییدا ئاوێتە نەبوون. چالاکی خوێندنگە تایبەتییەکانی پۆلۆنیا، ئیرلەندی و هی دیکە بەناچاری سیاسەتی بەئەمریکایی کردنی کەمینەکانی توندتر کردەوە. لەهەمان کاتدا ئەم جۆرە سیاسەتە لەسەر بنەمای سەپاندنی باڵاتربوونی نەتەوەی ئەنگلۆساکسۆن لە ئاست نەتەوەکانی دیکەدا بوو، لەبەرامبەر ئەم سیاسەتەش هەستی نەتەوەیی و نەتەوەپەرستیی کەمینەکان زیادی کرد و تایبەتمەندییە کەلتووری و ناسیونالیستیەکانیش تۆختر بوونەوە.

شێوەی بەشداریکردنی گروپە نەتەوەییەکان لە سیاسەتی نیشتمانیدا، لەو بوارانەدا کە شیاو بووە، جۆراوجۆرە. وەک نموونەیەکی کلاسیک دەتوانین سیستمی کانتۆنەکانی سویسرا وەبیر بهێنینەوە، کەلەودا لەرێگەی دابەشکردنی وڵاتەوە بۆ چەند ناوچەیەکی سەربەخۆ هەریەکە بەشێوەیەکی گشتی نوێنەرایەتی پێکهاتەیەکی نەتەوەیی دەکات و دامەزراوەی بەڕێوەبردنی جیاوازی هەیە، پەیوەندی سیاسی نێوان نەتەوەکان ڕێکخراوە. لە لوبنانیش بەرلەشەڕی ناوخۆ، دابەشکردنی پۆست و پلەی سیاسی بەپێی نەتەوە، ئایین و ئایینزا، ڕێگا چارەیەک بوو بۆ هاوکاری کردنی نێوان پێکهاتە نەتەوەیی و ئایینیە جیاوازەکان.

لە هەندێک وڵاتی ئەورووپای ڕۆژهەڵات وەکو ڕۆمانیا، هەنگاریا و چیکوسلۆڤاکیا، پاش جەنگی یەکەمی جیهان، بەمەبەستی دروست کردنی هاوپشتی نەتەوەیی، وەزارەتی تایبەت بە کەمینەکان پێکهات، یاخود لە کابینەدا پۆست و پلە بە نوێنەرەکانیان درا. یەکێتی سۆڤیەت دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر نزیکەی ١٨٥ گروپی نەتەوەیی تێدا بوو کە بە ١٤٧ زمان دەدوان. دابەش کردنی وڵات بەسەر ژمارەیەک کۆمار و ناوچەی ئۆتۆنۆم و بزواندنی هەست و ئاگایی ناسیونالیستی لە دژی دەوڵەتە سەرمایەدارییەکانی ڕۆژئاوا، ڕێگا چارەی پراکتیکی بەلشەفیەکان بوو بۆ وڵاتی فرە نەتەوەیی سۆڤییەت. لە هەندێک وڵاتی دیکەی وەک تورکیا و یۆنان ئاڵوگۆڕی زۆرەملێیانەی کەمینەکان وەک ڕێگا چارەیەک گیرایە بەر.

### کەمینە نەتەوەییەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا

لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا بەگشتی سنوورەکانی سیاسەت و زمان لەگەڵ یەکدا دێنەوە. بەم حاڵەشەوە کەمینەی ئەتنی و نەتەوەیی و زمانیی لە هەندێک وڵاتدا هەیە. بۆ نموونە پێویستە ئاماژە بە باسک و کەتەلۆنییەکان لە ئیسپانیا، سکۆتلاندی و وێڵزی لە بەریتانیاو ئیتالییە

ئاڵمـان زمانـەکان *Der tsnh* لـە تیرۆڵـی باشـوور بکەین.

هەندێك لەم کەمینانە بزاڤی سیاسی، پارت‌و رێکخـراوی سیاسـییان دروسـت کـردووە یـا بەشێوەیەکی سەربەخۆ چوونەتە پەرلەمانەوە. لە زۆربـەی ئـەم وڵاتانـەدا کەمینـە زمانییـەکان لـە رووی ژمـارەوە پێکهاتـەی بـچووکن. بـۆ نموونـە پـارتی خـەڵکی سـویدی زمـان لـە فینلانـد یـا کەمینـەی ئـەڵمانی زمانـەکان لـە دانیمـارك‌و دانیمارکی زمان*Danish* لە ئاڵمانیا، وەك هێزی سیاسی جێ سەرنج سەیر ناکرێن. بەپێچەوانەوە لە سویسراو بەلجیکا کەمینەی زمانیی بەرفراوان هەن. بەلجیکییە هۆڵەندی زمانەکان (فلمیشەکان) لـە باکوور زۆرینـەی دانیشتووان (نزیکـەی ٥٥٪) پێك دەهێنن. بەلجیکییـە فەرەنسی زمانەکانیش (والۆنـەکان) کەمینەیـەکی گـەورەن‌و نیشتەجێی باشـوورن. لـــە سویـــسرا ئاڵمانـــەکان ٦٥٪ن، فەرەنسییەکان کەمینـەی گـەورەن (نزیکـەی٢٥٪). بەم حاڵەشـەوە پـارتی سیاسی سـەرەکی لەسـەر بنـــەمای جیـــاوازی زمـــان لـــە ئـــارادانین‌و ســـنوورەکانی زمـــان لەگـــەڵ ســـنوورەکانی کانتۆنەکانـدا ویـك نایەنـەوە. بە پێـچەوانەشەوە سـنووری کانتۆنـەکان‌و سـنوورە ئاینییـەکان بەشـێوەیەکی بەرچاو لەگەڵ یەکدا دێنـەوە. لـە بەلجیکا ماوەیـەکی زۆر زمانی فەرەنسی زمانی چـینی فـەرمانڕەوا بـوو، لەبەرامبـەردا زمـانی فلمیش (یا فلامنگیەکان لە باکووری فلاندرن) لە باری ئابووری، کەلتوری‌و سیاسیەوە پێگەیەکی خـــوارترو پاشـــکۆیان هـــەبوو. لایـــەنگیری ناسیونالیـستی بـەردەوام لـەناو فلیمنگیەکانـدا بەهێز بووە. بەڵام ئاڵوگۆڕە ئابووریەکانی دەیەی هـەفتاکان بـارودۆخی پێـشووی هەڵگێڕایـەوە، والۆنـەکان لـەباری ئابووریـەوە بەرەو ئـاوا بـوون چـوون‌و فلامنگیـەکان گەشـەی کـشتوکاڵی‌و پیـشەسازیی بـۆ وێنـەیان بـەخۆوە دی. پـارتی سیاسـی بـچووکیش لەسـەر بنـەمای ئـارەزووی ناسیونالیستی‌و زمانی پێکهات (پارتی یـەکێتی نەتـــەوەیی فلامنگیـــەکان‌و بـــەرەی هـــۆگرانی فەرەنـسا لـەنێو والۆنـەکان پێکهـات) بەگـشتی جیاوازی کەلتووریی‌و ئابووری هەردوو نەتەوەکە کاریگەرییـەکی لەسـەر سیاسـەتی وڵات داناوە، دەبـوو پەیوەنـدی گروپـە نەتەوەییـەکان لـەرووی پێکهاتـەی ناوخۆییـەوە، لـە حکومەتـدا رەنـگ بداتـەوە. بـۆ نمونـە دوو وەزیـری رۆشـنبیری بـۆ دوو بەشـــی دانیـــشتوان دادەنـــراو پێکهاتـــەی کابینەکە دەبـوو بەیەکسانی لـە هـەردوو نەتـەوە پێك بێت‌و نوێنەرانی پەرلەمان لە هەر نەتەوەیەك بە جیـا لەسـەر ئاسـتی نـاوخۆ پەرلـەمانیان پێـك دەهێنن[٢].

## هۆزو خێڵ‌و نەتەوەکانی ئێران

هـۆزو خێڵـەکان لـە ئێرانـدا هەمیشە بەشـێکی سەرەکی دانیشتوانیان پێکهێنـاوە، راسـتەوخۆ یا ناراسـتەوخۆ رۆڵیـان لـە سیاسـەت‌و حکومەتـدا گێـڕاوە. دەسـتەواژەی ئـێل (خـێڵ) لەسـەردەمی ئێلخانیەکانەوە ماوەتەوەو زیاتر بە مانای خێڵی بیابـان نـشین بـەکارهێنراوە. خـێڵ رێکخـراوی ئیـداری‌و سیاسـی هـۆز بـووەو لـە خـوارەوە بـۆ سەرەوە پێکهاتووە لە مناڵەکان، (خێزان)، تیرە، تایەفە، هـۆزو خێڵـی گـەورە. خێڵـەکان لـە ئێران نیمـچە دەشـتەکی (بیابان نـشین) بـوون‌و سـاڵانە گـەرمیان‌و کوێـستانیان دەکـرد. لەگـەڵ ئەوەشـدا خێڵەکان شوێنی نیشتەجێ بوونی دیاریکراویـان هـەبوو، بـۆ نمونـە خێڵـی بـەختیاری لـە چـوار مـەحاڵ‌و خوزسـتان، خێڵـی قەشـقایی لـە فـارس، خێڵـی شاسـەوەن لـە ئازەربایجـان، خێڵـەکانی تورکمـان لـە دەشتی گورگان‌و خێڵـی بۆچاقچی‌و ئەفشار لە کرمان نیشتەجێ بوون.

وا دیـــارە ژیـــانی خێڵـــەکی‌و کۆچـــەری‌و ئیماراتی بنەماڵەیی و ئاژاوە لە ئەنجامی هێرشی

مەغۆلەکان بۆ ئێران بەرفراوان بووەوە، دەستەواژەی (خان)یش کە لەبنەڕەتدا(قائان)ە هەرلەو سەردەمانەوە ماوەتەوە. هەندێك لە خێڵەکان نیشتەجێ بوونو یا بەتەواوی نیشتەجێ کران. سیاسەتی نیشتەجێ کردنیان لە گوندەکاندا، لەسەدەی بیستدا، بووە هۆی سەقامگیر بوونیان لە شوێنێکدا. لەهەندێك خێڵدا بنەماڵەی نیشتەجێ بە (خاکی)و کۆچەریش بە(دەشتەکی) ناو دەبرێ. لە زمانی فارسیدا دەستەواژەکانی وەك هۆز، خێڵ، تایەفە، تیرەو بنەماڵە بە ڕۆشنی لەیەك جیانەکراونەتەوە (لە زمانی کوردیشدا هەمان کێشە هەیە . و.ك). بەڵام بەهەر حاڵ خێڵو هۆزەکان لەسەر بنەمای خزمایەتیو پەیوەندی ئاڵۆزی خوێن دامەزراوە کە لە خێزانەوە تا بنەماڵە، تیرە، هۆزو خێڵ دەگرێتەوە. هەندێکجار یەکێتی خێڵەکان وەك یەکێتی خێڵەکانی (بارکەزایی)، (میر مەرلزدایی)و (بوزورگ زادە)، برەوی هەبووە. لە پێناسەکردنی خێڵو هۆزەکاندا هاوڕاییەك نییە، هەندێك ئەتەوەیان بەبەشێك لە خێڵەکان داوەتە قەڵەمو هەندێکیش پێکهاتەی خاوەن دەسەڵاتو نەسەبی خێڵەکانیان کردە ستاندەرێكو کۆمەڵێکیش لەسەر تایبەتمەندێتی کۆچی گەرمیانو کوێستان پێداگریان کردووە.هەرچۆنێك بێت دەشتەکی بوونو شوانکارەییو کۆچی وەرزی لە تایبەتمەندییەکانی خێڵەکانی ئێران بووە. گرنگترین خێڵو هۆزەکانی ئێران بریتین لە کوردەکان، لوڕ، قەشقایی، پێنج فارس، شاسەوەنو تورکمانەکان.

وەکو باسمان کرد خێڵ پێکهاتەی کۆمەڵایەتیو سیاسی هۆزە. دەشێت خێڵێك لە چەندین هۆز پێکهاتبێت، هۆز وەك ڕژێمی ئابووریو خێڵو وەك ڕژێمی سیاسی وایە. لە بارودۆخێکدا کەرژێمی کۆمەڵایەتی ئابووری هۆز گۆڕانی بەسەردا نەهاتبوو( بەتایبەت پێش یاسای ریفۆرمی زەویو زار) [٢] خێڵو هۆز بەیەك مانا دەهاتن، لەدوای ئەوەوە باسی دوو گروپی خێڵەکی واتە ڕەوەندو دێهاتی( خێڵی نیشتەجێ بوون) هاتە ناوەوە، پەیوەندی خوێن لە نێو خێڵەکاندا سێ جۆری هەیە:١ــ پەیوەندی تۆرەمەی باوکایەتی، گەورەترین گروپ لێرەدا( کوڕان)ە کەلەلای هەندێك هۆز دابەش دەکرێت بۆ گروپی بچووکتری وەك (تش).٢ــ خزمایەتی ناچاری یا داسەپاو کە بەپێی ئەوە ئەندامانی هۆز یا خێڵو تیرەیەك خۆیان بە نەوەی یەك بەرەباب یا باپیرە گەورە دەزانن. بناغەی هۆزو خێڵیش بەشێوە باوکەی هەر ئەم پەیوەندییە بووە.

٣ــ پەیوەندی خزمایەتی شاراوە یا ژنو ژنخوازی، کە تاڕادەیەکی زۆر لەنێو تۆڕی پەیوەندییە خزمایەتییەکانی خوێندا چەسپا.

خانەکان ڕۆڵێکی تەوەرەییان لە ژیانی کۆمەڵایەتی، سیاسیو ئیداری خێڵدا هەبوو. هەر خێڵێك ئیلخانێكو چەندین خانی هەبوو. خانەکان لە ڕێکخستنی کاروباری کۆچو دابەش کردنی لەوەڕگاو کۆکردنەوەی پولوپارەدا خاوەن بڕیاری فراوان بوون. لە بواری کشتوکاڵیدا بەگشتی نزیکەی ٢٠٪ی بەرهەم وەکو دەستکەوتی موڵکانە وەردەگرت.

هەرچۆنێك بێت خان زۆربەی بڕیارەکانی بە پاوێژ کردن لەگەڵ ریش سپییەکان دەدا. ریش سپییەکان بەرپرسی کۆمەڵەی خێڵەکی بچووکتر بوون. پلەی ئیداری سیاسی خێڵەکان لە خوارەوە بۆ سەرەوە سەرپەرشتیاری خێزان، ریش سپی، کوێخا، داروغا( کەلانتەر)، کەلانتەرخان، ئیلخانو ئیل بەگی بوو. لەرووی مێژووییەوە سەرۆك خێڵەکان لە کۆمەڵگای نەریتی ئێراندا بەردەوام یەکێك بوون لە گروپەکانی دەسەڵات. لە کۆتایی سەردەمی

قاجارییەکاندا، بەوەدا کە خێڵەکان نزیکەی چواریەکی دانیشتوانی ئێران بوون، سەرۆک خێڵەکانیش دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و ئابووری بەرچاویان هەبوو.

خێڵ و هۆزەکان لەڕووی پێکهاتەی دەسەڵاتی نارخۆوە چەند کۆمەڵیەکی هاوپشت و پشت بەخۆ بەستوبوون، هەروەها وەک یەکەی چەکداریی سەربەخۆ سەیردەکران. لەراستیدا مێژووی سیاسی ئێران تا سەدەی بیست مێژووی کێبەرکێ و ململانێی خێڵ و هۆزی سەربەخۆی چەکدار بوو. سەرۆک خێڵەکان بەشێک بوون لە چینی تیۆڵداران[٤] ئێران و پەیوەندیەکی نزیکیان لەگەڵ دەوڵەتدا هەبوو. لەراستیدا ئەوان تەنها بەشێکی پاشماوەی خانەدانی خاوەن زەوی ئێران[٥] بوون. لە سەردەمی سەفەرییەکاندا و تا بەرلەوەی شا عەباس بە دروست کردنی سوپایەکی نوێ، دەسەڵاتی دەوڵەت ناوەندی بکاتەوە، سەرۆک هۆزەکان لەبەڕێوەبردنی کاروباری ویلایەتەکاندا رۆڵی راستەوخۆیان هەبوو. دوای رووخانی دەوڵەتی سەفەوی و هەتا دروست بوونی دەوڵەتی قاجاری، هۆزو خێڵەکان بۆ گرتنی دەسەڵاتی سیاسی ململانێیەکی زۆریان کرد. هەموو حکومەتەکان کەم و زۆر، بۆ سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر تایەفەو هۆزەکاندا، کێشەیان رووبەڕووبۆتەوە. باشترین رێگاش بۆ سەرکوت یا ملکەچ پێکردنیان بەهێزکردنی هێزی سەربازیی دەوڵەت بوو. حکومەتەکان شێوەی جۆراجۆریان بۆ کۆنترۆڵ کردنی هۆزەکان بەکاردەهێنا، تێڕوانینی پاشاکانی قاجار وابوو هەر ئیلخانێک لە سەرۆک خێڵەکان دیاری بکەن و گرنگترین ئەرکیشیان کۆکردنەوەی پارەو پوول بوو بۆ حکومەت. توخمی سەرەکیی سیاسەتی خێڵەکییانەی قاجارییەکان کەڵک وەرگرتن بوو لە هێزی چەکدارو شەڕکەری خێڵەکان، بەتایبەت لەسەر سنوورەکان، پاشان وەرگرتنی باج و پارە لە خێڵەکان و کۆچ پێکردنی خێڵەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بەمەبەستی بەرتەرسک کردنەوەی دەسەڵاتی سیاسییان. سەرۆک خێڵەکانیش وەک خاوەن موڵک موڵکانەیان وەردەگرت. لەنێو خێڵدا دەسەڵاتی خان و سەرۆکەکان تەنها پشتی بە زۆر نەدەبەست، بەڵکو جۆرێک لە دەسەڵاتی باوکسالاری بنەمای دەسەڵاتداریتیان بوو لەناو خێڵدا. لە ئێران هەر خێڵێک پێکهاتەی ئیداری سیاسی، کەلتووری و نەتەوەیی جیاوازی هەبوو. لەکاتی لاواز بوونی دەسەڵاتی ناوەندیدا ناوچە خێڵەکییەکان ئاستێکی باڵایان لەسەربەخۆ بوون لە دەوڵەت بەدەست دەهێنا. لەراستیدا دەسەڵاتی ناوەند خۆی بەمانای دەسەڵاتداریتی هۆزێک بەسەر هۆزەکانی دیکەوە بوو. دەوڵەتی قاجاریش لە باری ناوخۆییەوە ناوەڕۆکی خێڵەکییانەی خۆی لەدەست نەدا. بەم مانایە پاشاکانی قاجار بەپێی نەریتە خێڵەکییەکانی خۆیان، کەسێکیان وەک ئیلخان دیاری دەکرد تا لەناو دەربارەوە ئاگایان لە داوەری کردنی کێشەی خێڵەکان بێت[٦].

هۆزو خێڵەکان لە سەردەمی شۆڕشی مەشروتەشدا، وەک گشت سەردەمەکانی لاوازیی دەسەڵاتی ناوەند، رۆڵی بەرچاویان هەبوو، هەندێکیان بە بردنە پێشی پرۆسەی شۆڕش رۆڵیان گێڕا. بۆ نموونە خێڵی بەختیاری بە سەرۆکایەتی سەردار ئەسعەدی بەختیاری رۆڵێکی بەرچاویان لە سەرکەوتنی شۆڕشدا گێڕا. خێڵی بەختیاری لە سەردەمی ئەفشاری و قاجارییەکاندا، یەکێک بوو لە خێڵە هەرە دەوڵەمەند، سەرکێش و پڕ چەکەکانی خێڵەکانی ئێران و لەشکرێکی خێڵەکیی مەزنی لەبەردەستدا بوو. لەراستیدا راپەڕینی بەختیارییەکان لە دژی زۆرداریی قاجارییەکان بە ئامانجی

یەکلاکردنەوەی حساباتی کۆن بوو و کەمتر لە ئامانجخوازیو مەشروتەخوازییەوە سەرچاوەی گرتبوو، بەڵکو ئامانجەکانیان خۆی لە سەربەخۆبوون لە پاشاکانی قاجارو ئازادی خانەکانی بەختیاری لەڕێگەی دانانی فەرمانڕەوایانی ناوخۆیی لە ئەسفەهاندا[٧]، دەبینییەوە. سەرباری ئەوەش (ئیلخانی) بەختیارییەکان لە دەرباری (شا)وە دیاریدەکرا. لەشکری بەختیارییەکان لە بەشکست کێشانی ملهوڕییە بچوکەکەدا ڕۆڵێکی دیاری هەبوو. دوای ئەوەی ئەنجومەن درایە بەرتۆپ، (عەلیقولی خانی سەردار ئەسعەد)ی بەختیاری کە لە پاریس بوو لە ڕێگەی نامەکانییەوە خەریکی دنەدانی خانەکانی بەختیاری بوو لە دژی موحەممەد عەلی شا. دەست بەسەرداگرتنی ئەسفەهانو سەقامگیربوونی مەشروتە لەو شارە، بە یارمەتی شمشێری تیژی سوڵتانەکانی بەختیاری، کاریگەرییەکی سەرەکی لەسەر سەرکەوتنی مەشروتەخوازان هەبوو.

بەهاتنە ئارای پێکهاتەی دەوڵەتی ڕەها لە سەردەمی ڕەزاشادا، هەژموونی سیاسی هۆزەکان بەرەو دابەزین چوو. دەوڵەتی نوێ چەند هەنگاوێکی سەرەتایی نا لەوانەش، هەوڵدان بۆ ئاوێتەکردنەوەی ناوچە خێڵەکییە نیمچە سەربەخۆکان لەناو دەوڵەتی نیشتمانی نوێدا، هەڵوەشانەوەی پێکهاتەی خێڵەکیو تایەفەگەریی، بەرتەسک کردنەوەی دەسەڵاتی خانەکان، ناچارکردنی لاوانی خێڵەکان بۆ چوونە سەربازیی، داماڵینی چەک لە دەست خەڵکو نیشتەجێ کردنی خێڵەکان. لەم ڕووەوە دەوڵەتی ڕەزا شا بە کردەوە چووە شەڕی خێڵو هۆزەکانەوە. خێڵەکانی قەشقایی، بەختیاری، شاسەوەن، بویەر ئەحمەد، بەلوجستان، خوزستانو ئازەربایجان یەك لەدوای یەك تا ساڵی ١٣١٢ زەبوونو ملکەچی دەوڵەتی ناوەندی بوون. سەبارەت بەخێڵی گرنگی بەختیاریش، دەوڵەت کۆمەڵێك هەنگاوی گرنگی نا وەك، لەدەسەڵاتخستنی خانەکانی بەختیاری لە فەرمانڕەوایی ئەسفەهانو کرمانو یەزد لە ساڵی ١٣٠٠، هەڵوەشانەوەی نازناوی ئیلخانیو ئیل بەگی لەساڵی ١٣١٢، دەستگیرکردنو لەسێدارەدانی هەندێك خانی بەختیاری لە ساڵی ١٣١٣.

لەم نێوەدا سەرچاوەکانی دارایی خێڵەکانیش دەستیان بەسەرداگیراو زۆربەیان کەوتنە دەستی سەرکردەکانی سوپارە. بەسوود وەرگرتن لە یاسای نوێ تۆماری بەڵگەنامەکانی زەویوزارو موڵکی سەرۆك خێڵەکان دەستیان بەسەرداگیراو درانە سوپا. جگەلەوەش چەند هەوڵێك درا بۆ نیشتەجێ کردنی خێڵەکان لە گوندەکانداو بەرگرتن بە کۆچی وەرزی. سەرەنجام ئەم هەنگاوانە گوزەران، ژیانو ئازادیی خێڵەکانی خستە ژێر فشارێکی توندەوە، پۆستی سەربازیو ژەندرمە لەنێو جەرگەی ناوچە خێڵەکییەکاندا دانراو سەرکردە سەربازییەکان دەسەڵاتیان بەسەر ژیانی خێڵەکاندا سەپاند. هەروەها بەپێی یاسا پەسەندکراوەکانی ئەنجومەنی یانزەیەم سەبارەت بە دابەش کردنی سەرلەنوێی وڵات لە ١٣١٧ دا و دانانی بەرپرسە خۆجێییەکان لەلایەن ناوەندەوە، دەسەڵاتێکی بیرۆکراتی نوێ باڵی بەسەر ناوچە خێڵەکییەکاندا کێشا. بەم جۆرە دەسەڵاتی خێڵەکان شکستی خوارد.

خێڵەکان جارێکی دیکە، لە ساڵانی ١٣٢٠ ـ ١٣٣٢ پاش ڕووخانی ڕەزاشا، بە هۆی لاوازی دەسەڵاتی ناوەندەوە گیانیان بەبەردا هاتەوە. لەم ماوەیەدا سەرۆك خێڵەکان لە ئەنجومەنەکاندا ئۆتۆریتێکی بەرچاویان هەبوو. خانەکان کە لەتاراندا لەژێر چاودێریدا بوون، لەدوای دەرچوونی ڕەزا شا بێ پسانەوە گەڕانەوە بۆ

خێڵەکانیان و جارێکی دیکە فەرمانڕەوایەتی ناوچەکانیان گرتەوە دەست. زۆرێک لە خێڵەکان کە بەزۆرە ملێ نیشتەجێ کرابوون، گەڕانەوە سەر ڕێ و ڕەسمەکانی پێشوویان. بەڵام زۆری نەخایاند دیسانەوە بەهۆی بەهێز بوونەوەی دامەزراوەکانی دەسەڵاتی ناوەندەوە، دەسەڵاتی خێڵ و هۆزەکان لە قاڵب درایەوە. بەتایبەت چاککردنی زەوی‌وزار (اصلاح ارضي) و بە دەوڵەتی کردنی دارستان و لەوەڕگاکان زیانێکی زۆری بە دامەزراوەی ئابووری و گوزەرانی خێڵ گەیاند و دەسەڵاتی خان و دارۆغایانی خێڵەکی شکست پێهێنا.

لەدوای ١٣٣٢ەوە دروست بوونی دەسەڵاتێکی ناوەندیی ڕەها لەلایەک، گەشەی خێرای ئابووری و کۆمەڵایەتی لەلایەکی دیکەوە گۆڕینی کاریگەریان لە پایە سیاسی و ئابوورییەکانی خێڵەکاندا. لەدوای شۆڕشی ئیسلامیشەوە کە دەوڵەت لە سەرەتادا لاواز بوو، خواستی نەتەوەکان بۆ سەربەخۆیی، خۆ بەڕێوەبردن و باشبوونی دۆخی ئابووری پەرەی سەند. لە کوردستان هەردوو حزبی سەرەکی (حزبی دیموکراتی کوردستان و کۆمەڵە) دەستیاندایە نوێ کردنەوەی ڕێکخراوەکانیان و خوازیاری سەربەخۆیی و دامەزراندنی حکومەت و پەرلەمانی خۆیان بوون و هێزی پێشمەرگەیان پێکهێنا. (شێخ عیزەدینی حوسەینی) ئیمام و وتار خوێنی مزگەوتی مەهاباد بوو، هەر بەو ناوەشەوە داوای سەربەخۆیی کوردستانی دەکرد. (کۆمەڵە) خەتێکی ماوی و جوتیاری تیابوو کە خەریکی پێکهێنانی شورای جووتیاران بوو، داوای چاککردنی زەوی و زاری دەکرد. پەشێوی بارودۆخی کوردستان حکومەتی کاتیی ناچارکرد لیژنەیەک بنێرێتە مەهاباد تا دانوسان لەگەڵ ڕابەرانی کورددا بکەن. بەڵام گفتوگۆ بە بن بەست گەیشت و لەئەنجامدا شەڕو پێکدادان لەنێوان سوپای پاسداران و پێشمەرگەکانی دیموکرات و کۆمەڵەدا دروست بوو. لەشکرو پاسدار بەشێوەیەکی بەربڵاو هاتنە کوردستانەوە.

## ڕۆڵی سیاسی نەتەوەو خێڵەکانی ئەفغانستان

چوار نەتەوەی سەرەکی لە ئەفغانستاندا هەن، کە ئەمانەن: پاشتۆن، تاجیک، هەزارەو ئۆزبەک. جگە لەوانیش نەتەوەی بچووک هەن وەک بەلوج و تورکمانەکان کە لەڕووی سیاسییەوە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نییە. لەڕووی سیاسییەوە پاشتۆنییەکان گەورەترین و گرنگترین نەتەوەی ئەفغانستانن، کە لەدەوروبەری ڕۆژهەڵات و باشوور نیشتەجێن. پاشتۆنەکان بنەچەی خۆیان دەگێڕنەوە بۆ نەتەوەی ئیسرائیل. دوڕانییەکان کە بەردەوام دەسەڵاتی سیاسییان لەدەستدا بووە و گرنگترین خێڵی ئەفغانستانن، سەر بە پاشتۆنەکانن. خێڵێکی گرنگی دیکەی پاشتۆنەکان (غوڵزایی)ە کە بەپێچەوانەی دوڕانییەکان، ئەمان کۆچەر بوون و ئێستا لە دەوروبەری قەندەهار نیشتەجێن. هەروەها پاشتۆن گەورەترین نەتەوەی خاوەن زەوی‌وزارن.

گرنگترین کێشمە کێشە سیاسییەکانی ئەم وڵاتە لەنێوان هۆزەکانی نەتەوەی پاشتۆندا دەهاتە ئاراوە. بەتایبەت دوڕانییەکان و بارکزاییەکان هەمیشە ناکۆکی سیاسییان لەنێواندا بووە. پاشتۆنەکان حەنەفین.

دووەمین نەتەوەی سەرەکی ئەفغانستان تاجیکن، کە فارسن و بەکاری بازرگانییەوە خەریکن، خێزانەکانیشیان لە ڕۆژئاوای ئەفغانستان پەرت و بڵاون، لە شارەکانی بەلخ، بەدەخشان، هیرات و نیمروز نیشتەجێن. تاجیکەکانی باکوور حەنەفی و ئەوانەی ڕۆژئاواش شیعەن. تاجیکە سوننییەکان لەگەڵ پاشتۆنەکاندا

نزیکایەتی زیاتریان هەبووەو لەم رووەشەوە لە تاجیکی شیعە زیاتر گەیشتوونەتە پۆستو پلەی حکومی. تاجیکو پاشتونەکان بەردەوام لە رووی سیاسییەوە رکابەریان لە نێواندا بووە. ساڵی ١٩٢٩ حکومەتی (ئەمانولاخان)ی پاشتۆنی رووبەرووی راپەرینی تاجیکەکان بەناوی (حەبیبولای بەچە سەقا) بووەوەو سەرکوتی کرد.

دوای روخانی رژێمە مارکسییەکەی ئەفغانستان جارێکی دیکە ململانێی نێوان پاشتۆنو تاجیک پەرەی سەندەوە. بورهانەدین رەبانیو ئەحمەد شا مەسعود کە تاجیکن لەگەڵ گوڵبەدین حیکمەتیار کە پاشتۆنە، کەوتنە نێو کێشمەکێشی سیاسییەوە.

سێیەمین نەتەوەی سەرەکی ئەفغانستان هەزارەیە کە تێکەڵەیەکن لە رەگەزی سپیو زەرد، لەناوەڕاستی ئەفغانستان نیشتەجێن، بەفارسی دەدوێنو شیعەن. کوشتو بڕی بەربڵاوی هەزارەکان لەلایەن حکومەتە سوننە مەزهەبەکەی (ئەمیر عەبدولڕەحمان)ەوە لەمێژووی ئەفغانستاندا بەناوبانگە. هەزارەکان بەردەوام نەتەوەی ژێردەستی پاشتۆن بوون.

نەتەوەی ئۆزبەك لەئەفغانستان تورکنو لەباکووری وڵات نیشتەجێن، لەڕووی سیاسییەوە ئۆزبەکەکان نەتەوەیەکی دەسەڵاتدار نەبوون. دوای روخانی رژێمە مارکسیەکەی کابۆل، کە ئۆزبەکەکان بەشێکی گرنگی هێزی رژێم بوونو بەدرێژایی ساڵانی داگیرکاری وڵات لەلایەن سوپای یەکێتی سۆڤیەتەوە، لەدژی موجاهیدە ئەفغانییەکان بەرابەرایەتی ژەنراڵ (عەبدولڕەشید دۆستم) دەجەنگانو باکووری وڵاتیان بەدەستەوە بوو.

لە ئەفغانستان بەشێوەیەکی گشتی هەر هۆزێك(جەرگە)ی، واتە ئەنجومەنی ئیداری سیاسی، هەبووە. حکومەتی نیشتمانیش بەردەوام پەیوەندییەکی ئۆرگانیی لەگەڵ (جەرگە)ی هۆزەکاندا هەبووەو لەراستیشدا وەك درێژکراوەی (جەرگە) سەیری کراوە[8].

## پەراوێز:

*1.See F.Boas,(race) in Encyclopedia of Social Sciences,1934,p.26.*

*2.smith, op. cit, pp. 13-17, 264-66.*

٣. یاسای ریفۆرمی زەویو زار کە لە عیراق پێیدەوترا اصلاح زراعی لە ساڵانی١٣٤٠ تا ١٣٥٢ ی هەتاوی ئێرانی کە نزیکەی بەرانبەری١٩٦٩ تا ١٩٧٦ی زایینییە، ئەنجامدرا.و.ك

٤. تیۆل: وشەیەکی تورکییە بەو موڵکدارانە وتراوە کە شار یا گوندیان بەدەستەوەیەو داهاتو خێرو بێرەکەی بۆ ئەو دەبێت. و.ك.

٥. لمبتون، مالك و زارع،ص ٤٠٥.

٦. ا.ك.س. لمبتون، نگاهی به جامعه اسلامی در ایران، ترجمه یعقوب اژند، نشر مولی، ١٣٦٠.

٧.ایوانف، انقلاب مشروطیت ایران، ترجمة کاظم انصاری، امیر کبیر، ص٦٠.

٨. ماری لویس کلیفۆرد، سرزمینو مردم افغانستان، ترجمه اسعدی، انتشارات علمی فرهنگی،١٣٦٨ - الیور روا، افغانستان، اسلامو نوگرایی سیاسی، ترجمه سروقد مقدم،انتشارات استان قدس،١٣٦٩.

## سەرچاوە:

جامعه شناسی سیاسی (نقش نیروهایی اجتماعی در زندگی سیاسی)، د. حسین بشیریە، ل٢٧٩ - ٢٨٧

# وێستگەکانی سەردەم

- یادەوەریەکانی گۆنتەرگراس

لە عەرەبییەوە: فەرهاد

- سەرچاوەکانی ئەدەب

ڕەبیع جابر

لە عەرەبییەوە: سەردەم

- ستالینی گەنج

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانیع

- سایکۆلۆژیای توندڕەوی

ڕەشید بوتەیب

لە عەرەبییەوە: لاس

- شۆپنهاوەر.. گەورەترین فەیلەسوفی ڕەشبین

تۆماس وایتاکیر

لە عەرەبییەوە: باوکی پایان

# یادەوەریەکانی گۆنتەرگراس

لە عەرەبییەوە: فەرهاد

گۆڤاری "دیرشبیگل"ی ئەڵمانی ئەم دیمانەیەی لەگەڵ رۆمان نووس و شاعیری ئەڵمانی "گۆنتەرگراس"ی خاوەنی خەڵاتی نۆبڵدا سازدا، ئەمەیش بە بۆنەی چاپبوونی بەشی یەکەمی ژیاننامەی گراسەوە کە بە ناوی "پیازی پاککراو"ەوەیە. ژیاننامەکە لە دوانزە ساڵی تەمەنی گراسەوە دەگرێتەوە تا تەمەنی سی ساڵی. لە کاتی دەرچوونی ئەم کتێبەدا بە زمانی ئەڵمانی هەرایەکی زۆری خستەوە، چونکە نووسەر باسی ئەوە دەکات کە ماوەیەك لە ریزی تیپی "واڤن. ئێس. ئێس"ی نازیدا کاری کردووە. ئەگەرچی سوورە لەسەر ئەوەی کە ئەو تاوانانەی دراونەتە پاڵ ئەم تیپە، ئەو هیچیانی نەکردووە. گراس لە




دیمانەکەدا رووناکی دەخاتە سەر ئەو ئەنگێزانەی کە بوونەتە هۆی نووسینی کتێبەکەو، دیدی ئەو بۆ چەمکی گوناه کە گیانی ئەڵمانیی پڕ کردووە.

گراس باس لەو بەرهەڵستانە دەکات کە لە کاتێکدا ویستوویەتی باسی جەنگی دووەمی جیهان بکات چۆن هاتوونەتە سەر ڕێگای یادەوەریەکانی و، چۆن بەسەریاندا زاڵ بووە بۆ ئەوەی ئەم کتێبەی لێ دروست بکات کە گەلێك مشتومڕی خستۆتەوە، دەقی گفتوگۆکە ئەمەی خوارەوەیە:

*** بە توندی پەلامارت درا کاتێك لەم کتێبەدا بۆ یەکەمجار پەردەت لەسەر ئەو ڕاستیە لادا کە تۆ لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهاندا ئەندامی تیپی "واڤن، ئێس، ئێس" بوویت. بۆ لەم کتێبەدا ئەمەت باس کرد و پێشتر هیچت دەربارەی نەوتوە؟**

– من لە یادەوەریی خۆمدا ئەم باسەم سەرکوت کردبوو، بەڕاستیی نایشتوانم بەڵگەی دیار لەو بارەیەوە بخەمە ڕوو. مەسەلەکە هەمیشە لە زەینمدا بوو، بڕوایشم وابوو ئەوەی وەك نووسەر و هاووڵاتیەکی ئەڵمانی دەیکەم، چەند

مەسەلەیەكن كە بەوردی دژی ئەو بیرو بۆچوونانەن كە لە سەرەتای تەمەنمدا هەمبووە، واتا لەسەردەمی نازییەكاندا و ئیتر ئەمە بۆ من بەسە. من هیچ هەستم بە تاوان نەكردووە. لە كاتی دابەشكردندا بەر تیپی وافن، ئیس، ئیس كەوتم. ج تاوانێكم نەكردووە. هەست بە هیچ گوناهێكیش ناكەم. بێجگە لەمە بەردەوام هەستم بەوە كردووە كە پێویستە رۆژێك لە رۆژان لەسەر ئەزموونەكانم بنووسم، ئەمەیش تا ئەم دواییە گەڵاڵە نەبوو، بە تایبەتی دوای ئەوەی بەسەر ئەو بێزاریەی ناوەوەی خۆمدا زاڵ بووم كە بەرانبەر بە ژیان نامنووسی هەمبوو، ئەو بێزاریەیش هەر پەیوەندی بە ساڵە بەراییەكانی تەمەنمەوە هەیە. ئەم كتێبەیش هەموو ساڵانی نێوان دوانزە تا سی ساڵی تەمەنم دەگرێتەوە.. لە چوار چێوەی ئەم رەوتە بەرفراوانەدا هەستم كرد كە ئیدی دەتوانم بە راشكاوی قسە بكەم.

***لە سەرجەمی كارەكانتدا گوتارێكی زۆر گرنگ هەیە كە "گوتاری راهاتە" كە ساڵی ١٩٦٧ پێشكەشت كرد. لەو گوتارەدا دەڵێیت تۆ هەرگیز لەو راستیە نەترساویت كە لە تەمەنی چواردەساڵیدا ئەندامی رێكخراوی لاوانی هیتلەری بوویت و لە تەمەنی شانزە ساڵیدا خۆبەخشیت كردوو لە حەڤدە ساڵیدا گیرایت و بوویت بە دیلی شەڕ. ئایا لەو كاتەدا نەتوانی بڵێیت كە تۆ لە تیپەكانی وافن، ئیس، ئیس دا سەرباز بوویت؟**

-بەڵێ، دەمتوانی ئەوە بكەم، مەبەستم ئەوەیە كە ئێستا ئاسانە ئەوە بوترێت، كاتێك هەر ئەم پرسیارە رووبەرووی خۆم دەكەمەوە، لە كتێبەكەمدا ئەمەم باس كردووە، ئەوەیش كە بۆ تا ئێستا لەو مەسەلەیە بێدەنگبووم، ئێستا كتێبەكە لە بازاڕدایەو بۆ گەلێك زمان وەرگێڕاوە، بە جۆرێك كە خوێنەر دەتوانێت ڕای تایبەتی خۆی لەسەر بدات، ئەمەیش ئەو نهێنیەیە كە لەم هەڵوێستەی ئێستادا خوێنەر بەرەو رووی كتێبەكە دەكەمەوە.

***تۆ دەڵێیت هیچ شتێك نەبوو لە باری گرانی یادەوەریەكانت كەم بكاتەوە، دەتتوانی پێشتر بەمۆی دانپێدانانی خۆتەوە ئەو بارگرانیەت لەسەر شانی خۆت سووك بكردایە.**

-بەڵێ، هەر ئەوە بوو كە ئەم كتێبەی پێنووسیم، هەندێك دەڵێن ئەمە زۆر درەنگ كەوتوە، منیش تا ئێستا نەمتوانیوە ئەمە بكەم، ئەوانەیش كە دەیانەوێت لەسەرم بنووسن و رەخنەم لێ بگرن پێویستە پێش دەستی بكەن. بەڵام ئەوەی كە ئێستا منی تێدا دەژیم، وا پێویست دەكات كە ئەو كەسانە هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیان بە منەوە هەیە بیخەنە ژێر پرسیارەوە. هەموو ئەو شتانەی كە ژیانی ئایندەی منی وەك ئێستا لێكرد، ژیانێك كە سیمای هەستكردنێكی رسوایی پێوەیە و تا ئەمڕۆیش هەوڵی بەسەردا زاڵبوونی هەیە.

***دەشێت ئەمە دڵنەت بدات كە لەسەر بابەتی دیاریكراو بنووسیت، مەبەستم ئەو شتە قەدەغەیەیە كە هەمیشە لە زەمینەی زەینتدا بووە؟**

-بەڵێ، بێگومان، چاكە. نازانم ئەگەر بۆ مەبەستێكی وا پێویستم بە هاندانی تر هەبێت. بەڵام بێگومان ئەمە هانی دەدەم.

***كاتێك كارل یاسپری فەیلەسووف ساڵی ١٩٤٦ كەوتە بژار و كۆڵینەوە لەسەر تاوان، بەو ئەنجامە گەیشت كە شتێك بە ناوی تاوانی بە كۆمەڵی ئەڵمانیەوە نیە، بەڵكوو ئەوەی هەیە تاوانی تاكە كەسە. تۆ هەست بە تاوان دەكەیت؟ هیچ كارێكی وات كردووە ببێتە مایەی پاكانەكردن بۆ هەست كردنت بە تاوان.**

-باشە، ئەگەر قسە لەسەر تاوانگەلێك بكەین كە شیاوی

لێکۆڵینەوە لەسەرکردن بن، ئەوا شتی وا ڕووی نەداوە، بەڵام من وام پێ چاکە وەك دەستکەوتێك مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، ئەگەر من دوو یان سێ ساڵ گەورەتر بوومایەو، دەستم لە تاوان کردندا ببوایە، نەك ئەو تاوانانەی تیپەکانی وافن. ئێس. ئێس کردوویانە، بەڵکوو ئەوانەی کە ئێستا ئێمە دەیزانین کە گرووپی تری ناو هێزە چەکدارەکان کردوویەتی وەك گوللە باران کردنی دیل. کەس نەیدەتوانی دەستەبەری هیچ ببێت. بە هەر حاڵ، من نەمدەتوانی ئەو کارە بکەم.

**•لە ماوەیەکی دواتری ژیانتدا بەرگریت لە ژنە ڕۆماننووس کریستاولف کرد. کاتێك بەوە تۆمەتبار کرا کە پەیوەندی لەگەڵ پۆلیسی نهێنی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتدا بووە کە بە "ستازی" ناسراوە. هەروەها بەرگریت لە والتەر جینزی نووسەر کردووە کە لە ڕابوردوودا هاوکاری پارتی نازی بووە. ئایا کە ئەمەت دەکرد گەنجیی خۆتت دەهاتەوە بیر؟**

—من کێشەم لەگەڵ ئەم جۆرە گشتاندنە هەراوەدا هەیە. هەر کەسە و زادەی سەردەمێکی دیاریکراوی خۆیەتی. نامەوێت هیچ کەسێك لەوانە ببینم ڕووبەڕووی ئەو نرخە ببێتەوە کە لەو سەردەمەدا باو بووە. کاتێك کە ئەلتەرناتیڤی دیاریکراو لە گۆڕێدا بوو، یان هەر ئەلتەرناتیڤ نەبووە.

**•لە ساڵی ١٩٦٧دا تووشی هەڵوێستێکی ترسناك بوویت، کاتێك لە کۆنگرەیەکی کلێسایدا "بەنجکەری بەشەکی"ت خوێندەوە. کاتێك کە پیاوێك بەرەو سەکۆکە هات و وتی من دەمەوێت بێزارکەر بم، سڵاوی بۆ هاوڕێکانی تیپی ئێس. ئێس ناردو گولاجێکی لە ژەهری سیانید قووتدا و مرد. لەو کاتەدا چ باوەڕێکت هەبوو؟**

—ڕووداوێك بوو هەستم بە شۆك کرد. دوای چەند هەفتەیەك سەردانی خێزانی شوبیم کرد، لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا دوام و زانیاریی زیاترم لەسەر ئەو پیاوە پەیدا کرد کە بە تەواوی وێران ببوو، ئەو لەلایەکەوە یەکێك بوو لە پیاوەکانی تیپی ئێس، ئێس. لە هەمان کاتدا، بەو پێیەی کە ئەزموونی سەردەمی جەنگی هەیە خۆی بە یەکێك لەوانە دەزانی کە داواکاری ئاشتی و هێور بوونەوەن. یارمەتی دوو کوڕی خۆیشی دابوو لە نووسینی بەیانێکی ڕەخنەییدا کە لەبەر هۆکاری ویژدانیی نەیانویستبوو ببن بە سەرباز. پیاوێکی زۆر سەیر بوو! یەکێك لە کچەکانی کتێبێکی لەم ماوەیەدا بڵاوکردەوە هەندێك برگەی لە کتێبەکەم (یاداشتی لوول پێچێك"ی وەرگرتبوو کە پەیوەندیی بەو ڕووداوەوە هەیە، چونکە ڕووداوەکە زۆر بە قووڵی کاری لێکردم.

**•ئایا بە نیسبەت تۆوە ئەمە سەرچاوەیەکی دڵخۆشکەر نەبوو کە بتوانیت لەسەر ئەزموونی تری لەو بابەتە بنووسیت؟**

—وتنی ئەمە گرانە، ئەیشم کردووە، ئەوە بەسە کە کردوومە، بە دڵنیاییەوە، بە درێژایی کات لە ئاییندەدا گوێ لەو تۆمەتانە دەگرم، هەرچییەك کە ویستوومە لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە بیڵێم لەو کتێبەدا هەیە. سێ ساڵ پێوەی خەریك بووم. چیم لەسەر بوە بیڵێم وتوومە، ئەوەی ئێستا دەیڵێم تەنیا ڕاڤەکردنی ئەو شتانەیە کە پەیوەندیان بە کتێبەکەوە هەیە.

**•لە کتێبەکەدا وشەی "تاوان" و "بارگرانی" و "ترس" زۆر دووبارە دەبنەوە، بۆ نموونە دەنووسیت "لەو چرکەساتەدا کە لە کوڕە تەمەن سیانزە ساڵەکە کە خۆم بووم، خۆم ئامادە دەکرد و سووسەی ئەوەم دەکرد کە چۆن فیلێك بۆ حوکم بەسەردادانی بدۆزمەوە، ئەو پێچ و پەنای پێ دەکردم. ئەو حەز بەوە ناکات پێ نرخێنێت یان فەرمانی بەسەردا بدرێت. ئەو دەچێتە ئامێزی دایکیەوە دەڵێت "من ئەوسا منداڵ**

بووم" ئایا ئەمە هەڵتانی ئۆسکار نیە لە رۆمانی "تەپڵ"دا کە دەڵێت "من بەرپرسیاری ئەو شتانە نیم کە بە منداڵیی کردوومن".

—بێگومان ئەمە بەشێکی مەسەلەکەیە. وەلێ ڕاستیی ئەوەیە کە پێویستە من هەندێك شت بەسەر خۆمدا بسەپێنم، کاتێك لە ناکاوێکدا بە ئاگادێم کە لە گەرمەی فەرمان دەرکردنندام لەسەرخۆم بەو حسابەی کە کوڕێکی تەمەن سیانزە ساڵم، ئاماژەیەکی ڕاست بەوە دەکات کە ئەو کاتە منداڵ بووە. بۆ بوون بە ئەندامیشم، باشە، لە تیپی واڤن. ئێس. ئێسدا کرام بە سەرباز، من خۆبەخشی تەواو نەبووم، ئەوەیش هەر هەڵوێستێکی گەمژانەیە، من ویستم کەشتیەوان بم، کەچی چوومە ریزەکانی تیپی واڤن. ئێس. ئێسەوە.

*بۆچی بەخۆبەخشی! ویستت ببیتە قارەمان!

—ڕەنگە ئەوە بەشێکی مەسەلەکە بێت. لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت کە پێویستم بە بوارێك بووبێت و لە ماڵەکەی باوك و دایکمدا ئەوەم بۆ نەڕەخسابێت. وەك زۆرێك لەو کەسانەی کە لە هەمان ئەو گەرمکە تەنگەبەرانەدا لەو ڕۆژانەدا ژیاون. بۆیە هەنگاو هەڵهێنان بەرەو بەرەی شەڕ و، بوون بە سەرباز بە مانایەك لە ماناکان ئەزموونێکی ئازادی بەدەست هێنان بوو. ئازادبوون لەم بەدحاڵیبوونە مەرگ ئاسایە.

## وێستگەکانی ژیانی گراس:

*گۆنتەرگراسی نووسەر و شاعیر هونەرمەندی شێوەکار و ڕۆماننووسی ئەڵمانی ساڵی ١٩٢٧ لە دانزج لە باوك و دایکێکی ئەڵمانی پۆڵەندی لەدایك بووە. دوای خزمەتی سەربازی لە سوپای ئەڵمانیدا و، بەدیل گیرانی لەلایەن سوپای ئەمریکیەوە (١٩٤٤-١٩٤٦) کاری جوتیاری و کرێکاری لە کانە خەڵووز و ساختمانەدا کردووە، وانەی هونەری لە دسلدرف و بەرلین خوێندوە. لە ساڵانی ١٩٥٦-١٩٥٩ وەك پەیکەرتاش و نووسەر لە پاریس کاری کردووەو پاشان گەڕاوەتەوە بۆ بەرلین. یەکەم دیوانە شیعری ساڵی ١٩٥٦ دەرکردووە، ساڵی ١٩٥٧ یەکەمین شانزگەریی پێشکەش کراوە، بە یەکەم ڕۆمانی "تەپڵ" ناوبانگی جیهانی پەیداکردووە. دوای ئەوەیش بەکارە جیهانیەکانی تری وەك پشیلە و مشك، یاداشتی لوول پێچێك و پشیلە.

*لە ساڵانی شەست بەدواوە چووەتە ناو کاری سیاسیەوە، تاڕادەیەك قسەکەری ویژدانی ئەڵمانیا بووە. لەو ئەدیبە دەگمەنانەیە لەسەر ئاستی دنیا کە مۆزەخانەیەکی بەناوەوە کراوە. لەو ئەدیبانەی کە هێشتا لە ژیاندا ماون.

*گەلێك خەڵات و ڕێز لێنانی وەرگرتووە. لەوانە خەڵاتی نۆبڵ، خەڵاتی بۆکەر، خەڵاتی فۆنتانی، میداڵی ئەلکساندەر مایکوفسکی، گەلێك پلەی دوکتۆرای فەخری لە زانکۆکانی دنیاوە، لەوانە زانکۆی هارڤارد.

*کتێبی (پیازی پاککراو)ی هەراو زەنایەکی گەورەی نایەوە، ئەم کتێبە بەشێکە لە یاداشتەکانی، لەوێدا دانی پێدا دەنێت کە لە تەمەنی مێردمنداڵیدا وەك تۆپچیەك لە ڕیزی پۆشەکانی تیپی ئێس. ئێسی ئەڵمانیا، پێش کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهانی، کاری کردووە.

### سەرچاوە:

بیان الکتب، مؤسسة البیان للصحافة و النشر، ٢٠٠٧/٨/١٣.

# سەرچاوەکانی ئەدەب

ڕەبیع جابر

لە عەرەبییەوە: سەردەم

ئایا ئێمە سەرچاوەکانی ئەدەب پێ دەزانین؟ "کۆیتزی" لە کتێبی بیرەوەریەکانیدا (لاوان) چاپی ۲۰۰۲ دەنوسێت کە لە سەروەختی خوێندنی لە زانکۆکانی لەندەن، کتێبی "ولیام بێرشل"ی لە کتێبخانەی مۆزەخانەی بەریتانیادا خوێندۆتەوە. شوێن دەستی ئەم کتێبەی "بێرشل" (سەفەر بۆ قوڵاییەکانی باشوری ئەفریقا)، بەسەر زۆربەی کارەکانی "کۆیتزی"یەوە دیارە.

خاوەنی کتێبی (ژیانی مایکڵ ك و سەردەمەکەی) چاپی ۱۹۸۳ (مەبەست کۆیتزییە - و. کوردی)، ڕاستەوخۆ لە پەراوێزی کورتە ڕۆمانێکیدا کە "جاکۆب




کۆیتزی" پاڵەوانێتی، ئاماژە بەو کتێبەی "بێرشل" دەکات. سەرچاوەکانی "کۆیتزی" زۆرن: ئەم کتێبە (سەفەر بە قوڵاییەکانی باشوری ئەفریقادا) کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا نوسراوە، یەك لەو سەرچاوانەیە.

ئایا نوسەر دەتوانێت سەرچاوەکانی ئەدەبی خۆی ئەژمار بکات؟ (شارە نەبینراوەکان)ی "ئیتالیۆ کالڤینۆ"، لە سەفەرەکانی "مارکۆ پۆلۆ" وە دەست پێدەکات. ڕۆمانەکەی "کۆیتزی" (لە چاوەڕوانی بەربەریەکاندا)، لە کوێوە دەست پێدەکات؟ لە جیهانی "کافکا"وە؟ لە (دەستنوسێکی کۆن) و (پەیامی ئیمپراتۆریەت) و (شورای مەزنی چین)ەوە؟ ئەی (سەد ساڵ گۆشەگیری) سەرچاوەکانی خۆی لە کوێدا دەدۆزێتەوە؟ ڕۆمانی (پیدرۆ پارامۆ)ی "خوان ڕۆلفۆ"، کاریگەری لەسەر "مارکیز" هەبوو. کاریگەری زیاتر لەسەر

(سەد ساڵ تەنهایی)یە یاخود لەسەر (مەرگی ئەرتیمیۆ کرۆز)ی "کارل فۆینتس"ە؟ چەند پەرەگرافێك لە نەسکی یەکەمی رۆمانی (مەرگی ئەرتیمیۆ کرۆز)دا هەیە کە دووبارەکردنەوەی گفتوگۆی نێوان "پیدرۆ پارامۆ" و بەڕێوەبەری کێڵگەکەیەتی لە ڕۆمانەکەی "خوان ڕۆلفۆ"دا. ئایا خوێنەر ئاگای لەوەیە؟

ئەدەب بە ناویەکدا دەچێت. ڕەنگە "پیدرۆ پارامۆ" لە (گراتشۆسی ڕاوچی) "فرانز کافکا"وە دەستی پێکردبێت؟ ژەنەراڵ "جافلان"ی هاوڕێی "کروز" دوای چەند ساڵێك دەکەوێتەڕێ بەرەو ماکۆندۆ، هاوکات چیرۆك و بەسەرهاتەکانی (العهد القديم) خۆیان بەناو جیهانی "مارکیز"دا دەکەن.

تێکەڵبوون و بەیەکداچونی ئەدەب لەسەدەی بیستەمدا، بەچاکترین شێوە لە جیهانی "بۆرخیس"دا هەیە. "بۆرخیس" بە جۆرێك بەرهەمی نوسەرانی بەر لە خۆی دەخوێنێتەوە، وەکی ئەوەی بیاننوسێتەوە. لای ئەو سنورێك لە نێوان خوێندنەوەو نوسیندا نییە. ئایا ستایلی نوسینی "بۆرخیس" جیهانبینی دیاریدەکات، یاخود ئەوە دنیابینی ئەوە کە ئەو ستایلەی دەست نیشان دەکات؟ لە چیرۆکەکانیدا توانای ئەوەی هەیە ڕۆمان گەلێکت بۆ کورت و پوخت بکاتەوە. (ژیانی تیدیۆ ئیزیدۆرۆ کرۆز) نمونەیەکە لەوە. (مەرگێکی دی) و (پیاوی مردو) لەو چیرۆکانەن کە یەك جار ناخوێندرێنەوە؟

سەرچاوەکانی "بۆرخیس" چین؟ لە ژماردن نایەن. "بۆرخیس" بە چیرۆکی (وایکفیلد)ی "هۆسورن" سەرسام بوو. "هۆسورن" هەواڵی ئەو چیرۆکەی لە کوێ خوێندۆتەوە (پیاوێك لە ناکاو ماڵ و منداڵەکانی جێ دێڵێت و بە نهێنی دەچێت لە ماڵێکی ئەوبەریاندا دەژی، بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەو ژیانە نهێنیەی خۆیدا لە دەرەوەی دنیا دەمێنێتەوە)؟ "هوسورن" لە یەکەمین دێڕی چیرۆکەکەیدا دەڵێت: (بەسەرهاتی ئەم پیاوە سەیرەم لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندۆتەوە). دەڵێت چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە. ئایا باوەڕی پێ بکەین؟ بۆچی باوەڕی پێ بکەین؟ بۆچی باوەڕی پێ نەکەین؟ ئەم چیرۆکە *wakefield* نامێڵێت "هوسورن" بیر بچێتەوە. تۆ بڵێی ئەو چیرۆکەی سەرەتاکانی لە هەواڵێکی ڕۆژنامە وانیدابێت؟ ئەمە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. نرخی ئەو چیرۆکە لە وشەکانیدایە. لە توانای خەیاڵ و فانتازیای "هۆسورن"دایە کە کارەکتەری "وایکفیلد"ی پێ وێنا دەکات. ئەمە سەرچاوەی ئەدەبە: خەیاڵ. ئەگەر خەیاڵی "هۆسورن" نەبوایە، هەرگیز چیرۆکی (وایکفیلد) بە ئێمە نەدەگەیشت. ستایلی "هۆسورن" لەم چیرۆکەدا، پێدەچێت نامۆ بێت پێی. وا دیارە بە ستایلی "بۆرخیس" دەچێت! "بۆرخیس" لە دایك نەبوو بوو، کاتێك "هۆسورن" ئەم چیرۆکەی دەنوسێت!

"کویتزی" کە کتێبەکەی "بێرشل" دەخوێنێتەوە، لە ناخی خۆیدا هەست بە شتێکی سەیر دەکات: زۆر حەز بەوە دەکات کتێبێکی وەك ئەوە دەربارەی کۆچ و سەفەر بنوسێت. دەیەوێت دەربارەی سەفەرکردن بۆ باشوری ئەفریقا لەسەرەتای سەدەی نۆزدەدا بنوسێت. ئەمە چۆن بکات لە کاتێکدا ئەو لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا دەژی؟ "ئیڤۆ ئەندریچ" ئەو پردە کۆنە یارمەتی دەدات کە بە سەر ڕوباری درینادا ماوەتەوە. "کویتزی"ش "بێرشل" کۆمەکی دەکات.

ئەی کێ کۆمەکی بە "تۆلستۆی" کرد؟ ئەدەب تێکەڵ بە مێژوو دەبێت، هاوکات تێکەڵ بە جوگرافیاش دەبێت. هەرچی کۆمەک بە ئەدەب بکات، تێکەڵ بە بواری خەیاڵ و فەنتازیای دەبێت و دەبێت بە بەشێك لێی. ئەدەب جیهان هەڵدەمژێت، وەك چۆن ئیسفەنج ئاوهەڵدەمژێت. خوێندنەوەی (ئەلیادە) نمونەیەکە.

هەوڵدان بۆ نوسینی کتێبێکی هەمەلایەن – کتێبێك کە جیهان لە خۆ بگرێت – لای "هۆمیرۆس" هەیە، هەروەها لای "دانتی"یش هەیە. ئەم حەز و ویستە (مندالأنەیە) چیمان پێدەڵێت؟ بۆچی "هۆمیرۆس" لە دەسپێکی (ئەلیادە)دا لە سزایەك دەترسێت؟ لەویادا باس لە شاعیرێك دەکات کە کوێر و کەڕ بووە و تارەکەی بێدەنگ بووە.

"هۆمیرۆس" بۆچی دەترسێت؟ لە کێ دەترسێت؟ لەچی دەترسێت؟

ترسی "دانتی" ئەو وێنە تەماوییە دروست دەکات کە لە (دۆزەخ)دا دەیبینین. ئەمە ترسی "دانتی"یە یاخود توندوتیژی ئەوە؟ ئەدەب لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ لە خوێندنەوە یان لە ژیان یان لە ناخی مرۆڤ خۆیەوە؟ سەرچاوەکانی ئەدەب، ئاڵۆز و نادیارن، ئەمەش نهێنی ئەدەبە ئەدەب پێویستی بە پێناسە نییە. ئەدەب هەیە، وەك چۆن دنیا هەیە. تەنها بەیەك مەرج: کە بخوێنرێتەوە.

ئەو کتێبەی داخراوەو لە ژێر زەویدا شاردراوەتەوە – بونی نییە. ئەمە ڕاستە؟ ڕەنگە ڕاست نەبێت و لە جێی خۆیدا نەبێت. ساڵ دێت و دەڕوات خوێنەرێك دێت و لەسەر ڕەفەکان دەستی بە کتێبێك ڕادەگات و دەیکاتەوە. تۆز و غوباری سەری دەسڕێت و دەیکاتەوە. چی دەخوێنێتەوە؟ وشە بە دوای وشەدا دێت. وێنەکان دێنەبەرچاوی، کەسەکان و دورگە و شوێن و هەست و نەستەکان. وشەکان، دەستەواژەکان کە بە خوێندنەوەی جار لە دواجاریان تێیان دەگەین و پێیان ئاشنا دەبین. ئەمە ژیانی ئەدەبە، چاوگ و سەرچاوەی لە کوێیە؟ لە ناخدایە.

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی (الحیاة) – ٢٠٠٧/٦/١٢.

# ستالینی گەنج

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانیع

ستالینی گەنج ناوی کتێبێکی دیکەیە لەسەر "جۆزێف ستالین" دەرچووە، "ستالین" یەکێکە لەوانەی لە میانەی سەدەی بیستەم، مێژووی ڕوسیاو تاڕادەیەکی زۆریش مێژووی جیهانی دروستکردووە. گەرچی دانەری ئەم کتێبە" سیمۆن سیباگ مۆنتیفیۆر" پێشتر چەند کتێبێکی لەسەر "ستالین" نوسیوە، بەڵام ئەم کتێبەی (ستالینی گەنج) بەشێوەیەکی سەرەکی تایبەتە بەو ماوە نادیارو نەزانراوەی ژیانی "ستالین"، واتە ماوەی گەنجیەتی.




ئەوەی لەبارەی ژیانی "ستالین"ەوە دەیزانین ئەوەیە کوڕی پینەچییەکی جۆرجی بووە لە خواروی قەوقاز، دایکی بەهۆی ئەوەی پێشتر دوو برای "ستالین"ی لەدەستداوە، بۆیە زۆر هۆگری ئەم کوڕەی بووەو زیاد لە پێویست ئاگادارو پارێزگاری لێ کردووە. "ستالین" منداڵییەکی هەژار ژیاوە، بەڵام هەر لە ساڵانی سەرەتای منداڵییەوە زیرەکییەکی گەورەی تێدا بەدیکراوەو حەزێکی زۆری لە شیعر بووە، بەتایبەتی شیعری ڕۆمانسی. "ستالین"ی گەنج ویستویەتی وانەکانی زانکۆی تەواو بکات، وەلێ لەو تەمەنە گەنجەیدا خۆی لەناو کاری شۆڕشگێڕانەدا دەبینێتەوە.

ئەو وێنەیەی دانەری ئەم کتێبە بۆ "جۆزێف ستالین"ی گەنج دەیکێشێ، بریتییە لەوەی "ستالین" لە گەنجیدا سێ سیفەتی سەرەکی هەبووە کە ئەمانەن: ڕۆشنبیر، مرۆڤێکی لەیاسا یاخی، تیرۆرست. ئەم سێ سیفەتە وای لە "ستالین" کردووە ساڵی ١٩١٧ ببێتە کەسێکی نمونەیی و بتوانێ ڕۆڵێکی گرنگ لە ڕوسیادا ببینێت، واتە ئەو ساڵەی کە تێیدا شۆڕشی بەلشەفیك لەدژی قەیسەرەکان بەرپابوو. "ستالین" وەك ئەوەی نوسەری

کتێبەکە دەڵێ: هەر لە ساڵانی گەنجییەوە هەڵپەیەکی زۆری بۆ ژیان و بۆ دەسەڵات هەبووە، بەڵام لەژێر پەردەی شۆڕشگێڕیدا ئەو هەڵپەیەی دەرخستووە. دانەری کتێبەکە لە ڕێگەی توێژینەوەی ئەرشیفە تایبەتەکەی ستالینەوە گەشتووەتە ئەو دەرئەنجامە، بەتایبەتی ئەو ئەرشیفەی لەم ماوەیەی دواییدا لە ڕوسیا و جۆرجیا پیشانی جەماوەر درا. هەروەها بەپشت بەستن بە یاداشتەکانی زۆرێك لەو کەسایەتی و شایەتحاڵانەی لەو ماوەیەدا ژیاون. دانەر ئامانجی خۆی لە نوسینەوەی ئەم کتێبەدا ئاوا دەردەبڕێت: ویستویەتی ئەو تۆزە ئەفسانەییەی بۆ وێنەی "جۆزێف ستالین" کێشراوە ڕامالێت.

دانەر باس لەو ڕووداوەکات کۆمەڵێ ڕەگەز لە کەسایەتی "ستالین"ی گەنجدا کۆببونەوە کە وایان لێکرد ببێت بە دیکتاتۆرێکی گەورە. ئەو ڕەگەزانەش بەم شێوەیە دەستنیشان دەکات:

یەکەم: مەیلێکی قەوقازیانەی هەبوو کە لە بنەچە جۆرجییەکەیەوە سەرچاوەی گرتبوو، ئەمە وایکردبوو لە یاساکان یاخیببێت.

دووەم: دوولەتبونێکی دەرونی توندی هەبوو.

سێیەم: ڕەهەندی ئایدۆلۆژی، کە ئینتیمابونی بۆ حیزبی شیوعی دروستی کردبوو.

دانەر وایدەبینێ "ستالین" لە میانەی کۆکردنەوەی ئەو سێ ڕەگەزە پێکەوە، توانی بۆ ماوەی چەندین دەیە، وەك گەورەی کرێملین بکاتە سەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤیەت، لێرەوە "ستالین" کاتێ بەهێمنی دووکەڵی نێرگیلەکەی بە (با)دەکرد، هیچ دوودڵ نەبوو لەوەی فەرمانی کوشتنی هەزاران کەس لە نەیارەکانی دەربکات.

لە بەشەکانی ئەم کتێبەدا کە نزیکەی پەنجا ناونیشانی لەخۆگرتووە، شارەزای هەموو لایەنەکانی ژیانی "ستالین"ی گەنج دەبین، بۆ نمونە شارەزای ئەو پەیوەندییە ئاڵۆزەی ستالین دەبین کە لەگەڵ پۆلیسی نهێنی قەیسەردا هەیبووە، شارەزای پەیوەندییە زۆرەکانی دەبین لەگەڵ ئافرەتاندا، بەر هەموو کەتنانە دەزانین کە لە گەنجیدا ئەنجامی داوون. بەڵام لەپاڵ ئەوانەشدا شارەزای ئەو ڕۆڵە گرنگەی دەبین کە لە لەدایکبونی حیزبی بەلشەفیك (شیوعی)و شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ گێڕاویەتی.

"سیمۆن سیباگ مۆنتیفیۆر" جەخت لەسەر ئەو ڕووداوەکات چاوپێکەوتنەکەی نێوان "ستالین"و "ڤلادیمێر ئیلیتش لینین" دواتر کاریگەرییەکی گەورەی دەبێت لەسەر ژیانی ئەو کوڕە جۆرجییە گەنجە. کاتێ "لینین" تێکۆشانی چەکداری دژ بە قەیسەر ڕاگەیاند، ئەرکی سەرشانی "ستالین" بریتی بوو لە دابینکردنی توانای دارایی بۆ ڕێکخستنەکانی بەلشەفیك، لێرەوەو بۆ دابینکردنی دارایی حیزب "ستالین" هیچ دوودڵ یاخود ڕاڕا نەبوو لەوەی کاری چەتەیی و دزی ئەنجامبدات، هەروەها هیچ گوێی بەوە نەدەدا کە ڕەنگە لە ئەنجامی ئەو دزیکردنەوە خەڵکانێکی زۆر ببنە قوربانی. دانەر لەم ڕووەوە باس لەو دزییە دەکات کە "ستالین" لەساڵی ١٩٠٧ لەشاری تفلیس پێیهەستا، لەو کردەوەیەدا چل کەس بوونە قوربانی، ئەو دزییە بابەتێکە تاکو ئێستاش قسەوباسی لەسەر دەکرێت.

یەکێکی دیکە لەو سیفەتانەی "ستالین" کە لە قۆناغی گەنجیدا لێیدەرکەوت و پێی دەناسرایەوە، بریتی بوو

لەوەی پیاوێکی زۆر بەدگومان بوو، گومانی لە هەموو ئەو کەسانە هەبووە کە دەوریان دابوو، ئەم سیفەتەش لە سەردەمی کاری نهێنی ناو حیزبدا بەتەواوی لەلا جێگیربوو، چونکە لەو سەردەمەدا خیانەتو ناپاکی زۆرێك لە هەڤاڵانی حیزبی بۆدەرکەوت. لێرەوە هیچ دوودڵ نەبوو لەوەی کەسە هەرە نزیکەکانی خۆی بۆ سیبریا نەفی بکات، لەبەر هیچ نا تەنها لەبەر ئەوەی گومانی لێدەکردن، بەم شێوەیە خەڵکانێکی زۆری بێ تاوان باجێکی گرانی ئەو کارانەیان دا کە لە حەقیقەتدا ئەنجامیان نەدابوو.

کاتێ لە ساڵی ١٩١٧ شۆڕشی بەلشەفیك هەڵگیرسا، "ستالین" کە نزیکەی حەوت ساڵبوو خەریکی کاری نهێنی بوو بۆ حیزب، بووە هەڤاڵە هەرە نزیکەکەی "لینین"، لەم بارەیەوە "لینین" دەربارەی "ستالین" دەڵێ: دەتوانین داوای هەموو شتێکی لێبکەین. لەو سەردەمەدا "ستالین" وەك پیاوێکی پۆڵایین دەرکەوت، بەوەی بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکان، گرتنەبەری بەکارهێنانی هەموو ئامرازەکان شیاوە. ئەم (مایکافیلیبیەتە) بە درێژایی ژیانی لێی نەبووەوە. "ترۆتسکی" سێیەم لای ئەو سێگۆشە شۆڕشگێڕییەی پێکدەهێنا.

ئەوەی لەم کتێبەدا ڕوونو ئاشکرایە، ئەوەیە دانەر بایەخی سەرەکی خۆی لە نوسینەوەی ژیاننامەی "ستالین"ی گەنج، داوە بەو وەقائعو ڕوداوانەی لەو سەردەمەدا ڕویانداوە، نەك بە مەسەلە ئایدۆلۆژیو فیکرییەکان، دانەر لەپاڵ ئەمەدا جەخت لەوە دەکاتەوە کە "ستالین" هەر لە سەرەتاوە لەو بڕوایەدا بووە کە خودی خۆی بەرجەستەی ئاراستەیەکی مێژویی ڕاستو دروستی شۆڕشو وڵات دەکات. لێرەوەیە "ستالین" دوودڵ نەبووە لەوەی چی بەربەستو تەگەرەیەك کە دێتە پێشیو ڕێگای بەرەوپێشەوە چونی لێدەگرن، ڕامالێت. گەرچی ئەو ڕامالینە پێویستی بەوەبوو نزیکەی ٢٨ ملیۆن کەس ڕەوانەی گرتوخانەکانی سیبریا بکات.

دانەری ئەم کتێبە لە دەرئەنجامی کۆتایدا پێیوایە ساڵانی گەنجی "ستالین"، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر هەموو ژیانی دواتری داناوە، "ستالین" بەهەمان ئەو شێوازەی کە لە گەنجیدا گروپێکی شۆڕشگێڕی بچوکی ڕاونراوی دەبرد بەڕێوە، دواتر هەر بەو شێوازەش یەکێتی سۆڤیەتی برد بەڕێوە.

ناوی کتێب: ستالینی گەنج

نوسینی: سیمۆن سیباگ مۆنتیفیۆر

لە بڵاوکراوەکانی فۆنیکس- لەندەن

٢٠٠٨

ژمارەی لاپەڕە: ٥١٢ لاپەڕەی مام ناوەند.

سەرچاوە:

مرايا البيان، ٢٠٠٨/١٠/١٨

# سایکۆلۆژیای توندڕەوی

ڕەشید بوتەیب

لە عەرەبییەوە: لاس

کتێبی (چۆن چارەسەری توندڕەوەکان بکەین؟)، "ئاموس عوس" نوسیویەتی و لەم ماوەی دوایدا لەلایەن خانەی (سورکامب)ی ئەڵمانیەوە چاپ و بڵاوکراوەتەوە. ئەم کتێبە ئەو لێکچەرانەی "ئاموس عوس" لە خۆ دەگرێت کە لە چەندین زانکۆی ئەڵمانیادا سەبارەت بە پەرگیری ئاینی پێشکەشی کردووە. لە ڕێی توێکارییەکی ورد و قوڵەوە، "عوس" باس لە پەتای (چاککردنی جیهان) دەکات کە کلتورە پەرگیرەکان دوچاری بوون. نوسەر ئەم لێکچەرانەی لە پێناو ئەوەدا نوسیووە کە ئاین نەکرێتە گیتۆ و سیاسەت نەگۆڕێت بۆ توندو تیژی و مرۆڤ نەکرێتە



بۆمب و داهاتوش نەکرێتە گۆڕستانێکی گەورە.

سەرەتای ئەو لێکچەرانەی بە گێڕانەوەی قۆناغی منداڵی خۆی لە قودس دەست پێدەکات، ئەو ڕۆژانەی کە قودس شارێکی کۆسمۆپۆلێتی بوو. بەڵام ئەم شارە سیاسەتەکانی جولەکەو عەرەب گۆڕییان بە گیتۆیەك و

لە ئێستاشدا پەرگیری ئاینی و بە پیرۆزکردنی مێژوی نەتەوەیی و فەزڵدانی ئەو مێژووە بەسەر مێژوی نەتەوەکانی دیکەدا، ئەوەندەی تر ئەو شارە وێرانتر دەکات و بەرەو داخرانی زیاتری دەبات.

هەوڵدان بۆ پێکگەیاندنی لایەنە ناکۆکەکان و ئامادەگی نیشاندان بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەوی دیدا، ڕێگە لە توندڕەوەکانی هەردوولا دەگرێت. ئەمەش بەوە دەکرێت کە هەردوولا بتوانن سازش بۆ یەکتری بکەن، ئەگەرچی ئەم پرۆسەیە بۆ هەردوولا قورس و ناخۆشە.

کێشە و ناکۆکی عەرەب-ئیسرائیل، کێشەی نێوان دوور قوربانیە کە جەلادەکەیان

یەکە. عەرەب قوربانی سیاسەتە کۆلۆنیالیستەکانی ئەورووپایە و جولەکەش قوربانی پاکتاوی مەسیحی و جینۆسایدی نەژادیە. قوربانی هەمیشە حەزی لەوەیە تەماهی لەگەڵ جەللاددا بکات و لاسایی بکاتەوە. مێژوویەك کە نەخوێندرابێتەوە، هەمیشە بە توندوتیژی و نائەقڵانیەتی خۆیەوە دێتەوە ئارا.

"ئامۆس عوس" لە شیکردنەوەیدا بۆ ئەم کێشەیە، پێیوایە ئەمە ململانێیەکە لە نێوان دادپەروەری و ژیاندا، بە واتایەکی دی ململانێیە لە نێوان توندڕەوی و پراگماتیەتدا، لە نێوان پەرگیری و پلورالیزمدا، ململانێیە لە نێوان ئەوانەی تەقدیسی دادپەروەری دەکەن، لەگەڵ کەسانێکدا کە پێیان وایە ژیان لە دادپەروەری گرنگترە.

کەسی توندڕەو توانای دیالۆگی نییە، لەبەرئەوەی قەناعەتی وایە حەقیقەتی ڕەها لای ئەوەو خاوەنی هەق و ڕاستییە. لێرەوە دەستەوستانە لەوەی خۆی لەو سۆز و میسالیەتە نەخۆشە قوتار بکات. کەس توندڕەو دەیەوێت جیهان بگۆڕێت، بۆ خاتری ئەمەش گرنگ نییە بەلایەوە، گەر قوربانی بەخۆی و کەسانی دیکە بدات. ئەو پێی وایە ئەو کارە لە پێناو ئەواندا دەکات، بۆ ئەوەیە ڕۆحیان ئاسوودەکات و ڕزگاریان بکات! توندڕەو کەسێکە توانای نییە پێبکەنێت. "ئاموس عوس" پێیوایە پێکەنین یانی ڕێژەیی بوون، واتا توانای گومانکردن لە قەناعەتە تایبەتییەکانمان. پێکەنین چاکترین دەرمانێکە لە دژی توندڕەوی.

ئەم کتێبەی "ئاموس عوس" کتێبێکی زانستی نییە، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر ڕەخنەگرانە خواست و ئارەزووی کارەکتەری توندڕەو و مەیلی ئەو بۆ پاوانخوازی و سەپاندنی پاکژویستیەکی نەخۆشانەی ئایینی لەبەریەك هەڵدەوەشێنێت. ئەم کتێبە لەیەك کاتدا هەم بۆ ئیسرائیلیەکانە و هەم بۆ عەرەبەکان، کتێبێکە هەردوولا هان دەدات فێری پێکەنین بن. کتێبێکە پڕ و تاوان و مەرگی بێهودەی هەردوولا لە پێناو وەهم و خواستە بچوکەکانیاندا، ڕیسوا دەکات و دەیداتە بەر نوکی ڕەخنە.

سەرچاوە:

*www.elaph.com*

# شۆبنهاوەر..گەورەترین فەیلەسوفی ڕەشبین

تۆماس وایتاکیر

لە عەرەبییەوە: باوکی پایان

دانەری ئەم کتێبە پرۆفیسۆر "تۆماس وایتاکیر"ە کە مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی ویکینسۆن/ماویزۆن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو یەکێکە لەو نوسەرانەی تایبەتمەندە لە فیکری ئەڵمانی بەگشتیو فەلسەفەی شۆبنهاوەر بە تایبەتی. کەواتە دەبێ "شۆبنهاوەر" کێ بێت؟ دانەری کتێبەکە ئاوا وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە: "شۆبنهاوەر" گەورەترین فەیلەسوفی ڕەشبینی سەدە تازەکانە، ڕەشبینیەکەی بە جۆرێکە تا ئەو ئاستەی وەك نمونە دەیهێننەوەو پێیدەڵێن گەورەترین فەیلەسوفی ڕەشبین




لە مێژوودا. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو فەیلەسوفێکی گرنگ نییە، بگرە بەپێچەوانەوە، "شۆبنهاوەر" یەکێکە لە فەیلەسوفە دەگمەنەکانی ئەڵمانیا، لەپاڵ ""کانت"و "هیگڵ"و"فیختە"و "شیلینگ"و "نیتچە"و ئەوانی دیکەدا. "شۆبنهاوەر" هاوسەردەمی "هیگڵ" بووەو دوژمنێکی سەرسەختیشی بووە.

سالی ١٧٨٨ لە شاری (دانتزیگ)و لە خێزانێکی بازرگانی دەوڵەمەند لەدایکبووە، باوکی ویستویەتی بیکات بە بازرگان، تاکو پیشەی خێزانەکەیان وەك میرات وەرگرێتو تابێت دەوڵەمەندبونی خێزانەکەیان زیاتربکات، وەلێ ئەو توانا ئەدەبیو فیکرییەی کە لە تەمەنێکی زوودا تێیدا دەردەکەوێ، ڕێگری ئەوەی لێدەکەنو لەباتی ئەوەی ببێت بە بازرگانێکی گەورە دەبێ بە فەیلەسوفێکی گەورە. لە واقیعدا سەروەتو سامانی خێزانەکەی یارمەتی

"شۆبنهاوەر"ی داوە بەبێ ئەوەی سەرقاڵی ئیشکردن و نان پەیداکردن بێت، زانست و زانیاری بەدەستبێنێت و فێری زمانەکان ببێت، بەپێچەوانەی "هیگڵ" یان بە پێچەوانەی زۆربەی زۆری بیرمەندەکان. لە مێژووی فیکرو ئەدەبدا، ئەوانەی لە خێزانە دەوڵەمەندەکان لەدایکبوون، زۆر دەگمەنن. لەبەر ئەم هۆیە "شۆبنهاوەر" هەر لە سەرەتای منداڵییەوە توانیویەتی سەفەر بۆ وڵاتانی ئەورووپا بکات و زمانە سەرەکییەکان فێربێت، بەتایبەتی زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی. بۆ ماوەیەك لە فەرەنسا و لە ئینگلتەرەدا ماوەتەوە، باوکی نازی کێشاوە و پارەیەکی زۆری بۆ خەرجکردووە.

دواتر دانەری کتێبەکە دەڵێ: "شۆبنهاوەر" دوای ئەوەی گەشتێکی دوورودرێژ بە تەواوی ئەورووپادا دەکات، دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و لە کۆگاکەیاندا یارمەتی باوکی دەدات، بەڵام لە ساڵی ١٨٠٨ باوکی لە ڕووداوێکی کارەساتئامێزدا گیان لەدەستدەدا، باوکی لە شوێنێکی بەرزەوە دەکەوێتە ناو ئەو ڕووبارەی لە پشتی ماڵەکەیانەوە دەڕوات و کۆچی دوای دەکات. "شۆبنهاوەر" زۆر دڵگران و خەفەتبار دەبێ، چونکە باوکی "شۆبنهاوەر"ی زۆر خۆشویستووە و لە پارەپێدانا بێ دڵی کوڕەکەی نەکردووە و هەست و سۆزێکی ڕاستگۆیانەی باوکانەی بەرامبەر بە کوڕەکەی هەبووە. هەندێك دەڵێن بەشێوەیەکی عەفەویانە نەکەوتووەتە ناو ڕووبارەکەوە، بەڵکو خۆی کوشتووە، چونکە لەگەڵ ژنەکەیدا دڵخۆش نەبووە. هەندێکی تر دەڵێن ژنەکەی پاڵی پێوەناوە تاکو بکەوێتە ناو ئاوەکە و ئیدی خنکاوە. لەبەر ئەم هۆیە "شۆبنهاوەر" دواتر هێرشێکی بێئامان دەکاتە سەر دایکی و ڕقێکی گەورەی لە دایکی و لە هەموو ئافرەتێکی دیکە دەبێتەوە. دایکی دوای ئەوەی مێردەکەی دەمرێ، کۆگاکە دەفرۆشێت و سەروەت و سامانەکە لەگەڵ خۆیدا دەبات و دەڕوات تاکو لە شاری (ڤامیار) بژی کە لەو سەردەمەدا پایتەختی ئەدەبی ئەڵمانیا بووە. لەوێ قاوەخانەیەکی ئەدەبی بۆ پێشوازیکردن لە ئەدیب و شاعیر و عاشقەکان دەکاتەوە، بگرە دەبێت بە نووسەری ڕۆمان و سەرکەوتنێکی باش بەدەستدەهێنێ کە گاڵتەی پێناکرێ. لە ماڵەکەی خۆیدا پێشوازی لە ئەدیبە گەورەکانی ئەڵمانیای کردووە، لەسەرووی هەموویانەوە "گۆتە"، "گۆتە" هەر لەوێدا بۆ یەکەمجار "شۆبنهاوەر"ی گەنج دەناسێ.

دانەری کتێبەکە بەردەوام دەبێت و دەڵێ: دوای ئەوەی "شۆبنهاوەر" لە شاری (گۆتنگین) خوێندنی زانکۆ تەواودەکات، دەڕوات بۆ بەرلینی پایتەخت تاکو بڕوانامەی دکتۆرا بەدەستبێنێت، لەو سەردەمەدا زانکۆی بەرلین بەناوبانگترین زانکۆ بووە. لە واقیعدا "شۆبنهاوەر" بەتایبەتی بۆ ئەوە ڕۆشت بۆ بەرلین تاکو گوێ لە "فیختە" بگرێ و ئامادەی وانەکانی بێت، ئاشکرایە "فیختە" دوای مردنی "کانت"ی مامۆستای، بووە گەورەترین فەیلەسوفی ئەڵمانیا و بەوە ناوبانگی دەرکردبوو کە گوتاربێژێکی لێزانە، بەڵام "شۆبنهاوەر" دوای ئەوەی "فیختە" دەناسێ و گوێ لە لێکچەرەکانی دەگرێ، لێی بێزاردەبێت، هۆکاری ئەو بێزاربوونەی زۆرە، لەوانە "فیختە"لەبەر خاتری فەلسەفەکەی خۆی زیاد

لەپێویست کەسێکی دۆگمای دەمارگیرە.

ساڵی ١٨١٤ "شۆپنهاوەر" بە تەواوی نێوانی لەگەڵ دایکیدا تێکدەچێ و بڕیاردەدا لێی جیاببێتەوەو بەتەنها لە خانوییەکی تایبەت بەخۆیدا بژی، وەك ئاماژەمان پێدا "شۆپنهاوەر" ڕقی لەدایکی بوو، گومانی لە دایکی بوو بەوەی لەپشت مردنە ناسروشتییەکەی باوکییەوە بێت. دواتر بۆ ماوەیەك لە شاری (دریسدین) ژیان بەسەردەبا، پاشان داوای لێدەکرێ هەندێ وانەی فەلسەفە لە زانکۆی بەرلین بڵێتەوە، ناچار دەگەڕێتەوە بۆ بەرلین و تێیدا نیشتەجێ دەبێت. لەوێ "هیگڵ" دەبینێ، "هیگڵ" دوای مردنی "فیختە" کۆنترۆڵی زانکۆی بەرلینی کردبوو، بەتایبەتی کۆلێژی فەلسەفە، خوێندکاران لە هەمولایەکەوە ڕوویاندەکردە وانەکانی "هیگڵ" و گوێیان لێدەگرت، "شۆپنهاوەر" لەوەدا هەڵەبوو کە بڕیاریدا لە هەمان ئەو کۆلیژەدا وانە بڵێتەوە کە "هیگڵ" وانەی تێدا دەوتەوە، لەبەر ئەم هۆیە هیچ کەسێ نەدەهاتە وانەکانی "شۆپنهاوەر"ەوە هەموان دەڕۆشتن بۆ گوێگرتن لە "هیگڵ" و "شۆپنهاوەر"یان بە تەنها لەگەڵ پێنج تا شەش کەسێکدا بەجێدەهێشت. ئیدی لەو چرکەساتەوە ڕقێکی گەورەی لەبەرامبەر "هیگڵ"دا پەیداکردو هەرگیز لێی خۆش نەبوو، دواتر لەبەرئەوەی ژمارەیەکی کەم خوێندکار ئامادەی وانەکانی دەبن، بۆیە تەنها دوای تێپەڕبونی شەش مانگ بەسەر کاری وانەوتنەوەدا، ناچار واز لە وتنەوەی وانەی زانکۆ دێنێت. لەو کات و ساتەدا کتێبە بەناوبانگەکەی بڵاودەکاتەوە کە دواتر ناوی بەنەمری تۆماردەکات، کتێبی (جیهان وەك ئیرادەو وەك وێناکردنێك)، لەو کاتەدا تەمەنی تەنها ٣١ ساڵ بوو، ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە تەمەنێکی زودا لەڕووی فەلسەفییەوە پێگەیشتبوو.

لە ئێستادا ئەو کتێبە بەیەکێك لە هەرە گرنگترین کتێبە فەلسەفییەکانی ئەو سەردەمە دادەنرێت، تێزە سەرەکییەکەی ئەو کتێبە ئەمەی خوارەوەیە: ئیرادەی فەردی مرۆڤ گرنگی و بایەخی نییە، چونکە واقعی کوێری چواردەور گەمارۆی دەداو دواجار تێکیدەشکێنێ، لێرەوە پێویست بە بەرگریکردن ناکات، بەڵکو پێویستە تەسلیمی قەدەرەکان بین، ئەمەش بۆ ئەوەی مرۆڤ بە ئاسودەیی بمرێت و لەم ژیانە بێهودەیە ڕزگاری ببێت کە هیچ مانایەکی نییە.

بێگومان هیچ کەسێ گوێی بۆ ئەم فەلسەفە ڕەشبینە نەگرت کە دژ بە فەلسەفەی "هیگڵ"بوو، فەلسەفەی "هیگڵ" بانگەشەی ئەوەدەکات مرۆڤ بچێتە ناو ژیانەوەو کۆمەڵگا بەرەو باشتر بگۆڕێت، بگرە مێژوو دروستبکات. لەبەر ئەم هۆیەبوو لەو سەردەمەدا کتێبەکەی "شۆپنهاوەر" هیچی وای لێنەفرۆشراو تاکو دواساڵەکانی ژیانی ناوبانگێکی وای لێوە بەدەستنەهێنا، تەنها پێش مردنی بە چەند ساڵێك، ناوبانگی وەك بۆمبێکی تەوقیت کراو تەقییەوە.

"شۆپنهاوەر" دوای ئەوەی لە زانکۆ دەست لە کار دەکێشێتەوە، بۆ ساتێك حەوانەوە ئەڵمانیا بەجێدەهێڵێ و دەڕوات بۆ ئیتالیا، لە ڕاستیدا مەسەلەی پارە هیچ گرفتێکی بۆ دروست نەکردبوو، ئەو بە پێچەوانەی زۆربەی فەیلەسوفەکانی دیکەوە، دەیتوانی بەبێ ئەوەی ئیش بکات بەئاسانی بژی،

ئەمەش بەختێکی باش بووە بۆی و وایلێکرد خۆی بۆ سەفەرکردن و گەشتوگوزارو نوسین و بیرکردنەوە تەرخان بکات، بەبێ ئەوەی ئەوانە کێشەی مادیی بۆ دروستبکەن.

"شۆپنهاوەر" ساڵی ١٨٢٣ توشی نەخۆشییەکی دەرونی یاخود کەئابەیەکی عەسەبی دەبێت، بەڵام دواتر لەڕێگەی نوسین و کاری داهێنانەوە لەو نەخۆشییە ڕزگاری دەبێت و کۆمەڵێ کتێبی گرنگ بڵاودەکاتەوە، لەوانە (وتارێك دەربارەی ئازادی ئیرادەی مرۆڤ)، (دوو کێشە سەرەکییەکەی ئەخلاق) ساڵی ١٨٤١، "شۆپنهاوەر" لەو کاتەدا تەمەنی لەسەرو پەنجا ساڵەوە بوو، لە ساڵی ١٨٣٣ تاکو کۆچی دواییەکەی لە ساڵی ١٨٦١، لەشاری (فرانکفۆرت) نیشتەجێ دەبێ، واتە بەدرێژایی سی ساڵ لە فرانکفۆرت دەمێنێتەوە، لەو شارەدا پەیکەرەکەی و شتگەلێکی زۆری لێیە کە "شۆپنهاوەر" بیری خەڵك دەخەنەوەو گەشتیاران تاکو ئێستا دەتوانن سەردانی بکەن. وەك وتمان "شۆپنهاور"لە کۆتاییەکانی ژیانیدا، ناوبانگی بەشێوەیەکی بەرفراوان و لەڕادەبەدەر بڵاوبوەوەو گەشتە ئاستێك ناوبانگی "هیگڵ"ی داپۆشی، بەم شێوەیە تۆڵەی ئەو ڕیسوابونە کۆنەی خۆی کردووە کە هیچ کەسێ گرنگی و بایەخی پێنەدەدا. بەڵام دوای ئەوە زۆر نەژیا تاکو چێژ لەو ناوبانگە پان و فراوانەی وەربگرێت، ئێمە ئەمە دەڵێین و دەزانین "شۆپنهاوەر" بەگوێرەی ئەو زەمانە تەمەنێکی درێژ ژیاوە، واتە ٧٣ ساڵ، ئەمە لەکاتێکدا "هیگڵ"ی نەیاری تەنها شەست ساڵێك تۆزێك زیاتر ژیاوە.

دواجار دانەری ئەم کتێبە دەڵێ: کاریگەری "شۆپنهاوەر" لەسەر ڕۆشنبیری ئەڵمانی و فەیلەسوفانی دوای خۆی، کاریگەرییەکی گەورەیە، لە ناودارترین قوتابییەکانی یاخود لە ناودارترین شوێنکەوتوانی مۆسیقاری مەزن "ریچارد ڤاگنەر"و فەیلەسوفی گەورە "فردریك نیچە"یە، ڕاستە "نیچە" دواتر دەستبەرداری دەبێت تاك فەلسەفەیەکی تایبەت بەخۆی دادەڕێژێ، بەڵام لە سەرەدەمی گەنجیەتیدا تا ڕادەی پەرستن "شۆپنهاوەر"ی خۆشویستوە.

سەرچاوە:

بیان الکتب ٢٠٠٧/١٠/٤

# بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

لەماوەی دوو مانگی ڕابردودا، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم زیاد لە بیست کتێبی لە بوارە جیاجیاکانی فیکرو ئەدەبو فەرهەنگو مێژودا بەچاپ گەیاندووەو ئێستا لەبەر دەستی خوێنەراندان، کتێبەکان گەرچی هەموویان بۆ ئەمڕۆی کتێبخانەو ڕۆشنبیرکردنی خوێنەری کورد، کتێبی گرنگو بایەخدارن، گەرچی لە ئێستادا ناوەندی ڕۆشنبیری کوردی پێویستییەکی لە ڕادەبەدەری بەو کتێبانە هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە تەنها خوێندنەوەیەکی کورت بۆ چەند دانەیەکیان دەکەین.

## فەرهەنگی شیرینی نوێ

ئەمە یەکێکە لەو فەرهەنگە بەپێزو زۆرباشانەی دەزگای سەردەم چاپیکردووە، ئەم فەرهەنگە عەرەبی/ کوردییە بۆشاییەکی گەورە پڕدەکاتەوەو سودێکی زۆر بەو بەڕێزو ئازیزانە دەگەیەنێ کە سەرقاڵی کاری وەرگێڕانن لە زمانی عەرەبییەوە بۆ زمانی کوردی. ئاشکرایە کتێبخانەی کوردی لە بواری فەرهەنگسازیدا هەژارەو ژمارەی ئەو فەرهەنگانەی لە عەرەبییەوە بۆ کوردیيە، ئەوەندە کەمە شایەنی باسکردن نییە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لەبازاڕدا نەماون و نرخەکانیان زۆر بەرز بووەتەوە. ئەم فەرهەنگی شیرینی نوێیە کە لەلایەن خواڵێخۆشبوو "فازیل نیزامەدین" ئامادەکراوە، کارێکی تابڵێی گرنگو پڕ بایەخە، ئەم فەرهەنگە ١٣٦١ لاپەڕەی قەبارە گەورەیە، تیراژەکەی ٢٥٠٠ دانەیە، نرخی ٢٠٠٠٠بیست هەزار دینارە.

## ئەدۆنیس

## منداڵی، شیعر، تاراوگە

ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە دەگمەن و جوانانەی دەربارەی شاعیرو ڕوناکبیرو ڕۆشنبیری گەورەی عەرەب "ئەدۆنیس" نوسراوەو وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی، کتێبەکە لە ئەساسدا بریتییە لە چاوپێکەوتنێکی دووردرێژ لەگەڵ شاعیردا. ئەم شاعیرە گەرچی لە ئێستادا تەمەنی گەشتووەتە ٧٨ ساڵ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا لە

کاری نوسین و داهێنان نەکەوتووە، پیری و چوونەساڵەوە هەرگیز نەیانتوانیوە قەڵەمە بە بڕشت و پڕ داهێنانەکەی لەکاربخەن، نەیانتوانیەوە ئەم پیاوە سیما نورانییە لە دنیای نوسین و فیکرو ئەدەب دووربخەنەوە.

ئەدۆنیس لە تەمەنی سێزدە ساڵیدا چووەتە قوتابخانەی ڕەسمی، لەسەر دەستی باوکی قورئانی خەتمکردووە، هەروەها ژمارەیەکی زۆر شیعری شاعیرە کۆنەکانی لەبەرکردووە، لە بەهاری ساڵی ١٩٤٤، واتە لە تەمەنی ١٤ ساڵیدا، شیعرێکی نیشتیمانپەروەری خۆی لەبەردەم سەرۆک کۆماری ئەوکاتی سوریا "شوکری قوتلی" دەخوێنێتەوە، سەرۆک کۆمار زۆر بە شیعرەکە سەرسام دەبێت، بۆیە دەوڵەت بڕیاردەدات بینێرن بۆ قوتابخانەی عەلمانی فەرەنسی لە تەرتوس، قۆناغەکانی خوێندنی بە باز بڕیوە، واتە هەر ساڵەی دوو ساڵی خوێندنی بڕیوە. ساڵی ١٩٥٤ لە زانکۆی دیمشق بەشی فەلسەفە تەواودەکات.

لە هەمانساڵدا بۆ بەجێهێنانی خزمەتی سەربازی دەبێت بە سەرباز، لەوکاتەدا بەهۆی ئینتیمابونییەوە بۆ پارتی قەومی سوری، بێ دادگایی کردن ساڵێك زیندانی دەکرێت، ساڵی ١٩٦٠ واز لەو پارتە دەهێنێت. ساڵی ١٩٧٣ لە زانکۆی (قەدیس یوسف) بڕوانامەی دکتۆرا لە ئەدەب وەردەگرێت، لە ساڵی ١٩٨١ بەردەوام وەك مامۆستایەکی میوان لە زانکۆو ناوەندەکانی توێژینەوە لە فەرەنسا و سویسراو ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاو ئەڵمانیاو هەندێ لە ولاتانی عەرەبی وانە دەڵێتەوەو بەشداری چەندین کۆڕو سیمیناری ئەدەبی و فیکری کردووە. چەندین خەلاتی جیهانی وەرگرتووە، لەوانە خەلاتی (جان مارلیۆ بۆ ئەدەبی بێگانە، فەرەنسا ساڵی ١٩٩٣)، (خەلاتی فیرۆنیا دی فیامۆ، ڕۆما-ئیتالیا ١٩٩٤)، (خەلاتی نازم حیکمەت، ئەستەمبول ١٩٩٥)...هتد.




بەرهەمەکانی بۆ زیاتر لە سیازدە زمان وەرگێڕدراون، لە ساڵی ١٩٨٥ بەهۆی جەنگ و کارەساتە خوێناوییەکانەوە بێروتی بەجێهێشتووەو ڕوویکردۆتە پاریس.

هەندێك لە ئەدیب و ڕەخنەگران پێیانوایە "ئەدۆنیس" لە هەمو شاعیرەکانی دیکەی عەرەب زیاتر جێگای مشتومڕو قسەلەسەرکردنە، پێیانوایە لەسەر دەستی ئەم شاعیرە شیعری عەرەبی گەشتووەتە ئاستی جیهانی، هەربۆیە ماوەیەکی درێژە زۆرێك لە ڕەخنەگران ناوی دەخەنە لیستی ئەو ناوانەی شایەنی وەرگرتنی خەلاتی نۆبڵی ئەدەبن، جگە لە بەرهەمە شیعرییەکانی کە نزیکەی ٢٠ دیوان دەبێت، چەندین کتێبی لە بوارەکانی فیکرو ڕەخنەدا نوسیوە، ئەمە گەر باسی هونەری وێنەکێشان، بەتایبەتی هونەری کۆلاجکردن نەکەین کە شارەزاییەکی باشی تێدامەیە.

ئەم کتێبە کە چاپی دووەمە، لەلایەن بەڕێز "نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد" بە زمانێکی کوردی پوخت و جوان وەرگێڕدراوە، تیراژەکەی ١٠٠٠ دانەیە و نرخی ٣٠٠٠ هەزار دینارە.

### قەسابخانەی ژمارە (٥)

ئەم کتێبە یەکێکە لەو ڕۆمانە جوان و دەگمەنانەی باس لە کارەساتی جەنگ و لەوماڵوێرانییە دەکات کە جەنگەکان دوای خۆیان جێیدەهێڵن. باس لە شەڕانگێزی و پیسبونی ڕۆحی مرۆڤەکان دەکات، ئەو مرۆڤانەی بێباکانە جەنگەکان دەنێنەوە و شەڕەکان بەرپادەکەن، ڕۆمانی قەسابخانەی ژمارە پێنج کە لە نوسینی "کوورت ڤۆنێ گات"ەو عەتا نەهایی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، باس لە کوژرانی ئەو مرۆڤە بێتاوانانە دەکات کە دەبنە سوتەمەنی جەنگەکان، بێ ئەوەی هیچ گوناهو تاوان و خراپەیەکیان کردبێت. لەوەتەی مرۆڤ جەنگ و کوشتاری ناسیوە، هەمیشە ژمارەیەکی زۆری ئینسانەکان، دەبنە قوربانی و گیانیان لەدەستدەدەن، بێ ئەوەی دوورو نزیک ئەو جەنگە پەیوەندی بەوانەوە هەبێت، یاخود هیچ ڕۆڵێکیان لە هەڵگیرساندنی و بەردوامبونیدا هەبێت، هیچ جەنگێك نییە بە دەیان و سەدان و هەزاران هاوڵاتی مەدەنی نەکردبێتە سوتەمەنی بۆ خۆی، هیچ شەڕێك نییە چەندین کارەسات و نەهامەتی مرۆیی لەگەڵ خۆیدا نەهێنابێت.



ئەم ڕۆمانە گێڕانەوەی یاداشتەکانی نوسەری ڕۆمانەکەیە، واتە گێڕانەوەی ئەو ڕوداوە حەقیقیانەیە کە نوسەری ڕۆمانەکە "کوورت ڤۆنێ گات" بەسەریدا هاتووە، ئەم نوسەرە ئەمریکییە، وەك لە پێشەکی کتێبەکەدا هاتووە، لە سەروبەندی جەنگی دووەمی جیهانی، لەبەرەکانی شەڕدا لەلایەن سوپای ئەڵمانیای نازییەوە دەستگیر دەکرێت، لە شاری (درێسدێن) و لە گەنجینەیەکی ژێرزەمینی کە شوێنی هەڵگرتنی لاکە گۆشت بووە، زیندانیکراوە. دواتر شاری درێسدێن لەلایەن فڕۆکەکانی ئەمریکاوە بە خەستی و زۆر دڵڕەقانە بۆردومان دەکرێت، لەو بۆردومانەدا نزیکەی ١٣٤٠٠٠ هەزار کەس دەکوژرێن، پاش تەواوبونی بۆردومانەکە، دەرهێنانی تەرمی کوژراوەکان لەژێر کەلاوەکانی شاردا، بەو دیلانە دەسپێرن کە نەمردوون.

لێرەوە خوێنەر لەبەردەم کۆمەڵێ ڕوداوی ڕاستەقینەدایە کە تێکەڵ بووە بە ئەندێشەو خەیاڵ و هونەری گێڕانەوە. ڕوداوە ڕاستەقینەکان لەڕێگەی زمانێکی جوان و پڕ ئاماژەوە گواستراونەتەوە بۆ ناو لاپەڕەکان و بەرگێکی ئەدەبی جوانی کراوە بەبەردا. لەم ڕۆمانە ٢٧٠ لاپەڕەییەدا خەیاڵ و واقیع، یاداشت و فەنتازیا، بیرەوەری و خەیاڵ، بەشێوەیەکی هونەری جوان تێکەڵ بەیەکبوون و ڕۆمانێکی نایاب و سەرکەوتویان پێکهێناوە، ڕۆمانێك شایەنی ئەوەیە بخوێنرێتەوە. ئەم ڕۆمانە تیراژەکەی ١٠٠٠هەزار دانەیە و نرخی ٣٠٠٠هەزار دینارە.

### ڕێبەری پێچەوانەیی بۆ سەرکردایەتی



ئەم کتێبە دیدێکی تازە بە مانای سەرکردە دەبەخشێت و بە شێوەیەکی دیکە باس لە سەرکردە دەکات، لەم کتێبەدا سەرکردە تەنها سەرۆکی وڵات و سەرکردەی حیزبەکان نین، سەرکردە تەنها نوخبەی سیاسی و سەربازی ئەم پارت یاخود ئەو پارتی دیکە نییە، بەڵکو سەرکردە هەمو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لەبواری کار و فەرمانەکانیاندا بەرپرسیارن.

هەمو ئەو مرۆڤانە دەگرێتەوە کە بەشێوەیەك لە شێوەکان سەرپەرشتی بەڕێوەبردنی گروپێك یاخود دەستەیەك یان کۆمەڵەیەك دەکەن و تێدا بەرپرسی یەکەمن. بەمانایەکی دیکە لەم کتێبەدا وشەی سەرکردە لە مانا تەسك و تایبەتەکەی دەرهێنراوەو مانایەکی گشتگیرو فراوانتری پێبەخشراوە، وشەکە لە تاکە ڕەهەندی سیاسی یاخود سەربازیدا قەتیسنەکراوە، بەڵکو چەندین ڕەهەندی جۆراو جۆری لەخۆگرتووە. ئێمە لەم کتێبەدا لەبەردەم مانایەکی نوێی سەرکردەداین، مانایەك زۆر لایەنی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی دەگرێتەوە، لێرەوە سەرکردە مامۆستایەکی زانکۆ، پزیشکێکی خەستەخانە، بەڕێوەبەری کۆمپانیایەك، دادوەرێکی دادگا..هتد دەگرێتەوە، دەکرێ هەمو ئەوانەو چەندانی دیکەش لەژێر ناوی سەرکردەدا کۆبکەینەوە.

نوسەری کتێبەکە لەو پێشەکییەدا کە بۆ کتێبەکەی نوسیوە، مەبەستی خۆی لە نوسینی کتێبێکی لەم شێوەیە دەردەبڕێت و دەڵێ: (مەبەست لەم کتێبە ئەوەیە کە لە تێڕوانینێکی تازەو ڕەسەنەوە بیر لە سەرکردایەتی بکەیتەوە)، هەر لەوپێشەکییەدا دەڵێ: (بە تەنها هەوڵدان بە لاساییکردنەوەی سەرکردەیەکی بەناوبانگی ڕابردوو ناتوانیت ببیت بە سەرکردەیەکی کاریگەر... مەرجی سەرەکی ئەوەیە ئەگەر تەنها بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت، خۆت لە بیرکردنەوەی تەقلیدی ئازاد بکەیت بۆ ئەوەی توانای ئەفراندنی سروشتی خۆت و توانای بیری سەربەخۆی خۆت بێنیتە پێشەوە).

ئەم کتێبە لەلایەن "ستیڤ ب سامپل" نوسراوە، ئەم نوسەرە لە بنەڕەتدا ئەندازیاری کارەبایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرۆکی زانکۆی کالیفۆرنیابووەو مۆسیقاریشە، جگە لەوانە پرۆفیسۆرێکی چالاکی بواری وانە وتنەوەیە بە خوێندکارانی زانکۆو لە بوارەکانی زانست و ئەندازیاری و فێرکردندا ژمارەیەکی زۆر وتارو لێکۆڵینەوەی بڵاوکردۆتەوە. کتێبی ئەم نوسەرە لەلایەن "کاوە سەباح عومەر" لە زمانی ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی، تیراژی کتێبەکە ١٠٠٠ هەزار دانەیەو نرخی ٣٠٠٠هەزار دینارە.

# فایلەکانی ئایندەی سەردەم



- ڕۆشنگەری
- بونیادگەری

# Sardam

**Foreign Culture Magazine**


**57**

Dec. 2008 VOL.10








**Sardam Printing & Publishing House**